# وەڵامی پرسیارەکان

## ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام


**نووسینی:**

**د.کەریم ئەحمەد**



**کۆچی**1429 **زایینی**2008

**ناوی کتێب:** وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام

**نووسینی:** د.کەریم ئەحمەد

**ژمارەی سپاردن:** (1433) ساڵی (2008)

## بەناوی خوای گەورە و دلۆڤان

### پێشەکی

ئاشکرایە کە هەر سەردەمەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو کێشەو گیروگرفتی خۆی هەیە، ئەم سەردەمەش بە نیسبەت ئیسلامەوە یەکێکە لە سەردەمە هەرە سەختەکان، ئەویش لەبەر ئەوەی کە دوژمنانی ئیسلام زۆرێك لە رۆڵەکانی ئیسلامیان خستۆتە کار بۆ ئەوەی لێی بخوێنن و رەخنەی لێبگرن و دوژمنایەتی بکەن. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دوژمنان رەخنەیان لە ئیسلام دەگرت و هەولّی شێواندنیان دەدا بۆ ئەوەی میللەتانی خۆیان بپارێزن لەوەی کە ببنە موسڵمان، چونکە بارودۆخی موسڵمانان لەوان باشتر بوو، بەڵام لەوەتی رۆژئاوا پێشی داوینەتەوەو ولاتە ئیسلامییەکان کەوتوونەتە ژێر دەستییانەوە هەولّی شێواندنی ئیسلام بۆ ئەوە دەدەن، کە موسڵمانان لە ئایینەکەیان هەڵگێڕنەوە. ئەم قۆناغەش لە دوای داگیرکردنی میسر لە لایەن فەرەنساوە دەستی پێکرد، کە بۆ یەکەم جار موسڵمانان جیاوازیی نێوان ئەوروپاو خۆیانیان بینی لە رووی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژییەوە، دواتریش کە حکومەتی میسریی دەستی کرد بە ناردنی خوێندکاران بۆ ئەوروپا بە گشتیی و فەرەنسا بەتایبەتی زۆرێك لەوانە سەرسام بوون بەو پێشکەوتنەو وایان لێهات لە هۆکاری پێشکەوتنی ئەوان و دواکەوتنی موسڵمانان بکۆڵنەوە، لە ئەنجامدا زۆرێکیان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی یا راستر بڵێین: گەیەنرانە ئەو قەناعەتەی کە هۆی دواکەوتنی موسڵمانان دەستگرتنیانە بە کەلتورەکەیانەوە، کە لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووەو رێگای پێشکەوتنیش دەسبەرداربوونە لەو کەلتوورەو شوێنکەوتنی رۆژئاوایە. ئەوەبوو ئیتر بانگەشە بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی رۆژئاوا دەستی پێکرد و پرۆسەی رەخنەگرتن لە ئیسلام لەسەر دەستی موسڵمانان سەری هەڵدا.

دەتوانین بڵێین یەکەم هەولّ کە درا بریتی بوو لە رێگرتن لە گەڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامی بە جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت لە رێی نووسینێکەوە بە ناوی (**الأسلام واصول الحكم**) لە لایەن زانایەکی ئەزهەری بە ناوی عەلی عەبدولڕەزاق کە تێیدا نکوڵی لەوە دەکات، کە ئیسلام دین و دەوڵەت بێت یا سیستمی فەرمانڕەوایی تێدا هەبێت. دواتریش چەمکەکانی تر وردە وردە خرانە بەر چەقۆی رەخنەو رەخنەکارییەوە تا کار گەیشتە ئەمڕۆ کە زۆر بە راشکاوی بەو پەڕی جورئەت و زۆرجاریش بە بێئەدەبییەکی زۆرەوە هێرش دەکرێتە سەر هەموو چەمك و بەهاو پیرۆزییەکانی ئیسلام و ئەو شتانەی جاران موسڵمانان سامیان دەکرد لە نزیك کەوتنەوە لێیان، ئەمڕۆ بەوپەڕی جورئەتەوە رەخنەیان لێدەگیرێت لە لایەن چەپ وحەداسی و لیبراڵییەکانەوە!

هەولّەکانی شێواندنی ئیسلام بە دوو شێوە بووە، شێوەیەکیان لە دەرەوەی ئیسلامەوە، ئەویش بە وروژاندنی هەندێك شتی گشتی بێبەڵگە هێنانەوە لە خودی ئیسلامەوە وەکو ئەوەی ئیسلام بۆ ئەمڕۆ ناشێ و ئەو سەردەمە سەردەمی زانستەو قۆناغی ئایین بەسەر چوو و هتد، کە عەلمانی و مارکسی و لیبراڵییەکان دەیانوت. شێوەی دووەمیشیان لە خودی ئیسلامەوە، ئەمەش دوو جۆر بوو، جۆرێکیان بە مەبەستی دژایەتی کردنی ئیسلام نەبووە بەڵکو لە ئەنجامی دەمارگیریی هەندێك تایەفەوە بووە وەکو شیعە کە لە ئەنجامی دەمارگیرییان بۆ ئەهلی بەیت هاتوون مێژووی ئیسلامیان شێواندووەو کەسایەتییە ئیسلامییە ناودارەکانی مێژووی ئیسلامیان لەکەدار کردووە، وەك خەلیفە راشیدەکان و خێزانەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺو شەرەکانی ئیسلام و تەنانەت قورئانیش بە ساغی دەرنەچووە لەبەردەستیان، ئەمانەش ئەمڕۆ کەرەسەیەکی خاوی باش پێك دێنن بۆ ناحەزانی ئیسلام کە لە رێگەیەوە هێرش بکەنە سەر ئیسلام. جۆری دووەمیشیان بە مەبەستی دژایەتی کردنی ئیسلامەو لە لایەن چەپ و عەلمانی و بێ دینەکانەوە دەکرێت، ئەم جۆرەیان هەولّی ناشیرین کردنی هەموو چەمك و بەهاکانی ئیسلام دەدەن هەر لە قورئانەوە تا پێغەمبەر ﷺو شەریعەتی ئیسلامی و بەها ئەخلاقییەکانی و تەنانەت خودی خوای گەورەش لە دەستی شێواندنیان دوور نەبووە.

ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئیسلام لە هەموو جارێکدا کە رووبەڕووی ئاوها هێرشێك دەبێتەوە بەهێزتر لە جاران و تۆکمەتر دێتە دەرەوە لە مەیدانی ململانێکە، ئەویش لەبەر ئەو بەڵێنەی کە خوا داویەتی کە ئەمە کۆتا ئایینێتی و کۆتا

چرایەتی بۆ سەر زەوی و سەرەڕای هەموو هەوڵ و تەقەلایەك بۆ كوژاندنەوەی، خوا هەر بە رۆشنی دەیهێڵێتەوە و دەیگەیەنێتە ئەنجام و هەموو دوژمنانی رووڕەشییان بۆ دەمێنێتەوە: "**يريدون ليطفئوا نور الله بأفواههم والله متم نوره ولو كره المشركون**"، "....**ولو كره الكافرون**". ئەویش لە رێگەی ئەو زانایانەی كە پێغەمبەر دەربارەیان دەفەرموێت: (**يحمل هذا العلم في كل خلف عدوله، ينفون عنه تحريف الغالين، وانتحال المبطلين و تأويل الجاهلين**). **رواه احمد وصححه**.

ئیسلام هۆكارەكانی بەردەوام بوونی لەناو خۆیدایە، بۆیە جار دوای جار بەهێزتر لە پێشوو دێتە دەرەوەو دوژمنانی دەبەزێنێ و كۆمەڵێكی تر لە نهێنییە مەزنەكانی دەردەكەون، كە لەوەبەر نەزانرابوون، بەتایبەت قورئانی پیرۆز كە خوا بەڵێنی داوە بیپارێزێ (**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**) (**الحجر: 9**)، پێغەمبەریش دەربارەی دەفەرموێت: قورئان كتێبێكە نهێنییەكانی كۆتایی نایەت "**وأنه لا تنتهي عجائبه**".

ئەم كتێبەی بەردەستیشت لە ئەنجامی خوێندنەوەی هەندێك لەو رەخنانەی ئاراستەی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ كراون نووسراوە، كە تێیدا راستیی ئەو قسەیەی لەمەوبەر كردمان دەردەكەوێت و چەندین لایەنی مەزنمان بۆ بەرجەستە دەبێت، كە لەوەبەر ئاماژەیان پێنەدراوەو دەردەكەوێت كە ئیسلام زۆر لەوە گەورەترە كە ناحەزانی گومان دەبەن.

لەم كتێبەدا هەوڵمان داوە تیشك بخەینە سەر بەشێك لەو چەمكانەی كە ناحەزانی ئیسلام یا لەبەر نەزانی وەیا لە ئەنقەست و بۆ ناشیرین كردنی ئیسلام رەخنەی لێ دەگرن، بەتایبەت مەسەلەی ئافرەت و كۆیلایەتی و زەواجی پێغەمبەر ﷺو شەرەكانی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامی و ..هتد.

لە كۆتاییدا، هیوام وایە توانیبێتم ئەو چەمكانەی لەسەرم نووسیون مافی خۆم دابێتنێ و شتێكم بۆ سەر كتێبخانەی ئیسلامیی كوردیی زیادكرد بێت و ئەم كتێبە ببێتە سەرچاوەیەكی فكری بۆ ئەوانەی دەیانەوێت لەسەر ئەو چەمكانە بنووسن و هەر كەم و كورتییەكیشی تێدا بێت ئەوە لە ئێمەوەیە نەك لە ئیسلام كە ئایینی خوای بێ گەردە.

**نووسەر**
2008/4/13
**رەبیعی دووەمی** 1429**ك**

## چەند بنەمایەك بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام

پێش ئەوەی بێینە سەر ئەو چەمکانەی کە دەمانەوێت قسەیان لەسەر بکەین، بە پێویستی دەزانم هەندێك بنەمای گشتیی هەیە باسی بکەم کە پێویستن بۆ تێگەیشتن لە ئیسلام و زانینی هەڵوێستی ئیسلام لەمەر شتە جۆراوجۆرەکان :

1. پێویستە هەرچی دەق هەیە لەو بارەیەوە لە ئایەت و فەرموودە هەمووی کۆ بکرێتەوە و تاوتوێ بکرێن و بەراورد بکرێت لە نێوانیاندا و هۆ و بۆنەو کات و شوێنی هەریەکەیان بزانرێت و ئەو دەقانەی کە دەلالەتێکی گشتییان هەیە جیا بکرێنەوە لەوانەی کە دەلالەتی تایبەتییان هەیە و ئەو دەقانەی کە گشتین بۆ هەموو کاتێك و ئەوانەی تایبەتن بە بارودۆخێکی تایبەتەوە جیا بکرێنەوە، بە تایبەت ئایەتەکانی قورئان چونکە گومان لە راستییاندا نییەو بنەما تیۆرییەکانی ئیسلامیان بە تەواوی روون کردۆتەوە.

2. دەبێ پێش هەموو شتێك لە رۆحی ئەو دەقانە تێبگەین و بزانین مەبەستەکانی شەرع چییە لێیان، ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە و لای زانایان پێی دەوترێت مەبەستە گشتییەکانی شەریعەت (**المقاصد العامة للشريعة الاسلامية**) کە ئەگەر هەر کەسێك ئەوە نەزانێت نابێ قسە لە هیچ دەقێك بکات، چونکە لەوانەیە دەقێك بە رواڵەت پێچەوانەی ئەو شتە بێت کە شەرع دەیەوێت.

بۆ نموونە: دەبێ بزانی لە سەرجەمی ئەو دەقانەوە کە دەربارەی ئافرەت هاتووە ئایا شەرع مەبەستی بووە رێز لە ئافرەت بنێت و مافەکانی دەستەبەر بکات یا ویستوویەتی بێرێزی بکات، یا بە نیسبەت کۆیلەوە بزانی کە ئایا شەرع مەبەستی بووە کۆیلایەتی نەهێڵێت یا ویستوویەتی جیاوازیی چینایەتی قوڵتر بکاتەوە.

دەبێ لێرەدا دان بەوەدا بنێین کە زۆر جار زانایانیش کەوتوونەتە هەڵەوەو بەبێ تێگەیشتن لە مەبەستە گشتییەکانی شەرع دەقەکانیان راڤە کردووە و لە ئەنجامی ئەوەوە کەوتوونەتە هەڵەی گەورەوە. زانستی (**اصول الفقه**) یەکێکە لەو زانستانەی کە بایەخ بەم مەسەلەیە دەدات و کەسێك بێئاگا بێت لێی ناتوانێ بە جوانی لە ئیسلام بگات.

3.نابێ بە بڕیاری پێشتر ئامادەکراو (**مقررات مُسبقة**) مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکرێت، واتە کەسێك پێشتر بۆچوونێکی بە شێوەیەك لە مێشکی خۆیدا بڕیاردابێت یان بۆچوونێکی لە باوباپیرانەوە بۆ مابێتەوەو دوایی بچێت بە دوای دەقەکاندا بگەڕێت بۆ ئەوەی بەڵگەی لە سەر بێنێتەوە، بەڵکو دەبێ بچێ لە سەرجەم دەقەکانەوە هەڵوێستی ئیسلام لەو مەسەلەیە بزانێ.

4.دەبێ بە هاوسەنگی باسی شتەکان بکرێت، ئەو شتانەی کە پەیوەندیی بە نێوان دوو لایەنەوە هەیە دەبێ باسی هەردوولای هاوکێشەکە بکرێت. بۆ نموونە لە پەیوەندیی نێوان پیاوو ژندا نابێ بێی تەنها ئەو دەقانە باس بکەیت کە باسی مافی پیاو دەکات بەسەر ژنەوەو ئەو دەقانە پشتگوێ بخەیت کە باسی مافی ژن دەکات بەسەر پیاوەوە، بەڵکو دەبێ بە هاوسەنگی باسی مافی هەریەکەیان بەسەر ئەوی تریانەوە بکرێت، دەقەکانیش بە گوێرەی هێزو دەلالەتەکانیان ریزبەندیی بکرێن.

هەروەها لە مەسەلەی هەڵوێستی ئیسلام لە شەڕو ئاشتی یا لە نێوان بەکارهێنانی زۆر و لێبوردەیی، نابێ تەنها ئاماژە بەو دەقانە بدەیت کە باسی جیهاد و بەکارهێنانی هێز دەکات و ئەو دەقانەی باسی لێبوردەیی و چاوپۆشی دەکەن پشتگوێ بخەیت. ئەم هەڵەیە زۆربەی رەخنەگران لە ئیسلام تێی دەکەون هەندێکیان لە نەزانی و هەندێکیشیان لە دەستی ئەنقەست.

نموونەی تر زۆرن لە سەر ئەم مەسەلەیە، وەکو پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵ، پەیوەندیی نێوان گەل و دەسەڵاتدار، پەیوەندی نێوان کرێکار و خاوەن کار، پەیوەندیی نێوان کۆیلەو خاوەن کۆیلە و.. هتد.

لێرەدا دەبێ جیاوازی بخەینە نێوان لایەنی تیۆری و لایەنی کردەیی، ئێمە مەبەستمان زیاتر لایەنە تیۆرییەکەیە، چونکە لایەنی کردەیی زۆر هۆکاری تری تێکەڵاو دەبن کە لەوانەیە وێنەی مەسەلەکە لە زهنی خەڵکیدا بگۆڕێ. بۆ نموونە: دەسەڵاتدار دەسەڵاتی خۆی بەکارهێناوە بۆ دەرخستنی مافەکانی خۆی بەسەر خەڵکییەوەو شاردنەوەی مافەکانی گەل

بەسەر دەسەڵاتدارەوە، یا پیاو دەسەڵاتی خۆی بەکارهێناوە بۆ سەپاندنی مافەکانی خۆی و پێشێلکردنی مافەکانی ژن. لێرەدا شەرع تاوانبار نییە بەڵکو ئەو کەسە تاوانبارە کە ئەو کارە دەکات، ئەمەش لە شەرعدا پێی دەوترێت (التعسف في استعمال الحق) واتە ستەمکردن یا ناڕەوایی کردن لە بەکارهێنانی مافێکدا.

5. لە ناو دەقەکانی قورئان و فەرموودەدا هەندێك دەق پێیان دەوترێت موحکەم واتە ماناو مەبەست و دەلالەتەکانیان روون و ئاشکرایە و هەندێکی تریش پێیان دەوترێت موتەشابیهـ کە مانا و مەبەستەکانیان روون و ئاشکرا نین، بۆ تێگەیشتن لە هەڵوێستی ئیسلام لە هەر مەسەلەیەك دەبێ پشت بە ئایەتە موحکەمەکان ببەسترێت و ئایەتە موتەشابیهەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ موحکەمەکان و لەژێر رۆشنایی ئەواندا راڤە بکرێن.

خوا لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (**هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الألْبَابِ**) (**آل عمران: 7**)

ئەوەی کە ناحەزانی ئیسلام دەیکەن ئەوەیە کە دەچن بە دوای ئایەتە موتەشابیهەکاندا دەگەڕێن و لە روانگەی ئەوانەوە دەیانەوێ هەڵوێستی ئیسلام دەربخەن و ئایەتە موحکەمەکان پشت گوێ دەخەن.

6. بۆ هەڵسەنگاندنی کەسایەتی هەر کەسێك دەبێ ئەو کەسە لە هەموو لایەنێکەوە هەڵبسەنگێنرێت بۆ ئەوەی وێنەیەکی راستەقینە دەربارەی ئەو کەسە دروست ببێت و نابێت لایەنێکی کەسایەتییەکەی زیاد لە رێژەی خۆی زەق بکرێتەوەو لایەنەکانی تر بشاردرێتەوە، هەروەکو تابلۆیەك ئەگەر بتەوێت بە جوانی لێی تێبگەیت دەبێ سەرەتا کەمێك دوورکەویتەوە بۆ ئەوەی هەموو رەهەندەکانی ببینی و پاشان گەر بتەوێت لە دیمەنێکیان زیاتر بکۆڵیتەوە لێی دێیتە پێشەوەو لە نزیکەوە بۆی دەڕوانی.

بۆ نموونە: ئەو پێوەرەی هەندێك کەس بەکاری دەهێنێت بۆ لێکدانەوەی کەسایەتی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ پێوەرێکی زۆر ناتەواوەو هەرگیز مرۆڤ ناگەیەنێتە ئەنجامێکی راست، چونکە تەنها تیشك دەخەنە سەر یەك دوو لایەن لە ژیان و کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ و لایەنەکانی تر پشت گوێ دەخەن، بۆیە ئێمە لەم نووسینەدا هەوڵمان داوە گشتگیرانە لە ژیانی ئەو کەسە مەزنە بکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بگەینە دەرئەنجامێکی راست دەربارەی کەسایەتییەکەی و بەو شێوەیە لێی بگەین کە هەبوو بە بێ شێواندن و تێکدان.

## ئیسلام و کۆمەڵگەی عەرەبی (دەشتەکێتی عەرەب و رێنماییەکانی ئیسلام)

هەندێ کەس ئەم مەسەلەیە زۆر دووپات دەکەنەوە: ئیسلام ئاینێکە بۆ کۆمەڵگەیەکی عەشایری دواکەوتوو هاتووە و رێنماییەکانی لەگەڵ دابونەریتی ئەو کۆمەڵگەیەدا یەکانگیر دەبێتەوەو بۆ ئەم سەردەمە پێشکەوتووە دەسناداتـ. ئەم بۆچوونە لە دوو رووەوە هەڵەیە:

یەکەم لەو رووەی، کە عەرەب بەو رادەیە دواکەوتوو نەبوون و دووەم لەو رووەی کە ئیسلام بۆ کۆمەڵگەی دواکوتوو نەهاتووە، درێژەی ئەم باسەش بەم شێوەیەیە:

یەکەم: راستە کۆمەڵگەی عەرەبی دواکەوتوو بوو، بەڵام زۆر شتیشی تێدا بوو بەڵگەن لەسەر شارستانیی بوونی ئەو کۆمەڵگەیە، بۆ نموونە:

لە بواری سیاسییو ئابووریدا چوار مانگیان هەبوو بە ناوی (**الأشهر الحرم**) کە تێیدا بە هیچ شێوەیەك شەڕ نەدەکراو دەستدرێژی بۆ سەر کەس نەدەکراو بە ئازادیو بەبێ ترس هاتوچۆو کڕینو فرۆشتنو بازرگانی دەکرا.

لە بواری ئیدارییدا قورەیش کاروباری خزمەتکردنی حاجییانیان دابووە دەستی تیرەیەكو ئاڵای سەربازی بە دەست تیرەیەکی ترو خزمەتی کەعبە بە تیرەیەكو ..هتد.

لە بواری کۆمەڵایەتییدا خەڵکی مەککە گرێبەندێکیان لە نێوان خۆیاندا بەستبوو بە ناوی (**حلف الفضول**) کە لەماڵی (عبدالله بن جدعان)دا ئەنجام درابوو، بەپێی ئەوە رێککەوتبوون کە نەهێڵن کەس مافی بخورێت و هەرکەسێك ستەمی لێ بکرێت بە هەموویانەوە ستەمەکەی لەسەر لابەنو تۆڵەی بۆ بکەنەوە.

لە رووی رۆشنبیریشەوە چەندین جێگەیان دیاری کردبوو وەکو بازاڕی (**عکاظ** )و (**مربد**)و چەندین شوێنی تر کە تێیدا هەم ئاڵوگۆڕی بازرگانییان دەکرد و هەم پێشبڕکێی وتاربێژی و شیعرخوێندنیان دەکرد و گەورە وتاربێژو شاعیرانی ئەو دەوروبەرە لەوێ بەرهەمی خۆیانیان نمایش دەکرد.

لە پاڵ ئەمانەشدا شتی خراپیان زۆر بوو، وەکو بتپەرستی، زیناکردن، سوخۆری، مەشروبخۆری، کچ زیندەبەچاڵ کردنو چەوساندنەوەی ئافرەت و کۆیلەو.. هتد، کە هەموو ئیسلام گۆڕینیو لە جێگەیدا شتی تری دانا.

دووەم: دەستەواژەی ئیسلام ئایینێکە بۆ ئەو کۆمەڵگە زۆر عەشایەرییە هاتووەو لەگەڵ داب و نەریتی ئەو کۆمەڵگەیەدا یەکانگیر بووەتەوە، هەڵەیەکی گەورەیەو نەزانیی ئەو کەسانە دەردەخات بە گەورەیی و پتەوی شەریعەتی ئیسلام و بێئاگاییان لە رای ئەو هەموو یاساناس و کۆنگرە نێودەوڵەتییانەی کە گیراون بۆ هەڵسەنگاندنی یاساو شەریعەتەکانی ئەم سەردەمەی سەرزەوی، لەوانە ئەو کۆنگرە نێودەوڵەتییانەی کە لە لاهای بەستراونو چەند جار دانیان بە شیاویی شەریعەتی ئیسلامدا ناوە بۆ سەردەمی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی.

هەروەها بێئاگان لەوەی کە وڵاتێکی وەکو ئەڵمانیا لە دوای شەڕی جیهانی دووەم ویستی پەنا بباتە بەر شەریعەتی ئیسلام بۆ بەرپاکردنی سیستەمی فرەژنی، بەڵام دەمارگیریی قەشەکانو پیاوە ئایینییەکان رێگر بوون لەبەردەم بەرپاکردنی ئەم بڕیارەدا.

لەگەڵ ئەمەشدا من چەند نموونەیەك دێنمەوە لەسەر هەندێك لە تەشریعاتی ئیسلامی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بۆ ئەوەی بزانن کە ئیسلام نەك هەر شەریعەتی کۆمەڵگەیەکی ئەوپەڕی عەشایەر نییە، بەڵکو تەنانەت لە پێش ئەم کۆمەڵگایانەی ئەمڕۆی ئێمەشەوەیە.

1- دەربارەی سەردانو چوونە ماڵی یەکتر، قورئان دەفەرموێت: (**يَا أيها الَّذين آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُون* فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فيها أحَداً فلا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّه بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ**) (النور: **27 ـ 28**).

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جگە لە ماڵی خۆتان سەر بە هیچ ماڵێکدا نەکەن هەتا ئیزن نەخوازنو سڵاو لە خەڵکەکەی نەکەن، ئەمە بۆ ئێوە باشترە بەڵکو پەندی لێ وەرگرن، ئەگەر کەستان تێدا نەدیت مەچنە ژوورەوە تا ئیزنتان نەدەن، ئەگەر پێیان وتن بگەڕێنەوە پێویستە بگەڕێنەوە، ئەوە بۆ ئێوە باشترو پاکترە، خودا لە هەرکارێ دەیکەن ئاگادارە.

ئایا ئەم رێنماییانە تا ئێستا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بەرپا کراون؟ ئایا گەر بچینە ماڵی دۆستێك و ئیزنی چوونە ژوورەوەیان نەداین و وتیان بگەڕێنەوە بە ئاسانی و بەبێ دڵ ئێشان دەگەڕێینەوە؟ ئایا ئەم رێنماییانە هی کۆمەڵگەیەکی دەشتەکییە یا هی پێشکەوتووترینو باڵاترین کۆمەڵگەیە؟

2ـ دەربارەی مامەڵە کردن لەگەڵ منداڵدا لە ماڵداو چۆنێتی هەڵسوکەوتی منداڵان دەفەرموێت: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذنكُمُ الَّذين مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ منكُمْ ثَلاثَ مَرَّاتٍ من قَبْلِ صَلاة الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلاة الْعِشَاء ثلاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ وَاللَّهُ عَليمٌ حَكِيمٌ* وَإِذَا بَلَغَ الأطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذينَ من قَبْلِهِمْ كَذَلكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِه وَاللَّهُ عَليمٌ حَكِيمٌ**) (النور: **58 ـ 59**).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، با غوڵامو کەنیزەکەکانی بەردەستتانو منداڵە باڵغنەبووەکانتان سێ کات ئیزنتان لێ بخوازن: پێش نوێژی بەیانی و کاتێك کە جلەکانتان لەبەر دەکەنەوە لە گەرمەی نیوەڕۆدا و پاش نوێژی خەوتنان،

ئەو سێ کاتە وەختی تەنیایی ئێوەیەو کاتی خۆدەرخستنتانە، واتە بە بێ پرس لەو سێ کاتەدا نەدەن بەسەرتاندا، دوای ئەوە نە بۆ ئێوە نە بۆ ئەوان قەیدی نییە بەبێ ئیزن خواستن بچن بەسەر یەکدا، چونکە ئێوە تێکەڵن و بەسەر یەکدا دەگەڕێن، بەو جۆرە خوا ئایەتەکانی خۆی (نیشانەکانی خۆی) بۆ ئێوە ئاشکرا دەکات، خودا زاناو داناو کاردروستە. هەرکاتێکیش منداڵەکانتان باڵغ بوون ئەوا دەبێ وەکو ئەوانەی پێش خۆتان ئیزن بخوازن (واتە وەك ئەوانەی لە ئایەتی (**لَا تَدْخُلُوا بُيُوتاً غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا**) باسکراون ئیزن بخوازن)، واتە لە هەموو کاتەکاندا، خودا زاناو داناو کاردروستە.

ئەم دوو ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت، کە دەبێ ژووری دایكو باوك جیا بێتو ژووری منداڵان جیا بێت، هەتا منداڵی بچووکیش، (جگە لە کۆرپە) فێر بکرێن لە سێ کاتدا بەبێ ئیزن نەچن بە سەر دایكو باوکیاندا، بە نیسبەت منداڵە باڵغەکانیشەوە ئەوا هەموو کاتێك دەبێ ئیزن بخوازن بۆ چوونە ژووری دایكو باوك.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: (نوێنی منداڵەکانتان لە (10) ساڵیدا لەیەك جیا بکەنەوە)

ئایا ئەمە تەشریعی کۆمەڵگەیەکی عەشایەرییە یا هی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی ئەم سەردەمەیە؟

ئایا زۆرێك لە کۆمەڵگەی کوردەواریو کۆمەڵگاکانی تریش تا ئێستا گەیشتوونەتە ئەم ئاستە؟

یاساکانی ئیسلامو تەشریعی ئیسلامیی نەك هەر هەڵقوڵاوی کۆمەڵگەی دەشتەکی نییە، بەڵکو ئێستاش لە پێش هەموو تەشریعاتەکانەوەیەو لە هەموویان هاوسەنگترو گونجاوترە بۆ مرۆڤایەتی.

شەریعەتێك دانراوی خوا بێت، خوایەکی داناو زانا بە هەموو کونجو کەلەبەرو نهێنییەکانی مرۆڤو بڕیاری دابێت کە دوا شەریعەت بێت بۆ مرۆڤایەتی ناتوانێ وەڵامی پێویستییەکانی مرۆڤایەتی بداتەوە؟ ئەگەر کەسانێك خۆیان ئەم ڕاستییە نازانن با بچن لە پسپۆڕە یاساناسەکانو کۆنگرە یاساییە نێودەوڵەتییەکان بپرسن یان هیچ نەبێت فقهی بەراورد (**الفقه المقارن**) بخوێننەوە و بزانن شەریعەتی ئیسلامی فراوانترو گشتگیرترو نەرمترە یان یاسا داهێنراوەکان؟!

سێهەم: هەندێك وادەزانن ئەم دەستوورو یاساو سیستمانەی ئێستا بەرپا دەکرێت نوێنو لەدایکبووی ئەمڕۆن!

ئەوە سیستەمی دیموکراسی هی زەمانی یۆنانییەکانە کە چەند هەزار ساڵ پێش ئیسلامەو باوەڕیش ناکەم کەس بتوانێت بڵێت کۆمەڵگەی یۆنانی لە کۆمەڵگەی ئیسلامی پێشکەوتووتر بوو.

بە نیسبەت یاساکانی ئەمڕۆی وڵاتە ڕۆژئاواییەکانیشەوە زۆربەیان لە یاسای ڕۆمانییەوە وەرگرتووە کە ئەویش پێش ئیسلامە، ئیتر ئەم چەواشەکارییە لەپای چی؟!

چوارەم :گریمان وایەو عەرەب دەشتەکیو دواکەوتوو بوون، ئەمە چ زیانێك لە ئیسلام دەدات؟ ئەمە نەك هەر لە نرخی ئیسلام کەم ناکاتەوە، بەڵکو گەورەترین خزمەتی پێدەکات، چونکە ئەوکاتە گەورەیی ئەم ئایینە دەردەکەوێت لەوەی کە لە میللەتێکی ڕشو ڕووتی عەشایەری دواکەوتووی ئاوها کۆمەڵێکی پێگەیاند کە ببنە پێشکەوتووترین میللەتی سەردەمی خۆیانو دوو ئیمپراتۆرییەتی زەبەلاحی تەمەن چەند سەد ساڵە لەسەر دەستیان بڕوخێت و شارستانییەتێکی وای پێ پێکەوەنان کە هەموو مێژوونووسو کۆمەڵناسو شەریعەتناسو زانا بە ئینصافەکان دان بە گەورەییو مرۆڤانەییەکەیدا بنێنو بۆ ماوەی چەند سەد ساڵێك کردنی بە سەروەری دونیاو مامۆستای مرۆڤایەتیو شەریعەتێکی بەرپاکرد، کە بە دانپێدانانی پسپۆڕانی یاسا کە لە مەودوا باسی دەکەین لە سەرووی هەموو یاساو شەریعەتەکانەوەیە.

## شایەتی پسپۆڕانی یاسا لەسەر شەریعەتی ئیسلام

پرۆفیسۆر شیریل، راگری کۆلێژی یاسا لە زانکۆی ڤیەننا لە ساڵی 1927دا دەڵێ: "مرۆڤایەتی دەبێ شانازی بەوەوە بکات، کە موحەممەد ﷺ مرۆڤێکە، ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە شەریعەتێکی هێناوە ئێمەی ئەوروپاییەکان ئەوپەڕی بەختەوەر دەبین گەر پاش دوو هەزار ساڵ بگەینە لوتکەکەی (الغرب نحو الدرب محفوظ العباسی ص123 لە گۆڤاری العربی ژمارە323ساڵی 1985ل 67).

کۆنگرەی یاسای نێودەوڵەتی کە لە لاهای بەسترا ساڵی 1937، بڕیاریدا کە:

1ـ شەریعەتی ئیسلامی دادەنرێت بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی یاسادانانی گشتیی (التشریع العام).

2ـ شەریعەتی ئیسلام بە شەریعەتێکی زیندووی قابیلی پێشکەوتن دادەنرێت.

3ـ شەریعەتی ئیسلام سەربەخۆیەو لە هیچ شەریعەتێکی ترەوە وەرنەگیراوە.

یاسانسی بەناوبانگی ئەڵمانیش (شاخت) دەربارەی شەریعەتی ئیسلام دەڵێ: "گرنگترین شت ئیسلام بەجێی هێشتووە بۆ جیهانی پێشکەوتوو (شارستانێتیی) یاسا ئایینییەکەیەتی کە پێی دەگوترێت (شەریعەت)، شەریعەتی ئیسلام جیاوازییەکی ئاشکرای هەیە لە هەموو شێوەکانی تری یاسا بە رادەیەك توێژینەوەی کارێکی پێویستە بۆ ئەوەی رەهەندە تەواوەکانی مەسەلە یاساییەکانی بنرخێنرێت".

سەرەکیترین ئەو تایبەتمەندیانەی وا لە شەریعەتی ئیسلام دەکات لەگەڵ ئەو هەموو بابەت زۆرییەی، یەکگرتوویی خۆی بپارێزێت تێڕوانینەکەیەتی بۆ هەموو کردەوەکانی مرۆڤو پەیوەندییانە بە یەکترەوە، لەگەڵ ئەوەیشیان کە پێی دەگوترێت یاسایی لەسەر بناغەی ئەم چەمکانەی خوارەوە:

**(واجب، مندوب، متروك، مكروه، محظور)**، یاسای تێهەڵکێشێکی تەواو کردووە لەگەڵ سیستمە پەرستشییەکەیدا.

لەگەل ئەوەی کە تەشریعی ئیسلامی یاسایەکی ئایینییە، بەڵام لە رووی ناوەڕۆکەوە بە هیچ روویەك ناکۆك نییە لەگەڵ عەقڵدا.

تەشریعی ئیسلام خاوەنی پرۆگرامێکی رێکو پێکەو رێبازێکی پتەو پێك دێنێت **(مذهب متماسك)**و رێبازە جۆراو جۆرەکانی بەیەکەوە گرێداوە[1].

ئەمانە برێکی زۆر کەمن لە شایەتی یاساناسان ئیتر چۆن نووسەر دەتوانێ رەخنە لە شەریعەتی ئیسلام بگرێتو بە نامرۆڤانەی ناوەزەد بکات.

هەروەها بڕیارەکانی کۆنگرەی دووەمی لاهای بۆ بەراوردی یاساکان (القانون المقارن) کە لە ساڵی 1937دا گیرا، کە بە کۆی دەنگەکان ئەو بڕیارانەیان دا کە لەمەوپێش باسمان کرد، پێش ئەوەش لە کۆنگرەی یەکەمی لاهای کە لە ساڵی 1932دا بەستراوە تێیدا یاساناسانی ئەڵمانیو فەرەنسیو ئینگلیزیو ئیتالی دانیان بەوەدا نا کە شەریعەتی ئیسلامی توانای کشان (مرن)و توانای گەشەکردنو پێشکەوتنی هەیە.

لە کۆنگرەی مافناسانی نێودەڵەتی 1948 کە دیسانەوە لە لاهای گیرا بڕیاریان لەسەر ئەم برگەیەی خوارەوە دا: "بە دانپێدانان بەو نەرمییە (مرونە)ی لە شەریعەتی ئیسلامیدا هەیەو ئەو گرنگییەی هەیەتی پێویستە کۆمەڵەی مافناسانی نێودەوڵەتیی هەڵبسێت بە توێژینەوەیەکی بەراوردکارانەی ئەم شەریعەتەو هاندان لەسەر لێکۆڵینەوە دەربارەی".

لە ساڵی 1921دا بەشی مافە رۆژهەڵاتییەکان لە کۆمەڵەی نێودەولەتیی بۆ بەراوردی یاساکانی مافەکان کۆنگرەیەکی گرت لە کۆلێژی ماف لە زانکۆی پاریس لە ژێر ناوی (هەفتەی فقهی ئیسلامی) کە تێیدا پێنج بابەت پێشکەش کرا،

[1] (تراث الإسلام بەرگی سێیەم نووسینی جۆزیف شاخت و بوزورت وەرگێرانی د.حسین مؤنس و احسان صدقی العمد بەشی یاساو دەوڵەت).

سەلماندنی خاوەندارێتیی، ئیستملاك بۆ بەرژەوەندیی گشتی، لێپرسراوێتیی تاوانبارێتی، بیردۆزی سو خواردن لە ئیسلامدا.

لە كۆتایی كۆنگرەكەدا بە كۆی دەنگەكان ئەم بڕیارانەی خوارەوە درا:

1ـ بنەماكانی فیقهی ئیسلامیی بەهایەكی یاسایی گەورەیان هەیە.

2ـ جیاوازیی مەزهەبە فیقهییەكان لەم كۆمەڵە یاساییە مەزنە زەخیرەیەكی گەورەی لە بۆچوونو زانیاریو بنەمای یاسایی سەرسوڕهێنەری تێدایە كە بەوە فیقهی ئیسلامیی دەتوانێت بچێت بە دەم هەموو پێداویستییەكانی ژیانی نوێو گونجاندن لە نێوان پێداویستییەكاندا. شایانی باسو شانازیش ئەوەیە كە بایەخێكی زۆر بە یەكێك لە كەڵەپیاوانی شەریعەتی ئیسلامیی دەدرێت كە ئەویش (محمد بن الحسن الشیبانی)یە، كە لە ساڵی 189ك كۆچی دوایی كردووە كە لە گوتنجن لە ئەڵمانیا (كۆمەڵەی شەیبانی بۆ مافە نێودەوڵەتییەكان) دانراوە، كە زۆرێك لە مافناسو یاساناسەكانی جیهانی تێدایە بۆ ناساندنی ئەم كەسایەتییە گەورەیەو بڵاوكردنەوەی نووسراوەكانیو هەڵدان پێیدا تا رادەیەك كە دەڵێن: "شەیبانی شایانی ئەوەیە بخرێتە ریزی پێشڕەوانی یاساناسانی نێودەوڵەتیی جیهانییەوە".

## شایەتی رۆژئاواییەكان لەسەر شێوازی بڵاوبوونەوەی ئیسلام

سێر توماس أرنولد دەڵێ: "ئیسلام ئایینێكە ستەمو زۆرداری جێی نەبۆتەوە لەناو بنەماو رێنماییەكانیدا، ئایینی ئازادیو برایەتیو یەكسانی، ئایینی چاوپۆشیو رەوشتی بەرزو سروشتی سافو پاكی دەروونو ویژدانە"[1].

گۆستاف لۆبۆن دەڵێت: "هەرگیز هیچ هۆكارێك نەبووە لە بڵاوبوونەوەی قورئان، عەرەب میللەتە ژێردەستەكانیان ئازاد كرد لە ئایینی خۆیاندا، ئەگەر هەندێك لە مەسیحییەكان بوون بە موسڵمانو زمانی عەرەبیان كرد بە زمانی خۆیان ئەوە لەبەر ئەو هەموو دادپەروەرییە بوو كە لە عەرەبە براوەكانیان بینی كە خەڵكی پێشتر شتی وایان نەبینیبوو، لەبەر ئەو ئاسانكارییەی كە لە ئایینەكانی تردا نەبینرابوو، موسڵمانان بەوپەڕی نەرمونیانییەوە مامەڵەیان دەكرد لەگەڵ خەڵكی سوریاو میسرو ئیسپانیاو هەموو وڵاتێك دەسەڵاتیان بەسەریدا گرتبوو، دەستیان لە هیچ یاساو نەریتو بیروباوەڕێكیان وەرنەداو جگە لە جزیەیەكی كەم كە لەبەرامبەر پاراستنیان لێیان وەردەگرتن هیچی تریان بەسەریاندا نەسەپاند، میللەتان لەشكری بەبەزەییو لێبوردەی وەكو عەرەبیان نەبینیوە"[2].

میشود دەڵێت: "ئەو ئیسلامەی كە فەرمانی بە جیهاد داوە زۆر لێبوردە بوو بەرامبەر شوێنكەوتووی ئایینەكانی تر، باجی لەسەر بەترێكو راهیبەكانو خزمەتكارەكانیان لابردبوو، كوشتنی راهیبەكانی حەرام كردبوو لەبەر ئەوەی خەریكی عیبادەتن، عومەریش كە قودسی فەتح كرد هیچ دەستدرێژییەكی بۆ سەر مەسیحییەكان نەكرد لە كاتێكدا كە خاچپەرستەكان كاتێك چوونە ناو قودسەوە موسڵمانانیان سەربڕیو جوولەكەكانیان سوتاند".

ڕۆكوێل دەڵێت: "لێبوردەیی ئیسلام لەگەڵ ئایینەكانی تردا، كە ئەمەش لە فراوانی ئاسۆی هزرەوە هەڵدەقوڵێ، وای لێكرد نزیكبێتەوە لە دڵی ئەوانەی عاشقی ئازادین، موحەممەد داوای لە شوێنكەوتوانی كرد مامەڵەیان لەگەڵ شوێنكەوتوانی تەوراتو ئینجیلدا باش بێتو باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیمو موساو عیسا بێت، گومانیشی تێدا نییە كە ئەم لێبوردەییەیە كە ئیسلام جیا دەكاتەوە لە ئایینەكانی تر".

---

[1] المستشرقون والاسلام ص68تۆماس ئەرنۆڵد كە لە ساڵی 1864ز لەدایك بووەو دوا پلەی زانستی راگری بەشی لێكۆڵینەوە عەرەبییەكان بوو لە كۆلێژی زمانە رۆژهەڵاتییەكان لە لەندەن

[2] المستشرقون والإسلام ل 75ـ76 لە (حضارة العرب).

بوازار دەڵێت: "ئەگەر ئیسلام بانگەشە بۆ سیستمێکی جیهانی بکات بۆ بەڕێوەبردنی ناکۆکییە چەکدارییەکان، دەتوانێ شانازی بەوەوە بکات کە هەرگیز جینۆسایدو سەربازگەی زیندانی کردنی نەبووەو هێشتا دەتوانێ لەم سەردەمەدا بەو دانایی‌و میانڕەوییەی هەیەتی سوود بە مرۆڤایەتی بگەیەنێت‌و بە ناوی دادپەروەری‌و داناییەوە رێگە لە هەموو دەستدرێژییەك بگرێت".

دوزی دەڵێت: "موسڵمانان بە پێچەوانەی ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی دەربارەیان دەیڵێن، هەرگیز هێزیان بە کار نەهێناوە بۆ زۆرکردن لە خەڵکی بۆ ئەوەی موسڵمان بن، بوونی مەسیحییەکان لە ئیسپانیا بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەمە، ئەوان بە درێژایی هەشت سەد ساڵ کە لە ژێردەستی موسڵماناندا بوون، بە دڵنیایی‌و بەبێ ترس دەژیان کەچی کاتێك دەسەڵاتیان لە موسڵمانان سەندەوە یەکەم ئیشیان ئەوە بوو قڕیان خستە ناو موسڵمانان‌و قەتڵوعامیان کردن و هەموویانیان لەناو بردو پاشان جوولەکەکانیشیان ـ کە لەژێر سایەی ئیسلامدا بە هێمنیی دەژیان ـ بەهەمان دەرد برد".

هەروەها دەڵێت: "کاریگەری ئەخلاقی ئیسلامی لەسەر ئەوروپا کەمتر نەبوو لە کاریگەری زانستی عەرەبەکان، سەرباری ئەو لێبوردەییە ئایینییەی، کە هەیانبوون رەوشتی سوارچاکیشیان تێدا بوو".

بارتلیمی سانت هیلیر دەڵێت: "کاتێك ئەوروپاییەکان تێکەڵی عەرەبیان کرد لە ئیسپانیا و چاویان لێکردن، سروشتی رەقیان نەرم بوویەوەو سوارچاکانی ئەوروپی ـ بێ ئەوەی ئازایەتی لە دەستبدەن ـ کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەو هەست‌و سۆزە نەرم‌و بەرزو مرۆڤانەیەی موسڵمانان، جێی گومانە کە مەسیحییەت لەگەڵ ئەو هەموو رێنماییە بەرزەی هەیەتی بە تاقە سەرچاوەی ئەو هەموو جوامێرییە بزانرێت".

رۆبنسون دەڵێت: "تەنها شوێنکەوتوانی موحەممەد توانیویانە حەزی بڵاوکردنەوەی ئاین‌و مامەڵەی جوان بەیەکەوە گرێ بدەن، ئەم حەزە بوو پاڵی بە عەرەبەوە نا رێگای فتوحات بگرنە بەر"[1].

ڕوبەرتسون دەڵێت: "تەنها موسڵمانان توانیویانە جیهادو لێبوردەیی بە یەکەوە گرێ بدەن بەرامبەر بە شوێنکەوتوانی ئایینەکانی تر دوای ئەوەی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتیانەوەو رێگەی ئەنجامدانی هیچ دروشمێکی پەرستشیان لێ نەدەگرتن".

ستودارد دەڵێت: "هەندێك هۆکار هەبوون یارمەتی ئەم سەرکەوتنە بێوێنەیەی ئیسلامیان دا، گەورەترینیان رەوشتی عەرەب‌و سروشتی رێنماییەکانی پەیامبەرو شەریعەتەکەوی ئەو بارودۆخە گشتییە بوو کە رۆژهەڵاتی تێدا بوو لەو کاتەدا، عەرەب هەرچەند رابردوویان گەشاوە نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هێزێکی سەیریان تێدا بوون ئەو هێزە شاراوەیە لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا کەوتە دەر"[2].

کاستر دەڵێت: "موسڵمانەکان جیا دەکرێنەوە بە ئاشتیخوازی‌و ئازادی بیروڕاو جوانی مامەڵە لەگەڵ نەیاران، هەر ئەمەشە وامان لێدەکات باوەڕ بە قسەکەی (روبنسون) بکەین کە دەڵێت: (تەنها شوێنکەوتوانی موحەممەد توانیویانە جوانی مامەڵە کردن‌و حەزی بڵاوبوونەوەی ئایینەکەیان بەیەکەوە گرێ بدەن)، ئەو حەزو خۆشەویستییەی کە پاڵی بە عەرەبەوە نا رێگەی فتوحات بگرنە بەرو قورئانیش لە پشتی ئەو لەشکرە سەرکەوتوانەوە باڵی دەکێشا بەسەر میللەتاندا، هیچ ستەمێکیان نەدەکرد لەو رێگەیەدا مەگەر ئەوە نەبێت کە لە هەموو شەڕێکدا بە ناچاری دەکرێت، هیچ میللەتێکیان نەکوشتووە لەبەر موسڵمان نەبوون"[3].

گۆستاڤ لۆبۆن دەڵێت: "بۆی هەبوو سەرکەوتنە مەزنەکانی عەرەبەکان چاویان کوێر بکات‌و لە خۆیان بایی بکات‌و وایان لێبکات وەکو داگیرکەرانی تر بکەن‌و مامەڵەی خراپ لەگەڵ دۆڕاوەکاندا بکەن‌و زۆریان لێبکەن بۆ باوەڕهێنان بەو ئایینەی

---

[1] (المستشرقون والإسلام/ ص 218).

[2] (حاضر العالم الاسلامي) شكيب ارسلان.

[3] (المستشرقون والإسلام، ص 218).

کە حەزیان دەکرد بڵاوی بکەنەوە بە سەرانسەری دونیادا، ئەگەر ئەوەیان بکردایە ئەوە دەبووە هۆی ئەوەی ئەو میللەتانەی کە هێشتا دەسەلاتی تەواویان بەسەریاندا پەیدا نەکردبوو لێیان راپەڕن‌و ئەوەیان بەسەرا بێنن کە بەسەر مەسیحییەکاندا هات لە شامدا، بەڵام خەلیفە پێشینەکانی ئیسلام عەبقەرییەتێکی بێوێنەی وایان هەبوو کە بە دەگمەن لە بانگخوازە نوێکانی ئایینەکاندا دەبینرێت، دەرکیان بەوە کردبوو کە رێبازو ئایینەکان لەو شتانە نین کە بە زۆر بسەپێنرێن بۆیە مامەڵەیەکی زۆر نەرم‌و نیانیان لەگەڵ خەڵکی سوریاو میسرو ئیسپانیاو هەموو ئەو وڵاتانەی کەوتنە ژێر دەستیان کردو یاساو سیستەم‌و بیروباوەڕەکانیان بۆ بەجێ هێشتن بێ دەست لێدان‌و هیچ شتێکیان بەسەرا فەرز نەکردن جگە لەو جزیە کەمەی کە لەبەرامبەر پاراستنیان‌و دابینکردنی ئاسایش بۆیان درا بە سەریاندا، لە راستیدا میللەتان سوپای بە بەزەیی‌و لێبوردەی وەکو عەرەبیان نەبینیوە".

بەزەیی‌و لێبوردەیی سوپای ئیسلام لە هۆکارەکانی فراوانبوونی دەسەڵاتیان‌و بە دەمەوەچوونی زۆرێك لە میللەتان بوو بەدەم ئایین‌و سیستەم‌و زمانەکەیانەوەو هۆکاری چەسپین‌و بەرهەڵستی کردنی هەموو ئەو هێرشانە بوو کە کرایە سەریان‌و لە دوای نەمانی دەسەڵاتی عەرەبیش بە موسڵمانی مانەوە ـ با مێژوونووسانیش نکۆڵی لێ بکەن ـ میسر روونترین بەڵگەیە لەسەر ئەم راستییە، خەڵکی میسر باوەڕیان بەو ئایینە هێنا کە عەرەب هێنای‌و پاراستیان لە کاتێکدا کە ئەوانەی پێش ئەوان لە فارس‌و رۆم‌و یۆنانییەکان نەیانتوانی شارستانی فیرعەونی بگۆڕن وایان لێ بکەن شوێنی ئایینەکەیان بکەون[1].

ا لاب مشیون لە کتێبەکەی (گەشتێکی ئایینی لە رۆژهەڵاتدا) دەڵێت: "بە راستی جێی داخە بۆ وڵاتە مەسیحییەکان کە لە موسڵمانانەوە بنەماکانی لێبوردەیی ئایینی، کە هۆکاری سەرەکییە بۆ بەزەیی‌و چاکە لە نێوان میللەتاندا، فێربن"[2].

وابزانم شایەتی ئەو هەموو کۆنگرە نێودەوڵەتی‌و کەسایەتییە ناودارو شارەزایانە بەسە بۆ ئەوەی قەناعەت بە کەسێکی خاوەن ئینصاف‌و راستی خواز بکات کە سروشتی ئاکارو بیرکردنەوەی موسڵمانەکانی سەرەتاکانی ئیسلام سروشتێکی دەشتەکی نەبووەو سروشتی جەنگ‌و زاڵ بوون بەسەر شتەکاندا نەبووە، بەڵکو سروشتێکی ئەوپەڕی مەدەنی‌و ئەوپەڕی مرۆڤانە بووە، وەکو شیریل دەڵێت: مرۆڤایەتی زۆری ماوە بگاتە چڵەپۆپەی ئەو شەریعەتەو هەرگیزیش نایگاتێ، چونکە ئەو لەسەر بناغەیەکی پتەو لە چاودێری کردنی خواو ئەخلاقیاتی بەرزی هەڵقوڵاو لەو عەقیدەیەوە دامەزراوە.

## ئەو گۆڕانکارییەی پێغەمبەر کردی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا

(ئێچ جی وێڵز) دەڵێت: "ئەگەر بهاتبایە کەسێك تەماشای وەزعی عەرەبی بکردایە لە پێش هاتنی موحەممەد و پێشبینی ئەوەی بکردایە کە ئەو میللەتە بە چارەکە سەدەیەك دەبنە خاوەنی شارستانییەتێکی ئاوهاو گۆڕانکارییەکی وایان بەسەردا دێت‌و دوو ئیمپراتۆرییەتی گەورە دەڕوخێنن، شیاوی ئەوە بوو بە شێت‌و خڵەفاو تاوانبار بکرێت".

(سەیید قوتب)یش (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) بۆچوونی وایە کە خوا ئیسلامی بۆیە لەناو عەرەبدا نارد، چونکە ئەوان دواکەوتووترین میللەت بوون لەو کاتەداو خوا دەیویست هەموو مرۆڤایەتی بەرز بکاتەوە بۆیە لەوانەوە دەستی پێکرد، بۆ ئەوەی هەرچی لە رێگەیاندا هەیە لەگەڵ خۆیاندا بەرزی بکەنەوە، وەکو چۆن کەسێك لە شیوێکەوە بیەوێت سەرکەوێت بۆ لوتکەی شاخێك هەرچی لە بنارو قەدپاڵی شاخەکەدا هەیە لەگەڵ خۆیدا دەیباتە سەرەوە، هاتنی ئیسلامیش لەناو عەرەبدا بەو شێوەیە بوو.

[1] (روح الدين الإسلامي لە حضارة العرب ی گۆستاف لۆبۆن).

[2] (روح الدين الإسلامي ص 395-396 لە کتێبی حضارة العرب.

هەرچەند من قەناعەتم بەم قسەیەی سەیید نییە، بەڵکو وا دەزانم کە عەرەبی حیجاز سروشتیان پاك‌و ساف بوو وەکو بیابانەکانی خۆیان‌و ئایینەکان ئەو سروشتەی نەگۆڕییوون‌و تێکی نەدابوون، هەر بۆیەش بەو شێوەیە بەو ئەرکە هەستان‌و ئەم ئایینەیان بە دونیادا بڵاو کردەوە.

ڕاستە عەرەب نەفام بوون، بتیان دەپەرست، کچیان زیندەبەچاڵ دەکردو جیاوازیی چینایەتی لە نێوانیاندا زۆر قووڵ بوو، بە سوو مامەڵەیان دەکرد، شەڕی درێژخایەنیان لەسەر شتی سادە دەکرد، ئافرەتیان رووت بوو، مەشروبیان زۆر دەخواردەوەو دەیان شتی تر کە قورئان باسی کردووە، بەڵام ئەوە هونەرە بۆ ئیسلام کە لەو میللەتە رەش و روت و عەشایەرە دواکەوتووە ئەو میللەتەی دروست کرد کە بوون بە مامۆستای مرۆڤایەتی‌و گەورەترین وانەیان لە سنگفراوانی‌و لێبوردەیی‌و سوارچاکی‌و جوامێری فێری مرۆڤایەتی کرد، وەکو رۆژئاواییەکان شایەتییان بۆ داون.

ئەمانەی ئەمڕۆی لای خۆمان کە بەو شێوەیە تەماشای سوپای ئیسلام دەکەن ئەوا لە روانگەی عەرەبە ناسیۆنالیستە شۆڤێنییەکانی ئەمڕۆوە هەڵیان دەسەنگێنن، نەك لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە.

گریمان عەرەب میللەتێکی رەشۆکی عەشایەری دواکەوتوو بوون، ئەمە هیچ زەرەرێك لە ئیسلام نادات، بەڵکو لە قازانجی ئیسلامدایە، چونکە وەکو وتمان ئەوە گەورەترین هونەرو شانازییە بۆ ئیسلام‌و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کە ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی لەناو ئەو میللەتە دواکەوتووەدا کردووە، شتێکی باشە ئەگەر بەراوردێك لە نێوان کۆمەڵگەی پێش هاتنی پێغەمبەرو کۆمەڵگەی دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ بکرێت بۆ ئەوەی قەوارەی ئەو گۆڕانکارییە بزانرێت کە ئەو پێغەمبەرە مەزنە ئەنجامی داوە، من لێرەدا دوو نموونە دێنمەوە ئەودوای بۆ خۆت بە جێ دێڵم بگەڕێی بە دوایدا:

<u>یەکەم:</u> عومەری کوڕی خەتتاب، ئەو پیاوەی کە زۆر لە ریوایەتەکان دەڵێن کچێکی خۆی لە پێش ئیسلامدا بە دەستی خۆی زیندەبەچاڵ کردووە، هەر ئەو پیاوە دڵڕەقە لە کاتی خیلافەتیدا یەکێك لە والییەکانی خۆی لەسەر کار لا دەبات لەسەر هیچ شتێك نا تەنها لەبەر ئەوەی کە سەیری لە خەلیفە عومەر دێت منداڵەکانی خۆی ماچ دەکات‌و یارییان لەگەڵدا دەکات‌و لێی دەپرسێت ئەی پێشەوای ئیمانداران ئەوە تۆ منداڵەکانت ماچ دەکەیت؟ خەلیفەش دەپرسێ بۆچی مەگەر تۆ واناکەیت؟ دەڵێت: نەوەڵڵا من چەند منداڵم هەیە تاکو ئێستا نە کەسیانم ماچ کردووەو نە لە باوەشم گرتوون، خەلیفەش یەکسەر دەفەرموێت: ئەوا تۆم لەسەر کار لابرد، تۆ کە بەزەییت بە منداڵەکانی خۆتدا نەیەتەوەو رەحمت بۆیان نەجولێت، چۆن بەزەییت بە موسڵمانانندا دێتەوە؟!

<u>دووەم:</u> بەسەرهاتی بیلال‌و خالیدی کوڕی وەلیدە، ئەویش بە کورتی ئەوەیە کە خەبەر گەیشتە خەلیفە عومەر، کە خالیدی کوڕی وەلید، کە سەرکردەی لەشکرەکانی عێراق‌و پاشان شام بوو، بەشێکی زۆری لە دەستکەوتەکانی ئەو شەڕانەی بۆ خۆی گلداوەتەوە، عومەر لەو هەموو صەحابە خاوەن عەشیرەت‌و گەورەیە بیلالی کوڕی رەباحی رەشپێستی کۆنە کۆیلە دەنێرێت بۆ لێپێچینەوەی، بیلالیش بە بەرچاوی سوپاکەوە دادگا بۆ خالید دادەنێت‌و عەمامەکەی خۆی (هی خالید) دەکاتە ملی‌و دەیتاسێنێ‌و دەڵێ: چیت بۆ خۆت گلداوەتەوە دەری بێنە، لەوێدا خالید هەموو شتەکان دەخاتە روو و ناڕاستی تۆمەتەکە دەردەکەوێت.

ئەمە چ گۆڕانکارییەکە لەو کۆمەڵگە عەشایەرییەدا روو دەدات کە کۆیلەیەکی وەکو بیلال پاڵەوانێکی وەکو خالیدی فەرماندەی لەشکرو کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرەی سەرگەورەی قورەیش دادگایی بکات‌و بە عەمامەکەی خۆی بیتاسێنێ!

ئەگەر قسەکانی خەلیفە ئەبوبەکر بخوێنینەوە لە سەرەتای دەستبەکاربوونی‌و وەسیەتەکانی بۆ لەشکرەکانی ئەوکاتە دەزانی کە موحەممەد ﷺ لەم میللەتە رەش‌و رووت‌و عەشایەرە چ موعجیزەیەکی دروست کرد، من بە کورتی هەندێك لە وەسیەتەکانی (ئەبوبەکری صدیق)ت بۆ دێنمەوە وەکو نموونەیەك: لە یەکەم رۆژی دەستبەکاربوونیدا چووە سەر مینبەرو فەرمووی ئەی خەڵکینە من کرام بە لێپرسراوی ئێوە بێئەوەی لە ئێوە چاکتر بم (مەبەست لە رووی دین‌و پلەو پایەوە)، ئەگەر هەڵەم کرد راستم کەنەوە، ئەگەر راستم کرد هاوکاریم بکەن، بێهێزتان لای من بەهێزە تا مافەکەی بۆ وەردەگرم، بەهێزتان

لای من بێهێزە تا مافەکەی لێ دەسەنم. تا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بم گوێڕایەڵیم بکەن، ئەگەر سەرپێچیم کرد لە فەرمانەکانی خوا ئەوا هیچ گوێڕایەڵییەکتان بۆم نەبێت.

ئایا ئەمانە قسەی کەسێکی عەشایەری ڕش‌و ڕووتی شەڕەنگێزە؟ یان گەورەترین بنەمای حوکمێکی مەدەنی مرۆڤدۆستانەیە؟!

لە وەسیەتەکەیدا بۆ لەشکرەکانی دەڵێت: "دار مەبڕن، ئاژەڵ مەکوژن مەگەر ئەوەی کە پێویستتانە بۆ خواردن، زەوی کشتوکاڵی تێك مەدەن، ژن‌و پیرو منداڵ مەکوژن، کەسانێك دەبینن لە پەرستگاکانی خۆیاندا خەریکی عیبادەتن دەستیان بۆ مەبەن". ئایا ئەمە وەسیەتی کەسێکی عەشایەری ڕشۆکی شەڕەنگێزە؟

یا وتەکانی خەلیفە عومەرو هەڵوێستەکانی کە دەکرێت هەر یەکێکیان بکرێت بە بنەما بۆ حوکمێکی دامودەزگایی دادپەروەرانە.

ئەو عومەرە دڵڕەقەی زەمانی نەفامی ببینە لە کاتی خەلیفایەتیدا چ مامۆستایەکی لێ دەرچووە، لە قسەکانی:

بە عەمری کوڕی عاس کە والی میسر دەبێت‌و کوڕەکەی دەستدرێژیی دەکاتە سەر کوڕی کابرایەکی مەسیحی، دەڵێت: "لە کەیەوە ئێوە خەڵکیتان کردووە بە بەندەی خۆتان، لە کاتێکدا کە دایکانیان بە سەربەستی هێناویانەتە دونیاوە".

دەربارەی بەرپرسیارێتی خۆی لە ڕەعیەتەکەی دەڵێت: "سوێند بەخوا گەر هێسترێك لە عێراق پێی هەڵکەوێت دەترسم خوا لێم بپرسێتەوە بۆچی ڕێگام بۆ تەخت نەکردووە"، بڕوانە بۆ ئەم قسەیەو بۆ جادە پڕ چاڵەکانی خۆمان کە ڕۆژ نییە دەیان کارەساتیان تێدا ڕوو نەدات.

دەربارەی بەرپرسیارێتیی میللەت لە چاودێری کردنی فەرمانڕەوادا دەفەرموێت: "گەر چەوتییەکتان لە مندا بینی ڕاستم کەنەوە، یەکێك لە گۆشەی مزگەوتەکەوە هەڵدەستێت‌و دەڵێت: سوێند بەخوا گەر چەوتییەکت لێ ببینین بە نوکی شیر ڕاستت دەکەینەوە، ئەویش فەرمووی سوپاس بۆ خوا کە لە ئوممەتی موحەممەددا ﷺ کەسێك هەیە عومەر ڕاست بکاتەوە".

کاتێك کابرایەك پێی وت لەخوا بترسەو نەفەرێك سەرزەنشتی کرد کە چۆن بە خەلیفە وا دەڵێی، فەرمووی لێی گەڕێ، سوێند بەخوا ئێوە هیچ کەڵکێکتان تێدا نییە گەر نەیڵێن‌و ئێمەش هیچ کەڵکێکمان تێدا نییە گەر گوێی لێنەگرین.

هەر ئەوە خاوەنی بیرۆکەی لێپرسینەوەی والییەکان‌و وتەی (**من أين لك هذا**) لە داهێنانی ئەو بوو.

هەر ئەو بوو، کە موچەی بۆ پیاوە جوولەکە پیرەکە بڕییەوە کاتێك بینی سواڵ دەکات‌و پێی وت ناحەقییمان لەگەڵدا کردووی لە گەنجیدا پارەمان لێ سەندویت‌و ئێستا لێتگەڕێین سواڵ‌و دەرۆزە بکەیت؟

هەر ئەم خەلیفەیە کە شەهید دەکرێت‌و عوبەیدوڵڵای کوڕی دوو کەس لە پیلانگێڕان لە تۆڵەی باوکیدا دەکوژێت، دوایی لێی دەپێچرێتەوەو دادگایی دەکرێت، تا لە ئەنجامدا خەلیفە عوسمان فیدیەی کوژراوەکان لە ماڵی خۆی دەدات.

بەڵێ موحەممەد ﷺ لەم کۆمەڵگە عەشایەرە دواکەوتووە، ئەمەی دروست کرد مرۆڤایەتی بە خەویش نایگاتێ.

دەربارەی خەلیفە عوسمانیش (ڕەزای خوای لێ بێت) تەنها یەك هەڵوێستیتان بۆ باس دەکەم، کە بزانن چ کەڵەپیاوێك بووەو ئەوانەی ئەمڕۆ لە چاویدا چ قەزەمێکن: لە کاتێکدا کە ئاژاوەگێڕەکان هاتنە مەدینەو لە دەوری ماڵەکەی کۆبوونەوە، زۆربەی صەحابەکان چوونە لای بۆ ئەوەی مۆڵەتیان بدات هێز بەکاربێنن بۆ دوورخستنەوەیان‌و بجەنگن لە گەڵیاندا، بەڵام ئیزنی هیچ کەسێکیان نادات بەو کارە هەڵسن‌و دەڵێت نامەوێت لەبەر من یەك دڵۆپ خوێن بڕژێت، بەوەشەوە ناوەستێت ئیزنی هەموو پاسەوانەکان دەدات‌و دەیانێرێتە ماڵەوە تا لە ئەنجامدا ئەوانەی کە ئیسلامەتی تێکەڵی ڕۆحیان نەبوو بوو، چوونە سەری‌و شەهیدیان کرد.

مرۆڤ لەم کاتەدا هەرچی هێزی هەیە دەیخاتە کار بۆ بەرگریی لە گیانی خۆی‌و کورسییەکەی، بەڵام ئەو ڕازی نابێت قەترەیەك لە خوێن لە پێناویدا بڕژێت.

یان عـەلی کوڕی ئەبو تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) کە گەورەترین وانەمان فێر دەکات لە رەفتارکردن لەگەڵ نەیارەکاندا، چوار بنەمای دانابوو بۆ مامـەڵە لەگەڵ خەواریجە نەفامـەکاندا کە ئەویان بە کافر دەزانی.

1ـ ئێمە دەستپێشخەر نابین لە شەڕکردن لەگەڵتاناو تا شەڕمان پێ نەفرۆشن لەگەڵتاندا ناجەنگین.

2ـ ڕێی مزگەوتو کۆڕو مەجلیستان لێ ناگرین.

3ـ ئەگەر یارمەتییمان بدەن بەرامبەر دوژمنان بەشدارتان دەکەین لە هەموو دەستکەوتەکانی شەڕ.

4ـ ئەگەر شەڕتان لەگەڵدا کردین بریندارتان ناکوژینو بە دووی هەڵاتووتان ناکەوینو ماڵو سامانتان بە غـەنیمەت نابەین.

ئایا مامـەڵە هەیە لەمە مرۆڤانەترو لەمە مەدەنییانەتر؟

ڕەنگە هەندێك کەس بڵێن خۆ ئەوانەش کە شەڕیان لە گەڵ ئیمامی عەلی دا کرد هەر موسڵمان بوون و بە ناوی و ئیسلامـەوە ئەو شتانەیان دەکرد. خاڵە گرنگەکە لێرەدایە، کە هەردوولا بە ناوی ئیسلامەوە قسەیان کردووە بەڵام لایەنێکیان لە رۆحی ئیسلام تێگەیشتووەو مەبەستەکانی شەرع دەزانێت کە ئیمامی عـەلییەو لایەنەکەی تر لە گەڵ رواڵەتی دەقەکاندا مامەڵەی دەکرد و رۆنەچوو بوون بە ناو راستییەکانی ئیسلامدا بۆیە ئایەتی (إن الحكم الاّ لله)یان بە رووی کەسێکدا بەرز دەکردەوە، کە ئاگای لە دابەزینی یەکەیەکەی ئەو ئایەتانەو مەبەستەکانیانی لە زاری پێغەمبەرەوە ﷺ وەردەگرت. بۆیە لێرەدا ئیمامی عـەلییە کە گوزارش لە هەڵوێستی ئیسلام دەدات نەك ئەو خەواریجانەی کە لە رۆحی ئەم ئایینە نەگەیشتبوون. بەداخەوە ئەم سیناریۆیە زۆرجار دووبارە دەبێتەوەو ئەوانەی وەکو خەواریجەکان لە ئیسلام گەیشتوون بە هەڵوێستی پێچەوانەی رۆحی ئیسلامی خۆیان ئیسلام ناشیرین دەکەن و دوژمنانی ئیسلامیش وەکو نوێنەری ئیسلام نیشانیان دەدەن!.

ئەمانە هەندێکن لەو نموونانە کە ئەگەر لەسەری بڕۆین هەریەکەو کتێبێکی دەوێت، بۆیە ئەمانەم بە نموونە هێنایەوە لەبەر ئەوەی کە یەکەم لەو نەوەیە بوون کە لە سەرەتاکانی ئیسلامدا پەیدا بوونو نووسەر بە دەشتەکییان لە قەڵەم دەدات، دووەم لەبەر ئەوەی ئەمانە قوتابی راستەوخۆی پێغەمبەر ﷺبوونو لە هەموو کەسێك زیاتر لە رۆحی ئایینەکەی تێگەیشتبوونو پابەندی رێنماییەکانی بوون. ئەگەر هەرکەسێکیش کە دوای ئەمانە هاتووە هەر شتێکی پێچەوانەی ئەوەی ئەمانی کردبێت ئەوە لەبەر کەمی پابەندیی خۆی بووە بە ئیسلامو رێنماییەکانی پێغەمبەری ئیسلامەوە.

هەر ئەم کۆمەڵگە دەشتەکییەی ئەم نووسەرانە باسی دەکەن، موحەممەد ﷺ وای لێکردن ببنە مامۆستای مرۆڤایەتی لە زانستی شەریعەتو ئەخلاقو کۆمەڵناسیو روحانییەتدا، رەنگە ئەم قسەیە زۆر روون نەبێت بە لای هەندێکەوە، با زیاتر روونی بکەمەوە:

هەرچی زانستەکانی شەریعەتو فەلسەفەکانی ئەخلاقو کۆمەڵناسیو دەروونناسیو رۆحانیات هەیە زانایانی ئیسلام لە سەر قسەکانی ئەو نەوەیە بنیاتیان ناوە کە پێغەمبەر ﷺپێی گەیاندن.

بڕوانە کتێبەکانی فەرموودە بزانە چ سامانێکی گەورە لە زانستی شەریعەتو فەلسەفەی ئەخلاقو ئیعجازی زانستیو تەشریعیو کۆمەڵایەتیو پەروەردەیی تێدایە. هەروەها کتێبەکانی فیقهو شەریعەت تەماشا بکە بزانە چ سامانێکی دەوڵەمەند لە زانستی شەریعەت و یاسای تێدایە کە هەموو لەو پیاوانە وەرگیراون کە شاگردی موحەممەد ﷺ بوون و هەندێك نەخوێندەوار بە دەشتەکییان دەزانن.

هەر ئەو شەریعەتەی کە بە هی کۆمەڵێکی دەشتەکی دادەنێن سەدانو بگرە هەزاران بڕوانامەی ماستەرو دکتۆرای لەسەر وەرگیراوە لە ئەوروپاو ئەمـەریکاو بەردەوامیش هەر لێکۆڵینەوەیان لە سەر دەکرێت. نەك هەر شەریعەتەکەی بەڵکو عـەقیدەو هزری ئیسلامیی، بنەماکانی ئەخلاقیاتو مەنزومەی ئەخلاقی ئیسلامی، تەصەوفو مەنزومە رۆحییەکەی،

بواری زانستی فەلەکی و پزیشکی و چەندینی تریش کە بە سەدان و هەزاران بڕوانامەیان لەسەر وەرگیراوە. نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو دەیان بەشی تایبەت لە زانکۆکانی ڕۆژئاوادا بۆ لێکۆڵینەوە لەو زانستانە دانراوە.

بە راستی جێی سەرسوڕمانە ئەگەر کۆمەڵگەیەکی وا عەشایەرو دەشتەکی ڕەش و رووت ببنە سەرچاوە بۆ ئەو هەموو زانستە مرۆییانە، ئەوانەی لای خۆشمان تازە ئەڵێی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا دەژین و رەخنەی هیچ و پوچ و بێ بنەماو منالآنە لەم کۆشکە بەرزە دەگرن، بە راستی چاودێرێك ئەم رەخنانەی کوردە عەلمانییەکان لەسەر ئیسلام بخوێنێتەوەو لەو روانگەیەوە میللەتی کورد هەڵسەنگێنێت زۆر زەرەرمان دەبێت، چونکە ئەوکاتە دەبێ حوکم بە بێئاستی میللەتی کوردو ناشارستانێتییەکەیدا بدات، بەلآم گیان بەوەیە کە ئیسلام کەڵەپیاوی زۆر گەورەی لەناو کورددا پێگەیاندووە کە رووی کورد سپی بکەن لەبەرچاوی میللەتان و سەری بەرز بکەنەوە، لە وێنەی سەلآحەددینی ئەیوبی، ئیبن خەلەکان و (ابن **الاثير**)**کان** و سەعیدی نەورەسی و مەولەوی و مەحوی و نالی و مەولانا خالیدو ئەحمەدی خانی و مەلای جزیری و قازی موحەممەدو چەندانی تر کە ئەگەر نەبوونایە کورد وەکو رەوەکێکی بێرەگو ریشە لەناو مرۆڤایەتی و شارستانییەتەکاندا دەردەکەوت.

ئەگەر موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام کۆمەڵێکی دەشتەکی دەسەلآتخواز بوونایە وەکو چۆن مەغۆلە دەشتەکییە بێ شارستانییەکان لەناو ئایینی میللەتە ژێر دەستەکاندا توانەوە ئەو موسڵمانانەش بە هەمان شێوە لەناو ئەو میللەتانەی کە لە خۆیان پێشکەوتووترو مەدەنیتر بوون وەکو فارس و رۆم دەتوانەوەو رەنگی ئەوانیان دەگرت، بەلآم بە پێچەوانەوە چوونەتە هەر شوێنێك بەبێ تۆسقاڵێك زۆر کردن لە خەڵکی بۆ قەبوڵکردنی بیروباوەڕو کلتورەکەیان میللەتان چوونەتە سەر ئایینی ئیسلام و بوونەتە بەشێك لێی و وەکو ئەوان بەرگرییان لێ کردووە، وەکو لەمەوبەر شایەتی چەندین دانشمەندی رۆژئاواییمان هێنایەوە.

## ئیسلام و وتاری نەتەوەچێتی عەرەبی

هەندێك لە ناسیۆنالیستە کوردەکان دەڵێن ئیسلام گوتارێکی ناسیۆنالیستانەی عەرەبی هەیە و شەڕەکانی لە پێناوی فراوانکردنی دەسەلآتی عەرەب بووە! بابزانین ئەم قسەیە تا چەند لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام و مێژووی ئیسلامدا یەکانگیر دەبێتەوە:

یەکەم: ئەمە پێچەوانەی بنەماکانی ئیسلامە، چونکە ئیسلام لە یەکەم رۆژی هاتنییەوە خوا رایگەیاندووە کە ئەمە ئایینێکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە و جیاوازی لە نێوان عەرەب و عەجەم و سپی و رەشدا نییە بەهۆی رەگەزو رەنگی پێستەوەو خەڵکیی بەرامبەر خواو یاسای ئیسلام وەکو دانەکانی شانە وان و هەموو نەوەی ئادەمن و باشترینیان لای خوا ئەوەیانە کە لە هەموویان پابەندترە بە فەرمانەکانی خواوەو خۆی لە گوناهەکان دەپارێزێت، (**يَا أيها النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**) (**الحجرات**: 13). (**وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ**) **انبياء107**)، (**إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرَى لِلْعَالَمِين**) (**تكوير22**). (**لا فضل لعربي على أعجمي ولا لأبيض على اسود الا بالتقوى**)(، (**كلكم من آدم وآدم من تراب**)، (**الناس سواسية كأسنان المشط**).

دووەم: پێچەوانەی مێژووی ئیسلامە، چونکە لە رووی کردەییەوە موسڵمانانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ سەرەتا بریتی بوون لە ئەبوبەکرو عەلی و بیلالی حەبەشی و سوهەیبی رۆمی و سەلمانی فارسی و..هتد. ئەم هەمەڕەنگییە لە دواییدا لە رێگای دەسەلآتەوە رەنگی داوەتەوە، سەرەتا عەرەب حوکمی کردو دوایی فارس و دوایی تورك و کوردو ئەفغانییەکان و هەموو ئەو میللەتانەی کە ئوممەتی ئیسلامییان لێ پێك هاتبوو هەریەکە بەش بە حاڵی خۆی حوکمڕانی کردو هەموو موسڵمانانیش گوێڕایەڵیان بوون و بە حوکمیان رازی بوون، بە رادەیەك یەکێکی وەکو میشێل عەفلەق گلەیی لە عەرەبەکانی شام دەکات کە کاتێك لێی پرسیون حوکمی تورکێکی موسڵمانیان پێ باشترە یان عەرەبێکی مەسیحی، حوکمی

تورکە موسڵمانەکەیان پێ باشتر بووە، ئێستاش ئیسلامییە عەرەبەکانی دونیای عەرەب حوکمی عوسمانییان پێ باشترە لە حوکمی ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، ئیتر چۆن ئایینێك ئەوە بۆچوونی بێت لە رووی ئایدۆلۆژیاوە و ئەوە مێژووی بێت لە رووی دەسەڵاتەوە تاوانبار دەکرێت بەوەی کە وتارێکی ناسیۆنالیستی عەرەبی هەیە؟

موسڵمانە عەرەبەکان نەك هەر بە دەسەڵاتی سیاسیی غەیرە عەرەب رازی بوون، بەڵکو بە دەسەڵاتی زانستی و پیشەوایەتی زانستیو کۆمەڵایەتی غەیرە عەرەبیش رازی بوون، ئەوەتا بوخاری کە کتێبەکەی باوەرپێکراوترین کتێبی فەرموودەیە لای موسڵمانان، تورکمانە و بە گەورەترین زانای ئیسلام دادەنرێت، هەروەها ئیمامی نەسائیو ترمزیو ئیبن ماجە کە هەموو زانای فەرموودەناسن کتێبەکانیان باوەڕ پێکراوترین کتێبن، لە رووی زانستی زاراوەی فەرموودەناسیشەوە کتێبەکەی ئیبن صەلاحی شارەزووری، کە کورد بووە سەرچاوەی هەموو کتێبەکانی ئەو زانستەیە، لە بواری فیقهیشدا ئیمامی ئەبو حەنیفەو قوتابییەکانی، کە زۆربەیان عەرەب نەبوون گەورەترین پێشەوای مەزهەبەو سێ لەسەر چواری جیهانی ئیسلامیی بە هەموو نەتەوەکانەوە لەسەر مەزهەبی ئەون.

لەم سەردەمەشدا سێ موفتی گەورەی عێراق یەك بە دوای یەکدا کورد بوون، کە شێخ موحەممەد ئەمین ئەفەندی زەندو شێخ ئەمجەد زەهاویو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس بوون، لە سوریاشدا ئەحمەد کفتارۆ کە کورد بوو موفتی سوریا بوو، لە تورکیادا مامۆستا سەعیدی نەورەسی کە کوردە زۆربەی هەرە زۆری شوێنکەوتووانی تورکن.

لە رووی سەرکردایەتی رۆحییشەوە ئەوەتا مەولاناخالیدی نەقشبەندی کە کوردە، موریدی هەیە لە هەموو نەتەوەکان.

ئەگەر حوکمی ئیسلامی ناسیۆنالیستی بوایە دەبوایە ئەو میللەتانەی کەوتنە ژێر دەستی موسڵمانانەوە ئێستا هیچیان زمانی خۆیانیان لەبیر نەمابایە هەروەکو چۆن فەرەنسییەکان زمانی هەموو ئەو میللەتانەیان گۆڕی، کە کەوتنە ژێر دەستیان، دەبوایە لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامیشدا، کە زیاد لە دوازدە سەدەی خایاند هەمان شت رووی بدایە، بەڵام دەبینی بە پێچەوانەوە عەرەب بە هەموو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوەو لە هەر کوێیەك بووبن زمانی ئەو شوێنەیان وەرگرتووە و بوون بە بەشێك لەو میللەتە، بەڵگەی زیندووش ئەو سەییدانەن کە لە کوردستاندان، ئەوانە یا دەبێ سەیید نەبن و بەدرۆ خۆیان کردبێت بە سەیید بۆ ئەوەی خەڵکیی رێزیان لێ بگرن لەبەر ئەوەی کە سەییدەکان نەوەی پێغەمبەرن، ئەمیش لۆژیکی نییە ئەو خەڵکە هەموو فێڵباز بن، وەیا ئەوەیە کە ئەوانە بە راستی سەییدن و لەناو کورددا تواونەتەوەو زمان و دابونەریتی کوردیان هەڵگرتووە. جا ئەگەر موسڵمانان بیرۆکەی ناسیۆنالیستییان هەبوایە چۆن ئەو هەموو سەییدە کە کاکڵەی عەرەبن نەتەوە و زمانی خۆیانیان لە بیر دەکرد؟

ئەوەی حزبی بەعسەی ناسیۆنالیستی بە (35) ساڵ لە عێراقدا کردی و ئەوەی کەمالییەکان لە تورکیا بە حەفتا ساڵ کردیان ئەگەر موسڵمانان بیانکردایە ئێستا کورد ناوی نەمابوو.

جیاوازی نێوان گوتاری ئایینی ئیسلامو گوتاری ناسیۆنالیستی عەرەبی لەوە روونترە کە پێویست بە بەڵگە هێنانەوە بکات، بەڵام چی دەڵێی بە کەسانێك کە چاویان لە ئاستی هەموو راستییەکان کوێرەو لە رۆژی رووناکی نێوەرۆدا هەتاو نابینن!!

## پاڵنەری ڕاسەقینەی شەڕەکانی موسڵمانان

ئەوانەی کە لە ئیسلام نەگەیشتوون وادەزانن شەڕەکانی ئیسلام بۆ فراوانکردنی دەسەڵات و غەنیمەو دەسکەوتی دونیایی بووە. ئەم قسەیە بنەماکانی ئیسلام و مێژووی ئیسلام بە درۆی دەخەنەوە.

ئەگەر ئەو گیانەی موسڵمانانی دەجوڵاند لە شەڕەکانیاندا لەسەر زمانی سەرکردەو سەربازەکانی سوپای ئیسلام باس نەکرایەو لە هەڵوێست و ڕەفتاری لەشکری ئیسلامیدا بەرجەستە نەبوایە ئەم نووسەرانە تا ڕاددەیەك مافی خۆیان بوو بڵێن ئەو شەڕانە بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتی عەرەب یا بۆ دەستگرتن بەسەر خێروبێری وڵاتان بوو، بەڵام کاتێك تەماشای وتارەکانی سەرکردەکانو سەربازانو ڕەفتاریان دەکەیت کە دوژمنان پێش دۆستان شایەتییان بۆ داوە و دواتر تەماشای مامەڵەو هەڵسوکەوتی سەرکردەو سەربازانی ئیسلام دەکەیت لەگەڵ میللەتە ژێردەستەکان و باوەشکردنەوەی ئەو میللەتانە بۆ ئیسلام بۆت دەردەکەوێت کە ئەم قسەیە هیچ بنەمایەکی زانستیی نییەو مەسەلەکە ڕێك بە پێچەوانەوەیە.

ئەو گیانەی موسڵمانانی دەجوڵاند یەکێك لە سەربازانی ئیسلام دەریدەبڕێت کاتێك ڕۆستەمی سەرکردەی سوپای فارس لێی دەپرسێ ئێوە بۆ هاتوون خۆتان بە گژ ئەم زلهێزەدا دەدەن، ئەگەر برسیتانە تێرتان دەکەینو ئەگەر ڕووتو قوتن پۆشتەتان دەکەینو ئەوەندەتان دەدەینێ کە بەشی هەمووتان بکات، نوێنەری سوپای ئیسلام (ڕەبعی کوڕی عامر) لە وەڵامدا دەڵێت: **(نحن قوم ابتعثنا الله لنخرج العباد من عبادة العباد الى عبادة الله ومن جور الأديان الى عدل الإسلام ومن ضيق الدنيا الى سعة الدنيا والآخرة)**، واتە: ئێمە کۆمەڵێکین (کەسانێکین) خوا زیندووی کردوینەتەوەو ناردووینی بۆ ئەوەی بەندەکان لە بەندایەتی یەکتر ڕزگار بکەین بۆ بەندایەتی خوای تاكو تەنیاو لەژێر ستەمی ئایینەکانی تر دەریان بێنین بۆ ژێر عەدالەتو دادوپەروەری ئیسلامو لە تەسکیی دونیا بۆ فراوانیو دونیاو دوارۆژ.

ئەگەر ئەمە ئەو گیانە نەبوایە چۆن بە ژمارەیەکی کەمەوە لە یەك کاتدا دەچوون بە گژ دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەدا کە لە هەموو ڕوویەکیی ماددیو سەربازی ژمارەو شمەکی سەربازییەوە لەوان لە پێشتر بوونو لە ناو خاكو وڵاتی خۆیاندا بوون؟

هەستی بەرپرسیارێتی بڵاوکردنەوەی ئیسلام بوو پاڵی بە موسڵمانانەوە دەنا جیهاد بکەن بۆیە هیچ شارێكو هیچ دێیەکیان نەڕوخاندو هیچ ئاوەدانییەکیان وێران نەکرد وەکو ئەوەی کە ڕۆمەکانو فارسەکانو پاشان خاچپەرستانو مەغۆلەکان دەیانکرد، هەست کردنی موسڵمانان بەو بەرپرسیارێتییەی کەوتبووە سەرشانیان لە گەیاندنی ئەو ڕووناکییە بە مرۆڤایەتیو ڕزگارکردنی لە تاریکایی بتپەرستیو نەفامی گەورەوترین پاڵنەربوو بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو جەنگانە بکەن نەك ئارەزووی دەسەڵات یا دەسکەوت یا سێکس کە هەندێك لە نەفامەکانی کوردستان دەیڵێن.

تەماشای ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەر بکە بۆ سەرکردەکانی لەشکرەکان، دەزانی مەبەستی شەڕەکان چی بووەو بەرنامەی شەڕکەرە موسڵمانەکان چۆن بووە.

شەڕەکانی سەردەمی پێغەمبەریش ﷺ بۆ گێڕانەوەی مافە زەوتکراوەکانو سەندنەوەی تۆڵە بوو، هەندێکی تری بۆ بەرگری بوو، هەندێکی تریش لەو جۆرە بوو کە ئێستا پێی دەگوترێت شەڕی دەستپێشخەری دژ بەو لایەنو هۆزانەی کە دەیانویست هێرش بکەنە سەر موسڵمانان، هەندێکی تریش تەمێ کردن بوو. ئەمە جگە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ تا توانیبێتی هەوڵیداوە خۆی لە شەڕو کوشتار دوور بخاتەوەو هەر مەبەستێکی لە ڕێگای ئاشتییەوە بەدەست هێنابێ پەنای نەبردۆتەوە بەر شەڕ.

ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە بابەتەکە زۆر درێژ دەبێتەوە هەر لێرەدا باسێکی سەرجەم ئەو غەزاو شەڕانەم دەکرد کە لە زەمانی پێغەمبەردا رووی داوە، بەڵام تەنها ئەوەندە بە بەس دەزانم بیڵێم لەسەر مەبەستەکانی شەڕی ئیسلام کە کاتێك حەجاج دەیویست لەو مەبەستە لابدات و بۆ دەوڵەمەندکردنی دەوڵەت باجو سەرانە لەسەر ئەو گەلانە هەڵنەگرێت کە دەبوونە موسڵمان، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەمووی لەسەر لابردنو فەرمووی خوا پێغەمبەری ناردووە بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵکیی بۆ سەر ڕێی ڕاستنەك بۆ سەرانە لێ سەندنو پارە کۆکردنەوە **(ان الله بعث محمد ا هاديا ولم يبعثه جابيا)**.

## ئیسلام و عەرەب و شەڕ

لە وەڵامی ئەوانەی کە دەڵێن شەڕ و کوشتن و غەنیمە نەریتێکی هەمیشەیی عەرەب بووەو ئیسلام ڕێگریی لێنەکردووە بەڵکو پەرەی پێداوە دەڵێین:

یەکەم: شەڕو شۆڕو شمشێرو کوشتنو غەزاو غەنیمە تەنها نەریتی عەرەب نەبووە، بەڵکو پێش عەرەب نەریتی فارسو ڕۆمەکان بووە، مەگەر ئەو هەموو دونیاگیریی‌و لەشکرکێشییەی فارسو ڕۆمەکان بە شمشێر نەبووەو خەڵکی تێدا نەکوژراوەو ماڵو سامانی خەڵکیی بە تاڵان نەبراوەو شارو دێهاتی نەڕوخێنراوە؟

هەروەها نەریتی ئەوروپاییەکانیش بوو، فیلمەکانی کاوبۆی کە تێیدا مرۆڤ لەبەر بێنرخترین شت کوژراوە باشترین بەڵگەو دۆکیومێنتە لەسەر واقیعی ئەوروپاییەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا.

هەروەها شەڕی خاچپەرستەکان کە دوو سەد ساڵی خایاند گەورەترین بەڵگەن لەسەر واقیعی شەڕەنگێزی ئەوروپا.

داهێنانی چەكو تەقەمەنی‌و تۆپو تەیارەی جەنگی‌و بۆمبی ئەتۆمی‌و کیمیایی‌و بەکتریۆلۆژیش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر سروشتی ڕۆژئاوای پێشکەوتوو و مۆدێرن لەم سەردەمەدا. کەواتە تاوانبارکردنی ئیسلامو عەرەب بە شەڕو شمشێر ناڕەواییەکی تەواوەو پێچەوانەی ڕاستییە.

دووەم: ئیسلام هەموو شەڕێکی ناحەقی حەرام کردووەو کوشتنی خەڵکی بە ناڕەوا قەدەغە کردووەو خواردنی ماڵی خەڵکی بە ناهەقو زەوتکردنی ماڵیانی حەرام کردووەو ستەمیشی حەرام کردووە.

واتە ئیسلام نەك هەر پەرەی نەداوە بە شەڕو کوشتن بەڵکو سنوری زۆری بۆ داناوەو لە پێناوی مەبەستی زۆر پیرۆزو ڕەوادا نەبێت ڕێگەی پێنەداوە، وەکو بەرگری لە نەفسو ماڵو ئەرزو ناموس، بۆ لابردنی ستەمو ستەمکارانو بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیرکەران یان تەمێکردنی دەستدرێژکەران وەیا شەڕ لەگەڵ ئەوانەی دەبنە بەردەست لە نێوان خەڵکی‌و بانگەوازی ئیسلامیدا لەمەوبەریش ئاماژەمان بەم مەسەلەیە داوەو پێویست ناکات دوبارەی بکەینەوە.

ئەوەی مێژووی عەرەبو فارسو ڕۆمو پاشان ئەوروپاو دەوڵەتی یێزەنتی بخوێنێتەوەو ئینجا تەماشای ڕێنماییەکانو تەشریعاتی ئیسلام بکات، دەزانێت ئیسلام چەند ئەم مەسەلەیەی سنوردار کردووەو کوشتنی خەڵکی بە ناهەق یان زەوتکردنی ماڵیانی چەند بە تاوانێکی گەورە لە قەڵەمداوە.

قورئان هەر لە مەککەوە کوشتنی بە ناهەقی حەرام کردووە. خوا لە سورەتی (**الأنعام**)دا کە سورەتێکی مەککییە دەفەرموێت: (**قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ * وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ**) (**الأنعام**: 151،152).

ئەمە لە مەککەو لە پێش پێکهێنانی دەوڵەتو پەیداکردنی دەسەڵات. لە مەدینەش کە سەردەمی دەسەڵات بوو بنەماسەرەکییەکانی پەیوەندی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی‌و غەیرە ئیسلامیدا دانرا کە پێکهاتووە:

(**وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ**) (**البقرة**: 190). واتە: بجەنگن لە پێناوی خوادا (بڕوانە: لە پێناوی خوادا نەك لە پێناوی دەسەڵاتو غەنیمە)دا لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵتاندا دەجەنگنو دەستدرێژی مەکەن، خوا دەست درێژکەرانی خۆش ناوێت.

بەنیسبەت ئەو ئایەتانەش کە هانی موسڵمانان دەدەن بۆ شەڕ هەمووی لەگەڵ قوڕەیشییەکانو ئەو هۆزانەی عەرەبو جولەکەیە کە بە درێژایی تەمەنی بانگەوازی ئیسلامی دژایەتییان کردووەو سەرەتا بە چەوساندنەوەو ڕاونانو هەوڵی هەڵگێڕانەوەیان لە ئایینە تازەکەیان و دواتریش بە شەڕو لەشکرکێشی بۆ سەریانو هاندانی هۆزەکانی عەرەب لێیانو هەوڵی بنەبڕکردنیان.

(وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِن قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ * فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ * وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ فَإِنِ انتَهَواْ فَلاَ عُدْوَانَ إِلاَّ عَلَى الظَّالِمِينَ * الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (البقرة: 191- 194 ).

کورتەی ماناکەی ئەمەیە: ئەوانەی کە شەڕتان لەگەڵ دەکەن (لە ئایەتی پێشوودا ئاماژەمان پێدا) لە هەر شوێنێك پێیان گەیشتن بیانکوژن، چۆن دەریانکردن ئاوها دەریان بکەن، سزادانو چەوساندنەوەی موسڵمانان بە مەبەستی هەڵگێڕانەوەیان لە ئایینەکەیان گەورەترە لە کوشتنیان. لای کەعبە شەڕیان لەگەڵدا مەکەن مەگەر ئەوان شەڕتان لەگەڵدا بکەن، ئەگەر شەڕیان لەگەڵدا کردن لەوێ ئەوا بیانکوژن، ئەگەر دەستیان هەڵگرت، ئەوا خوا بەخشندەو لێبوردەیە. لەگەڵیان بجەنگن تا چەوساندنەوەی بڕواداران نەمێنێت و ملکەچی بۆ خوا بێت، ئەگەر دەستیان هەڵگرت ئەوا دەستدرێژیی ناکرێتە سەر کەس ستەمکاران نەبێت... هتد.

(لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ * إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (الممتحنة:8 ـ 9). واتە خوا ڕێگەتان لێناگرێت چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی شەڕیان لەگەڵ نەکردوونو دەریان نەکردوون لە ماڵو شاری خۆتان، چاکەیان لەگەڵدا بکەن، خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت، بەڵام ڕێگەتان لێدەگرێت لەوەی چاکە لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کە شەڕیان لەگەڵ کردن لەبەر ئەوەی کە موسڵمانن‌و دەریان کردن لە ماڵتانو یارمەتی ئەوانەیاندا کە هەوڵی دەرکردنیان دان، خوا ڕێگەتان نادات دۆستایەتی لەگەڵ ئەوانەدا بکەنو پشتیان پێ ببەستن.

بە هەرحاڵ ئەگەر توێژینەوەیەکی زانستییانەو بە ئینصاف بکرێت لە نێوان شەڕەکانو لەشکرەکانی ئیسلامو شەڕو لەشکرەکانی تردا بە درێژایی مێژوو دەردەکەوێت کە لەشکری ئیسلام بە بەزەییترینو مەبدەئیترین لەشکر بوونو بە هیچ شێوەیەك شارو دێهاتیان نەڕووخاندووەو نەسووتاندووەو خەڵکی بێتاوانیان نەکوشتووە. ئەگەر لەملاو لەولاش شتێکی پێچەوانەی ئەمەش ڕوویدابێت ئەوا هەڵوێستێکی تاکەکەسی بووەو لادان بووە لە ڕۆحی ئیسلامو ڕێنماییەکانی ئیسلام.. هەر ئەمەش بووەتە هۆی موسڵمان بوونی ئەو میللەتانەی دەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانانەوە.. لەمەوبەریش شایەتی چەندین بیرمەندو مێژوونووسو ڕۆژهەڵاتناسە ڕۆژئاواییەکانمان هێنایەوە وەکو بەڵگەو شایەتییەك لەسەر ئەم ڕاستییانە.

ئەوانەی کە ئیسلام تاوانبار دەکەن بەوەی کە شەڕ بۆ دەسەڵات دەکات لێیان دەپرسین:

شەڕی نێوان ساسانییەکانو ڕۆمەکانو بیزەنتییەکان لە سەر چی بوو، کە هەموو جارێك سەدەها هەزار قوربانیی گیانی و وێرانکردنی سەدان شارو لادێی لەگەڵدا بوو؟

یان شەڕەکانی خاچپەرستان، کە سەدان‌هەزار کەس تێیدا لەناو چوو وهەموو جارێك دەیان شارو لادێی تێدا دەسووتێنرا لەبەرچی بوو؟ یان شەڕی مەغۆلەکان کە خەریك بوو هەموو دونیا بگرێتەوەو تەڕو وشکی بەیەکەوە دەسوتاندو داروبەردی بە پێوە نەدەهێشتو هەر شارەی بچوکترین بەرگریی نیشان بدایە لە بنیان دەهێنا، دڕندایەتییەکەشیان بە ڕاددەیەك بوو کە ناویان بوو بە هێمای هەموو دڕاندایەتییەك، بەڵام دوای ئەوەی موسڵمان بوون دەستیان لەو وێرانکارییە هەڵگرتو ڕوویان کردە شارستانیەت.

ئەوانەی ئاگایان لەم شتە مێژووییانە نییە خۆ ئاگایان لە شەڕی جیهانی یەکەمو دووەم هەیە کە بە هەردوو شەڕەکە زیاتر لە پەنجا ملیۆن کەس کوژرانو لەو ژمارەیەش زیاتر بریندار وسەقەت بوونو سەدەها شاری گەورە لەگەڵ زەویدا تەخت کران. ئەمانە لە پێناوی چیدا بوون؟ ئایا لە پێناوی دەسەڵاتو بۆ دەستگرتن بەسەر بەروبوومی وڵاتاندا نەبوو؟

ئایا ئەوروپاو ئەمەریکا لەسەر حیسابی میللەتانی ترو لە ئەنجامی دەستگرتن بە سەر سەروەتو سامانی وڵاتانی تردا خۆیانیان پێش نەخستو وڵاتانی خۆیانیان ئاوەدان نەکردەوە؟

شیوعیییەکانی سۆڤییەت لە پێناوی چیدا دەستیان گرت بە سەر رۆژهەڵاتی ئەوروپاداو زیاد لە نیو سەدە هەناسەیان لە خەڵکی بڕیبوو؟ ئایا ئەو شەڕانە شەڕی دەسەڵاتو دەسکەوت نەبوون کە ملیۆنەها کەس بوونە بە قوربانی تێیدا؟

ئەگەر موسڵمانان وەکو رۆژئاوای سەرمایەداری و رۆژهەڵاتی شیوعی شەڕی دەسەڵاتیان بکردایەو شەڕیان بۆ رووتاندنەوەی خەڵکیو دەستگرتن بەسەر سەروەتو سامانەکانیاندا بوایە دەبوایە دوای نەمانی دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسیی هەموو ئەو میللەتانە وەك چۆن دەستیان لە شیوعیەت هەڵگرت ئاوها دەست لە ئیسلامیش هەڵگرن.

ئێستاش ئەگەر خەڵکی کورد چەواشە نەکرێنو لە رێگای تۆقاندنو ترساندنەوە لە ئیسلام دوور نەخرێنەوە و رێگا بدرێت بە بانگخوازە ئیسلامییەکان بە سەربەستی قسە بکەن و رێگە بدەن بە مزگەوت رۆڵی خۆی ببینێت و رێگە بە دڵسۆزانی ئیسلام بدرێت بە ئازادی کار بۆ ئیسلام بکەن زۆربەی هەرە زۆری ئەم میللەتە دەست بە ئیسلامەوە دەگرن و بە هیچ رێبازێکی تری ناگۆڕنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا وە لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی دەدرێت بۆ لە ئیسلام کردنی کورد کەچی هێشتا زۆربەی خەڵکی هەر ئیسلامیان دەوێت.

شیوعیییەکانی یەکێتی سۆڤیەت، چونکە مەبەستیان دەسگرتن بوو بە سەر جیهاندا و هەموو شتێکیان لە پێناوی دەسەڵاتدا بوو دەبینی لە بواری سەربازی و چەك و تەقەمەنیدا زۆر پێشکەوتوو بوون، بەڵام لە بوارەکانی تردا دواکەوتووبوون.

## ناسخو مەنسوخ، ئایەتەکانی جیهاد و چاوپۆشی

بابەتی ناسخو مەنسوخ کە بریتییە لە سڕینەوەی حوکمێکی شەرعی بە حوکمێکی تر ئیتر چ ئەو حوکمانە بە ئایەت هاتبن یان بە فەرموودە، بابەتێکی ئاڵۆزەو کەسانی زۆر شارەزای دەوێ لێی بکۆڵێتەوەو لە کۆلێژی (شەریعە)یشدا وانەیساڵانی کۆتاییەو وانەی ماجستێرو دکتۆرایە.

بۆ زانینی ناسخو مەنسوخ ئەو کەسەی دەیەوێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات دەبێ لایەنی کەم عەرەبییەکی زۆر باش بزانێت بۆ ئەوەی مانای تەواوی ئایەتەکە بزانێتو بتوانێ ئەگەر لێکنەچواندنێك هەبێت لە دەقەکاندا چارەسەری بکات، ئینجا دەبێ مێژوو و بۆنەی دابەزینی هەموو ئایەتەکان و بۆنەی وتنی فەرموودەکان بزانێتو رای زانایانو موفەسیرەکانیش بزانێت، پاشان دەبێ لە فیقهـ و ئەصولی فیقهـ شارەزا بێت ئینجا بۆی هەیە قسە لەم بابەتە بکات. کەسانی کەمسەوادیش توخنی هەر بابەتێك بکەون نابێ توخنی ئەم بابەتە بکەون، چونکە قورسو دژوارەو زوو نەزانی و کەمسەوادییان ئاشکرا دەکات.

زانایانی کۆنیش زۆرێکیان قسەیان لەم بابەتە کردووە، هەندێکیان زیادەڕەوییان لەو بارەدا کردووە کە بڕێکی زۆر لە ئایەتەکانیان بە مەنسوخ داناوە (وەکو هەموو ئەو ئایەتانەی باسی نەرمو نیانیو حیکمەت و ئامۆژگاری دەکەن، لەگەڵ ئەو ئایەتانەی کە باسی جیهاد دەکەن کە گوایە هەموو ئەو ئایەتانەی باسی نەرمونیانی دەکەن بە (**آية السيف**) حوکمەکەیان سڕاوەتەوە). هەندێکی تریش بە بارەکەی تردا زیادەڕەوییان کردووە کە گوایە هیچ ئایەتێك نییە حوکمەکەی یان خوێندنەوەکەی سڕابێتەوە.

هەریەك لەم دوو چینەش کاریگەری واقیعیان زۆر بە سەرەوە دیارە بۆ نموونە چینی یەکەم کە زۆرێك لە ئایەتەکانی بەکارهێنانی نەرمونیانیو دانایی بە مەنسوخ دەزانن لە سەردەمێکدا ژیاون کە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامی بووەو دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە لە چڵەپۆپەدا بووە، وەکو سەردەمی عەباسییەکان، کۆمەڵگە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی بووەو هەموو تاکێك لەماڵەوەو لە دەرەوە پەروەردەی ئیسلامی پێگەیشتووە ولە لایەکی تریشەوە پەیوەندی دەوڵەتی ئیسلامی لەگەڵ

دەوڵەتانی دراوسێدا شتێك نەبووە لەسەر نەرمونیانی و موجادەلە بە چاکترین شێوە وەستا بێت، بەڵکو یا عەهدو پەیمان لە نێواندا هەبووە یان شەڕ، ئەمەش هێز بریاری دەداتو یەکلایی دەکاتەوە، لەبەر ئەوە ئەو کەسانە بوارێکیان نەبینیوەتەوە ئایەتەکانی گفتوگۆو وەعزو موجادەلەی تێدا بەرپا بکرێت بۆیە وتوویانە ئەم ئایەتانە هەمووبە ئایەتی (السیف) (کە کۆکیش نین لەسەری چ ئایەتێکە) نەسخ کراوەتەوە.

ئاشکراشە کە ئەمە بۆچونێکی هەڵەیەو لە ئەنجامی کاریگەریی واقیعەوە بووەو بەڵگەیە لە سەر کورتبینی ئەو زانایانە لەو بوارەدا.

هۆیەکی تر بۆ زیادەڕەوی لە زیادکردنی ژمارەی ئایەتە نەسخکراوەکان بوونی بیرۆکەیەکی پێشتر لە مێشکی ئەو زانایەداو کاتێ بینیبێتی لەگەڵ هەندێك ئایەتدا پێچەوانەیە، جا یان ئایەتەکەی تەئویل کردووەو ماناکەی گۆڕیوە یان وتویەتی نەسخ کراوەتەوە.

هۆیەکی تر ئەوەیە، کە ئەو کەسانە بە رواڵەت لێك نەچواندنێکیان بینیوە لە نێوان هەندێك لە ئایەتەکاندا و بۆیان چارەسەر نەکراوە لە ئەنجامدا وتویانە ئەم ئایەتە نەسخ کراوە.

یان هەندێك زانا لە بێئیشی یان وەکو پەتایەك کە کێ زۆرترین ئایەتی نەسخکراو لە قورئاندا دەدۆزێتەوە هەوڵی داوە بە بۆنەو بە بێ بۆنە حوکمی نەسخی هەندێك ئایەت دەر بکات، وەکو چۆن ئێستا پەتای رەخنەگرتن لە ئیسلام بڵاوبوەتەوە، کێ بۆی بکرێت زۆرترین رەخنە بگرێت ئیتر بە حەقو بە ناحەق پیاهاتوونو رەخنە لەسەر رەخنە ریز دەکەن وەکو ئەمانەی لای خۆمان.

ئەگەر کەسێك دەیەوێت بە باشی لەم بابەتە بگاتو توانای زانستیی هەیە با بچێت کتێبەکەی مامۆستا (موستەفا زەڵمی) بخوێنێتەوە نەك خوێننامەکەی زەردەشتی.

## لە نێوان چاو پۆشی و لێبوردەیی و شەڕو جیهاددا

هەندێك کەس لە پەیوەندیی نێوان ئەو ئایەتانەی باسی لێبوردەیی و نەرمونیانی دەکەن و ئەو ئایەتانەی هانی شەڕو جیهاد دەدەن تێناگەن و وادەزانن ئەمانەی دوایی ئەوانەی پێشوویان نەسخ کردۆتەوەو موسڵمانان زیاتر ئەم ئایەتانەی دواییان بەرپا کردووە و کاریان بە ئایەتەکانی بەزەیی و چاوپۆشی و لێبوردەیی نەکردووە.

لە وەڵامدا دەڵێین:

ئەو ئایەتانەی باسی بەزەییو بەخشندەییو لێبوردەییو رەوشتبەرزی دەکەن بە باشترین شێوە لە لایەن موسڵمانانەوە بەرپا کرابوو، ئەوەندەی موسڵمانانی سەدەکانی یەکەمی ئیسلام بە ئیسلامەوە پابەند بوون شوێنکەوتوانی هیچ پێغەمبەرێك بە رێنماییەکانی پێغەمبەرەکەیانەوە پابەند نەبوون، بچووکترین بەڵگەش بڵاوبوونەوەی ئیسلامە بە نزیکەی چواریەکی جیهاندا لە ماوەی چارەکە سەدەیەکداو موسڵمانبوونی ئەو هەموو میللەتانەو دەستگرتنیان بە ئیسلامەوە، ئەگەر بەرزیی رێنماییەکانی ئیسلام و پابەندیی موسڵمانان بەو رێنماییانەوە نەبوایە ئەو میللەتانەی کەوتنە ژێر دەستی موسڵمانانەوە دوای لەناوچوونی دەسەڵاتی موسڵمانانو لاوازبوونی دەوڵەتی ئیسلامی هەموو هەڵدەگەڕانەوە لە ئیسلام، بەڵام دەبینی بە پێچەوانەوە ئیسلام چووبێتە هەر وڵاتێکەوە میللەتەکەی پاش ماوەیەکی کەم بوونەتە موسڵمانو خۆیان بوونەتە بەرگریکەر لە ئیسلامو بەشێك لە لەشکری ئیسلام.

هەر ئەم خاڵەشە سەرنجی رۆژئاواییەکانی راکێشاوەو ناچاری کردوون دان بەوەدا بنێن کە لەشکری موسڵمانان بە بەزەییترین لەشکر بووەو دان بە بەرزی بنەماکانی ئیسلامو جوانی رەوشتی موسڵماناندا بنێن.

لەشکری ئیسلامی هیچ ڕۆژێك شارێك یا لادێیەکیان وێران نەکردووەو قەتڵو عامی خەڵکەکەیان نەکردووە، بە پێچەوانەشەوە لەشکری خاچپەرستەکان کە خۆیان بە شوێنکەوتووی ئایینی حەزرەتی عیسا دەزانن، ئەو عیسایەی کە فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك زللەیەکی لە لای ڕاستت دا ڕوو وەرگێڕە بۆ ئەوەی زللەیەك لە لای چەپیشت بدات، ئەو لەشکرە بە دڕندەترین شێوە ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکی ئەو شوێنانەدا دەکرد کە دەکەوتە ژێر دەستیانەوە. خۆ لەشکری مەغۆلەکانو تەتەرەکان ئەوە هەر باس ناکرێتو هەر شارێك کەمێك بەرهەڵستی بکردایە دارو بەردیان بەسەریەکەوە نەدەهێشتو ژنو پیاوو منداڵو پیریان لەناو دەبرد.

ئەو ئایەتانەی باسی جیهاد دەکەن نەسخکەرەوەی ئەو ئایەتانە نین کە باسی چاوپۆشی و چاکە کردن و بەزەیی و لێبوردەیی دەکەن وەکو ئەوەی ئەم نووسەرانەی لای خۆمان لێی تێگەیشتوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو ئایەتانەی باسی بەزەیی و چاوپۆشی و لێبوردەیی دەکەن بناغە بوون و بۆ هەموو کاتێکن و لەگەڵ موسڵمان و ناموسڵماندا بەرپا دەکرێن, بەڵام ئایەتەکانی جیهاد تەنها بۆ کاتی شەڕن لەگەڵ ئەو دوژمنانەی کە شەڕ بە موسڵمانان دەفرۆشن یان ئەوانەی کە ماوەیەکی زۆر شەڕیان لەگەڵدا کردن و ئازاریان دەدان و پیلانیان بۆ دەگێڕان ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا کە موسڵمانان سەرکەوتن بە سەریاندا ئەوپەڕی چاوپۆشییان لەگەڵدا بە کار هێنان.

نموونەش لە سەر ئەم ڕاستییە زۆرن من دووسێیەکیان باس دەکەم و ئەوانی تر دەهێڵمەوە بۆ خوێنەر بچێت بیخوێنێتەوە.

یەکەم: ڕەفتاری پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەهلی مەککەدا, لەگەڵ ئەوانەی کە ئەو هەموو ئەشکەنجە و ئازارەی موسڵمانانیان دا و ئەو هەموو شەڕەیان لەگەڵدا کردن و ئەو هەموو خەڵکەیان لێ هان دان, کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ زاڵ بوو بە سەریاندا و هەموویان کەوتنە ژێر دەستی و دوای ئەوەی کە خەڵکی مەککە خۆیان چاوەڕوان بوون پێغەمبەر تۆڵەیان لێ بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بڕۆن ئێوە ئازادن ( **أذهبوا فأنتم الطلقاء**).

کاتێك بیستی کە سەعدی کوڕی عوبادەی سەرلەشکری موسڵمانان وتویەتی (**اليوم يوم الملحمة**) واتە ئەمڕۆ ڕۆژی کوشتارە.

پەیامبەر ﷺ یەکسەر لایبرد و کوڕەکەی لە جێی دانا و فەرمووی (**بل اليوم يوم المرحمة**): واتە نەخێر بەڵکو ئەمڕۆ ڕۆژی بەزەییە.

دووەم: ڕەفتاری لەشکری موسڵمانان لەگەڵ خەڵکی شامدا کارێکی کرد زۆربەی هەرە زۆریان ببنە موسڵمان. لەشکری موسڵمانان دوای ئەوەی خەڵکی (حمص) ڕازی بوون بە خۆ بەدەستەوە دان بەرامبەر بە جزیە, ئەبوعوبەیدەی سەرلەشکری موسڵمانان کاتێك (حمص)ی بەجێهێشت سەرانی ئەو شارەی بانگ کرد و پارەکەی بۆ گەڕاندنەوە, ئەوانیش سەیریان لێهات بۆچی ئەو پارەیەیان بۆ دەگێڕێتەوە, ئەویش فەرمووی ئێمە ئەو پارە (جزیە)یەمان لێوەرگرتن لەبەرامبەر ئەوەی کە پارێزگاریتان لێ بکەین ئێستاش ئێمە کە ئێرە بە جێ دێڵین و ناتوانین پارێزگاریتان لێبکەین ئەو پارەیە بۆ ئێمە حەرامە و دروست نییە لێتان وەرگرین.

سێهەم: ڕەفتاری موسڵمانان لەگەڵ خاچپەرستەکاندا لە فەلەستین لە دوای ئەوەی، کە ئەوان ماوەی دوو سەد ساڵ کوشتار و دزی و تاڵانییەکی زۆریان کرد, کاتێك موسڵمانان سەرکەوتن بە سەریاندا و فەلەستینیان لە دەست سەندنەوە لێیان خۆش بوون و دەستیان بۆ ماڵ و سامانیان نەبردو ڕێگەیان پێدان ئەوەی پێیان هەڵدەگیرێت لە ماڵ و سامان و زێر لەگەڵ خۆیاندا بیبەن.

هەر ئەم ڕەفتارەش بوو وای کرد لە ئەوروپا دادگاکانی پشکنین (محاكم التفتيش) دابنێن بۆ دادگایی کردنی ئەو کەسانەی باسی جوامێری و ڕەوشت بەرزی و جوانی مامەڵەی موسڵمانانیان دەکرد.

پەیوەندیی نێوان قورئانی مەککی و مەدەنی:

بە کورتی دەڵێم: نە ئەم نووسەرانەو نە مامۆستاکانیان لە رۆژهەڵاتناسەکان پەیوەندیی نێوان قورئانی مەککی و مەدەنیان نەزانیوەو وایان زانیوە کە دژایەتی و لێکنەچوون لە نێوان ئایەتەکانی ئەو دوو سەردەمەدا هەیە و لە ئەنجامدا وتویانە ئەمانە نەسخکەرەوەی ئەوانەی پێشوون, لە کاتێکدا کە تەواوکەری یەکترن و قورئانی مەککی بناغەیە و قورئانی مەدەنی بیناکەیە, هەر وەکو چۆن لە باسی چیرۆکی پێغەمبەران و لە باسی زینا و پیاوکوشتن و مەسەلە کۆمەڵایەتییەکاندا پەیوەندیی نێوان قورئانی مەککی و مەدەنیمان باسکردو وتمان قورئانی مەککی بناغەیە بۆ قورئانی مەدەنی, لێرەشدا بە هەمان شێوە دەڵێین قورئانی مەککی بناغەیە بۆ قورئانی مەدەنی.

لە مەککەدا باسی ئەوە دەکات ئەم پێغەمبەرە مایەی رەحمەت و بەزەییە بۆ مرۆڤایەتی و باسی بانگەواز کردنی خەڵکی دەکات بۆ ئیسلام, لە قورئانی مەدەنیشدا کاتێك موسڵمانان دەسەڵات پەیدا دەکەن ئەم بنەمایانەیان بیر ناچێتەوە کە خوا ئەوانی بۆ رێنمایی کردنی خەڵکیی ناردووە بۆیە تا شێوازی ئاشتیخوازانە وەستابایە پەنایان نەدەبردە بەر چەك, نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لە گەرمەی شەڕدا گەر کەسێك شایەتمانی بهێنایە یا بە زاریش بووایە و بۆ خۆ دەرباز کردن بووایە لە کوشتن نەدەبا بکوژرێت, نموونەیەك لە سەر ئەم حاڵەتە زەیدی کوڕی حاریسە یە، کە لە یەکێك لە شەڕەکاندا پیاوێکی کوشت دوای ئەوەی لە کاتی شەڕەکەدا شایەتمانی هێنا, کاتێك هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ناردی بە دوایدا و لێی پرسی بۆچی واتکردووە؟ ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بۆیە شایەتمانی هێنا بۆ ئەوەی لە کوشتن رزگاری بێت, پێغەمبەر فەرمووی (**هلا شققت عن صدره**) ئایا تۆ سنگیت هەڵدری هەتاوەکو بزانی ئەو بە چ مەبەستێك ئەو شایەتمانەی هێنا؟ چی دەکەیت لە وشەی **لا اله الا الله**.

پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە سەرزەنشتی زەیدی کرد کە بڵێت خۆزگە ئێستا موسڵمان دەبووم (لەبەر ئەوەی موسڵمان بوون هەمووو رابردوو دەسڕێتەوە).

نموونەیەکی تر: قسەکانی رەبعی کوڕی عامر بوو، کە بە رۆستەمی سەرلەشکری فارسی وت: ئێمە کۆمەڵێکین خوا زیندووی کردوینەتەوە و ناردوینی بۆ رزگار کردنی خەڵکیی لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوا و لە ستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادوەریی ئیسلام و لە تەسکی دونیا بۆ فراوانی دونیا و دوارۆژ.

نموونەش زۆرن لە سەر ئەم راستییە و هەمووو مێژوونووسە بە ئینصافەکان دانیان پێداناوە و خاڵێکی رۆشنە بە نێوچەوانی موسڵمانانەوە.

ئەو ئایەتانەی باسی جیهاد و شەڕ دەکەن بە تایبەت لە سورەتەکانی (ئەنفال و تەوبە و **آل عمران و نساء** و **محمد** و ئەحزاب و هتد)، لەگەڵ فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ و رێنماییەکانی خەلیفە راشیدەکان ئەگەر بەرپا بکرێت یەك کەسی بێتاوان ناکوژرێت و کەس بە ناڕەوا دەستدرێژی بۆ سەر گیان و ماڵی کەس ناکات هەرچییەکیش کرابێت لە مێژووی ئیسلامدا کە پێچەوانەی ئەو رێنماییانە بوو بێت ئەوە لادان بووە لە بنەما و رێنماییەکانی ئیسلام و ئیسلام لێی بەر پرسیار نیە و مرۆڤەکان خۆیان لێی بەرپرسیارن و پەیوەندیی بە رادەی تێگەیشتن و پابەندی ئەو کەسانەوە هەیە بە ئیسلامەوە, لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا مێژووی ئیسلام لەو رووەوە زۆر گەشترە لە مێژووی ئایین و رێبازەکانی تر. ئەوە ئەمریکایە کە خۆی بە چاودێری مافی مرۆڤ دەزانێت تا ئەمرۆ ملیۆنەها کەسی کوشتووە لە پێناو سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی, هەر لە جینۆساید کردنی دانیشتوانە رەسەنەکانی ئەمریکاوە تا بۆمبارانی هیرۆشیماو ناکازاکی و ڤێتنام و ئەفغانستان و هتد.

مێژووی شیوعییەتیش لە خوێنرێژی و داپڵۆسین و دیکتاتۆرییەت و خەفەکردنی دەنگە نەیارەکاندا لە کەس شاراوە نییەو مێژووی مەسیحییەتیش کە خەڵکیی بە ئایینی ئاشتی دەزانێت پڕە لە خوێنرێژی و توندوتیژی بە رادەیەك کە لە سەرتاسەری ئەوروپادا تا کەنیسە دەسەڵاتی هەبوو جگە لە مەسیحیەت هیچ ئایینێکی تر جێی نەدەبویەوە تێیدا, نەك هەر ئایینی تر بەڵکو تەنانەت مەزهەبی تریش (لە مەسیحییەکان) جێی نەدەبویەوە, ئەوەتا وەکو لەمەوبەریش باسمان کرد لە ساڵی (1571) زایینی تەنها لە یەك شەودا لە پاریس صەد هەزار پرۆتستانت کوژران, بە پێچەوانەی جیهانی ئیسلامیەوە

که له ئەنجامی چاوپۆشی کردندا سەدان ئایین و مەزهەبی جیاجیای تێدایە, ئەوەتا بتەکانی بودا لە ئەفغانستان ماوەی هەزار و چوار سەد ساڵە دەستکاری نەکرابوو لەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی پێشوو لەوانەی ئێستا شارەزاتر و پاپەندتر بوون بە ئیسلامەوە, ئەوەش کە تالیبان کردیان لە روخاندنی ئەو بتانە نەزانی و دەمارگیری ئەوانی دەردەخست نەك هی رێنماییەکانی ئیسلام.

مانەوەی ئەو هەموو تایفە و مەزهەب و ئایینانە لە وڵاتی ئیسلامیدا ئەگەر بەڵگە نەبێت لە سەر چاوپۆشی ئیسلام و زۆر نەکردن لە خەڵکیی بۆ گۆڕینی ئایینەکەیان بەڵگەیە لە سەر چی؟

هیندستان کە زیاد لە هەزار و دووسەد ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا بووە کەچی زۆربەی دانیشتوانی کە نزیکەی ملیارێکە لە سەر ئایینی هیندۆسی ماونەتەوە.

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە بەزەیی هاتنەوەو بەخشندەیی و لێبوردەیی و چاکەکاری شتێکی بناغەیین لە ئیسلامدا ئەو ئایەتانەیە کە لە کۆتایی سەردەمی مەدینەدا دابەزیون و بانگەشە بۆ ئەم شتانە دەکەن.

بەڵگەیەکی تر فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە هانی موسڵمانان دەدات بۆ ئەو چاوپۆشی و لێبوردەیی تەنانەت لە کاتی شەڕیشدا تەنها بە تەماشاکردنی سەرباسەکانی کتێبەکانی فەرمودە ئەم راستییە نیشان دەدات. هەڵسوکەوتو رەفتاری پێغەمبەریش ﷺ گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئیسلام ئایینی بەزەیی و ئاشتی و چاکەکارییە وەکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"إنما أنا رحمة مهداة"**. یا دەفەرموێت: **"إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق"**. یا دەفەرموێت: **"خير الناس من نفع الناس"**.

واقیعی موسڵمانانیش شاهیدە لەسەر ئەم راستییە، بەڵام ناحەزان دەیانەوێت بە شێواویی وێنەی بکێشن و نیشانی خەڵکی بدەن، ئەوەتا لە سەرجەمی سەدان بزوتنەوەی ئیسلامیی تەنها چەند دانەیەکی بچوکیان پەنا دەبەنە بەر شەڕ بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان، بەڵام دەزگاکانی راگەیاندن و لایەنە دژ بە ئیسلامییەکان تەنها تیشك دەخەنە سەر ئەو لایەنە توندوتیژانە، بۆ نموونە بزوتنەوەی تەصەوف، کە لە کۆنەوە تا ئێستا هەیە، بزوتنەوەی نوور، کە لە زۆر شوێنی دونیادا بڵاوبونەتەوە، بزوتنەوەی تەبلیغ و جەماعەی ئیسلامی لە پاکستان و کۆمەڵی عەدل و ئیحسان لە مەغریب و کۆمەڵی چاکسازی و ئاشتی لە جەزائیر و تونس و کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین کە لە هەموو جیهاندا هەیەو...هتد.

ئەگەر ئەم نووسەرە چەپ و شۆڤێنیانە متمانە بە نووسەرە موسڵمانەکان ناکەن کە راستگۆترین و بە ئینصافترین نووسەر بوون با بڕۆن شایەتیی رۆژهەڵاتناسەکان بخوێننەوە، ناڵێم ئەوانەیان کە موسڵمان بوون لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئیسلام و رەفتاری موسڵمانان، نە ئەوانەشیان کە خاوەنی ئینصافن، بەڵکو تەنانەت بێ ئینصافەکانیشیان بزانن چییان وتووە دەربارەی ئاکار و رەفتاری موسڵمانان. ئەوەندە بەسە بیزانی کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام بە تایبەت دەسەڵاتی عەرەب کە ئەم شۆڤێنیانە ئەوەندەیان رق لێیانە، یەك لادێی کورد نەڕوخێنراوە و یەك شار لە شوێنی خۆی نەگوێزراوەتەوە، لە کاتێکدا کە رژێمێکی عەلمانی ناسیۆنالیستی وەکو بەعس لە ماوەی بیست و سێ ساڵدا (1968 تا 1991) خەریك بوو داری کوردستان بەسەر بەردییەوە نەهێڵێت.

ئەگەر ئەوەی رژێمی ناسیۆنالیستی شۆڤێنی بەعس لە ماوەی رۆژێکدا دەیکرد دەوڵەتی ئیسلامیی لە ماوەی (10) ساڵدا بیکردایە ئێستا میللەتی کورد ناوی لەسەر نەخشەی زەویدا نەمابوو.

ئەوەی ئەم نووسەرە چەپ و شۆڤێنییانە نایانەوێت دانی پێدا بنێن بێ ئینصافترین نووسەرانی رۆژئاوا دانیان پێدا ناوە.

## شایەتیی ڕۆژهەڵاتناسان

ئەگەر لەبەرئەوە نەبێت لە بابەت دەردەچم شایەتیی سەدان ڕۆژهەڵاتناس و نووسەرانی ڕۆژئاواییم دەهێنایەوە لەسەر ڕەوشتبەرزی موسڵمانانو کاریگەریی ئیجابی ئیسلام لەسەر شوێنکەوتوانی، بۆیە تەنها ئاماژە بە هەندێك لەو کتێبو نووسەرانە دەدەم کە ئاماژەیان بەم ڕاستییانەیان داوە.

- تۆماس ئەرنۆلدی ئینگلیزی لە دایك بووی (1864ز) لە کتێبی بانگەواز بۆ ئیسلام (**الدعوة الى الإسلام**) و بیرەباوەڕی ئیسلامی (**العقيدة الإسلامية**).

- گۆستاف گرونیاوم لە دایکبووی 1909 لە ڤییەنا لە کتێبی شارستانێتی ئیسلام (**حضارة الإسلام**).

- لیۆپۆلد ڤایس لە کتێبی: ئیسلام لە سەر دوریانێك (**الإسلام على مفترق الطرق**). لامارتین لە کتێبی (**إعترافات**). ولیم مۆیر مێژوونووسی گەورەی ئینگلیزی لە کتێبی (**حياة محمد**).

- لۆرا فیشیا فاغلیری مامۆستای زمانی عەرەبی و مێژوویی و شارستانی ئیسلام لە زانکۆی ناپۆلی لە ئیتالیا لە کتێبی بەرگری لە ئیسلام (**دفاع عن الإسلام**).

- پرۆفیسۆر جارسون دی تاسی لە کتێبی (**الإسلام**).

- تۆماس کارلیلی فەیلەسوفی ئینگلیزی ساڵی 1881 مردووە، لە کتێبی (**الأبطال وديانة الأبطال**).

- پرۆفیسۆر (کارادیفۆ) لە کتێبی (**المحمدية**).

- رینولد ألین نیکولسون ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی خاوەنی کتێبی (**تأريخ الآداب العربية**)، (**دراسات في التصوف الإسلامي**).

- گۆستاف لۆبۆن زانای فەرنسی بەناوبانگ لە زانستی کۆمەڵناسی و دەروونناسیو خاوەنی کتێبی (**حضارة** العرب). شایانی باسە لۆبۆن یەکێکە لە ڕۆژهەڵاتناسە دەمارگیرو بێ ئینصافەکان.

- دوزی لە کتێبی (تأريخ عرب إسبانيا).

- **آدم ميتز**، ڕۆژهەڵاتناسی سویسری لە کتێبی (**الحضارة الإسلامية في القرن الرابع الهجري**).

- ئیتین دینیە، ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی لە کتێبی (**أشعة من نور الإسلام**)، (**الشرق في نظر الغرب**).

- أرنولد توینبی مێژونووسی ئینگلیزی خاوەنی کتێبی (التأريخ البشرى) شایانی باسە توینتی قەناعەتی وایە کە ئیسلام جارێکی تر لەسەر دەستی عەرەب سەردەکەوێتەوەو دەسەڵات بەسەر جیهاندا پەیدا دەکات ئەویش لەبەر ڕەوشتبەرزییان.

- پرۆفیسۆر هامیلتون گیپ خاوەنی چەندین کتێب لەسەر شارستانی ئیسلامی.

- لوپروب ستوداردی ئەمریکی خاوەنی کتێبی (**حاضر العالم الإسلامي**).

- **ولفريد كانتويل سميث**، مامۆستای زانستە ئیسلامییەکان لە زانکۆی مۆنتریال و خاوەنی کتێبی **الإسلام في التاريخ الحديث**.

- **الأب عبدالأحد داودى** ئاشوری لە کتێبی (**الإنجيل والصليب**).

- روبرت بریفال (**فضل المسلمين على الإنسانية**).

- ئێچ جی وێلز لە کتێبی **مختصر** تأريخ العالم.

- دکتۆرە زیگرید هۆلتکەی ئەڵمانی خاوەنی کتێبی (**شمس الله على الغرب وفضل العرب على أوروبا**).

ئەمانە هەندێك بوون لەو زاناو ڕۆژهەڵاتناسانەی لەسەر ئیسلامو موسڵمانانیان نوسیووەو هەندێکیان بە ئینصافەوەو هەندێکیان بەبێ ئینصافی، بەڵام لەگەڵ بێئینصافییەکەشدا دانیان بە گەورەیی ئیسلامو جوانی ڕەفتاری موسڵماناندا ناوە نەك وەکو ئەم نووسەرانەی لای خۆمان کە چاویان بەرایی نادات هیچ ڕاستییەك ببینن.

لە هەمووش سەیرتر ئەوانەی هێرش دەکەنە سەر ئیسلام بە زۆری چەپەکان و مارکسییەکانن، ئەوانەی کە هاوبیرەکانیان لە یەکێتی سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەڵاتدا دکتاتۆرترین و داپڵۆسێنەرترین رژێمیان داناو لە ماوەیەکی کەمدا ملیۆنەها خەڵکی ئەو وڵاتانەیان کوشت و دەربەدەر کرد.

ئەو رێنماییانەی ئیسلام ئەوەندە کاریگەریی لەسەر عەرەب دانابوو وە ئەوەندە گۆڕانکاریی تێدا کردبوون بە رادەیەك کە مێژوونووسی ئینگلیزی ئێچ جی وێلز بڵێت: گەر کەسێك ژیانی عەرەبی لە پێش ئیسلامدا بخوێندایەتەوەو پێشبینی ئەوەی بکردایە کە دوای چارەکە سەدەیەك ئەو هەموو گۆڕانکارییانەیان بەسەردا دێت تۆمەتبار دەکرا بە شێت، واتە لە خەیاڵی هیچ ژیرو دانایەکدا نەبووە کە عەرەب لەو ماوە کەمەدا ئەو هەموو گۆڕانکارییەی بەسەردا بێت.

ئەو ئایەتانەش کە باسی شەڕو کوشتار دەکەن ئەوە هیچ کاتێك کاریگەریی نێگەتیڤی لە سەر رەوشتی موسڵمانان نەبووە بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو پەروەردە ئیسلامیەی یارانی پێغەمبەر ﷺ کرابوون لە سەر دەستی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو لایەنەکانی ژیانیاندا رەنگی دابوویەوە بە تایبەت لە کاتی شەڕ و سەرکەوتن بە سەر دوژمناندا.

واتە ئەو ئایەتانەی باسی بەزەیی و لێبوردەیی و چاوپۆشی و رەوشتبەرزی دەکەن ئەوانە بنەماو بناغە بوون و باڵیان کێشا بوو بە سەر هەموو لایەنەکانی ژیانی موسڵماناندا لە شەڕو ئاشتیدا.

گەورەترین شایەتیش لە سەر ئەم راستییە ئامۆژگارییەکانی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی بوو بۆ لەشکری موسڵمانان کە پیر و ژن و منداڵ و پیاوانی ئایینی نەکوژن, هیچ دارێك نەبڕن مەگەر بەشی پێویستی, خانوو بورە نەڕوخێنن...هتد.

هەر ئەم رەوشتەش بوو وای لە خەڵکی شام کرد باوەش بۆ لەشکری ئیسلامی بکرنەوە و بچن بە پیریانەوە.

ئەگەر ئەم نووسەرانە خۆیان ئەم راستیانە نابینن با لە سەر زمانی هەندێك لە رۆژئاواییەکانەوە بۆیان باس بکەین و بیخەینە بەرچاویان.

گۆستاف لۆبۆن دەڵێت: لە راستیدا میللەتان لەشکری بە بەزەیی لێبوردەی وەکو عەرەبیان نەبینیوە.

روبەرتۆنیش دەڵێت: تەنها موسڵمانان توانیویانە جیهاد و چاوپۆشی بە یەکەوە گرێ بدەن بەرامبەر بە شوێنکەوتوانی ئایینەکانی تر بە شێوەیەك کە شوێنکەوتوانی ئایینەکانی تریان بە ئازادی بەجێ هێڵاوە لەوەی کە ببنە موسڵمان یان لە سەر ئایینەکەی خۆیان بمێننەوە.

روبنسون دەڵێت: تەنها شوێنکەوتوانی موحەممەد توانییان چاوپۆشی کردن و حەزی بڵاوبوونەوەی ئایینەکەیان بە یەکەوە گرێبدەن.

## لێبوردەیی لە نێوان مەسیحییەت و ئیسلامدا

سەرەڕای ئەوەی کە مێژووی مەسیحییەت پڕە لە شەڕو خوێنڕێژی، چ شەڕی ناوخۆیی بێت لە نێوان مەزهەبە جیاجیاکانی مەسیحییەتدا، یا شەڕی مەسیحییەکان دژ بە شوێنکەوتوانی ئایینەکانی تر وەکو یەهودییەت و ئیسلام، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی چەکە وێرانکەرەکانی دونیا لە جیهانی مەسیحیدا بەرهەم دەهێنرێن و سەدان شەڕی وێرانکاری بەو چەکانە لە لایەن رۆژئاوای مەسیحییەوە ئەنجام دراوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك کەس فریو دەخۆن بەو قسە نالۆژیکییەی، کە دەدرێتە پاڵ حەزرەتی عیسا کە گوایە فەرموویەتی ئەگەر کەسێك زللەیەکی لە لایەکتدا ئەو لاکەی تری بۆ وەرگێڕە بۆ ئەوەی زللەیەك لەویش بدات!. یا ئەو قسەیەی کە دەڵێت: دوژمنانتان خۆش بوێت دەسخۆشی لەوانە بکەن، کە نەفرەتتان لێدەکەن. ئەم قسانەی کە موژدەدەرانی مەسیحی گوێی دونیایان پێ کەڕ کردووە سەرەڕای ئەوەی کە نالۆژیکییەو لەوانەیە لە سەردەمێکدا خرابێتە ناو ئینجیلەوە کە پێویستی کردبێت مەسیحییەکان دەسەمۆ بکرێن بۆ دەسەڵاتداران، شتێکە قابیلی بەرپاکردن نییەو پێناچێ بە درێژایی مێژووی مەسیحییەت کەسێك بەرپای کردبێت هەر لە سادەترین مەسیحییەوە تا گەورەترین قەشە.

ئەمە جگە لەوەی کە چەندین دەق هەیە لە خودی ئینجیلدا کە هانی کوشتن دەدات و ئەو موژدەدەرانە دەیشارنەوەو نایخەنە روو، عەهدی کۆنیش کە بریتییە لە تەورات و سیفری پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل: کە پێش عیسا هاتوون و بریتین لە بنەمای تەشریعی بۆ مەسیحییەت وەکو حەزرەتی عیسا خۆی دەفەرموێت: نەهاتووم بۆ رووخاندنی نامووس (واتە تەورات) بەڵکو هاتووم بۆ تەواوکردنی تەورات، چەندین دەقی تێدایە کە هانی کوشتن و لەناوبردنی گەلانی تر دەدات کە لەمەودوا ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین.

لەگەڵ ئەم راستییانەدا خەڵکیی وا دەزانن ئایینی مەسیحی ئایینی ئاشتی و لێبوردن و خۆشەویستییەو ئایینی ئیسلام کە دەیان دەقی قورئان و فەرمودەی تێدایە لەسەر هاندانی ئاشتی و لێبوردەیی و خۆشەویستی، ئایینی تیرۆر و شەڕو کوشتنە!.

ئەوانەی کە باسی مەسیحییەت دەکەن کە گوایە ئایینی ئاشتییە و باسی ئیسلام دەکەن کە گوایە ئایینی شەڕو توندوتیژییە میتۆد (مەنهەج)ێکی زۆر سەقەت دەگرنە بەر بۆ لێکۆڵینەوە، لە کاتی باس کردنی ئایینی مەسیحیدا هەموو ئەو دەقانەی عەهدی کۆن و نوێ پشتگوێ دەخەن کە باسی شەڕو بەکارهێنانی توندوتیژی دەکات و تەنها تیشك دەخەنە سەر ئەو قسە نالۆژیکییەی کە لەمەوبەر ئاماژەمان پێداو دەیانەوێت تەنها لە روانگەی ئەو قسەیەوە مەسیحییەت هەڵسەنگێنن، لە کاتی باسکردنی ئیسلامدا ئەو هەموو دەقەی باسی لێبوردن و چاوپۆشی دەکات و ئەو هەموو هەڵوێستە کردەییەی پێغەمبەرو هاوەڵانی پشتگوێ دەخەن و تەنها تیشك دەخەنە سەر ئەو دەقانەی باسی شەڕو هانی جیهاد دەدات و بەوە دەگەنە دەرئەنجامێکی هەڵە دەربارەی هەردوو ئایینەکە، یەکەمیان بە هەڵە بە ئایینی ئاشتی ناوزەد دەکەن و دووەمیشیان بە هەڵە بە ئایینی شەڕو توندوتیژیی.

پێش ئەوەی ئاماژە بەو ئایەتانە بدەم کە باسی چاوپۆشی و لێبوردەیی و دان بەخۆدا گرتن دەدات پێم باشە هەندێك راستی دەربارەی ئەوروپاو ئەمریکای مەسیحی بخەمە بەرچاوی خوێنەر:

خوێنەری بەڕێز ئایا تا ئێستا ئەو پرسیارەت لە خۆت کردووە کە بۆچی ئەوروپا بتپەرستی تێدا نییە لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەتی رۆمانی دەوڵەتێکی بتپەرست بوون؟ ئایا پرسیوتە چۆن هەموو ئەوروپا بە جارێك بوون بە مەسیحی؟ ئەگەر بچی وەڵامی ئەو پرسیارە وەرگریتەوە ئەو کاتە خۆت دەزانی کە مەسیحییەکان چەند دوور بوون لە لێبوردەیی و ئاشتیخوازی و چەند رێزیان لە بیروباوەڕی خەڵکی ناوە ؟!

نەکەی باسی ئەمڕۆی ئەوروپام بۆ بکەیت و بڵێی ئەوەتا هەموو ئایینەکانی تێدایەو خەڵکیی ئازادن لە هەڵبژاردنی ئایینی خۆیاندا، ئەمە ئازایەتی مەسیحییەت نییە بەڵکو یەکێکە لە دەسکەوتەکانی عەلمانیەتی ئەورووپی و دوای لاوازبوونی دەسەڵاتی کەنیسە هاتە کایەوە، من دەمەوێت بگەڕێیتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی کەنیسە کە نوێنەرو دەمڕاستی مەسیحییەتە. بۆ ئەو سەردەمەی کە یەکەم پاشای رۆمی بوو بە مەسیحی و ببینی مەسیحییەکان چییان کرد لە بتپەرستان و شوێنکەوتووی ئایینەکانی تر.

هەروەها لە خۆت بپرسی چۆن ئیسپانیا دوای هەشت سەدە لە دەسەڵاتی ئیسلام یەك موسڵمانی تێدا نەما لە کاتێکدا کە ژمارەی ئەو ئیسپانییانەی موسڵمان بووبوون بە ملیۆنەها کەس دەخەملێنران. ئەگەر وەڵامەکەی بخوێنیتەوە ئەو کاتە دەزانی شوێنکەوتووانی ئایینی مەسیحی چەند دوور بوون لە ئاشتی و لێبووردەییەوە و چەند دڕندانە لەگەڵ شوێنکەوتووی ئایینەکانی تردا جووڵاونەتەوە.

ئایا هیچت دەربارەی دادگاکانی پشکنین خوێندۆتەوە کە چۆن پیاوانی کەنیسە دادگایان دادەنا بۆ ئەو مەسیحییانەی دەیانویست دەست لە ئایینی مەسیحیی هەڵگرن؟

ئەگەر هەموو ئەوانەت نەیستبێت خۆ شەڕی خاچپەرستەکانت بیستووە، ئایا نەتپرسیوە ئەو شەڕانە بە ناوی چی و لە پێناوی چی و بە رابەرایەتی پیرۆزبایی کێ کرایە سەر شام و میسر و ماوەی دووسەد ساڵ کوشتارو خوێنرێژییان کرد لەو وڵاتانەداو دەیان و سەدان شارو دێیان وێران کرد ؟!

ناڵێم ئەو مێژووە بخوێنەرەوە کە موسڵمانان نووسیویانە بەڵکو ئەوانەی کە رۆژئاواییەکان خۆیان نووسیویانەو ئەو کاتە نهێنی ئەو قسانەت بۆ دەردەکەوێت کە ئەو بیرمەندو مێژوونووسە رۆژئاواییانە نووسیویانە لە مەدح و ستایشی ئیسلام و لەشکری ئیسلامدا.

ئێستا رەنگە بە لاتەوە سەیر بێت ئەو نووسەرە رۆژئاواییانە چۆن ئەو شتانەیان وتووە دەربارەی ئیسلام، چونکە تەنها ئەوە دەبیستی دەربارەی ئیسلام کە ئایینی توندوتیژی و خوێنرێژییە و دەربارەی ئەوروپاو ئایینی مەسیحیش ئەوە دەبیستی کە ئایینی ئاشتی و شوێنی دەسەبەر کردنی مافی مرۆڤە، بەڵام ئەگەر بچی مێژووی ئەو سەردەمەی ئەوروپا بخوێنیتەوە ئەو کاتە بە ئاسانی تێدەگەیت بۆچی ئەو نووسەرانە ئەو قسانەیانە کردووە.

نازانم ئەو موژدەدەرانەی بە سەر پشتی دەبابەو زرێپۆشەوە هاتوون بۆ وڵاتە ئیسلامییەکان بۆ ئەوەی موژدە بە ئایینی مەسیحی بدەن چۆن قسەیان بۆ دێت و چۆن دەتوانن شتێك بڵێن کە باوەڕیان پێی نییە یا پێچەوانەی قەناعەتیانە ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ئاماژە بە هەندێك لە دەقەکانی قورئان بدەین کە سەرەکیترین دەستووری موسڵمانانە و بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەم دەقانەو ئەو دەقە ناڵۆژیکییانەی لە ئینجیلدا هاتوون:

1. **"وإن تعفوا و تصفحوا فإن الله غفور رحيم" تغابن 14**، واتە: ئەگەر ببورن و چاوپۆشی بکەن ئەوا خوا لێبوردەو بەبەزەییە، واتە ئەویش لێیان خۆش دەبێت و لە ئێوەش خۆش دەبێت.

2.**"وهُدوا الى الطيب من القول وهُدوا الى صراط الحميد" الحج 24**، واتە: بڕواداران رێنمایی کراون بۆ وتنی قسەی بەکەڵك و جوان و بۆ رێگەی خوای ستایشکراو.

3.**"وليعفوا وليصفحوا ألا تحبون أن يغفر الله لكم " نور 22**، واتە با لەوانەی خراپەیان بەرامبەر دەکەن ببورن و چاوپۆشییان لێبکەن، ئایا ئێوە حەز ناکەن خوا لێتان خۆش بێت ؟ واتە ئەگەر ئێوە لە خەڵکیی خۆش بن خواش لە ئێوە خۆش دەبێت.

4.**" ولا تزال تطلع على خائنة منهم الاّ قليلا منهم فاعف واصفح ان الله يحب المحسنين "مائدة 13**، واتە: بەردەوام دەبینی زۆربەیان (واتە بەنی ئیسرائیل) خیانەتکارو دوژمنکارن، مەگەر کەمێکیان نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا قەیناکات هەر لێیان خۆش ببەو چاوپۆشییان لێ بکە، خوا چاکەکارانی خۆش دەوێت.

**5."وقيله يا رب ان هؤلاء قوم لا يؤمنون فاصفح عنهم وقل سلام فسوف يعلمون "زخرف 89**، واتە: سوێند بەو قسەیەی پێغەمبەر کە وتی: پەروەردگارا، ئەمانە کۆمەڵێکن باوەڕ ناهێنن، تۆش ئەی موحەممەد چاوپۆشییان لێ بکە و لێیان ببورە، سەرئەنجام بۆیان دەردەکەوێت کە تۆ لەسەر راستییت. بڕوانە لێرەدا تەنانەت بەرامبەر ئەوانەی، کە باوەڕ ناهێنن خوا فەرمان لە چاوپۆشی لێبوردەیی دەدات چ جای خەڵکانی تر.

**6."وما خلقنا السموات والأرض وما بينهما الاّ بالحق وان الساعة لآتية فاصفح الصفح الجميل"**حجر 85، واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیاندا هەیە بە حەق و رەوا دروست کردووە و رۆژی دواییش بەرێوەیەو دێت، تۆش بە شێوازێکی جوان چاوپۆشی بکە.

7.**"ودّ كثير من أهل الكتاب لو يردوكم من بعد ايمانكم كفاراً حسداً من عند أنفسهم من بعد ماتبين لهم الحق، فاعفوا واصفحوا حتى يأتي الله بأمره، ان الله على كل شيء قدير" البقرة 109**. واتە: زۆرێك لە ئەهلی کیتاب (گاورو جولەکە) لەبەر حەسادەتی خۆیان حەز دەکەن بتانگێڕنەوە لە ئایینەکەتان دوای ئەوەی کە راستییان بۆ دەرکەوت (کە نێردراوی

خوای)، جا ئێوه لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن تا خوا بڕیاری خۆی بەجێ دێنێ. بڕوانە لێرەدا سورەتەکە لە مەدینە دابەزیوەو فەرمان بە موسڵمانان دەدات چاوپۆشی لەو جولەکەو گاورانە بکەن لێیان خۆش بن کە حەسادەتیان پێ دەبەن و هەوڵی هەڵگێڕانەوەیان لە ئیسلام دەدەن!

8."**والذين يجتنبون كبائر الأثم والفواحش واذا ما غضبوا هم يغفرون. والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة ومما رزقناهم ينفقون. والذين اذا اصابهم البغي هم ينتصرون. وجزاء سيئة سيئة مثلها، فمن عفا وأصلح فأجره على الله، انه لايحب الظالمين.ولمن انتصر بعد ظلمه فأولئك ما عليهم من سبيل، انما السبيل على الذين يظلمون الناس ويبغون في الأرض بغير الحق، اولئك لهم عذاب اليم. ولمن صبر وغفر ان ذلك لمن عزم الامور."**الشورى 37-43

ئەم چەند ئایەتە بە تەواوی واقعییەتی ڕێنماییەکانی ئیسلام دەردەخات بە پێچەوانەی ڕێنماییەکانی مەسیحییەتەوە کە ئەوپەڕی ناواقعی و نالۆژیکین. لێرەدا ستەم و ناڕەوایی کردن بەرامبەر بە خەڵك حەرام دەکات، بەڵام ڕێگە بە تۆڵەسەندنەوە دەدات بە مەرجی ستەم و زیادەڕەوی نەکردن و لە سنوور دەرنەچوون، لەوەش باشتر بە لایەوە لێبوردن و چاوپۆشییە و بەڵێنی پاداشتی گەورە دەدات بەو کەسانەی کە لێبوردەن و چاوپۆشی دەکەن و ستایشی لێبوردەیی دەکات.

**9."وأن تعفوا أقرب للتقوى، ولا تنسوا الفضل بينكم" البقرة237**، واتە: چاوپۆشی و لێبوردنتان لە مافی خۆتان لە پارێزکارییەوە نزیکترە و چاکەی نێوان یەکتر فەرامۆش مەکەن.

**10." لايحب الله الجهر بالسوء الاّ من ظلم وكان الله سميعاً عليما .ان تبدوا خيراً أو تخفوه أو تعفواعن سوء فان الله كان عفواً قديراً."النساء 148–149**واتە: خوا پێی خۆش نییە ئاشکرا کردنی قسەی نابەجێ و خراپ مەگەر کەسێك ستەمی لێ کرابێت، بۆی هەیە ئەو ستەم و خراپەیە ئاشکرا بکات، خوا بە هەمیشەیی بیسەر و زانایە. ئەگەر خێرو چاکە بە ئاشکرا بکەن یا بیشارنەوە، یا چاوپۆشی لە خراپەیەك بکەن کە بەرامبەرتان دەکرێت ئەوا خوا لێبوردەو بەتوانایە، واتە لێتان خۆش دەبێت و پاداشتتان دەداتەوە.

**11." وسارعوا الى مغفرة من ربكم وجنة عرضها السموات والأرض أُعدت للمتقين.الذين ينفقون في السراء والضراء والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس والله يحب المحسنين"آل** عمران134.واتە: پێشبڕکێ بکەن بۆ بەدەستهێنانی لێبوردنێکی گەورە لە لایەن پەروەردگارتانەوەو بەهەشتێك کە پانییەکەی بە ئەندازەی زەوی و ئاسمانەکانە، کە ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران، ئەوانەی ماڵ دەبەخشنەوە لە ڕێی خوادا لە خۆشی و ناخۆشیدا ڕقی خۆیان دەخۆنەوەو لە خەڵکی خۆش دەبن. خواش چاکەکارانی خۆش دەوێت.

**12."قل للذين آمنوا يغفروا للذين لا يرجون أيام الله ليجزى قوماً بما كانوا يكسبون"الجاثية14.** واتە: بڵێ بەوانەی بڕوایان هێناوە ببورن لەوانەی بە تەمای ڕۆژەکانی خوا نین (بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە) تاوەکو خوا خۆی پاداشتی خەڵکی بداتەوە لەسەر ئەوەی کردوویانە.

**13."وعباد الرحمن الذين يمشون على الأرض هوناً واذا خاطبهم الجاهلون قالوا سلاما" الفرقان 63**، واتە: بەندە چاکەکانی خوا ئەوانەن کە بە هێمنی و لەسەرخۆیی و بێ فیز بە سەر زەویدا دەڕۆن ئەگەر نەفامەکان بە شێوازی ناشیرین لەگەڵیان بدوێن دەڵێن سڵاوتان لێ بێت (وەڵامی جنێوو قسە ناشیرینەکانیان نادەنەوە).

ئەمانە هەندێك بوون لە ڕێنماییەکانی قورئان دەربارەی لێبوردەیی و چاوپۆشی، هەندێکیان لە مەککە دابەزیون کە سەردەمی لاوازی بوو، هەندێکیشیان لە مەدینە کە سەردەمی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی بوو، هەندێکیان فەرمان بە لێبوردەیی و چاوپۆشی دەدات لە نێوان موسڵماناندا، هەندێکیشیان بەرامبەر بێباوەڕو گاورو جوولەکە. پێغەمبەریش دەیان فەرمودەی هەیە لە سەر ئەم مەسەلەیە، ئەگەر هەمووشی نەبێت زۆربەی هەرە زۆری هی سەردەمی مەدینەیە، ژیانیشی پڕە لە نموونەی کردەیی، شوێنکەوتووانی پێغەمبەریش بە جوانترین شێوە بەرپایان کردبوو لە کاتی شەڕو ئاشتیشدا، هەر

ئەمەش بوو پاڵی بە رۆژهەڵاتناسەکانەوە نابوو ئەو هەموو ستایشەی ئیسلام و سوپای ئیسلام بکەن و لەشکری عەرەب بە بەزەییترین لەشکر لە قەڵەم بدەن.

## تێڕوانینی ئیسلام بۆ مرۆڤ

پێش ئەوەی باسی هەڵوێستی ئیسلام لە مەسەلە جۆراوجۆرەکان بکرێت، کە پەیوەندییی بە مرۆڤەوە هەیە پێویستە باسی تێڕوانینی ئیسلام بکرێت بۆ خودی مرۆڤ و لەوێوە بچینە سەر باسەکانی تر:

ئایەتو فەرموودە زۆرن لەسەر پلەو پایەی مرۆڤ و چۆنێتی بەدیهێنانیو ئەرکو مافەکانیوئەو وەزیفەیەی پێی سپێردراوە لە ژیاندا، کە هەموو رێزو گەورەییو تایبەتمەندێتیی مرۆڤو گەورەیی رۆڵی لە ژیانداو پیرۆزی وەزیفەکەی دەردەخات، کە ناکرێت لێرەدا هەموویان بێنینەوە، بەڵام ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین کە بەس بێتبۆ نیشاندانی وێنەیەکی روون دەربارەی ئەو چەمکانەی سەرەوە:

خوای گەورە لەسەر رێزی مرۆڤو پلەو پایەی دەفەرموێت: (**وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً**) (**الإسراء: 70**)، واتە: بە راستیی ئێمە رێزمان ناوە لە نەوەکانی ئادەمو هەڵمانگرتوون لە وشکانیو دەریادا (واتە هۆی نیشتەجیٚو هاتوچۆمان تێیاندا بۆ ئاسانکردووە) و رۆزیمان پیٚ داون لە هەموو شتە باشو بە کەڵکەکان و باوێکی زۆرمان داون بە سەر زۆربەی ئەوانەی بەدیمان هێناوە.

دەربارەی سەرچاوەی بەدیهێنانی مرۆڤیش خوای گەورە تا راددەیەك بە درێژی باسی دەکات کە بە شێوەیەکی تایبەت و لە رێورەسمێکی زۆر شکۆداردا بەدیهێنراوە، لە مەلەکوتی باڵادا کە هەموو مەلائیکە نزیکەکانی خوای بۆ بانگهێشت کراوەو لە رۆحی خوا فوی پێدا کراوەو پاشان فەرمان دراوە بەو فریشتانە سوجدەی پیرۆزبایی لێکردنی بۆ ببەنو لەبەر سەرپێچی کردنی گەورەی جنۆکەکان کە (ابلیس)ە کە لە ئەنجامی حەسادەتو خۆ بە باشترزانینیو خۆ بەزلزانینیندا سوجدەی بۆ ئادەم نەبرد، لە پلەو پایەی هێنرایە خوارەوەو دەرکرا لە ریزی مەلائیکەکانو نەفرەتی لێکراو پاشان ئادەمیش دوای ئەوەی خوا هاوەڵێکی لە پەراسووی لای چەپی خۆی بۆ دروست کردو خستنیە بەهەشتو فەرمانی پێدان کە بە ئارەزووی خۆیان بخۆنو بگەرێن لە بەهەشتداو ئاگاداری کردنەوە لەو هەرِشەیەی ئیبلیس لێی کردوونو ئاگاداری کردنەوە لەوەی نزیك یەکێك لە درەختەکان نەکەونەوە ئەگینا دەردەکرێن لە بەهەشت، پاشان خوا بە فریشتەکانی فەرموو دەمەویٚ جێنشینیٚ بۆ سەرزەوی دابنێم فریشتەکان لە ئەنجامی زانینی سروشتی ئادەم کە خوا پێی راگەیاندبوون یان لە ئەنجامی ئەزموونیان لەگەڵ ئەوانەی پێش ئادەم لەسەر زەوی بوونو ستەمو خوێنرێژییان کردبوو لە خوایان پرسی کە چۆن جێنشینێك بۆ سەرزەوی دادەنێی کە خەریکی خوێنرێژیو فەساد و خراپەکاریو تێکدان بێت، خوا پێی فەرموونئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن، ئەوە بوو هەندێك شتی فێری ئادەم کردو پاشان کۆی کردنەوەو بە مەلائیکەکانی فەرموو ناوی ئەم شتانەم پیٚ بڵێن، ئەوانیش وتیان پاکیی رەها بۆ تۆیە ئێمە شتێك تۆ فێرت نەکردبین نایزانین، پاشان بە ئادەمی فەرموو ئادەی ناوی ئەو شتانەیان پیٚ بڵیٚ، کاتێك ئادەم ناوی ئەو شتانەی پیٚ وتن خوا پێی فەرموون نەمگوت ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

ئەوەبوو لەو بەهەشتەی خوا ئادەمو حەوای تێدا دانابوو وە ئاگاداری کردبوونەوە لەوەی کە ئیبلیس هەرِشەی لێکردوونو داوای لێکردبوون وریای خۆیان بن فریویان نەدات، ئەوە بوو ئیبلیس توانی فریویان بداتو لە ئەنجامدا هەردوو هێنرانە سەر زەویو لەوێدا گەشتی ژیانیان دەستی پێکردو وەزیفەکەیان لەسەر زەوی بۆ دیاری کرا، کە لە دواییدا باسی دەکەین.

ئەمە بە کورتی چیرۆکی بەدیهێنانی مرۆڤو هاتنیان بۆ سەر زەوی، ئێستاش با هەندێك لەو ئایەتانەی لەم شتە دەدوێن بێنینەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِّن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ**) (**الحجر: 28 ـ 40**).
(**إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً من طِينٍ* فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ* فَسَجَدَ الْمَلائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ* إِلاَّ إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ* قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ**

مِنَ الْعَالِينَ* قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ* قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ* وَإِنَّ عَلَيكَ لَعْنَتِي إِلَى يَوْمِ الدِّينِ* قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ* قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ* إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ* قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ* إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ* قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ* لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ) (ص: 70 ـ 85).

(وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ* وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَـؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ* قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ* قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ) (البقرة: **30 ـ 33**).

لەم كۆمەڵە ئايەتەدا چەند مەسەلەیەك هەیە پێویستە روونی بكەینەوە:

1ـ بەدیهێنانی یەكەم مرۆڤ بە تایبەتی بووەو خوا بە دەستی خۆی لە قوڕێكی رەش دروستی كردووە.

2ـ لە رێورەسمێكی زۆر شكۆمەندی پیرۆزدا لە مەلەكوتی باڵا ئاهەنگی دەستپێكردنی ژیانی دونیای یەكەم مرۆڤ دەستی پێكردووە، بە فوو پێداكردنی لە لایەن خواوەندەوە لە رۆحی خۆی ئەو دروستكراوە {لەش بە تووك داننەپۆشراوە (بشر)} رێزدار بووەو مەلائیكە نزیكەكان سوجدەی پیرۆزباییان بۆ بردووەو پاشان بڕیاری جێنشینی ئەو لەسەر زەوی دراوەو ئەركی بنیاتنانو ئاوەدانكردنەوەی زەوی پێدراوەو هەرچی لە دەوروبەریدا هەیە لە ئاسمانو زەویدا كە بۆ ئەنجامدانی ئەركەكەی پێویستە خراوەتە ژێر دەسەڵاتییەوەو پاشان پڕچەك كراوە بەو كەرەسانەی كە لە رێگەیەوە دەتوانێت بەو كارە هەڵسێت وەكو عەقڵو توانای فێربوونو بینینو بیستنو دەسەڵاتو.. هتد، هەر ئەو فووەش ئەو توانایەی تێدا دروست كردووە كە بتوانی پەیوەندیی بە بەدیهێنەرەكەیەوە بكات، كە خوایە.

3ـ ئەم پێكهاتە دوورەگەزییەی مرۆڤ: قوڕێكی رەشی بۆگەنو فوو لە رۆحی خوا سروشتی ئەركەكانی مرۆڤـو پلەو پایەی دیاریی دەكات، سروشتە زەوییەكەی رایدەكێشێت بۆ لای زەویو سروشتی ئەوانەی لەسەر زەوی دەژین كە بریتین لە غەریزەكانی خواردنو سێكسو مانەوەو خۆشویستنی ژیانو.. هتد، لەگەڵ هەموو گیانلەبەرانی سەرزەویدا بەشدارە.

رەگەزی دووەمیش كە ئەو فووەیە خواوەند لە رۆحی خۆیەوە تێی كردووە، مرۆڤ رادەكێشێت بەرەو مەلەكوتی باڵاو نزیكی دەكاتەوە لە سروشتی ئەوانەی لەو مەلەكوتەدا دەژینو مانای ئینسانییەتو مرۆڤایەتییەكەی لەوێوە بە دەست دێنێتو جیا دەبێتەوە لەوانەی لەسەر زەویی دەژین.

جا هەر كاتێك مرۆڤ پەیوەندیی خۆی لەگەڵ پەروەردگاریدا پچڕی ئەوە سیفەتە زەمینەییەكەی بەسەریدا زاڵ دەبێت، رەوشتو بیركردنەوەو دەروونی لەو ئاژەڵانە نزمتر دەبێتەوە كە لەگەڵیدا دەژین، چونكە پێكهاتەی ئەم لە قوڕێكی بۆگەنە، ئەوكاتە ئەو بۆگەنییە زاڵ دەبێت بە سەریداو لە هەموو بوارەكانی ژیانیدا رەنگدەداتەوە، لە بیركردنەوەیو رەفتاریو ئاكاریو دەروونی.. هتد.

ئەوكاتە ئەگەر ئاژەڵ سێكس بۆ هێشتنەوەی رەگەزی خۆی ئەنجام بدات و زۆرێكیان بەدزییەوە بیكەنو لە زۆرێكیشیاندا نیمچە خێزانێك پێك دێنن، مرۆڤ لەو نزمتر دەبێتەوەو بە ئاشكرا ئەنجامی دەداتو بە تێكەڵیو بێ گوێدانە خێزانو ژنو مێردایەتی.

ئەگەر ئاژەڵ تەنها بۆ مانەوەی خۆیو زاڵبوون بەسەر برسێتیدا یەكتری دەكوژن مرۆڤ زیادەڕەوییەكی بێ سنوور دەكات لە كوشتنداو زۆرجار تەنها لەبەر شەهوەتی كوشتن خەڵكیی دەكوژێت، بە كورتی لە ئاژەڵ نەزانترو دڕندەتر دەبێتەوە، وەكو خوا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيراً مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ) (الأعراف: **179**).

(أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلاَّ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً) (الفرقان: 44).

به پێچەوانەشەوە کاتێك پەیوەندیی بکات بە خواوە مانا مرۆڤایەتییەکەی زیاتر تێدا ڕەنگ دەداتەوە سیفەتە مەلائیکییەکە زاڵ دەبێت بە سەریدا.

4ـ لەبەر خاتری مرۆڤ ئیبلیس نەفرەتی لێدەکرێت، چونکە ئامادە نییە سوجدەی بۆ ببات و لە ئەنجامدا ئەو پلەو پایەی هەیەتی لە دەستی دەدات‌و لەوێشەوە ئاڵای دژایەتی کردنی ئادەم‌و نەوەکانی هەڵدەکات‌و هێزەکانی شەڕ دەردەکەون‌و بڕیاری بەگژداچوونەوەی هێزەکانی خێرو چاکە دەدەن.

5ـ خوا بڕیاری داوە کە ئەم مرۆڤە بکاتە جێنشینی سەر زەوی، بەڵام لە سەرەتاوە دەیخاتە بەهەشت‌و هاوسەرێکی بۆ بەدیدەهێنێت لە پەراسووی چەپی، ئەو پەراسووانەی کە بە سەر دڵەوەن، بۆ هاودەمی‌و دەست پێکردنی گەشتی ژیان پێکەوە، هەر لەبەر ئەوەشە ئەم دووە ئەوەندە مەیلیان بۆ یەکتر هەیە، چونکە بەشێکن لە یەکترو تەواوکەری یەکترن‌و هەر بانگەشەیەك بۆ لەیەك جیاکردنەوەیان یان بەگژیەکتردادانیان خیانەتە لێیان.

6ـ هێزی خراپە کە ئیبلیسە دەتوانێ بەفرۆفێڵی خۆی ئادەم‌و خێزانەکەی لە خشتە ببات، بەوەی کە وایان لێبکات لەو دارە بخۆن کە خوا لێی قەدەغە کردبوون، بە بیانووی ئەوەی، کە گوایە ئەو دارە داری نەمرییە، ئەگەر بیخۆن ئەوا هەتا هەتایە دەژین، ئەوانیش بەو قسەیەی هەڵدەخەڵەتێن، چونکە ئەو سوێندیان بۆ دەخوات کە ڕاستیان لەگەڵ دەکات، (**وَقَاسَمَهُمَا إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ النَّاصِحِينَ**) (**الأعراف**: 21).

ئەوەبوو لە ئەنجامدا لێیان خواردو عەورەتیان کەوتە دەرن ئەوکات بە پەلە دەستیان کرد بە داپۆشینی خۆیان‌و هەستیان بە هەڵەکەیان کردو هەر لەوێدا ئادەم داوای لێبوردنی کردو خوا لێی خۆشبوو، پاشان لە سزای ئەوە دایبەزاندنە سەر زەوی‌و فەرمووی دابەزنە سەر زەوی‌و لەوێدا دەبنە دوژمنی یەك لەگەڵ ئیبلیس‌و نەوەکەیداو منیش کەسانێکتان بۆ دەنێرم ڕێنموونیتان بکات، هەرکەسێك پشتی تێ بکات‌و شوێنی ئیبلیس بکەوێت ئەوا دەیخەینە دۆزەخ. ئەم ڕووداوە بۆ ئەوە بووە، کە پڕ چەك بکرێن بەرامبەر بەو هێزی شەڕە بۆ ئەوەی جارێکی تر نە خۆیان، نە نەوەکانیان فریویان پێ نەخۆن و بە ئەزموونێکەوە بێنە سەر زەوی: (**يَا بَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَاتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاء لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ**) (**الأعراف**: 27).

ئەم چیرۆکە لە چەند شوێنێکی قورئاندا باسکراوە، لە زۆربەیاندا ئاماژە بەوە دەکات، کە شەیتان هەردووکیانی فریو داوە و لە شوێنێکیشدا لە سورەتی (**طە**) باسی ئەوە کە ئیبلیس ئادەمی فریوداوە، (**فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لا يَبْلَى**) (**طە**: 120).

لە هیچ شوێنێکی قورئاندا نەهاتووە، کە ئیبلیس لە ڕێگەی حەواوە ئادەمی فریو دابێت، ئەمە یەك، دووەمیش لە هەندێك شوێندا هاتووە کە هەردووکیان داوای لێبوردن لە خوا دەکەن، لە هەندێ شوێنی تردا تەنها ئادەم داوای لێبوردن دەکات، وەکو ئەوەی قورئان لێپرسراوێتییەکە هەمووی بخاتە ئەستۆی ئادەم بە تەنیا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە وەکو لە ئایەتەکەی سورەتی (**طە**)دا هاتووە سەرەتا شەیتان ئادەمی فریو داوەو ئەویش بۆتە هۆی فریودانی حەوا نەك بە پێچەوانەوە، ئەمەش ڕێك پێچەوانەی تەورات‌و قسەی جولەکەکانە، کە بە هۆیەوە ئافرەتیان بە هێمای شەڕو خراپە زانیوە، خوا دەفەرموێت: (**وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً**) (**طە**: 115). واتە: پێشتر وەسیەتمان کرد بۆ ئادەم (کە لەو دارە نەخوا) لە بیری کردو خۆی پێ نەگیرا.

پاشان دەفەرموێت: (..**وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى**)، واتە: ئادەم سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوا کردو بەوە لە ڕێی ڕاست لایدا. ئینجا دەفەرموێت: (**ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَى**) (**طە**: 122). پاشان خوا هەڵیبژارد بۆ پێغەمبەرایەتی‌و لێی خۆشبوو خستییە سەر ڕێی ڕاست.

سێهەمیش ئەوەیە کە قورئان هەر لەم سورەتەدا باسی ئەوە دەکات کە ئەگەر بێت‌و ئەو دارە بخۆن ئەوا ئادەم تووشی دەردەسەری‌و ناڕەحەتیی دەبێت (..**فَلا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى**)، ئەویش بەوەی هەوڵی بژێوی پەیداکردن‌و بەرگری لە

خۆی و لەوانەی لەگەڵیدان بە زۆری دەکەوێتە ئەستۆی ئادەمو نەوە نێرینەکانی، گەر ژنان بە فرۆفێڵی پیاو خۆیان تووشی ئەو سەرئێشەیە نەکەن کە پیاوان تووشی بوون ئەوا زۆربەی دەردەسەرییەکان براوەتەوە بەشی نێرینە.

7ـ پاش ئەوەی کە مرۆڤ هێنرایە سەر زەوی و پرچەك کرا بەو کەرەسانەی کە بتوانێ زەوی ئاوەدان بکاتەوەو بنیاتی بنێت پشتگوێ نەخراو فەرامۆش نەکرا، بەڵکو خوا پەیتا پەیتا کەسانێکی لە خۆیانی لێ هەڵبژاردوون بۆ ئەوەی ڕێنماییان بکاتو ڕێگای خێرو شەڕو چاکەو خراپەیان بۆ لێك جیابکاتەوەو ئاڕاستەیان بکات چۆن ئەو وزەو توانایەیان هەیە لە ڕێگەی چاکەو چاکەسازیداو بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤایەتی بەکاری بهێنین.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە وەڵامی پرسیارە سەرەکییەکانیان بداتە کە چۆن بەدیهاتوونو کێ بەدیهێناونو بۆچی بەدیهێناونو پەیوەندیی نێوان ئەوانو بەدیهێنەرەکەیان چییەو چۆنە دەرئەنجامیان بۆ کوێیە. هەروەها چیرۆکی یەکەم مرۆڤیان بۆ باس بکاتو لەگەڵ ئەو شتانەی ڕوویداو چۆنێتی هاتنیان بۆ سەرزەوی و ئەو پلانەی هێزی خراپە بۆی داناون بۆ دوورخستنەوەیان لە پەروەردگاریانو مەحروم کردنیان لەو بەهەشتەی کە باوەگەورەیانی لێ دەرکرا، پێیان ڕابگەیەنێت کە ژیانی سەرزەوی کاتییەو ژیانی ڕاستەقینەو نەبڕاوە وا لە بەهەشتدا (**وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ**).

جا لەبەر ئەوەی کە ژیانی ڕاستەقینە لە بەهەشتدایەو ژیانی سەر ئەم زەوییە کاتییە خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە لەو ژیانە ڕاستەقینە نەبڕاوەیەو ڕێگەی بەدەست هێنانیشیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە خوا خۆی دیاریی کردووە کە ئەویش بریتییە لە ناسینو پەرستنی خواو پابەند بوون بەو ڕێنماییانەی بۆی ناردوون لەگەڵ پێغەمبەراندا.

کەواتە خوا هۆیەکانی بنیاتنانو ئاوەدانکردنەوەی ئەم زەوییەی بۆ مرۆڤ فەراهەم هێناوە کە وەکو پێشتر وتمان بریتییە لە عەقڵو توانای فێربوونو دەسەڵاتو توانای ئاخاوتنو بینینو بیستنو توانای بیرکردنەوەو.. هتد. شتە پێویستەکانی دەوروبەریشی خستۆتە ژێر دەسەڵاتییەوە، پاشان ڕێنمایی کردووە چۆن بۆ خێرو بەرژەوەندیی خۆی بەکاریان بهێنێت، هەروەها هۆیەکانی بەدەستهێنانی بەهەشتیشی بۆ دیاری کردووە کە بریتییە لە خواناسی و گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی. هەر وەکو لەمەوبەر وتمان لەبەر ئەوەی ژیانی دوارۆژ گرنگترو درێژترە بایەخی زیاتری بەو داوەو پێغەمبەران زیاتر مەبەستیان ڕۆشنکردنەوەی ڕێگەی گەیشتن بەو ژیانە بووە. بۆ ئەوەی خەڵکیی سەریان لێ نەشێوێتو باوەڕ بکەن بە پێغەمبەران نێردراوی خوان، هەندێك نیشانەی لەگەڵدا ناردوون بۆ ئەوەی بەڵگە بێت لەسەر ڕاستگۆییان، هەریەکەو بە گوێرەی ئەقڵییەتو تێگەیشتنی ئەو سەردەمەی کە تێیدا هاتووە، دوا پێغەمبەریش کە (**محمد**)ە ﷺ، بڕیارە کۆتا پێغەمبەر بێت بۆ مرۆڤایەتی خوا شتێکی لەگەڵدا ناردووە کە هەتا هەتایە بەڵگە بێت لەسەر ڕاستگۆییەکەی، کە ئەویش قورئانی پیرۆزەو پەیمانیشی داوە کە نەهێڵێت گۆڕانکاریی بەسەردا بێت.

لێرەوەو لە ڕوانگەی قورئانەوە وەزیفەی مرۆڤایەتی بۆ باس دەکرێت کە یەکەم بریتییە لە ناسینی خواو پابەندبوون بە فەرمانەکانیەوە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی هەمیشەیی لە بەهەشتدا بە پلەی یەکەم و لەم دونیایەی سەرزەویشدا بە پلەی دووەم لە ڕێگەی ئەو ڕێنماییانەی کە کردونی بۆ بەکارهێنانی وزەو تواناکانمان لە ڕێگەی خێرو چاکەسازیدا.

دووەمیش بریتییە لە بنیاتنانو ئاوەدانکردنەوەی زەوی، (**وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ**) (**هود: 61**).

چیرۆکی پێغەمبەران کە لە سورەتەکانی (**أعراف، طه، أنبياء، شعراء**)دا هاتووە بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەنو لەبەر دوورودرێژی نەمهێناونەتەوە، دەتوانی بۆ خۆت لە قورئاندا بۆی بگەڕێیتەوە.

بە کورتی ناردنی پێغەمبەران، یەکەم، بۆ ناساندنی خوایە بە بەندەکانی، دووەم، ناساندنی بەهەشتو ڕێگەی بەهەشتە کە جێی بەختەوەری هەمیشەییە، سێهەم، بەدەستهێنانی بەختەوەریی ئەم ژیانەی سەرزەوییە، لە ڕێگەی پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەران لە چۆنێتی بەکارهێنانی وزەو تواناکانی مرۆڤ لە بنیاتنانو ئاوەدانکردنەوەی زەویدا.

## تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئافرەت

ئێستاش دوای ئەوەی باسی پیرۆزی مرۆڤـو بەرزی پلەو پایەیمان کرد لە روانگەی ئیسلامەوە کاتی ئەوە هاتووە باسی تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئافرەت بکەین.

سەرەتا وەکو باسمان کرد حەوا لە پەراسوی لای چەپی ئادەم دروست کراوە، لێرەدا دەپرسین ئایا ئەمە هیچ نەنگییەکی تێدایە کە هەندێك ئەیانەوێت بیکەن بە تانە بەسەر ئیسلامەوە. ئەوانەی کە بڕیاریان داوە دژایەتی ئیسلام بکەنو چاکەکانی نەبینن گەر حەوا لە چاوی ئادەم یا لە دڵێشی دروست بکرایە هەر رەخنەی خۆیانیان دەگرت.

دەڵێین:

چی تێدایە گەر حەوا لە ئادەم دروست کرابێت، ئەمە چ زیانێك بە پلەو پایەی حەوا دەگەیەنێت بە تایبەت ئەگەر بزانرێت بۆ ئەوە دروست کراوە کە ببێتە تەواوکەری ئادەمو مایەی ئارامگرتنیو دڵنەواییکەر بۆی؟

ئەگەر خوا بیگوتایە حەوامان لە رەگەزێکی نزمتر لە ئادەم دروست کردووە یا بۆ خزمەتکردنی ئادەم دروست کردووە ئەوا جێی خۆی بوو قسەی لەسەر بکرێت، بەڵام کە دەبینی خوا دەفەرموێت ئادەممان دروست کردو پاشان جوتەکەیمان هەر لە خۆی دروست کرد بۆ ئەوەی ببێتە مایەی ئارامیو دڵنەوایی بۆی، ئەمە چ نەنگییەکی تێدایە؟ لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە دەفەرموێت سۆزو بەزەییشمان خستە نێوانیانەوە نەك رکابەتیو دوژمنایەتیو ململانێ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بانگەشەکەرانی مافی ئافرەت دەیڵێین: (**وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**) (**الروم: 21**).

بە راستی ئەمانە نیشانەن بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە نەك کەسانێك دوای هەواو نەفس کەوتبن!!

خۆشبەختانە قورئان بە هیچ شێوەیەك تاوانی لە خشتەبردنی ئادەمی نەخستۆتە ئەستۆی حەواوە، بەڵکو بە راشکاوی لە سورەی (**طه**)دا دەیداتە پاڵ ئادەم خۆی.

هیچ ئاماژەیەك نییە لە قورئاندا بۆ حەوا، بەڵکو ئەوە قسەی هەندێك لە راڤەکەرانە کە پێدەچی لە جوولەکەیان وەرگرتبێت، بە تایبەت ئەوانەیان کە شارەزا بوون لە تەوراتو بوون بە موسڵمان وەك (**كعب الأحبار**)ن کە ئەمیش نابێتە بەڵگەیەك بەسەر ئیسلامەوە، ئەو فەرموودەیەش کە دەڵێت حەوا لە پەراسویەکی چەوت دروست کراوە ئەویش فەرموودەیەکی لاوازەو لە قورئاندا بە هیچ شێوەیەك ئاماژەی پێ نەدراوە، بەڵکو دەفەرموێت هەر لەو نەفسە حەوا بەدیهێنراوە.

کەواتە بە کورتی گەر حەوا لە هەمان رەگەزی ئادەم دروست کرابێتو بۆ مەبەستی هاودەمیو دڵنەوایی یەکتر پەیدا بووبێتو سۆزو خۆشەویستی خرابێتە نێوانیانەوەو بەرپرس نەبێت لە هەڵەی ئادەم ئیتر ئەمە چ ئیشکالیەتێکی تێدایە؟!

ئەوەی کە عەهدی کۆن (تەورات) دەیڵێت کە گوایە حەیزی ئافرەت تۆڵەیە کە لە حەوا سەندراوەتەوە، بەڵگە یەلەسەر ئەوەی ئەو کەسەی ئەو دەستەواژەیەی نووسیوەتەوە مرۆڤەو ئەوە قسەی خوا نییە بە موسای وتبێت، چونکە ئاشکرایە لە رووی زانستییەوە حەیزی ئافرەت شتێکی فسیۆلۆژییەو پەیوەندی بە ئامادەباشی منداڵدانەوە هەیە بۆ لە خۆگرتنی هێلکەی پیتێنراو و هەر لەو ساتەوەختەی خوا حەوای دروست کردووە ئەو شتەی تێدا داناوە نەك لە تۆڵەی هەڵەیەك.

لەوانەیە دروستکردنی حەوا لە پەراسووی لای چەپی ئادەم سەدان حیکمەتی تێدا بێت بەڵام ئێمە نایزانین، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە پەراسووەکانی لای چەپ بەسەر دڵەوەن، دڵیش هەروەکو چۆن جێگای دابەشکردنی خوێنە بە لەشدا هەروەها جێگای خۆشەویستیو سۆزو بەزەییە کە لەگەڵ خوێنەکەدا بە هەموو لەشدا بڵاوی دەکاتەوە.

پێدەچێ هەر لەبەر ئەوەشە کە ژن سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستیو هەروەها بە بەردەوامی سەرچاوەی ئیلهام بووە بۆ پیاو.

لەبەر ئەوەی کە ژن بەشێکە لە پیاو، پیاو هەمیشە سۆزی بۆی هەیەو حەز دەکات بیگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، هەروەکو چۆن مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی باسی نەی دەکات کە لە قامیش دروست دەکرێت و ئەو دەنگەی دەریدەکات بریتییە لە نالّەی دڵی ئەو (نەی)ـەو مەیلی بۆ گەڕانەوەی بۆ ناو ئەو قامیشەڵانەی لێیان دابڕێنراوە، بە هەمان شێوە سۆزی ئافرەتیش بۆ پیاو یا مەیلی پیاو بۆ ژن بۆ ئەوەیە کە یەك بگرنەوەو ببنەوە یەك پارچە، لەو باوەڕەدام گەر ژن و پیاو بە جیا دروست بکرانایە بەو شێوەیە مەیلیان بۆ یەك نەدەبوو. ئەمە بە نیسبەت دروستکردنی ئافرەتەوە، ئەوەشی کە هەندێك بە سەرچاوەی شەڕی دەزانن و گوایە ئەو بووەتە هۆی فریوخواردنی ئادەم و لە بەهەشت دەرکردنی و پاشان تووشی دەردەسەری بوونی، بینیت لە قورئاندا بە هیچ شێوەیەك ئەو باسە نەکراوەو هیچ بەرپرسیارێتییەك نەخراوەتە ئەستۆی حەواو هیچ ڕۆڵێکی خراپی نەدراوەتەوە پاڵ، بە پێچەوانەوە دەبینی لە سورەتی (**طه**)دا بەرپرسیارێتییەکە بە تەنها دەداتە پاڵ ئادەم و سەرگەردان بوونەکەش دەبڕێتە بەشی ئادەم (**وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْماً**) (**طه: 115**). (**فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى**) (**طه: 117**). (**فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَا آدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لا يَبْلَى* فَأَكَلا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى**) (**طه: 120** ـ 121).

کەواتە ئەوەی لە تەورات و سەرچاوەکانی تردا هاتووە دەربارەی لێپرسراوێتی حەوا لە لەڕێدەرکردنی ئادەم، قورئان ڕەتی دەکاتەوەو دەیداتە پاڵ ئادەم، هەر فەرموودەیەکیش درابێتە پاڵ پێغەمبەر پێچەوانەی ئەمەی قورئان بێت ئەوا دیسانەوە ڕەت دەکرێتەوە.

ئەگەر تەماشای قورئان بکەین لەم سەر بۆ ئەوسەر لە یەك شوێندا نابینی سوکایەتی بۆ ئافرەت تێدا بێت، بەڵکو هەمووی بەرگرییە لێی و سنووردانانە بۆ دەسەڵاتی پیاو، هەر ئایەتێك دەبینی کە جیاوازییەك دەخاتە نێوان پیاو و ئافرەت یان لە جۆری ئەو ڕۆڵەی کە دەیبینن هەمووی هەڵقوڵاوی ئەو جیاوازییە سروشتی و بایۆلۆژی و فسیۆلۆژییەیە کە لە نێوانیاندا هەیە و هەریەکەیان کاندید دەکات بۆ ئەنجامدانی جۆرێك لە ئەرك و وەزیفە کە جیاوازە لە هی ئەوی تر، هەر وەکو چۆن ئەوەی باڵای بەرز بێت هاندەدرێت بۆ یاریی باسکەو باڵە، ئەوەی لەشی پتەوو بەهێز بێت بۆ لەشجوانی و زۆرانبازیی و هەڵگرتنی قورسایی، بە هەمان شێوە جیاوازیی پێکهاتەی لەشی ژن و پیاو هەریەکەیان کاندید دەکات بۆ ئەنجامدانی جۆرێك ئیش و بینینی جۆرە وەزیفەیەك لە ژیاندا.

ئەوانەش کە ڕەخنە لەو جیاوازییانە دەگرن و دەیانەوێت ژن و پیاو لە هەموو شتێکدا وەکو یەك بن یان نەزانن و چەواشەکراون وەیا پیاوانی چەواشەکەرن بۆ مەبەست و بەرژەوەندیی خۆیان نەك هی ئافرەت ئەو بانگەشەیە دەکەن.

دەبێ ئافرەت بەوەدا بزانێت کە فریودراوە ئەوانەی بانگەشە بۆ ئازادکردنی دەکەن خۆیان لەو هەموو جیاوازییە بایۆلۆژی و فسیۆلۆژییە گێل دەکەن و چاویان لە ئاستیان دادەخەن ئەویش تەنها بۆ ئەوەی ئەو نیازەی لەدڵیاندایە بە ئەنجامی بگەیەنن، بە پێچەوانەشەوە قورئان چونکە کتێبێکی خوایە، خواش هیچ نیازێکی بە مرۆڤ نییەو پێویستی پێی نییە لەبەر ئەوەی بەدیهێنەرو پەروەردگاریانەو ئاشنایە پێیان زۆر واقیعییانەو بە گوێرەی جیاوازییە سروشتییەکان ئەرکەکانیان دیاریی دەکات و مافەکانیان بەسەریەکەوە دەست نیشان دەکات.

ئافرەتان دەبێ بەوەدا بزانن کە پیاوانی بانگهێشتکەری ئازادیی ئافرەت درۆیان لەگەڵدا دەکەن لە گرنگی ئەو جیاوازییە سروشتیانە کەم دەکەنەوە و پەیوەندیی ئەو جیاوازییانە بە ئەرك و ڕۆڵی هەریەك لە ژن و پیاو پشتگوێ دەخەن.

لێرەدا باسی ئەو جیاوازییانە ناکەم لە بواری ئەرك و مافەکاندا، چونکە مەبەستمان تەنها ئەوەندەیە کە خوێنەر بزانێت ئافرەت لە ڕوانگەی قورئانەوە بەشێکە لەو مرۆڤەی کە ڕێزی لێگیراوەو کراوەتە جێنشینی سەر زەوی و پلەوپایەی بەرزکراوەتەوەو بە هیچ شێوەیەك بە پلە دوو یان سێ دانەنراوە، وەکو ئەوەی ناحەزانی ئیسلام پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن.

## شایەتی ڕۆژهەڵاتناسان

ڤۆلتیر لە فەرهەنگی فەلسەفەدا لەژێر ناونیشانی (وتەی قورئان)دا دەڵێ: "ئێمە زۆر شتی پڕو پوچمان دایە پاڵ قورئان، کە لە ڕاستیدا هیچێك لەو شتانەی تێدا نییە، نووسەرەکانمان کە ئەوەندە زۆر بوون دەڵێی ئینکشارییەکانن دەتوانن بە ئاسانی ئافرەتانمان بکەنە لایەنگری خۆیان لە ڕێگای قەناعەت پێکردنیان بەوەی کە موحەممەد ژنانی بە ئاژەڵی زیرەك لەقەڵەمداوەو ئەوان لە ڕوانگەی شەریعەتەوە وەکو کەنیزەکن، هیچ شتێکیان بەدەست نییە لەم دونیایەی خۆیانو هیچ بەشێکیشیان نییە لە دوارۆژیاندا (ڕۆژی قیامەت)، بەڵگە نەویستیشە کە ئەم قسەیە بەتاڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکیی باوەڕیان پێدەکرد".

ئێمە ئاگادارین کە قورئان پیاوی جیاکردۆتەوە بەو تایبەتمەندییەی کە لە سروشتەوە پێی دراوە، بەڵام قورئان جیاوازە لە تەورات لەوەی کە لاوازیی ئافرەتی نەکردۆتە سزا (تۆڵە)یەکی خوایی، وەکو ئەوەی کە لە (سفر التكوين) ئیصحاحی سێ ژمارە (16)دا هاتووە.

ئەوە شت تێکەڵ کردنە کە ئاوەها مامەڵەیەکی ناشیرین بدرێتە پاڵ شەریعەتدانەرێکی مەزنی وەکو موحەممەد، لە ڕاستیدا قورئان دەفەرموێت: (..**فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَن تَكْرَهُواْ شَيْئاً وَيَجْعَلَ اللّهُ فِيهِ خَيْراً كَثِيراً**).

واتە: (گەر خۆشیتان لێیان نەدەهات ئەوا بۆی هەیە شتێك خۆشیتان لێ نەیەتو خوا خێرو سودێکی گەورەی تێ بخات بۆتان، واتە تەڵاقیان مەدەنو دەستیان پێوە بگرن، بەڵکو خێرێکی گەورەی تێدا بێت بۆتان).

یان دەفەرموێت: (**وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**) (**الروم**: 21).

ئەننی بێزەنت سەرۆکی تیۆسۆفیزمی جیهانی لە کتێبەکەیدا (ئایینە بڵاوەکانی ناو هندستان) دەڵێ: چەند گەورەیە هەڵەی جیهان لە نرخاندنی بۆچوونەکانی پێغەمبەر دەربارەی ئافرەتان، گوتراوە گوایە ئەو وای بڕیارداوە کە ئافرەت گیانلەبەرێکی بێ ڕۆحە! ئەم تۆمەتبارکردنە لەبەر چی؟ گوێم بۆ بگرن باسی حەقیقەتی ڕێنماییەکانی (**محمد**)تان بۆ بکەم لەو بارەیەوە:

لە قورئاندا هاتووە: (**وَمَن يَعْمَلْ مِنَ الصَّالِحَاتَ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَـئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يُظْلَمُونَ نَقِيراً**) (**النساء: 124**). واتە: (هەرکەسێك کردەوەی چاك بکات لە نێرو لە مێو بڕوادار بێت ئەوا دەچنە بەهەشتو تۆسقاڵێك ستەمیان لێ ناکرێت).

دوای ئەوەی کۆمەڵێك ئایەت دەهێنێتەوە دەڵێت: "ڕێنماییەکانی پێغەمبەر لە سنووری شتە گشتییەکاندا ناوەستێت، یاساییەکی داناوە بۆ میراتگرتنی ژنان کە زۆر دادپەروەرانەترو سەربەستییەکی فراوانتریشی تێدایە لەو سەربەخۆییەی پێی دەدرێت لە یاسای مەسیحی ئینگلیزی کە تا پێش بیست ساڵ کاری پێدەکرا، ئەوەی کە ئیسلام دایناوە بۆ ئافرەت یاسایەکی نموونەییە، ئەو بە هەموو شێوەیەك پێی دەکرێت پاراستنیانی گرتووەتە ئەستۆو ئەوەی بۆ دابین کردون کە ستەمیان لێ نەکرێت لەو بەشەی بۆیان دەمێنێتەوە لە خزمو براو مێردەکانیان".

هەروەها دەڵێ: "زۆرجار دێت بە مێشکمدا کە ئافرەت لەژێر سایەی ئیسلامدا زۆر سەربەستترە لەوەی ژێر سێبەری مەسیحییەت، ئیسلام مافەکانی ئافرەت زۆر زیاتر دەپارێزێت لە مەسیحییەت کە ڕێگە لە فرەژنی دەگرێت، ڕێنماییەکانی قورئان زۆر دادپەروەرانەترەو دابینکەرترە بۆ سەربەستیی ئافرەت، لە کاتێکدا کە ئافرەت تەنها پێش بیست ساڵ مافی موڵکدارێتیی بەدەست هێنا لە ئینگلتەرا لە کاتێکدا کە دەبینین ئیسلام لە یەکەم ساتەوە ئەم مافەی بۆ سەلماندووە، ئەوە بوختانە کە بگوترێت ئیسلام ئافرەت بە گیانلەبەری بێڕۆح حیساب دەکات.

لورا فیشیا فاغیلری له کتێبی "بەرگری له ئیسلام" ل (106)دا دەڵێت: "ئەگەر ئافرەت له رووی کۆمەڵایەتییەوه له ئەوروپا گەیشتبێته پایەیەکی بەرز ئەوا پلەو پایەی ئافرەت، لانیکەم له رووی شەرعەوه، تا ساڵانێکی زۆرکەم لەمەوبەرو تا ئێستاش له زۆر وڵاتدا سەربەستییەکەی کەمتره له ئافرەتی موسڵمان له جیهانی ئیسلامیدا".

رۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی فەرەنسی (گۆستاف لۆبۆن) له کتێبی (شارستانێتی عەرەب)دا: "ئەو بنەمایانەی میرات که قورئان دایناون دادپەروەریی و ئینصافێکی گەورەی تێدایه، خوێنەر دەتوانێ لەو ئایەتانەی بۆی دێنمەوه دەرکی پێ بکات و بۆی دەرکەوێت له کاتی بەراوردکردن لەگەڵ مافه فەرەنسیی و ئینگلیزییەکاندا شەریعەتی ئیسلامی -که دەگوترێت موسڵمانان به باش مامەڵه لەگەڵ ژنەکانیاندا ناکەن- مافێکی داوه به ژنان له میراتدا که له یاساکانی خۆماندا نایانبینین"[1].

"ئیسلام کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر بارودۆخی ئافرەت له رۆژهەڵاتدا، ئیسلام باری کۆمەڵایەتی ئافرەتو پلەو پایەی زۆر بەرز کردەوه نەك نزمی بکاتەوه، به پێچەوانەی ئەو قسانەی که بەبێ بەڵگه دەکرێت، قورئان مافی یاسایی وای داوەتێ دەربارەی میرات زۆر باشتر له یاسا ئەوروپییەکانمان".

"ئەگەر بمانەوێت کاریگەریی قورئان بزانین دەربارەی ژنان پێویسته بڕوانین بۆ رۆژگاری گەشەسەندنی شارستانیی عەرەبی، بۆمان دەردەکەوێت لەوەی که مێژوونووسان بۆمان دەگێڕنەوه، ژنان گەیشتبوونه پایەیەك مەگەر به تازەیی بۆ دەستەخوشکەکانیان هەڵکەوتبێت له ئەوروپا، ئەوه کاتی بڵاوبوونەوەی سوارچاکی عەرەبی بوو له ئەندەلووس".

"باسمان کرد له بەشی پێشوودا که ئەوروپاییەکان بنەماکانی سوارچاکیو رێزگرتن له ئافرەتیان له عەرەبەوه وەرگرت، کەواته ئیسلام بوو ـ نەك مەسیح ـ که پلەو پایەو بایەخی ئافرەتی بەرز کردەوەو لەو باره پەستەی دەرهێنا که تێیدا بوو به پێچەوانەی ئەوەی که بڵاو دەکرێتەوه، ئەگەر بڕوانین بۆ میره مەسیحییه دەرەبەگەکانی سەدەکانی ناوەڕاست دەبینی هیچ رێزێکیان بۆ ئافرەت دانەناوه".

"بەڵگه لەسەر گرنگی ئافرەت له رۆژەکانی شارستانێتی عەرەبدا زۆری ئەو ئافرەتانەن که ناوبانگیان دەرکردبوو به زانیارییان له بواری زانستو ئەدەبدا ژمارەیەکی زۆریان ناوبانگیان بڵاوبووبوویەوه له سەردەمی عەبباسییەکان له رۆژهەڵاتو سەردەمی ئەمەوییەکان له ئەندەلووس".

"لێرەدا دەتوانین دووپاتی بکەینەوه که ئیسلام پلەو پایەی ئافرەتی زۆر بەرزکردەوه، ئێمه یەکەم کەس نین بەرگریمان لەم بۆچوونه کردبێت، بەڵکو زۆرێکی وەکو (کوسان دوبروسفال)، (مسیو بارتلمی سن هیلەر) پێشی داوینەتەوه".

"چاکەی ئیسلام تەنها لەوەدا نییه که پلەو پایەی ئافرەتی بەرز کردۆتەوه بەڵکو دەڵێین ئەو یەکەم ئایینێکه که ئەو شتەی کردووه وه سەلماندنی ئەمه ئاسانه ئەویش بەوەی که هەڵوێستی ئایینەکان و میللەتانی تر له ئافرەت دەربخەین که پێش عەرەب هاتوون و هەموویان زۆر خراپەیان بەرامبەر ئافرەت کردووه"[2].

"ئەو مافه هاوسەرێتییەی که قورئان بڕیاری بۆ ئافرەت داوه و راڤەکەرانی قورئان باسیان کردووه زۆر باشتره لەوانەی که له ئەوروپادا هەیه"[3].

"سەرباری ئەو بایەخو تایبەتمەندییانه ئافرەتی موسڵمان به رێزێکی گەورەوه مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، که بەوه دۆخێك بەدەست دێنێت که هەموو توێژەرەوه به ئینصافەکان ـ بەوانەشەوه که له رووی عاتفییەوه دژایەتی بنەمای فرەژنی دەکەن ـ دان به باشو جوانییەکەیدا بنێن، لەوانه (مسیودو ئەمیبس) که له کاتی قسەکردن دەربارەی ئافرەت له

[1] (ل474 چاپی دووەم).
[2] (ل 488 ـ 490).
[3] (ل 497).

رۆژهەڵاتدا، دوای لۆمەکردنی فرەژنی لە روانگە ئەوروپییەکەیەوە دەڵێت: ئافرەت لە رۆژهەڵاتدا رێزی لێدەگرێتو بە جوامێریو بەخشندەیی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، بە شێوەیەکی گشتیی کەس ناتوانێ لە سەرەرێگا دەستی لێ بەرز کاتەوە، هیچ سەربازێك ناوێرێ بەدکاریو دەستدرێژیی بکاتە سەر خراپترین ژن هەتا لە کاتی ئاشووبیشدا، لە رۆژهەڵاتدا مێرد چاودێری (رعایەی) ژنەکەی دەکات، لە رۆژهەڵاتدا بایەخدان بە دایك دەگاتە پلەی پەرستن، لە رۆژهەڵاتدا پیاوێك نابینی هەوڵ بدات سوود لە ئیش و دەستکەوتی ژنەکەی وەربگرێت، مێرد مارەیی دەدات بە ژنەکەی لە رۆژهەڵاتدا.."

لۆبۆن قسەکەی بەمە تەواو دەکات: "من چاوەڕوانی ئەوەم کە خوێنەر دوای زانینی ئەمانەی پێشوو باوەڕ بەوە بێنێت کە مەبدەئی فرەژنی شتێکی باشە، خۆشویستنی خێزانو رەوشتبەرزیو دەستو دڵ جوانی لە تەبیعەتخۆشی، زیاتر لە ناو ئەو میللەتانەدا گەشە دەکات کە باوەڕیان بە فرەژنی هەیە، ئیسلام باری ئافرەتی زۆر چاك کرد و یەکەم ئایینێکە کە پلەو پایەی بەرز کردبێتەوەو ئافرەتی رۆژهەڵات بە شێوەیەکی گشتیی زۆر رێزدارترو رۆشنبیرترو بەختەوەرترە لە هی ئەوروپا "[1].

"یاساکانی ئیسلام دەربارەی ئافرەت زۆر روونن لە دابینکردنی چاودێریی بۆی بە پاراستنی لە هەموو شتێك کە ئازاری بدات یان ناوبانگی بزڕێنێ".

ئەمانە شایەتی هەندێك لەو رۆژهەڵاتناسانەن کە موسڵمانان نەبوون، ئەوانەی کە موسڵمان بوون ئەگەر قسەکانیان بێنینەوە ئەوا کتێبێکی گەورەی تایبەت بەشیان ناکات.

## تێڕوانینی بەرنامە دەستکردییەکان بۆ مرۆڤ بە گشتیی و ئافرەت بە تایبەتی

ئێستاش با بێین بزانین عەلمانییەکان یان وجودیو مارکسییەکان چۆن دەڕوانن بۆ مرۆڤ بۆ ئەوەی ئەو کاتە بزانین ئەوان رێز لە ئافرەت دەگرن یان ئیسلام؟!

دەتوانم بڵێم هەموو عەلمانییەکان باوەڕیان بە گریمانەکەی (**فرضية**)ی داروین هەیە وەکو تەفسیرێك بۆ پەیدابوونی مرۆڤ کە دەڵێت مرۆڤ بەشێکە لە زنجیرەی پەرەسەندنو لە گیانلەبەرە نزمەکانەوە پەیدا بووەو کەسێك بە بەرنامەو مەبەستو بە تایبەت بەدیی نەهێناوەو هیچ وەزیفەیەکی لەم ژیانەدا پێ نەسپێردراوەو بۆ هیچ مەبەستێکی تایبەت نەهاتۆتە سەر زەویو سەرئەنجامەکەشی لەناوچوونو رزینە، ئیتر با تا بۆی دەکرێت رابوێرێتو بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی هەوڵبدات تەنانەت ئەگەر لەسەر حسابی خەڵکی تریش بێت، مەگەر بیرۆکەی (مانەوە بۆ باشترینو بەهێزترینە)، جگە لەمە هیچ مانایەکی تری هەیە؟

هەروەها ئەو عەلمانیو عەبەسی و وجودییانە پشت بە بیردۆزە سێکسییەکەی فرۆید دەبەستن بۆ لێکدانەوەی زۆرێك لە پاڵنەرەکانی مرۆڤ لە هەڵسوکەوت و رەفتارو ئاکاریدا.

کەواتە نە سەرچاوەیەکی پیرۆز، نە وەزیفەیەکی بەرێز، نە پاڵنەرێکی بەرێزو نە کۆتاییەکی بەرێز.

جا ئەگەر ئەمە رێزو پلەو پایەی مرۆڤ خۆی بێت دەبێت پلەو پایەی ئافرەت کە بەشێکە لە مرۆڤ چەند بێت؟ تەنانەت ئەگەر بێتو ئافرەت لە ئیسلامدا نیوەی پلەو پایەی پیاوی هەبێت هێشتا هەر زۆرتر و بەرزترە لەوەی کە لە عەلمانییەتدا هەیەتی. بۆ نزیککردنەوەی مەسەلەکە با نموونەیەك بێنینەوە:

ئەگەر کۆمەڵێك ژنو پیاو لە شوێنێکدا ئیش بکەن، پیاوەکان یەکی هەزار دۆلاریان پێ بدرێت و ژنەکان یەکی پێنج سەد، لەولاشەوە کۆمەڵێکی تر لە پیاوو ژن لە شوێنێکی تردا ئیش بکەن، یەکی پەنجا دۆلاریان پێ بدرێت (پیاوو ژن وەك یەك)، ئایا ژنانی کام لا زیاتری دەست کەوتووە؟

[1] ل503.

جیاوازییەکی تری گەورە لە نێوان ئیسلامو ڕێبازەکانی تردا ئەوەیە کە ئیسلام بایەخی بە هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئافرەت داوە هەر لەمنداڵییەوە تا پیریی، داوای ڕێزلێگرتنی کردووە بە پێچەوانەی ڕێبازەکانی ئەمڕۆوە کە مەبەستیان بە زۆری ئافرەتی گەنجەو ئەویش ئاشکرایە لەبەر چی، ئەو هەڵوێستەی لە مارلین مۆنرۆوە گێڕرایەوە چەند ساڵێك لەمەوبەر و هەندێك لە میدیاکان باسیان کرد گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم ڕاستییە.

لە ئیسلامدا نەبێت لە کوێ باسی مافی دایك کراوە بەسەر منداڵەوە؟ لە کوێ هانی خزمەتکردنی دایكو باوکی پیر دەدرێت جگە لە ئیسلام؟ **(وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيما* وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً) (الإسراء: 23 ـ 24)**.

ئەوانەی ڕەخنە دەگرن لە هەڵوێستی ئیسلام لە ئافرەت بۆچی باسی ئەو فەرموودەیە ناکەن کە پێغەمبەر ﷺ سێ جار لەسەر یەك بەو کابرایەی کە لێی دەپرسی کێ لە هەموو کەسێك لە پێشترە چاکەی لەگەڵدا بکەم، دەیفەرموو دایکت، پاشان لە جاری چوارەمدا فەرمووی باوکت؟ یا بۆچی باسی ئەو فەرموودەیە ناکەن کە فەرمویێت: **(الجنة تحت أقدام الأمهات)**، واتە بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە. بۆچی باسی ئەو فەرموودەیە ناکەن کە دەفەرمویێت: **(من یمن المرأة ان تلد بکرها انثی)**، واتە: لە نیشانەکانی فەڕو بەرەکەتی ئافرەت ئەوەیە کە یەکەم منداڵی کچ بێت، یان بۆچی باسی ئەو فەرموودەیە ناکەن کە دەفەرمویێت هەر کەسێك چەند کچێك بەخێو بکاتو ڕێزیان لێ بگرێتو باش پەروەردەیان بکاتو مافەکانیان پێ بداتو نازیان بکێشێت ئەوا ڕەفیقی منە لە بەهەشتدا؟

بۆچی باسی ئەوە ناکەن کە لە **(حجة الوداع)**دا زۆر پێی داگرت لەسەر ڕێزگرتن لە ئافرەتو چاکەکردن لەگەڵیاندا؟ یان تەنانەت لە سەرەمەرگیشدا داوای کردووە پیاوان باش بن لەگەڵ ژنەکانیانداو ستەمیان لێ نەکەن؟ ئەوەتا لە **(حجة الوداع)**دا دەفەرمویێت: **(فاتقوا الله في النساء فانکم اخذتموهن بأمانه الله واستحللتم فروجهن بکلمة الله)**. واتە: ترسی خواتان هەبێت (یان خۆتان لە سزای خوا بپارێزن) لە مامەڵەکردن لەگەڵ ژنەکانتاندا، ئێوە ئەوانتان بە ئەمانەتی خوا وەرگرتووەو بە قسەی خوا (بە فەرمانی خوا) ئەوانتان بۆ حەڵاڵ بووە.

جا بڕوانە بۆ ئەم وشە گەورەو جوانانە، **(أمانة الله)** وە **(کلمة الله)** کە چەند مەسەلەکەی گرنگو گەورەو بایەخدار کردووە نەك بڵێ بە پارە کڕیوتانن وەکو ئەوەی چەپەکان دەیڵێن!!

## ئەو ڕێ وشوێن و هەنگاوانەی ئیسلام گرتییەبەر بۆ گۆڕینی دۆزی ئافرەت

ئەگەر بێتو بەدواداچوونێك بکەین لە قورئاندا لەسەر چۆنێتی گۆڕینی تێڕوانینو هەڵوێستی خەڵك بەرامبەر ئافرەت دەزانین ئیسلام چ ئەرکێکی زۆری کێشاوە تا ئەو گۆڕانکارییانەی کردووە؟

سەرەتا هاتووە دژی ئەو ڕەشبینییە وەستاوە کە هەیانبووە بەرامبەر بە لەدایکبوونی کچو بە شێوەیەکی زۆر کاریگەرانە گاڵتە بە عەقڵییەتیان دەکات، **(وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيم* يتوارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ) (النحل: 58 ـ 59)**.

واتە: گەر کەسێکیان مژدەی ئەوەی بدرایەتێ کە ژنەکەی کچی بووە ڕەنگی ڕەش دادەگەڕاو پیشی دەخواردەوەو لە خەڵکیی دوور دەکەوتەوە، لەبەر ناخۆشی مژدەکەو دەکەوتە بیری ئەوەی کە چی لێبکات، ئایا بیهێڵێتەوە و بەخێوی بکات بە بێ ڕێزی یان بیخاتە ژێر گڵەوە، بە ڕاستی ئەمە بڕیارو حوکمێکی زۆر خراپە. بڕوانە بە چ شێوەیەك ڕەخنە لەو ڕەفتارو هەڵوێستەیان دەگرێتو چەند کارەکەیان قێزەون دەکات، پاشان دێتە سەر ئەوانەی کە منداڵ زیندەبەچاڵ دەکەنو دیسانەوە بە شێوازێکی زۆر کاریگەرانەو هەڕەشەئامێز باسی مەسەلەکە دەکاو ڕەخنەی لێدەگرێت، **(وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ* بِأَيِّ ذَنبٍ**

**قُتِلَتْ) (التكوير: 8 ـ 9)**. واتە: گەر لەو کچە منداڵە زیندەبەچاڵ کراوانە پرسیار بکرێت: تۆ لەسەر چی زیندەبەچاڵ کرایت؟ ئیتر وەڵامەکەش ناداتەوە بۆ ئەوەی بیسەر خۆی بیر لە مەسەلەکە بکاتەوەو لە قەوارەی ئەو تاوانەی ئەنجامدراوە بەرامبەر بەو کۆرپە بەستەزمانە تێ بگات.

هەر لێرەوە قورئان پێدادێت و ئەو بناغە هەڵەیە هەڵدەتەکێنێتەوەو هاوشان لەگەڵ فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ دید و بۆچوونێکی تر دەخاتە جێگەی، کە لە سەدا سەد پێچەوانەی ئەوەیە و وا لە خەڵکی دەکات لە جیاتی رەشبینی گەشبین بن بە منداڵی کچ، ئەو دوو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە لەمەوبەر باسمان کرد: لە نیشانەکانی فەڕ و بەرەکەتی ئافرەت ئەوەیە کە نۆبەرەکەی کچ بێت و ئەوەی چەند کچێکی هەبێت و باش بەخێویان بکات و نازیان هەڵگرێت لەگەڵ پێغەمبەردایە ﷺ تەواوکەری ئەو دوو کۆمەڵە ئایەتە بوون، کە لەسەرەوە هێنامانەوە، ئایەتەکان دژ بە رەشبینی بەرامبەر منداڵی کچ و زیندەبەچاڵ کردنیان دەوەستێت و ناشیرینی دەکات و هەڕەشە لە بکەرەکانیان دەکات، فەرموودەکانیش لەبەرامبەردا هانی گەشبینی بە منداڵی کچ و باش بەخێوکردن و رێزلێنان و ناز هەڵگرتنیان دەکات.

پاش ئەوە ئیتر وردە وردە مافەکانی تریان بۆ دیاری دەکرێت و ئەرکەکانیان دەستنیشان دەکرێت (**وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوف**)، هەر لە مافی هەڵبژاردنی هاوسەرو مافی داوای جیابوونەوەو مافی موڵکداری (**البكر تستأذن والثيب تستأمر**)، واتە: کچ پرسی پێ دەکرێت (نەك پرسە گورگانە کە لە ناو کوردەواریدا دەکرێت و مەلاکان ئیحراجیان کردووە، بەڵکو پرسی راستەقینەی بێ زۆر لێ کردن یان ئیحراج کردن) بێوەژنیش بڕیاری بە دەستی خۆیەتی و سەرپشکە لەوەی چ بۆ خۆی بڕیار دەدات (**فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوف) (البقرة: 234)**، واتە: ئێوە هیچتان لەسەر نییە ئەوان چی بۆ خۆیان بڕیار دەدەن بەو مەرجەی لە سنووری حەڵاڵ دەرنەچێت.

پێشتریش دەفەرموێت ئەگەر ژنەکانتان تەڵاقداو عیددەیان تەواو بوو رێگەیان لێ مەگرن لەوەی شوو بە کەسانی تر بکەن (**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوف..) (البقرة: 232)**.

دەربارەی موڵکداریش دەفەرموێت: (**وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُواْ اللّهَ مِن فَضْلِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً) (النساء: 32)**.

ئەمە بە کورتی تێڕوانینی ئیسلامە بۆ ئافرەت، دەربارەی جیاوازییەکانیش لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین و خوێنەر گەر مەبەستی بێت زیاتر لێی شارەزابێت دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ هەندێك کتێب، کە بە درێژی باسی ئەم مەسەلانە دەکات، وەکو کتێبی (**تحرير المرأة في عصر الرسالة**)، کە شەش بەرگە لە نووسینی (**عبدالحليم أبو شقة**)، (**المرأة بين الفقه والقانون**) نووسینی (**د. مصطفى السباعي**)، یان بەشی (**تحرير المرأة**) لە کتێبی (**واقعنا المعاصر**) لە نووسینی (**محمد قطب**)، کتێبی (**الحجاب**)ی (**أبو اعلى المودودي**) و (**المفصل في أحكمام المرأة**)ی ( د. عبدالكريم زيدان)، کە زیاد لە دە بەرگی قەبارە گەورەیەو دەیان کتێبی تر.

ئەڵبەتە بۆ کەسی باوەڕوداری خواناس پێویست ناکات بیسەلمێنین کە تێڕوانین و هەڵوێستی ئیسلام باشترە کە ئایینی خوایە لە هی بەرنامە وەزعییەکان کە دانراوی مرۆڤە، چونکە جیاوازیی لە نێوان ئەم دووەدا بەقەدەر جیاوازیی نێوان خوا و مرۆڤە، هەر ئیشێك گوزارشت لە رادەی زانست و تواناو دەسەڵات و دانایی دانەرەکەی دەکات.

ئیسلام دانانی خوایەکی زانای دانای بەتوانای بە بەزەیی و رەوایە، بەرنامەکانی تر دانانی مرۆڤی کەم زانستی کەم دەسەڵاتی مەحکوم بە مەیل و ئارەزوورەکانی نەفسە.

جیاوازیی لە نێوان ئیسلام و رێبازەکانی تردا بەقەدەر جیاوازی نێوان مرۆڤ و پەیکەرەکەیەتی کە یەکەم داهێنانی خوایەو دووەم داهێنانی مرۆڤە. ئەوەندە بەسە بۆ کەسی باوەڕدارو خواناس، چونکە خوا دەفەرموێت (**أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللّه**)، ئایا ئێوە زاناترن یان خوا، دەفەرموێت: (**أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ**)، ئایا کەسێك بەدیهێنەری شتێك بێت نازانێ ئەو شتە

لە چی پێکهاتووە، چ شتێك باشو بە کەڵکە بۆی؟ بەڵام بۆ کەسانێك کە خواناسی راستەقینە نین یان باوەڕیان بەوە نییە ئیسلام ئایینی خوا بێت، ئەم تیشك خستنە سەرو روونکردنەوانە پێویستن.

**فەرموودەی (تصدقن فانی رأیت أکثر اهل النار من النساء...**

پێغەمبەر ﷺ جارێکیان کۆمەڵێك ژنی بینی پێی فەرموون ماڵ ببەخشنەوە، چونکە بینیم زۆربەی خەڵکی دۆزەخ لە ئێوەیە، کە لێی دەپرسن بۆچی؟ ئەویش لە وەڵامدا دوو شت دەڵێت: یەکەم سکاڵاو دەمەبۆڵەتان زۆرەو دووەم بە ماندووبوونو زەحمەتی مێردەکانتان نازانن.

هەندێك کەس لە ئەنجامی تێنەگەیشتنی خۆیان ئەمە دەکەنە رەخنەیەك لە ئیسلام و لە پێغەمبەری ئیسلام و دەیکەنە بەڵگەیەك لەسەر بە سوك تەماشاکردنی ئافرەت. با بزانین ئەمە تا چ رادەیەك وایە:

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ وەکو عادەتی خۆی چینێك لە چینەکانی کۆمەڵ، کە ئافرەتە ئامۆژگاری دەکاو دەیانترسێنێت لە سزای رۆژی دوایی، بۆیە پێیان دەڵێت، (**صدقة**)، واتە: چاکە بکەن بە پارە بەخشینەوەو خێرکردن، بۆ ئەوەی رزگارتان بێت لە سزای دۆزەخ، چونکە بینیم زۆرترینی خەڵکی دۆزەخ ئافرەت بوون، کە لێشی دەپرسن لەبەر چی؟ دوو سیفەتی زۆر سەرەکی باس دەکات، کە دەلالەتە لە سەر شارەزایی پێغەمبەر ﷺ بە سروشتی ئافرەتو ناخی ئافرەت، من ئەمە ئاڕاستەی هەموو پیاوو ژنێکی بە ئینصافو دانا دەکەم، کە ئایا ئەمەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی وایە یان نا؟ مەگەر ئەوانەی کە چاو لە ئاستی جیاوازییە بایۆلۆژیی و فسیۆلۆژیی و دەروونی و عەقڵییەکانی نێوان پیاوو ژندا دەپۆشنو دەڵێن هیچ جیاوازیی لە نێوان پیاوو ژندا نییە بڵێن نەخێر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی وا نییە.

**شیکردنەوەی فەرموودەی: (ما رأیت ناقصات عقل ودین أذهب للب الرجل الحازم من احداکن..)**

واتە: کەسێکم نەدیوە وەکو ئێوە عەقڵو دینی نوقسان بێت، بەڵام بتوانێ عەقڵو هۆشی پیاوی خاوەن بڕیارو بەهێز لای خۆی نەهێڵێت.

ئەم فەرموودەیەش بوەتە بنێشتە تاڵەی ژێر دانی ناحەزانی ئیسلام و لە هەموو بۆنەیەکدا باسی دەکەن و جەختی لەسەر دەکەن وەکو بەڵگەیەك لەسەر کەم تەماشاکردنی ئافرەت لە لایەن ئیسلامەوە. با بزانین ئەمەیان تا چ رادەیەك وایە:

سەرەڕای ئەوەی کە ئەم فەرموودەیە لە رووی زانستی فەرموودەناسییەوە لاوازە، بەڵام لە گریمانێکیشدا کە ئەگەر ئەم فەرمودەیە راست بێت ئەمە لێکدانەوەکەیەتی:

ئەم وتەیە لە رواڵەتدا زەم کردنە، بەڵام لە راستیدا پیاهەڵدانە بە ئافرەتدا، وەکو ئەوەی بە منداڵێك بڵێی چۆن بەو منداڵیو لاوازییەوە توانیت ئەو پیاوە بەهێزە بێنی بە چۆکدا؟

بە نیسبەت ئافرەتیشەوە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بۆ لایەنێك لە لایەنەکانی هێزی ئافرەتان دەدات کە لە رێگەیەوە دەتوانێ کام پیاو بە دەسەڵاتو بڕیار بەدەستو بەهێزە بە چۆکیدا بێنێتو بیخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە، ئایا نابینیت زۆربەی هەرەزۆری پیاوان پەیوەندییان لەگەڵ ماڵی باوكو براو کەسوکاری خۆیاندا لاوازەو لەگەڵ ماڵی خەزوورانیاندا بەهێزە، بە پێچەوانەی زۆربەی ژنانەوە کە پەیوەندییان لەگەڵ ماڵی باوکی خۆیانو کەسوکاری خۆیاندا بەهێزە، بەڵام لەگەڵ ماڵە خەزووراندا لاوازە، ئایا ئەمە کاریگەریی ژن نییە بەسەر پیاوانەوە؟ من چاوەڕوان نیم لەم جۆرە نووسەرانە بتوانن لە قوڵایی ئەم فەرموودانە تێبگەن، چونکە ئەمانە کەسانێکی دەوێ شارەزایی باشیان هەبێت لە دەروونناسی، کۆمەڵناسی، زانستی ئەخلاق، پێکهاتەی بایۆلۆژیی و فسیۆلۆژی هەریەك لە پیاوو ژن.. هتد.

سەرەڕای ئەوەی ئەم فەرموودەیەو هەندێك لەوانەی کە بە رواڵەت بەکەم تەماشاکردنی ژنی تێدایە، زانایان هەڵوێستەی زۆریان لەسەریان کردووە و گومانیان هەیە کە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ وترابێت، چونکە بە رواڵەت دژی سەرجەم ئایەتەکانی قورئانو پێچەوانەی مەبەستەکانی شەرعن کە ویستوویەتی پلەو پایەی ئافرەت بەرز کاتەوەو رۆڵی لە

کۆمەڵگەدا کاریگەرتر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆرێك لەم فەرموودانە ورد دەبیتەوە دەبینی زۆر مانای قووڵی تیدایە. یەکێك لەم فەرموودانە ئەمەیە کە باسمان کرد دژایەتی کردنەکەشی لەگەڵ مەبەستەکانی شەرعو سەرجەم دەقەکان لەوەدایە کە:

**یەکەم:** قورئان هیچ شتێکی تێدا نییە کە ئەو مانایەی تێدا بێت.

**دووەم:** پێغەمبەر خۆی ﷺ لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ژناندا زۆر ڕێزی لێگرتوونو هەمیشە پرسی پێ کردوونو بە قسەشی کردوون.

بۆ نموونە لە گرێبەندی ئاشتی حودەیبیەدا کاتێك صەحابەکان بە گوێی پێغەمبەر ناکەنو سەریان ناتاشن، ئوم سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ پێی دەڵێ تۆ بڕۆ سەری خۆت بتاشەو قوربانییەکەت بکە، ئەوانیش ناچار دەبن چاو لە تۆ بکەن، پێغەمبەریش ﷺ بە گوێی کرد.

**سێیەم:** لە کۆتایی فەرمودەکەدا هاتووە کە لێی دەپرسن لەبەر چی؟ دەفەرموێت لەبەر ئەوەی شایەتیی ئێوە بە نیوەی شایەتیی پیاو دەژمێردرێت و چەند ڕۆژێکیش لە مانگدا نوێژتان لەسەر نییە. لە ڕاستیدا نە نیو شایەتیی ئافرەت دەلالەتە لەسەر کەم عەقڵی ئافرەت و نە نوێژنەکردنو ڕۆژوو نەگرتنی کاتی حەیزو زەیستانی دەلالەتی کەم ئایینییە، بەڵکو لەبەر سروشتی کاری ئافرەتە کە کەمتر ڕووبەڕووی ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانە دەبێتەوە و زاڵیی لایەنی سۆزو عاتیفەیە بە سەر ئافرەتەدا کە وای لێدەکات لە بارەی دەروونییەوە زۆر گونجاو نەبێت بۆی بچێتە دادگاکانو شایەتی لەسەر کێشەکانی ناو خەڵکی بدات، کە زۆربەیان هی نێوان پیاوانن و کەسێك ئەگەر ڕۆژانە ڕووبەڕووی ڕووداو و کێشەی نێوان خەڵك نەبێتەوە ئەو شارەزایی و توانایەی بۆ پەیدا نابێت لەو بوارەدا، بۆیە ئەگەری لەبیرچوونەوەی زۆرە هەر لەبەرە ئەوەشە کە قورئان دەفەرموێت (**أن تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى**)، واتە: ئەگەر یەکێکیان لێی تێکچوو ئەوی تریان بیری بخاتەوە، کەواتە لێرەدا لەبیرچوونەوەیە لەبەر کەم ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەو جۆرە کێشانەی لە دەرەوە ڕوو دەدەن نەك لەبەر نەزانی، ئەمەش بۆ کۆمەڵگەیەکە کە ئیسلام پێکی هێنابێت کە تێیدا ئافرەت زیاتر لە ماڵەوە دەبێتو خەریکی کاروباری ناوماڵو بەخێوکردنی منداڵ دەبێتو پیاو لە دەرەوە خەریکی کارو پەیداکردنی بژێوی دەبێت، ئەم ڕاستییەش ڕوونو ئاشکرایە بۆ ئەوانەی ئیشیان دەکەوێتە دادگاکانو پێویستیان بە شایەت و شایەتکاری هەیە، دەبینی دەگەڕێن بە دوای کەسانێکدا کە شارەزایی زیاتریان هەبێتو خۆیان دەچن تەلقینی دەکەن کە چی بڵێتو چی نەڵێت لای دادوەر.

خاڵێکی گرنگی تر ئەوەیە کە عەقڵ (ژیری) و زیرەکی دوو شتی جیاوازن، زۆربەی خەڵکیش لەم فەرموودەیە واتێگەیشتووە کە مەبەستی زیرەکییە، جا ئەگەر ئێمە جیاوازیی نێوان ژیری و زیرەکیمان بۆ دەرکەوت ئەوکاتە تێگەیشتنی مەبەستی فەرمودەکەش (لە گریمانێکدا ئەگەر راستبێت) بۆ دەردەکەوێت.

زیرەکی توانای تێگەیشتنە و ژیریش توانای خۆکۆنترۆڵکردن و لەگەڵ داناییدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە بۆ نموونە بە کەسێك دەوترێت عاقڵ کە قسە لە جێی خۆیدا بکات نەك قسە زۆر بزانێت، ئاشکراشە کە توانای تێگەیشتنی پیاو لە هی ژن زیاتر نییە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی توانای خۆ کۆنتـرۆڵکردنی زیاترە، هەر لەبەر ئەوەشە ژنان ناسراون بە مەکر کە لە ئەنجامی لاوازی و زیرەکییەوە دێت. لە عەرەبییشدا عەقڵ لە (عقال)ـە وە هاتووە واتە بەستنەوە.

جیاوازیی نێوان ژیریی پیاوو ژن (بە مانای خۆکۆنترۆڵکردن) لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە و ڕووداوەکاندا بە زەقی دەردەکەوێت، دەبینی پیاو (بە شێوەیەکی گشتیی) زیاتر بە ژیریی ڕووبەڕووی شتەکان دەبێتەوە، بەڵام ئافرەت زیاتر بە سۆز و عاتیفە بۆ نموونە بڕوانە تەعزێی پیاوان و ژنان یا کاتی مردنی کەسێکی خۆشەویست یا بیستنی هەواڵێکی زۆر خۆش یا زۆر ناخۆش.

ئەم دوو سیفەتەش (زیادی ژیری و کەمی سۆز وە کەمی ژیری و زیادی سۆز) بە کەم و کورتی ناژمێررێت بۆ هیچکام لە پیاو لە ژن بەڵکو دوو شتی تەواوکەری یەکن و پێکەوە جوانن. هەر لەبەر ئەوەشە تەڵاق دراوەتە دەست پیاوو بەخێوکردنی منداڵ بەدەستی ژن، یەکەمیان پێویستی بە خۆ کۆنترۆڵکردن هەیەو دووەمیان بە سۆز.

ئێستاش دوای ئەوەی، کە جیاوازی نێوان ژیری و زیرەکیمان زانی بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو فەرموودەیەی دراوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەردوو ماناکەدا ناکۆکە، چونکە ئەگەر بە مانای زیرەکی بێت ئەوا وەکو وتمان لە رووی زیرەکییەوە یەکسانن و جیاوازیی نێوانیان وەك جیاوازیی نێوان دوو پیاو یا دوو ژن وایە لە نێوان خۆیاندا، ئەگەر بە مانای خۆکۆنترۆڵکردن بێت ئەوە ئەو کاتە پەیوەندیی نابێ بە لەخشتەبردنی پیاوەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە توانای لەخشتەبردنی پیاو بەڵگەی زیرەکییە نەك گێلی!

بە نیسبەت کەمی دینیشەوە: ئاشکرایە کە نوێژ نەکردن و رۆژوو نەگرتنی ئافرەت لە کاتی حەیزو زەیستانیدا دەسەڵاتی خۆی تێدا نییە و ئەمەش نابێتە تاوانێك بۆی و رۆژووەکە دوایی دەیگێڕێتەوە و بۆ نوێژەکەش چاوپۆشی لێکراوە، پاشان ئەو هەموو پاداشتەی دەستی دەکەوێ لەبەر ئەو ئازارو ناڕەحەتییەی دەیچێژێ کاتی حەمل و منداڵ بوون زۆر زۆرەو بەسە بۆ ئەوەی قەرەبووی ماوەی نوێژنەکردنەکەیان بۆ بکاتەوە، هەر لەبەر ئەمەشە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی ئەو کەسەی لێی پرسی کێ شیاوترین کەسە چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ سێ جار فەرمووی دایکت و چوارەمین جار فەرمووی باوکت.

کەواتە نە نیوشایەتی ئافرەت پەیوەندیی بە عەقڵی ئافرەتەوە هەیە، نە نوێژنەکردن و رۆژوو نەگرتنی کاتی حەیزو زەیستانی پەیوەندیی بە کەم دینییەوە هەیە، تەنها ئەوەندە هەیە کە ئافرەت لەبەر حەیزو حەمل و زەیستانی تەحەممول و بەرگری کەمتر دەبێت و باری دەروونی ناسکتر دەبێت و زووتر تووڕە دەبێت و حلم و حەوسەڵەی کەمتر دەبێتەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە ئافرەت سۆزو عاتیفەی زاڵترە بەسەر عەقڵ و بیرکردنەوەیدا، ئەمەش بە روونی دەردەکەوێت لە هەڵوێستی ئافرەتان لە کاتی رووداوی گەورەی خۆش و ناخۆشدا، بۆ نموونە لە دەستدانی کەسی خۆشەویست زیاتر کاریگەریی هەیە لەسەر ئافرەت وەکو لەسەر پیاو، هەروەها ئافرەت زیاتر پەنا دەباتە بەر گریان و لە خۆدان بە پێچەوانەی پیاوەوە، هەروەها لە کاتی خۆشییشدا شێوازی دەربڕینی ئافرەت جیاوازە لە هی پیاوان، ئەمە پەیوەندیی بە پەروەردەو داب و نەریتی کۆمەڵایەتییەوە نییە، بەڵکو لە ناخ و سروشتی هەریەك لە پیاوو ژندا هەیە.

دەبینی لە بەخێوکردنی منداڵدا ئافرەت زیاتر شەونخوونی و ناڕەحەتی بە منداڵەوە دەکێشێ و زیاتر بە تەنگیانەوەیە بە پێچەوانەی زۆربەی پیاوانەوە کە تەنانەت تەحەمولی یەك سەعات گریانی شەوانی منداڵەکانیان ناکەن.

خێزانێك کە منداڵێك یا دوو منداڵی نوقسانی دەبێت دایکەکە زیاتر خەریکیان دەبێت و بە تەنگیانەوە دەبێت، هەموو ژیانی خۆی بۆ خزمەتکردنیان تەرخان دەکات و لە منداڵە ساغەکان زیاتر خۆشی دەوێن و خەمیان دەخوات.

ئایا ئەم جیاوازییانە لە نێوان پیاوو ژندا روون و ئاشکرا نییە، ئایا ئەم سۆزو عاتیفە زاڵە کاریگەریی نییە بۆ سەر بڕیارو هەڵسوکەوتی ئافرەت؟.

ئایا لەشی ئافرەت بە شێوەیەکی گشتیی لە هی پیاو لاوازتر نییە؟ ئایا ماسولکەی ئافرەت لە هی پیاو کەمترو چەوری ژێر پێستی زیاتر نییە؟ کە ئەمەشە ئەو لاشە نەرمەی پێ بەخشیوە.

ئایا ئێسکی ژن لەهی پیاو بچووکترو باریکتر نییە، ئایا دەنگی ژن لەهی پیاو ناسکتر نییە؟ ئایا موی لەشی ژن لە هی پیاو کەمترو نەرمتر نییە؟ ئایا لەشی پیاو بە هۆی ریش و سمێڵ و سەر رووتانەوەو ماسوولکە زۆری و ئێسك ئەستووری لە لەشی ژن زبرترو بەهێزتر نییە؟ کە ئەمانەش هەمووی جیاوازیی بایۆلۆژی و فسیۆلۆژییەو دەستی هیچ کەسی تێدا نییەو کاریگەریی کرۆمۆسۆم و جینەکان و هۆرمۆنەکانە.

ئایا حەیزو مانگانەو حەمل و زەیستانی و شیر بە منداڵ دان کاریگەرییان لەسەر لاشەو دەروونی ئافرەت نییە؟

## سەرچاوەی هێزی ئافرەت

ئەمانەی لە سەرەوە باسمان کرد هەموو راستین، بەڵام هەندێ کەس نکوڵی لێدەکەن و چاو لە ئاستی دادەخەن. ئەم شتانە هەموو سەرجەم ئافرت لاوازتر دەکەن لە پیاو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئافرەت زاڵترە بەسەر پیاودا، چونکە سەرچاوەی هێزی ئافرەت شتێکی ترە کە دەتوانێ لە رێگەیەوە زاڵ بێت بەسەر گەورەترین و بەدەسەڵاتدارترین پیاودا. مەسەلەیەکی گرنگ هەیە زۆربەی خەڵکی پەی پێ نابەن، ئەویش ئەوەیە کە سەرچاوەی هێزی ئافرەت لە جوانی لەش و ناسکی پێست و زیادەی سۆزو عاتیفەیاندایە نەك عەقڵ و ماسوولکە. پیاو بە هێزی بازووی لە ئافرەت بەهێزترە، بەڵام ئافرەت بەو شتانەی باسمان کرد و بەو هێزە شاراوەیەی خوا تێیدا دروستی کردووە زاڵە بەسەر پیاودا.

پیاو بە رواڵەت بە دەسەڵاتدارترە لە ئافرەت و لەوانەشە زۆرجار دەستی لێ بوەشێنێ و لێی بدات، بەڵام سەرەنجام دەبینی هەر ژنەکە زاڵترە بەسەریداو بە زۆری قسە قسەی ژنەو بڕیار بڕیاری ژنە لە ماڵدا. با بە نمونەیەك زیاتر مەسەلەکە روون بکەینەوە: دەبینی زۆرێك لە گیاندارە درەندەکان بە لەش لە مرۆڤ بەهێزترن و پەلاماری بدەن پارچە پارچەی دەکەن، بەڵام مرۆڤ بەهێزی عەقڵ زاڵ بووە بە سەریانداو لە ئەنجامی ئەو چەك و کەرەسەیەی دروستی کردووە هەموو گیانلەبەرانی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، پیاویش گەرچی بە لاشە لە ئافرەت بەهێزترە، بەڵام ئافرەت بە هەندێك چەکی تر کە هەمووی لە ناسکی و لاوازییەوە سەرچاوە دەگرێت زاڵە بەسەر پیاوداو سەرەڕای ئەوەی کە بۆتە سەرچاوەیەکی گەورەی ئیلهام بۆ پیاو هەروەها بۆتە مایەی زاڵبوونیشی بەسەریدا ئەگەرچی بە رواڵەت پیاو زاڵتر دیار بێت، ئەم راستییە هەموو پیاوو ژنێك بیری لێ بکەنەوە بۆیان دەردەکەوێت کەوایە ئەگەرچی تاکو ئێستا زۆرێکیان دەرکیان پێ نەکردووە.

من لێرەوە داوا لە ئافرەتان دەکەم بە دوای خاڵەکانی هێزی خۆیاندا بگەڕێن و بیدۆزنەوە، ئەو کاتە بۆیان دەردەکەوێت کە خوای داناو باڵادەست هەموو شتێکی جوانە و لە جێی خۆیدایە ئەگەر زۆرجاریش پێی نەزانین، ئافرەتان هەر لە کۆنەوە بە کردەوە ئەم شتەیان بەرپا کردووە، بەڵام وەکو زانیاری تیۆری نەیانزانیوە بۆیە بە دوای یەکسانیدا دەگەڕێن.

لە کۆتاییدا دەڵێم پێغەمبەر ﷺ لەوە داناتر بوو کە دوو شت بەیەکەوە ببەستێت پەیوەندیی لە نێوانیاندا نەبێت. قابیلە پێغەمبەر نەزانێت ژن بە چی کار دەکاتە سەر پیاو؟ مەگەر بە ناز و مەکر و جوانی نییە؟ ئەوانەش چ پەیوەندییەکیان بە کەمی ژیری و ئایینەوە هەیە؟

## فەرمودەی مافی پیاو بەسەر ژنەوە

ئافرەتێك دەچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دەڵێ ئامۆزایەکەم داوام لێ دەکات شووی پێ بکەم، پێم بڵێ مافی مێرد بەسەر ژنەوە چییە، ئەگەر لە توانامدا هەبوو ئەوا شووی پێ دەکەم، ئەگەرنا ئەوە شووی پێ ناکەم، پەیامبەر وتی: هەقی مێرد بەسەر ژنەوە ئەوەیە ئەگەر ژنەکە زمانی لەناو کێم و جەراعەت و خوێن و پیساییدا بۆ مێردەکەی بگێڕێ هێشتا مافی مێردەکەی نەداوە، ئەگەر بکرایە ئادەمیزاد جگە لە خوا کڕنووشی بۆ کەسێك ببردایە ئەوا دەبوایە ژن کڕنووشی بۆ مێردەکەی ببردایە، (هو جنتك ونارك)، ئەو بەهەشت و دۆزەخی تۆیە، هەر ئەوەندە هەقی مێرد بەسەر ژنەوە هەیە. ژنەکەش وتی: سوێند بەوەی تۆی بۆ ئێمە بەهەق ناردووە هەتا لەم دونیایەدا بمێنم شوو ناکەم.

ئیمامی بوخاری دەربارەی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت (**فيه سليمان بن داود اليمامي (أو اليماني) منكر الحديث**) واتە: لە زنجیرەکەدا سلێمانی کوڕی داودی یەمامی (یان یەمانی)، بە هەردوو شێوە هاتووە)، تێدایە کە ئەو فەرموودانەی

دەیانگێڕێتەوە لاوازن (**المنكر: ما تفرد به الراوي الضعيف**)، واته بەهەر فەرموودەیەك بگوترێت (منكر) واته فەرموودەیەکە کە کەسێکی لاواز گێڕابێتیەوەو ئەو فەرموودەیەش بە لاواز لە قەڵەم دەدرێت[1].

فەرموودەش کە لاواز بوو ئیشی پێناکرێتو بەڵگەی پێناهێنرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر شیدەکەینەوە:

یەکەم: ئەم رووداوە ئەوە دەردەخات کە ژنسەربەستییەکی باشیان هەبووە لە شووکردندا و لە قبوڵکردن یا رەتکردنەوەی ئەو پیاوەی کە دێتە داخوازییان ئیتر چ ئەو سەربەستییە پێش ئیسلام بوو بێت یان لە ئەنجامی رێنماییەکانی ئیسلامەوە بەدەستیان هێنابێت، هەر کامێکیان بێت ئەوە خاڵێکی ئیجابییە بۆ ئەو سەردەمە، هەرچەند لۆژیك ئەوە دەسەلمێنێت کە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەوە بێت کە ئیسلام بەدیهێناوە.

دووەم: ئەم فەرموودەیە زیادەڕەوییەکی زۆری تێدایە لە مافی پیاو بەسەر ژنەوە کە فەرمودەو ئایەتی تر پشتیوانی لێناکەن و پێدەچێ (ڕاوی) خۆی بۆی زیاد کردبێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە قورئان بنەمایەك رادەگەیەنێ بۆ مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا رێك پێچەوانەی ئەمەیە ئەویش ئەو ئایەتانەیە کە دەفەرموێت: **(ولهن مثل الذی علیهن بالمعروف وللرجال علیهن درجة)**. واته چەند ئەرکیان لەسەرە ئەوەندەش مافیان هەیە و پیاوان پلەیەکیان بەسەریانەوە هەیە ئەویش لە ئایەتی تردا دەریدەخات کە قیوامەیە (قیوامەش واته هەڵسوڕاندنی کاروبار)، ئەو قیوامەیەش هەر ئایەتەکە خۆی روونی دەکاتەوە کە بە هۆی ئەوەوەیە کە پیاوان مەسرەفی خێزانیان لەسەرە .ئیتر ئایا ئەم تەنها پلەیە شایانی ئەوەیە کە ئافرەت زمانی لە کێم و خوێن و پیسابییدا بگێڕێ لە پێناوی پیاوەکەیداو هێشتاش مافی خۆی نەدابێتێ؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە بنەمایەك دێنینەوە کە زانایانی فەرموودە باسیان کردووە بۆ حوکمدان بەسەر فەرموودەدا ئەویش ئەوەیە کە دەڵێن فەرموودەی راست روونا‌کییەکی بە سەرەوەیە گوزارش لە راستییەکەی دەدات. ئەم فەرموودەیەش بە پێچەوانەوەیە، تاریکییەکی زۆری بە سەرەوەیە کە گوزارش لە هەڵبەستراوییەکەی دەدات و بزانە چ پیاوێك ویستوویەتی خۆی فەرزکات بەسەد ژنەکەیەوە بۆ ئەو مەبەستە پەنای بردۆتە بەر هەڵبەستنی ئەمفەرموودەیە بەسەر زمانی پێغەمبەرەوە، هەروەکو چۆن خاوەن رێبازە چەوتەکان پەنایان بردۆتە بەرهەڵبەستنی فەرموودە بۆ سەلماندنی راستیی رێبازەکەیان و هەندێکی تر بۆ گەرمکردنی بازاڕی شتومەکەکانیان هەندێك پیاوانیش پەنایان بردۆتە بەر هەڵبەستنی فەرموودە بۆ ملکەچکردنی ژنەکانیان.

## هەندێك مافی ژن لە شەرعدا کە نەزانراون

گومانی تێدا نییە کە تەنانەت ئێمەی خوێندەوارو رۆشنبیری ئیسلامیش هەڵوێستمان لە ئافرەتو هەڵسوکەوتمان لەگەڵیاندا زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی دابو نەریتی کۆمەڵگەوە، ئەو دابو نەریتەی کە لە زۆر شتدا پێچەوانەی شەریعەتە، بۆ نموونە لە رووی شەرعەوە بۆت نییە زۆر لە خێزانت بکەیت شیر بە منداڵەکەتان بدات، بەڵکو دەتوانێ بۆ ئەو کارەی داوای کرێ بکات، هەروەها بۆت نییە زۆری لێ بکەیت چێشتت بۆ لێ بنێو ماڵت بۆ خاوێن کاتەوەو جلوبەرگت بۆ بشوات بەڵکو ئەوە بە دەستی خۆیەتی، بۆی هەیە داوای خزمەتکارت لێ بکاتو لەسەریشتە ئەگەر هەتبوو بۆی دابین بکەیت، بۆی هەیە مەرجی ئەوەت لەگەڵدا بکات لە کاتی مارەبڕیندا ژنی تری بەسەردا نەهێنیو تەلاق بە دەستی خۆی بێت.

لە شەریعەتدا کەس بۆی نییە ژنی خۆی بکوژێ ئەگەر خیانەتیشی لێ بینی بەڵکو دەبێ شکاتی دادگای لێبکات، هەروەها کەس بۆی نییە خوشکی خۆی یا کچی خۆی لەسەر هیچ کارێك بکوژێت، بەڵکو ئەوە بڕیاری دادگایە.

مەسەلەی کوشتنی ئافرەت بە ناوی شۆردنی شورەیی واته بۆ لابردنی ئەو ناوزڕاندنەی تووشی ئەو خێزانە دەبێت بە بۆنەی زیناکردنی ئافرەتێکی ئەو خێزانە لە شەریعەتدا بوونی هەر نییە، ئەمما کوشتنی دایك ئەوە هەر بە هیچ شێوەیەك

---

[1] التأريخ الكبير للإمام البخاري ص126.

دروست نییە لەسەر کوڕ ئەنجامی بدات لەبەر هەر هۆیەك بێت، بەڵکو لەسەرێتی لە هەموو بارو دۆخێکدا هەر چاکەی لەگەڵدا بکات، ئەمانەو دەیان مافی ئافرەت بەسەر مێردەوەو کچ بەسەر باوكو دایكو براداو دایك بەسەر منداڵەوە کە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا ڕەچاوی شەریعەتی تێدا ناکرێتو لەسەر بنەماکانی دابونەریتی کۆمەڵایەتی ئەنجام دەدرێت.

بە گوێرەی شەرع کەس بۆی نییە ماڵی ژنەکەی زەوت بکات یان داوای لێبکات خشڵو زێڕەکانی بۆ بفرۆشێت یا هەر مولکێکی هەبوو بۆ مێردەکەی بفرۆشێت تەنانەت ئەگەر دەستکورتیش بێت مەگەر بە ویستی ئافرەتەکە خۆی ئەگینا مولكو سامانی ئافرەت تایبەتە بە خۆیەوەو لەسەری نییە فلسێك بۆ ماڵەکەی سەرف بکات، هەرچیش بکات لە چاکەی خۆیەتی.

ئەو بێ ڕێزییەی بەرامبەر ئافرەت دەکرێتو تەنها لە ڕێگەی فەرمان دەرکردنەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێتو ڕایان لەسەر هیچ شتێك وەرناگیرێت ئەمە هیچی لە ئیسلامەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو هەموو هەڵقوڵاوی دابو نەریتی کۆمەڵگەیە، ئەو کۆمەڵگەیەی کە هەموو تاکێکی دەسەڵاتدار تێیدا لە ئاستی خۆیدا دکتاتۆرێکە ئیتر چ ئەو دەسەڵاتدارە مێرد بێت لە ماڵدا یان باوك بێت یان بەرێوەبەرێك بێت لە فەرمانگەیەکدا، یان سەرۆکی بەشێك یان زانکۆیەك یان دەزگایەك بێت..

هیوام وایە، خەڵکانی تریش لە ئەنجامی گەڕان بە دوای حەقیقەتی هەڵوێستی شەریعەتی ئیسلام لە ئافرەت بە هەڵوێستو ڕەفتاری خۆیاندا بچنەوەو ئەندازەیەکی کەم لەو مافانەی ئیسلام بۆ ئافرەتی بڕیوەتەوە پێی ڕەوا ببینن.

## شەریعەتی ئیسلام و دابونەریتی کۆمەڵگە

هەندێك کەس دەیانەوێت هەرچی نەریتێکی نەشیاوی ناوکۆمەڵگە هەیە بیدەنە پاڵ ئیسلام بۆ نموونە بە چاوی سووك ڕوانینە ئەو ئافرەتانەی لاقە دەکرێن، یا کوشتنی ئافرەت لەسەر نامووس، یا ستەم کردن لە ئافرەت بە شێوەیەکی گشتیی و هتد....

هەڵەی ئەو کەسانە لەوێدایە کە یەکەم نازانن مەرج نییە هەرچی دابو نەریتی کۆمەڵگە هەیە دروستکراوی ئایین بێت و بێئاگان لەوەی کە زۆرجار هۆکاری تر ڕۆڵی هەبووە لە دروستبوونی ئەو نەریتانەدا، لەوانە عەقڵیەتی عەشایەری پیاوی زاڵ و باڵادەست لە کۆمەڵگەدا.

بۆ نموونە لە هەندێك ناوچەی کوردستان دیاردەی (ڕەدووکەوتن) هەیە کە کچ یان تەنانەت ژنی مێردداریش لەگەڵ پیاوێکدا ڕێك دەکەوێتو بە نهێنی دوای دەکەوێت بێئەوەی کەسوکاری کچ ئاگایان لێ بێت یان ژنە تەلاقی خۆی لە مێردی یەکەمی وەرگرتبێت، وەنەبێ ئەمە شوورەیی بێت بە لایانەوە، بەڵکو هەندێك جار ژنان شانازیشی پێوە دەکەنو بە یەکتر دەڵێن ئەگەر ڕێکوپێك بویتایە ڕەدوو دەکرای! ئایا ئەم دابونەریتە دروستکراوی دەستی ئیسلامە یا میللەتەکەش موسڵمان بێت لە کاتێکدا کە حوکمی ئافرەتی بەشوو ئەگەر کاری وا بکات ڕەجم کردنەو هی کچیش صەد جەڵدەیەو پیاوەکەش ئەگەر ژندار بێت ڕەجم دەکرێتو ژنی نەبێت سەد جەڵدەی لێ دەدرێتو ساڵێك دوور دەخرێتەوە.

دێیەکی تر هەیە لە کوردستانی خۆماندا کچیان بە زۆری ماونەتەوەو مێردیان نەکردووە ئەویش لەبەر ئەوەی ناوێرن گفت بۆ هیچ پیاوێك بدەن، چونکە هەر گفت بدەن باوكو برایان لێیان دەکەونە گومانەوەو دەیانکوژن، ئایا ئەم نەریتە دروستکراوی دەستی ئیسلامە ؟! یا ڕێنماییەکانی ئیسلام بە تەواوی پێچەوانەی ئەمە نین و پێغەمبەر ﷺ نافەرموێت (**الثيب تستأمر والبكر تستأذن**)؟ واتە: بێوەژن بڕیاری لە دەستی خۆیدایەو کچیش دەبێ پرسی پێ بکرێتو ڕەزایەتی وەربگیرێت.

دەربارەی حوکمی ئافرەتێکیش، کە بە زۆر کاری سێکسی لەگەڵدا کرابێت، لە شەرعدا هیچ سزایەکی نییە، چونکە دەسەڵاتی خۆی تێدا نەبووەو زۆری لێکراوە، پێغەمبەریش ﷺ دەربارەی ئەو کەسانە دەفەرموێت: **(ان الله تجاوز عن متی الخطأ والنسیان وما استکرهوا علیه)**. واتە: خوا لە سێ شتی ئومەتم بوراوە، هەڵەو لەبیرچوونەوەو زۆر لێکردن.

واتە: هەرکەسێك بە هەڵەو نەزانی گوناهێك بکات یان لە بیری بچێتەوە کە حەرامە، یان بە زۆر پێی بکرێت هیچ گوناهێکی لەسەر نییەو سزا نادرێت.

جگە لەمەش ئافرەتی لاقەکراو لە رووی شەرعەوە بێتاوانەو مارەیی تەواوی دەکەوێتە سەر کابرای لاقەکەر، ئەڵبەتە لەگەڵ سزادانی لاقەکەردا، تەنانەت ئافرەتێکیش بە ویستی خۆی زینای کردبێت پاش سزادانی کەس بۆی نییە سوکایەتی پێ بکات.

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو چووە بەسەر ژنەکەیداو پیاوی بە سەرەوە بینیوە، نەچووە هەردووکیان بکوژێ، بەڵکو هاتووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ شکاتی کردوون، پێغەمبەریش بە گوێرەی فەرمایشتەکانی قورئان داوای لێکردووە شایەت بێنێت لەسەر قسەکەی، جا ئەگەر سێ شایەتی تری هێنابێت ئەوا هەردوو زیناکەرەکە سزا دراون، ژنەکە بە رەجمو پیاوەکەش ئەگەر ژندار بووبێت بە رەجمو ئەگەر کوڕیش بووبێت سەد جەڵدەو ساڵێك دوور خستنەوە، ئەگەر شایەتیشی نەبێت دەبێ مێردەکە چوار جار سوێند بخوات کە راست دەکات، پێنجەمیش بڵێ بەر نەفرەتی خوا کەوم ئەگەر درۆ بکەم، ژنەکەش ئەگەر دانی بە تاوانەکەیدا نا ئەوا سزا دەدرێت، ئەگەر دانیشی پێدا نەنا دەبێ چوار جار سوێند بخوات کە مێردەکەی درۆ دەکات، پێنجەمیش بڵێت بەر خەشم و سزای خوا بکەوم ئەگەر مێردەکەم راست بکات، لەو حاڵەدا سزای لەسەر لادەچێت و لەیەك جیا دەکرێنەوە بە هەتا هەتایی، ئیتر ئەمە لە کوێ‌و ئەوە لە کوێ، کە پیاوی کورد (غەیرە کوردیش) دەیکردو بەردەوام دەیکات لە کوشتنی هەردووولا!!

ئەمە لە رووی حوکمی شەرعەوە بەرامبەر ئافرەتێك کە مێردی هەبێت‌و پیاوی بە سەرەوە ببینرێت، ئەمما ئەوانەی کە بە زۆر لاقە دەکرێن، ئەوا وەکو وتمان هیچ تاوانێکیان نییە. لە رووی رەفتاری موسڵمانانیشەوە ئەوە شایەتی مێژوو و شایەتی واقیع دەیسلەمێنێت کە هەر کاتێك کۆمەڵگا پابەندبووبێت بە شەرعەوە نەك هەر دەستدرێژی کردن زۆر کەم بووە، بەڵکو زیناکردنیش زۆر کەم بووەو بە درێژایی حوکمی پێغەمبەر ﷺو چوار خەلیفەکە ژمارەی ئەوانەی سزا دراون لەسەر زینا بە پەنجە دەژمێردرێن‌و لاقەکردنیش زۆر لەوە دەگمەنتر بووە.

واقعی ئەمڕۆش ئەوە دەسەلمێنێت کە زیناو لاقەکردن لەناو کۆمەڵگە ئیسلامییە پابەندەکان زۆر زۆر کەمترە لە چاو کۆمەڵگە ناپابەندەکان، ئەم راستییەش ئەوەندە ئاشکرایە کە هەموو کەسێك هەستی پێ دەکات‌و هیچ کەسێك نییە بتوانێ نکۆڵی لێبکات مەگەر کەسێك کە شتەکان بە پێچەوانەوە دەبینێت.

ئەگەر بەڵگەشت دەوێ برۆ تەنها چاوێك بگێڕە بەو راپۆرتانەی باسی لاقەکردن دەکەن لە ئەمریکادا کە تێیدا خولەك نییە دەیان حاڵەتی لەو جۆرە روو نەدات، جگە لەو حاڵەتی زینایانەی کە بە رەزامەندیی هەردوولا ئەنجام دەدرێت، هەروەها تەماشای ئەو راپۆرتانە بکە کە باسی رێژەی لاقەکردنی کچی منداڵ‌و کوڕی منداڵ دەکات، هەروەها رێژەی ئەوانەی لە تەمەنی دوانزە ساڵی بە دواوە کچێنییان لە دەست داوە چ لە رێگەی زیناوە یان لاقەکردنەوە.

وەکو وتمان ئەو کەسانە جیاوازیی ناکەن لە نێوان داب‌و نەریتی کۆمەڵگەو بنەماو رێنماییەکانی ئیسلامداو بێئاگان لە حوکمی شەرع لەو مەسەلانەدا یان بە ئەنقەست خۆیان لە گێلی دەدەن و دەیانەوێ هەرچی پۆخڵەواتی کۆمەڵگە هەیە بەسەر ئیسلامدا ساغی بکەنەوە.

وەکو لەوە بەر وتمان هیچ کەسێك بۆی نەبووەو بۆی نییە لە رووی شەرعەوە هەڵسێت بە کوشتنی هیچ کەسێك لەسەر زینا جا چ ئەو کەسە خوشکی بێت یان کچی بێت یان دایکی بێت یان ژنی بێت، بەڵکو دەبێ شکاتەکەی بگەیەنێتە دادگاو

شایەت لەسەر دەعواکەی بێنێت ئەگینا داری حەددی بوختانی لێ دەدرێت و لەوەودواش شایەتییەکەی وەرناگیرێت مەگەر تۆبەیەکی راستەقینەی وا بکات کە بەرجەستەو ئاشکرا بێت و دەوروبەر شایەتی بۆ بدەن، ئەمما بە نیسبەت دایکەوە ئەوە هەر بە هیچ شێوەیەك کەس بۆی نییە دایکی خۆی بکوژێت، نەك هەر کوشتن بەڵکو ئازاردانیش لەبەر ئەوەی کە مافی دایك بەسەر منداڵەوە زۆر زۆرەو تەنانەت لە حاڵەتی کوفرو شیرکیشدا منداڵ بۆیان نییە خراپەیان لەگەڵدا بکەن تەنها ئەوەندە هەیە کە نابێ بە گوێیان بکەن. ئیتر نازانم نووسەر ئەم قسانە لەکوێوە دێنێت و دەیەوێ کێی پێ فریو بدات.

## رێنمایی بۆ ژنان و کاربەدەستان: فەرمودەی بینینی ئافرەتێك و چوونە ماڵەوە بۆ لای زەینەب

نووسەری سێکس و شەرع و ژن رووداوێك دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بینیوەو چووەتە ماڵەوە بۆ لای زەینەبی خێزانی و سەرجێیی لەگەڵدا کردووەو دوایی گەڕاوەتەوە ناو هاوەڵانی، ئەم رووداوە لە حاڵەتێکیشدا ئەگەر راست بێت ئەوە گەورەترین رێنمایی تێدایە بۆ کاربەدەستان و دەسەڵاتداران کە دەسەڵاتی خۆیان بەکار نەهێنن بۆ پەلاماردانی ژن و کچی خەڵکی وەکو ئەوەی عودەی کوڕی سەددام و زۆرێك لە عودەیەکانی تر دەیکەن بەوەی کە چاویان بە ژنێك یا کچێکی جوان دەکەوێت پاسەوانانی خۆیانی بۆ دەنێرن و بە خۆشی یا بە ترشی خۆی و کەسوکاری کاری ناڕەوای لەگەڵدا دەکەن و زەوتی دەکەن تا شەهوەتی بەرەڵڵا کراوی خۆیانی پێ تێر دەکەن.

پێغەمبەر ﷺ گەورەترین دەستوور دادەنێت بۆ پیاوان بە تایبەت دەسەڵاتداران بۆ ئەوەی چاو نەبڕنە نامووسی خەڵکی و وەکو گورگی برسی تەماشای ژن و کچی خەڵکی نەکەن و گەر کەسێکیشیان بینی سەرنجی راکێشان بە دوایدا نەچن بەڵکو بچنە لای ژنانی خۆیان و لەوێ خۆیان دامرکێننەوە.

هەمووو دەزانین ئەمڕۆ کاربەدەستان و لێپرسراوانی پیاو چۆن پێویستیی ئافرەتان بە هەل دەگرن بۆ فشار خستنە سەریان و پاشان لەرێ دەرکردنیان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی کە دەسەڵاتی تەنفیزی هەبوو بەسەر خەڵکیدا دەسەڵاتێکی رۆحیی بێ پایانیشی هەبوو بە سەریاندا، داوای هەرچییەکی لێ بکردنایە بێ سێ و دوو ئەنجامیان دەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی وای نەکردووە. ئەم رووداوە ئەگەر راست بێت گەورەترین خاڵی ئیجابییە بۆ پێغەمبەر ﷺ، چونکە یەکەم دەریدەخات کە خۆی خاوەنی تەشریع نییە بەڵکو خوا خاوەنێتی ئەگینا بەیەك قسە حەڵاڵی دەکرد بۆ خۆی و لە جیاتی ئەوەی بچێتە ماڵەوە بۆ لای خێزانەکانی دەینارد ئەو ژنەی بۆ بێنن و مارەی دەکرد.

## بەرپرسیارێتی ئافرەت لە پاك راگرتنی کۆمەڵگە

گەڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ماڵەوەو چوونی بۆ لای زەینەب رێنماییەکە بۆ ئافرەتان کە رەچاوی بارودۆخی مێردەکانیان بکەن و یارمەتییان بدەن بۆ دوورکەوتنەوە لە گوناه و کاری بێ شەرعی و ئەنجامدانی کاری ژن و مێردایەتییان بۆ ئاسان بکەن هەرچەندە ئەگەر دەستیشیان گیرابێ.

هەڵسوکەوت و ژیانی پێغەمبەر ﷺ دوای پێغەمبەرایەتی زۆربەی تەشریعە، زۆرجار پێغەمبەر ﷺ تەنها بۆ فێرکردنی خەڵکی هەندێك شتی کردووە.

ئەو قسەیەش، کە دەدرێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، کە گوایە فەرموویەتی ئافرەت لە شێوەی شەیتاندا دێت و دەچێت، ئەگەر راست بێت ئەوە بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە بە مەبەستی سەرنج راکێشانی پیاوو لە خشتەبردنیان خۆیان دەرازێننەوەو دەچنە دەرەوە، بەشێکی زۆر لە مەسئولییەتی پاك راگرتنی کۆمەڵگە دەکەوێتە ئەستۆی ئافرەتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە شەرع داوا لە ئافرەت دەکات بۆ مێردی خۆی خۆی برازێنێتەوە نەك بۆ خەڵکی تر.

**فەرموودەی: (الشؤم في المرأة والدار والفرس)**: مایەی بەدبەختیی لە ژن و ماڵ و مایندایە، ئەوە ناگەیەنێ کە ژن لە ریزی ئەسپ و مایندایە، بەڵکو گرنگی ئەو سێ شتە بۆ پیاو دەردەخات، ئەمەش راستییەکە تەنها کەسی نەزان نکۆڵی لێدەکات، ئەگینا کەس هەیە نەزانێ ژنی خراپ یان خانووی خراپ یان هۆکاری هاتوچۆی خراپ مایەی سەرئێشەو ناڕەحەتین بۆ مرۆڤ مەگەر کورد نالێت: ژن یا ژانە یا مایەی ژیانە! ئەی لەبەرامبەر ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ نافەرموێت: (دونیا جێێ

رابواردنێکی کاتییەو باشترین شتی دونیاش بۆ پیاو ژنێکی باشە، کە ئەگەر تەماشای کرد دڵی شادکاتەوەو ئەگەر فەرمانی پێکرد گوێڕایەڵی بێتو ئەگەر لێی دوور کەوتەوە ماڵو ناموسی بپارێزێت)، **(الدنیا متاع وخیر متاعها المرأة الصالحة، ان نظر الیها سرّته، وان أمرها اطاعته، وان غاب عنها حفظته في نفسها وماله) رواه مسلم 1467/ نسائي 6/69، ابن ماد 1855.**

یان دەفەرموێت: **(وان خیر هذه الأمة کان أکثرها نساء) بخاري/** 5069. واتە: چاکەکانی ئەم ئوممەتە (واتە موسڵمانان) زۆربەیان ژنانن.

یان دەفەرموێت: **(من یمن المرأة ان تلد بکرها انثی)** و دەیان فەرموودەی تر کە داوا لە پیاوان دەکات رێز لە ژنان بگرنو لێیان نەدەنو ئەزێتی رۆحیو جەستەییان نەدەنو دوا وەسیەتیشی لە **(حجة الوداع)**دا هەر ئامۆژگاریی پیاوان بوو بۆ ئەوەی چاك بن لەگەڵ ژنەکانیاندا.

لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە لەبەرامبەر ئەو فەرموودەیەدا کە دەفەرموێت: مایەی بەدبەختی پیاو لە ژنو خانوو مایندایە، فەرموودەیەکی تر هەیە دەفەرموێت: **(من سعادة ابن آدم ثلاثة: المرأة الصالحة، والمسکن الصالح والمرکب الصالح). رواه احمد وصححه ابن حبان والحاکم**، واتە: سێ شت لە هۆیەکانی بەختەوەری نەوەکانی ئادەمە، **"**ژنی باش، خانووی باش، ئامرازی هاتوچۆی باش**"**.

بۆچی ئەم نووسەرانە ئاماژە بۆ یەك لای هاوکێشەکە دەدەن و لایەکەی تر پشتگوێ دەخەن؟ هۆیەکەی ئاشکرایە و پێویست بە روونکردنەوە ناکات، ئەویش ئەوەیە کە هەر لە سەرەتاوە بڕیاریان داوە بە چاوێکی رەخنەگرانەو بە چاویلکەیەکی رەش تەماشای ئیسلام بکەن و هیچ پەڕەیەکی سپی تێدا نەبینن‌و ئەوانەشیان کە سپین ئەو هەر بە رەش نیشانیان بدەن.

## جیاوازیی فسیۆلۆژی و بایۆلۆژی نێوان ژن و پیاوو کاریگەریی لەسەر ئەرك و وەزیفەیان

زانستی نوێ قووڵیی جیاوازییە بایۆلۆژیو فسیۆلۆژیو دەروونییەکانی نێوان نێرو مێی دەرخستووەو دەریدەخات کە ئەو جیاوازیی ئەركو وەزیفەیە گونجاوە لەگەڵ جیاوازییە سروشتییەکانیاندا، بەڵام ئەوەی کە ئەمڕۆ دەکرێت لە بانگەشە بۆ دابەشکردنی ئەرکەکان بەسەر ژنو پیاودا بە یەکسانیو بەبێ رەچاوکردنی ئەو جیاوازییە سروشتییانە ئەنجامەکەی زۆر خراپ دەبێت بۆ سەر هەردوولاو ئافرەت بە شێوەیەکی تایبەتتر. ئەوەی لەم سەردەمەدا دەکرێت لە شێواندنی راستییەکان رەنگە لە هیچ سەردەمێکدا نەکرابێت ئەویش بە هۆی ئەم تەوژمە ماددییەی کە باڵی کێشاوە بە سەر مرۆڤایەتیداو قازانجی ماددی بووەتە مەبەستی یەکەمی هەموو دەوڵەتو کۆمپانیا و سەرمایەدارەکانو لەپێناویدا قوربانیی بە هەموو شتێك دەدرێت: بە راستی، بە شەرەفو کەرامەت، بە ئایین، بە نیشتمان، بە مرۆڤو مرۆڤایەتی، بە کورتی بە هەموو بەهایەك. ئەوەتا بازرگانانی جەنگ بۆ قازانجی ماددی خۆیان هەوڵ دەدەن ئاژاوە بخەنە هەموو دونیاوە، بازرگانانی تلیاك هەوڵ دەدەن هەموو خەڵکی فێری تلیاکخۆری بکەن، خاوەنی کۆمپانیاکانی نەوت هەوڵ دەدەن بە هەر شێوەیەك بووە دەست بگرن بەسەر هەموو چاڵەکانی نەوتی دونیادا، هەندێك لە سەرمایەدارەکان دەیان کەناڵی ئاسمانی بێ رەوشتیی دادەنێنو هەزارەها ئافرەتی بەرەڵڵا پەسیج دەکەن (بەکار دەهێنن) تەنها بۆ قازانجی ماددیی خۆیان بێ گوێدانە هیچ دابو نەریتێكو بەهایەکی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتیو مرۆڤایەتی.. هتد.

هەموو ئەو بانگەشانەی بۆ ئازادی ئافرەتو بەشداریی پێکردنی لە هەموو بوارەکانی ژیان بە یەکسانی لەگەڵ پیاوداو بێ گوێدانە جیاوازییە سروشتییەکان بەشێکە لەو دیاردە ماددییە بەرژەوەندپەرستەی شارستانێتی ئەمڕۆ کە هەموو شتێك بەلایەوە دروستە بۆ گەیشتن بە مەبەستو قازانجو چەواشەکارییەکی گەورەیە بۆ ئافرەت کە سەرەنجام ئافرەت بە پلەی یەکەم زەرەرمەندە تێیدا.

دەبینی دەوڵەتێکی داگیرکەر دێتە وڵاتێکەوە، لێیان دەکوژێ و ژێرخانی ئابووری وڵاتەکە دەڕوخێنێ و سامان و سەرمایەی بۆ خۆی دەبات، لەولاشەوە بانگەشە بۆ ئازادیی ئافرەتانی ئەو وڵاتە دەکات، ئەگەر ئەو مەبەستی رزگارکردنی ئافرەت بێت وڵاتەکەی داگیر ناکات و خێرو بێرەکەی بۆ خۆی نابات و پیاوانی ناکوژێت!

## خەتەنەی کچان

یەکێك لەو رەخنانەی ئاراستەی ئیسلام دەکرێت لە لایەن ناحەزانیەوە مەسەلەی خەتەنەکردنی ژنانە کە گوایە ئەوە ستەم و سوکایەتییە بەرامبەر بە ژن دەکرێت!

بابزانین ئەمە وایە یا بەڵگەی نەزانی و تێنەگەیشتنە:

پێش هەموو شتێك با بزانین پێغەمبەر ﷺ خۆی چی دەڵێت دەربارەی ئەم مەسەلەیە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **الختان سنة للرجال مكرمة للنساء.** واتە خەتەنە کردن سوننەتە بۆ پیاوان و رێزلێنانە بۆ ژنان. جارێ یەکەم دەرکەوت کە خەتەنەی کچان سوننەت نییە بە پێچەوانەی ئەوەی، کە زۆر کەس بۆی دەچێت، دووەمیش بۆ رێزلێنانە نەك بۆ سوکایەتی پێکردن، جا بابزانین چۆن؟

لە راستیدا بیرۆکەی خەتەنەکردنی ژنان و پیاوان یەك شتە ئەویش ئەوەیە کە لە ئەندامی مێینەی ئافرەتدا شتێك هەیە لە ئەندامی نێرینەی پیاو دەچێت، بەڵام قەوارەکەی زۆر بچووکترە، بەو رێژەیەی کە لە ئەندامی نێرینەی پیاو دەبڕدرێت لە هی ژنیش دەبڕێت.

ئەو بەشەی ئەندامی ئافرەت هەر هەمان ئەندامی پیاوە، بەڵام بە کاریگەریی هۆرمۆنی مێینە پووکاوەتەوە، ئەو بڕەی کە لێی دەبڕدرێت زۆر کەمترە لەوەی لە هی نێرینە دەبڕدرێت. ئیتر بۆچی بۆ پیاو رێزلێنان بێت و بۆ ژنیش چەوساندنەوە.

کوا بەڵگە لە قورئان و فەرموودە کە بڵێ حیکمەت لە خەتەنەکردنی پیاو بۆ ئەوەیە کە چێژ زیاتر وەرگرێت لە کاری سێکسی و بۆ ئافرەتیش ئەوەیە کە نەوروژێنرێت؟

زانستی پزیشکی سەلماندوویەتی کە مانەوەی ئەو پێستە بەسەر عەورەتەوە دەبێتە هۆی دوو شت:

1- هەوکردنی پێستەکە کە پێی دەوترێت (فایمۆسز) لە ئەنجامی کۆبوونەوەی پیسی لە نێوان پێستەکە و گۆشتەکە.

2- زیادی رێژەی شێرپەنجەی ئەندامی نێرینە.

هەر لەبەر ئەوەشە لە رووی پزیشکییەوە چاکترە منداڵی نێرینە خەتەنە بکرێت..

کەواتە ئەم سوننەتە دینییە زانست دەیسەلمێنێ کە شتێکی بە کەڵك و زانستییە.

گریمان خەتەنەکردنی کچان بۆ ئەوە بێت کە وروژاندن و خرۆشاندنیان کەمتر بکاتەوە، ئایا ئەمە خاڵێکی ئیجابییە یا سلبی؟

ئایا ئەگەر کەسێك یارمەتی بدرێت بۆ ئەوەی زیاتر زاڵبێت بەسەر غەریزەکان و هەڵچوون و داچوونەکانیدا و زیاتر بتوانێ کۆنترۆڵی خۆی بکات کارێکی باشە یا خراپ؟

ئاشکرایە کە هەموو مرۆڤێك تا زیاتر زاڵ بێت بەسەر ئارەزووەکانیدا و کۆنترۆڵیان بکات کەسایەتییەکەی بەهێزترە، بە پێچەوانەشەوە هەرکەسێك خۆی نەگرێت بەرامبەر ئارەزووەکانی ئەوا بە کەسێکی دەروون نزم یان کەسایەتیەکی لاواز لە قەڵەم دەدرێت.

ئەوەی زاڵ نەبێت بەسەر غەریزەی خواردن دا و کۆنترۆڵی نەفسی خۆی نەکات پێی دەوترێت نەوسن و دەروون نزم، ئەوەی زاڵ نەبێت بەسەر هەوەسی سێکسی خۆیدا پێی دەوترێت شەهوانی یان شەبەقی سێکس.

هەرکەسێك زاڵ نەبێت بەسەر سۆزەکانیدا و زوو هەڵچێت و تووڕە ببێت بە خاوەن کەسایەتییەکی لاواز لە قەڵەم دەدرێت.

هەر کچێك بە ئاسانی خۆی بدات بە دەست کوڕەوە هەموو کەسێك بە سووك تەماشای دەکات، هەتا گرانتر بێت ڕێزی لای پیاوو لە کۆمەڵگەدا زیاتر دەبێت.

کەواتە ئەگەر ئافرەتێك ئەو نەختە پێستەی بەسەر ئەو ئەندامۆچکەیەوەیە لێبکرێتەوە و بەوە ووروژان و خرۆشانی سێکسی کەمتر بێتەوە گەورەترین خزمەتە پێی دەکرێت، چونکە لە ئەنجامدا خۆڕاگریی زیاتر دەبێت و دەبێتە مایەی ڕێزی زیاتر بۆی. ئەمەش مانای فەرمودەکە کە دەفەرموێت: خەتەنە بۆ ئافرەتان ڕێز لێنانە.

لە ڕاستیشدا خەتەنەکردنی ئافرەت بۆ ئەوە نییە کە هەستی سێکسی کەمتر بکرێتەوە، بەڵکو یەکسانکردنێتی بە پیاو لە بڕینی بەشێك لەو ئەندامەیان کە لەیەك دەچێت و لە بناغەدا یەك شتن.

خەتەنەکردنی ئافرەت سوننەت نییە، بەڵکو شتێکی ڕێگەپێدراوە و لە پێش ئیسلامدا هەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی زۆرترو بە بڕینی بڕێکی زۆرتر لەو ئەندامۆچکەیە، پێغەمبەری ئیسلام ﷺ فەرمانیدا کە دەست سووك بکرێتەوەو ئەوەی ئەو کارە دەکات زۆر دەست دانەگرێت بەڵکو تا دەتوانێ کەمی لێبکاتەوە.

گریمان ئەم قسەیە ڕاستە و خەتەنەکردنی ژنان بۆ ئەوەیە کە هەوەسی سێکسییان کەم ببێتەوە، ئایا ئەمە دژ نییە لەگەڵ ئەو قسانەی کە دەڵێت ئایینی ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسبازە؟؟ ئەگەر ڕاستە ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسبازە نەدەبوایە کارێك بکات هەوەسی ژنان کەم بێتەوە، چونکە ئەمە کارێکی ڕاستەوخۆی لەسەر پیاوان دەبێ بەڵکو دەبوایە هەرچی ڕێگا هەیە بیگرتایەتە بەر بۆ ئەوەی هەوەسی ژنان زیاد ببێت بە ڕاددەیەك کە لە پیاو تێر نەخۆن بۆ ئەوەی پیاوان خۆشیان لە ئەنجامدا زیاتر ڕابوێرن وەکو ئەوەی کە ئێستا لە شارستانیەتی ڕۆژئاوادا دەکرێت!!

ئەگەر بڵێین مەبەست کوشتنی هەوەسی ژنان بووە ئەوکاتە دەبێ هەموو میللەتان تاوانبار بکەین بەوەی کە ویستوویانە هەوەسی ژنان بکوژن، چونکە نەریتێکی باوە لە ناو زۆربەی میللەتاندا.

لە کۆتاییشدا دەڵێین: سەرەڕای کوشتنی هەوەسی ژنان ئەم هەموو فەسادە هەیە لە دونیادا ئەی ئەگەر بێتو بوروژێنرێت چی ڕوو دەدات؟!

## تێڕوانینی ئیسلام بۆ سێکس

ئێستاش دوای ئەوەی تێڕوانینی ئیسلاممان زانی بۆ مرۆڤ بە گشتیی و ئافرەت بە تایبەتی کاتی ئەوە هاتووە باسی تێڕوانینی ئیسلام بکەین بۆ سێکس و ماباقی غەریزەکانی تری مرۆڤ بۆ ئەوەی وێنەکە بە تەواوی ڕوون بێتەوە بۆ خوێنەرو پاشان هەرچی شتی تر هەیە لە سەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستییانە شی بکرێتەوە.

وەکو وتمان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە مرۆڤ بە تایبەت بەدیهێنراوەو ڕێزێکی زۆری لێنراوەو جیاوازییەکی زۆری کراوە لە گیانلەبەران و باوی زۆری دراوە بەسەر هەموویاندا و هەرچی شت هەیە خراوەتە ژێر دەسەڵات و ئیختیارییەوە، ئاشکراشە کە ئەمانە هیچی بێ حیکمەت و بێ مەبەست نییەو حەتمەن دەرئەنجامێکی بەسەردا کەڵەکە دەبێت کە بە گوێرەی پلەو پایەو مەسئولیەتەکە بێت. شتێکی بەڵگەنەویستە لە دەستووری ژیاندا کە هەرکەسێك تا پلەوپایەی بەرزتر بێت مەسئولیەت و لێپرسینەوەی زیاتر دەبێت و ماف و ئەرکەکانی و تەنانەت هەڵسوکەوت و پەیوەندییەکان و شێوازی ژیانی جیاواز دەبێت لەگەڵ خەڵکانی تر داو دەبێ هەمووی گونجاو بێت لەگەڵ ئەو پلەو پایەیەی کە هەیەتی.

لێرەوە، هەڵسوکەوتی مرۆڤ و چۆنێتی ژیانی و ڕەفتارو ئاکارو هەموو شتێکی پێویستە جیاواز بێت لە هی ئاژەڵ و گیانلەبەرانی تر.

خوا کە مرۆڤی بە مرۆڤ و بەو تایبەتمەندێتییە دروست کردووە داوای لێدەکات کە ڕەفتارو ئاکاری مرۆڤانە بێت و گونجاو بێت لەگەڵ پلەو پایەیدا. هەندێك لەو ڕەفتارو ئاکارانە هەر بە غەریزە جیاوازە لە هی ئاژەڵان و هەندێکیش دەبێت خۆی جیای بکاتەوەو هەوڵ بدات مرۆڤانەی بکات، بەڵام شوێنکەوتووی ڕێبازەکانی تر بە تایبەت ئەوانەی کە مرۆڤ بە زنجیرەیەك

له زنجیرەكانی پەرەسەندن دەزانن‌و باوەڕیان وایە ڕەچەڵەكی مرۆڤ ئاژەڵ‌و گیانلەبەرانی پلە نزمن بەلایانەوە ئاساییە گەر ڕەفتاری ئاژەڵانە بێت‌و مامەڵەی لەگەڵ غەریزەكانیدا ئاژەڵانە بێت.

دەبینی مرۆڤ تەنانەت لەو غەریزەو شتانەی بەشدارە لەگەڵ ئاژەڵاندا مرۆڤانە بەكاریان دێنێ یان بە لایەنی كەمەوە جیاواز لە ئاژەڵ بەكاریان دێنێ‌و مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات، بۆ نموونە خواردن، دەبینی ئاژەڵان لەوەتەی هەن هیچ گۆڕانكارییەكیان لە جۆر و چۆنێتی خواردنیاندا ئەنجام نەداوەو هیچ پەرەیەكیان پێ نەداوە، ئەوانەی گۆشتخۆرن هەر گۆشت دەخۆن‌و باوو باپیرانیان چۆنیان خواردووە ئەوانیش هەروا بێ هیچ گۆڕانكارییەك، بەڵام مرۆڤ جۆری خواردنی خۆی زوو زوو دەگۆڕێت‌و هەر جارەی جۆرە خواردنێك دادەهێنێت‌و پەرەیان پێ دەدات‌و جۆرەكەی باشتر دەكات‌و شتی ئیشتیهاكەرەوە دادەهێنێت‌و سفرە دەڕازێنێتەوەو كاتی نانخواردنەكانی دیاریی دەكات‌و بۆنەو موناسەبەی بۆ دروست دەكات، بە كورتی ئیرادەو زەوق و زانست‌و عەقڵی خۆی لە دیاری كردنی جۆری خواردن‌و كاتی خواردن‌و شوێنی خواردن‌و ئەو كەسانەی لەگەڵیاندا دەخوات بەكار دەهێنێت‌و كۆنترۆڵی ئەو هەموو شتانە دەكات، بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە كە نە كۆنترۆڵی كاتی خواردن، نە جۆری خواردن‌و نە شوێن‌و بۆنەی خواردن ناكەن، بەڵكو تەنها بە حوكمی غەریزە دەجوڵێنەوە، كەی برسییان بوو دەگەڕێن بە دوای خواردندا یان ئەوانەی بە غەریزە فێركراون خواردن كۆ بكەنەوە (وەكو مێروولە) ئەگینا ڕۆڵی عەقڵ‌و ئیرادە لە هیچ شتێكدا نابینی‌و پەرەپێدان لە هیچ شتێكدا لە لایەن خۆیانەوە ئەنجام نادرێت.

هەروەها شوێنی ژیان‌و چۆنێتی ژیانیان هەریەكەیان (واتە ئاژەڵ) باو و باپیرانیان پێشتر چۆن ژیاون ئێستا هەروا دەژین بێ هیچ گۆڕانكارییەك‌و پەرەپێدانێك لە لایەن خۆیانەوە، بەڵام مرۆڤ ڕۆژ دوای ڕۆژ شوێن‌و چۆنێتی ژیانی خۆی دەگۆڕێت‌و بە بەردەوامی هۆیەكانی ژیانی خۆی پەرە پێدەدات‌و هەوڵ دەدات هۆیەكانی حەسانەوە بۆ خۆی دابین بكات‌و هەزارەها هونەری ئەندازیاری‌و بیناسازی دادەهێنێت‌و دەروبەری خۆی جوان دەكاتەوەو شوێنی سەیران‌و ڕابواردن‌و حەسانەوە بۆ خۆی دروست دەكات‌و بە بەردەوامی پەرەی پێدەدات، بە شێوەیەك كە ژیانی هیچ نەوەیەك لەوی پێشووی ناچێت.

غەریزەی سێكسیش بە هەمان شێوە، دەبینی ئاژەڵ هیچ گۆڕانكارییەك بەسەر ژیانیدا نایەت‌و ئاژەڵانە ئەنجامی دەدات بەو ڕادەیەی تێیدا چێنراوە بۆ بەردەوامیدان بە جۆری خۆی، كەچی مرۆڤ بە جۆرێك تێیدا چێنراوە كە وای لێبكات مرۆڤانە بژی‌و مرۆڤانە بەكاری بێنێ.

هەر جۆرە ئاژەڵێك بە جۆرێك ئەو غەریزەیە ئەنجام دەدات، زۆرێكیان وەرزی تایبەتیان هەیە بۆ زاوزێ، تەنها لەو وەرزەدا سێكس ئەنجام دەدەن‌و دوای ئەوە هەریەكەو بە لایەكدا دەچن‌و دواتریش بە زۆری مێینە بە تەنها هەڵدەستێت بە بەخێوكردنی بێچووەكانی‌و زۆربەیان دوای ماوەیەكی كەم پشت بە خۆیان دەبەستن.

بەڵام غەریزەی سێكس لە مرۆڤدا لە هەر لایەكەوە تەماشای دەكەیت جیاوازە لە هی ئاژەڵ‌و مرۆڤانە تێیدا چێنراوەو ئیسلام داوای لێدەكات مرۆڤانە بەكاری بێنێت:

سەرەتا دەبینی ئەم غەریزەیە لە مرۆڤدا بەردەوامەو بە درێژایی ساڵەو وەرزی تایبەتی بۆ نییە، ئەمەش بۆ ئەوەیە كە نێرو مێی مرۆڤ هەمیشە پێویست بكات بە یەكەوە بژین‌و نەتوانن دوور كەونە لە یەكتر.

دووەم: ئەم غەریزەیە ئەوەندە بەهێزە كە مرۆڤ لە پێناو دامركانەوەیدا ئامادە بێت هەموو فیداكارییەكی بۆ بكات، لەوانە: لە ئەستۆگرتنی لێپرسراوێتی ژیانی هاوسەری، دیارە ئەگەر ئەو غەریزەیە وا بەهێزو بەردەوام نەبوایە هیچ پیاوو ژنێك تاقەتیان نەدەبوو بەو شێوەیە بەیەكەوە بژین‌و هەموو ئەو لێپرسراوێتییەی ژیانی ژن‌و مێردایەتی دەیخوازێ هەڵگرن‌و تاڵی‌و ترشی ژیان پێكەوە بێ دەست لەیەك هەڵگرتن قبوڵ بكەن.

سێهەم: لەگەڵ ئەوەی كە مرۆڤ باڵاترین گیانلەبەرە لەسەر زەوی كەچی كۆرپەی مرۆڤ لاوازترین كۆرپەلەیەو لە كۆرپەلەی هەموو ئاژەڵێك درەنگتر دەتوانێ پشت بە خۆی ببەستێت، ئەمەش بۆ ئەوەیە كە دایك‌و باوك هەمیشە پێكەوە بن بۆ

بەخێوکردنو پێگەیاندنی ئەو کۆرپەلەیە، ئەوەندەش سۆزو بەزەییان تێدا چێنراوە کە ئامادە بن لە پێناویدا هەموو زەحمەتێك بکێشنو هەموو نارەحەتییەك قبوڵ بکەن.

چوارەم: دەبینی لەگەڵ ئەوەی مرۆڤ باڵاترین گیانلەبەرە کەچی پەردەی کچێنی تەنها لە مێینەی مرۆڤدا هەیەو لە هیچ گیانلەبەرێکی تردا نییە، ئەمەش ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر ئەوەی کە دەبێ ئەو پەردەیە لە ڕێوڕەسمێکی شکۆدارو مرۆڤانەدا لێ بکرێتەوە چ مانایەکی تر دەبەخشێت؟

لەگەڵ ئەم جیاوازییانەی نێوان مرۆڤو ئاژەڵو ئەم پێکهاتە تایبەتییەدا کە وای لێدەکات (ناچاری دەکات) مرۆڤانە بژی، ڕێنماییشی بۆ هاتووە لە لایەن بەدیهێنەرو پەروەردگارییەوە کە مرۆڤانە بژیو بە شێوەیەکی شیاوو بە گوێرەی ئەو پلەو پایەیە سوود لەو غەریزەو سیفەتو پێدراوانەی وەرگرێتو وەکو ئاژەڵ تەنها غەمی خواردنو ڕابواردنی نەبێت، بە نیسبەت خواردنەوە دەبینی ئەو خواردنانەی زیانیان بۆ لەشو عەقڵو دەروونی هەیە لێی قەدەغە کراوە (**وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ) (الأعراف: 157**).

بە نیسبەت غەریزەی سێکسیشەوە، داوای لێکراوە و ڕێنمایی کراوە کە مرۆڤانە بەکاریان بهێنێت، ئەوەتا چۆنێتی بەیەکگەیشتنی ئەو دوو ڕەگەزە دیاریکراوەو سنوورەکانی دیاریکراوەو تەشریعێکی دوورو درێژی بۆ دانراوە بۆ چۆنێتی پێکەوەژیانو هەڵگرتنی مەسئولیەتی ژیان پێکەوە، پەیامبەر ﷺ لە فەرموودەیەکیدا بە جوانی ئەم مانایەی بەرجەستە کردووە، ئەویش لەو بەشە فەرموودەیەی کە باسی کچێك دەکات کە لەبەر نەبوونیی ڕوو دەکاتە ئامۆزایەکی بۆ ئەوەی یارمەتی بدات ئەویش داوای پەیوەندیی ناشەرعی لێدەکات، کچەکە پێی دەڵێت: (**اتق الله ولا تفض الخاتم الا بحقه) متفق عليه، رياض الصالحين**. واتە: لەخوا بترسەو مۆرەکە بە حەقی خۆی نەبێت هەڵمەپچڕە. واتە: بە مارەبڕین نەك زینا، دەبینی لێرەدا کچ دەشوبهێنرێت بە نامەیەکی فەرمی یان شتێکی زۆر گرنگی مۆرلێدراو کە ئەو مۆرە دەبێ بە شێوەیەکی فەرمی هەڵپچڕێت لە لایەن ئەو کەسەی کە بۆی نێرراوە.

ئایینی ئیسلام بەمانەشەوە نەوەستاوەو ئیکتفای نەکردووە، بەڵکو سەرەڕای هەڕەشە بە سزای دوارۆژ سزای دونیایی جەستەییو دەروونیو کۆمەڵایەتیشی داناوە بۆ ئەوانەی کە ئاژەڵانە ئەو غەریزەیە بەکار دێننو ئەنجامی دەدەن، قورئان دەفەرموێت: (**وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً) (الإسراء: 32**). واتە: نزیکی زینا مەکەونەوە، چونکە کردەوەیەکی ناشیرینەو خراپترین ڕێگایەو ئەنجامەکەی خراپە.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (**ما عمل قوم الفاحشة علانية الا عمّهم الله بالطاعون والأوجاع التي لم تكن في اسلافهم**)، واتە: هەر کۆمەڵێك بە ئاشکرا زینا بکەن خوا دووچاری نەخۆشی درمو تووشی ئەو دەردانەیان دەکات کە لە پێشینان‌دا نەبووە، نەخۆشییەکانی سفلسو گۆنۆریاو ئایدز هەندێکن لەوانەی بە هۆی زیناو پەیوەندیی ناشەرعییەوە بڵاو دەبنەوە و بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستییە.

ئەمانە جگە لەو کاریگەرییە نێگەتیڤانەی کە لەسەر کۆمەڵگا هەیەتی، وەکو هەڵوەشانی خێزانو زیادبوونی ڕێژەی تەڵاقو بێ متمانەیی نێوان ژنو پیاوو بێنازکەوتنی منداڵانو.. هتد.

لە ئەنجامە خراپەکانی بڵاوبوونەوەی زینا پشتهەڵکردنی گەنجانو پیاوانە لە ژنهێنانو لە ئەنجامدا زۆربوونی ژمارەی کچانی شوونەکردوو کە ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەیبینین ئاشکرایە کە ئەمەش کاریگەریی زۆری لەسەر باری دەروونی هەردوولا هەیە.

بە کورتی گەر بمانەوێت زیانەکانی بەکارهێنانی غەریزەی جنسی بە شێوەیەکی نامرۆڤانەو لە ڕێگەی ناشەرعییەوە باس بکەین ئەوا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتمان دەوێت، تەنها ئەوەندە بەسە لێرەدا کە ئەوە بزانین ئەو زەرەرانە بۆ ئەوەیە کە پاڵ بە مرۆڤەوە بنێت بە شێوەیەکی مرۆڤانە ئەو غەریزەیە بەکار بهێنێتو ئەنجامی بدات.

کەواتە بە کورتی سێکس غەریزەیەکە لە مرۆڤو ئاژەڵدا بۆ هێشتنەوەی جۆرو ڕەگەز، لە مرۆڤدا بەهێزترو بەردەوامترە بۆ مسۆگەرکردنی پێکەوەژیانی نێرو مێو هەڵگرتنی مەسئولییەت پێکەوە، بەڵام داوای لێکراوە مرۆڤانە بەکاری بێنێتو لە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵو ئیرادەدا بێت، نەك عەقڵو ئیرادەی بخاتە ژێر دەسەڵاتی غەریزەوە. ئاشکرایە کە بەکارهێنانی ئەم ئیرادەو بیرکردنەوەیە بۆ زاڵبوون بەسەر داواکارییەکانی نەفسو جەستەدا شتی باشنو لە هەر کەسێکدا هەبێت دەلالەتی بەهێزی کەسایەتییەتی، بەڵام بە لای ئەمانەوە بە پێچەوانەوەیە، دەبێ مرۆڤ عەقڵو ئیرادەو بیرکردنەوەو هەموو شتێکی بداتە دەستی غەریزەکانیەوە بۆ کوێی بەرن بچێ بەدوایاندا، جا ئەگەر بڕیارە وەکو ئاژەڵ ڕەفتار لەگەڵ غەریزەکاندا بکەین ئیتر چ پێویستی بەو تایبەتمەندێتیو جیاکارییانە دەکردو چ زەرورەتێك هەبوو بۆ پەیدابوونی مرۆڤ لەسەر زەویو جیاکردنەوەی لە ئاژەڵ؟

کاتێك ئاژەڵێك نەخۆش دەکەوێتو دکتۆری ئاژەڵ دەرمانی بۆ دیاری دەکاتو هەندێك شتی لێ قەدەغە دەکات دەبێ مرۆڤئەو کارەی بۆ ئەنجام بدات، بەڵام کە مرۆڤ نەخۆش دەکەوێتو دکتۆر هەندێك خواردن یان شتی لێ قەدەغە دەکات خۆی بە ویستی خۆی پابەندی ئەو ڕێنماییانە دەبێتو هەر کەسێك پابەند نەبێت خەڵکیی بەبێ عەقڵو نەزانو بێ ئیرادەی لەقەڵەم دەدەن، وەکو کەسێك شەکرەی هەبێتو دکتۆر شەکرو هەندێك میوەی لێ قەدەغە بکاتو ئەو پێوەی پابەند نەبێت.

مرۆڤ ڕێنماییەکی زۆری بۆ نێرراوە دەربارەی چۆنێتی بەکارهێنانی سێکس و بۆ دابینکردنی پابەندبوون بەو ڕێنماییانەوە پەیمانی پاداشتێکی زۆری پێدراوە لەو دونیادا (واتە قیامەت)، لەبەرامبەر ئەوەشدا سزایەکی زۆری سروشتیو شەرعی دانراوە بۆ ئەوانەی لە دەرەوەی چوارچێوەی ژنو مێردایەتییدا ئەنجامی دەدەنو نامرۆڤانە بەکاری دێنن.

گومانی تێدا نییە کە ئەم غەریزەیە لە پیاودا بەهێزترە تا ئافرەت ئەویش لەبەر ئەوەیە پابەند بوون بە ژیانی ژنو مێردایەتییەوە زۆربەی مەسئولییەتەکەی دەکەوێتە ئەستۆی پیاوەوەو زیاتر دەیبەستێتەوە، جا ئەگەر ئەو غەریزە بەهێزە نەبێت بیبەستێتەوەو ناچاری بکات ئەو مەسئولییەتە هەڵگرێت هیچ پیاوێك ڕازی نەدەبوو خۆی ببەستێتەوە بە ژیانی ژنو مێردایەتیو هەڵگرتنی ئەو هەموو ئەرك و بەرپرسیارێتییە.

## واقعییەتی ئیسلام لە مامەڵە لەگەڵ سێکسدا

مەسەلەیەك هەیە ئەم نووسەرانە لێی تێ ناگەن و نایزانن، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر سەرنجی ژیانی پێغەمبەر ﷺو یارانی بدەی دەبینی هەوڵوێستیان بەرامبەر سێکس زۆر واقعیو هاوسەنگ بووە نە وەك مەسیحییەکان بە گڵاوی بزانن، یاوەکو هەندێك لە خەڵکی عەشایەر بە عەیبەی بزانن، بەڵکو بە شتێکی سروشتیو ئاسایی تەماشایان کردووە، بەڵام لە چوارچێوەی حەڵاڵدا، بۆ نموونە بە لایانەوە ئاسایی بووە چ پیاوو چ ژن گەر بێن بۆ لای پێغەمبەر ﷺو پرسیاری لێ بکەن دەربارەی سێکسو ژیانی ژنو مێردایەتی، یان بە لایانەوە سروشتی بووە گەر یەکێکیان بیگوتایە ئەمشەو لەگەڵ خێزانمدا بوومو فڵانە شت ڕوویدا بێ ئەوەی هەست بە حەرەجێك بکەن.

ئەوە شتێکی ئاساییە کە ئایینەکان بە گشتیی و ئیسلام بە تایبەتی باسی سێکس بکات و دەست وەرداتە ئەم بوارە و دەبێ هەر واش بێ، ئەگینا چ دەگوترا بە پێغەمبەران کە نێردراوی خوان بۆ ڕێنماییکردنی مرۆڤ گەر ئەم لایەنە گرنگەی ژیانی مرۆڤایەتییان فەرامۆش بکردایە.

ئایا چ دەوترێ بە کۆمپانیایەك گەر ئامێرێکی ئاڵۆز بخاتە بازاڕەوەو هیچ کەتەلۆکێکی لەگەڵدا نەنێرێت کە هەموو بەشەکانی ئەو ئامێرەو چۆنێتی بەکارهێنانیان ڕوون بکاتەوە؟ ئەی چۆن دەبێ خوای بەدیهێنەری مرۆڤ کەتەلۆکێك بۆ ئەم مرۆڤە نەنێرێت بۆی ڕوون بکاتەوە چۆن دروستکراوەو لە چی پێکهاتووەو چۆن سوود لە وزەو تواناکانی وەربگرێت.

ئێمە ئاوەها دەڕوانین بۆ ئایینو پێغەمبەران، گەر خەڵکانی تریش بە جۆرێکی تر بۆ ئەم شتانە دەڕوانن ئەوە ئارەزووی خۆیانە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە کاتی بەراوردکردندا بە ئینصافو بێلایەن بنو خیانەتو چەواشەکاری نەکەن وەکو ئەوەی ئەمجۆرە نووسەرانە دەیکەن.

ئیسلام کە دوا دەستوورو بەرنامەو پرۆگرامی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارە چۆن دەبێ قسەی لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤدا نەبێت، ئەی بۆ کێی بەجێ بهێڵێت؟ بۆ نەزانو شوێنکەوتووانی ئارەزووەکانی نەفس؟ مرۆڤ گەر بە هەواو ئارەزووەکانی نەفس یان بە نەزانی مامەڵە لەگەڵ دەقە نەگۆڕو پیرۆزەکانی ئایینیشدا بکات دەیانشێوێنێتو لە جیاتی ئەوەی بە خێرو چاکەی مرۆڤایەتی بگەڕێتەوە بە شەڕو نەگبەتیو دەردەسەری دەگەڕێتەوە بۆ سەری جا چ جای ئەگەر هیچ دەقێکیشی لەبەردەمدا نەبێتو تەنها شتێك پشتی پێ ببەستێت عەقڵی خۆی و بیرکردنەوەی خۆی بێت لە ژێر فشاری ئارەزووەکانو داواکارییەکانی نەفسدا.

ئەم قسانە لە خۆوە و بەبێ بناغە ناکەم بەڵکو واقعی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی گەورەترین شایەتن لەسەری، شایەت لەسەر ئەوانەی بە نەزانی یان بە گوێرەی ویستو ئارەزوەکانی نەفس مامەڵە لەگەڵ دەقەکانی ئیسلامدا دەکەن، ئەو ئیسلامییە توندڕەوانەن کە کوشتنو بڕینی بێ مەبەست بووەتە پیشەیان و وێنەی جوانی ئیسلامیان لەبەر چاوی مرۆڤایەتی ناشیرین کردووە، یان ئەوانەی ئیسلامیان کورت کردۆتەوە لە کۆمەڵە دروشمێکی ناشیرینو هێنانەوەی رابردوو بۆ ئەمڕۆو ژیان لە چوارچێوەی ململانێکانی رابردوودا وەك ئەوەی کە شیعە دەیکەن. شایەتیش لەسەر ئەوانەی بەبێ پشت بەستن بە پەیامەکانی خواو بە پشت بەستن بە عەقڵو بیرکردنەوەی مرۆڤ بەرنامە دادەنێن بارودۆخی ئەمڕۆی جیهانە لە هەڵوەشانی خێزانو بڵاوبوونەوەی ئیباحییەتو زیادبوونی رێژەی تەڵاقو ئیغتیصابو رفاندنی ئافرەتانو پەلاماردانو رفاندنی منداڵانو زەواجی نێر لە نێرو مێ لە مێو جووت بوون لەگەڵ ئاژەڵاندا بە راشکاویو بڵاوبوونەوەی تلیاکو ئایدزو زیادبوونی رێژەی کچی شوونەکردوو نەخۆشییە دەروونییەکانو دەیان شتی تر، کە ئێستا رۆژئاوا دەناڵێنێت بە دەستیانەوەو دڵسۆزانی ئەو وڵاتانە بە جددی هەوڵ دەدەن چارەسەری بکەنو لێرەو لەوێ دەنگی دڵسۆزانە بەرز دەبێتەوە بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانی خێزانیو نەهێشتنی هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی فەسادی ئەخلاقی.

بارودۆخی ئافرەتیش لە کوردستانی خۆماندا شایەتێکی ترە لەسەر ئەم راستییە، دەبینی رێژەی تەڵاق و رێژەی کچی تەمەن گەورەی شوونەکردوو، ئیغتیصابو کچ رفاندن و دیاردەی ئافرەت کوشتن ئەمانە هەموو روو لە زیادبوونن.

چ ئایینو مەزهەبو دەستوورو بەرنامەیەکی عەلمانی بە مارکسیەتو دیموکراسیو لیبراڵیو.. هتد توانیویەتی وەکو ئیسلام رێگا بۆ بەکارهێنانی ئەم غەریزەیەو ماباقی غەریزەکانی تری مرۆڤ دابنێتو بەو شێوەیەی کە ئیسلام ئاراستەی کردوون ئاراستەیان بکەن.

بەداخەوە ئەمڕۆ ئەوانەی هێرش بۆ سەر ئیسلام دەبەن زۆربەیان رۆژنامەنووسن یا نیمچە خوێندەوارن یان کەسانی ناحەزو دوژمنن کە مەبەستیان دەرخستنی راستیی نییە، بەڵکو تەنها مەبەستیان ناشیرینکردنی ئیسلامە، ئیتر هەر یەکەو بۆ مەبەستێك، یەکێك بۆ بژێویو یەکێك بۆ ناوو شوهرەتو یەکێك لە نەخۆشی و یەکێك لە رقو قینی خۆیو یەکێك بۆ بەدەستهێنانی پەناهەندەییو.. هتد.

## زەواجی ئیسلامی و ڕەخنەی چەپەکان

زۆرێك لە چەپەکان ڕەخنە لەم شێوە زەواجە دەگرن کە لە ناو موسڵمانانندا بەرپا دەکرێت و بە جۆرێك لە لەشفرۆشی لە قەڵەم دەدەن، بەڵام لەبەرامبەرەکەیدا شێوازێکی تر پێشنیاز دەکەن کە زیاتر ئاژەڵانە بێت نەك مرۆڤانە، کاتێك ئەم نووسەرانە ئەم جۆرە شێوازانە پێشنیاز دەکەن هیچ فکرمیەکیان نییە لەسەر داهاتووی کۆمەڵگەو مرۆڤایەتیی کە چی بەسەر دێت، منداڵ چۆن بەخێو بکرێتو کێ بەخێویان بکاتو کێ مەسئولیەتیان هەڵبگرێت، خزمایەتیو چەندین پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی تر کە لە ڕێگەی زەواجەوە پەیدا دەبن چییان بەسەر دێت؟.

ئەوان ئەگەر ژنهێنان بە لەشفرۆشی لە قەڵەم بدەن، ژنهێنانێك کە بریتییە لە دروستکردنی ژیانێکی هاوبەشی پڕ لە مەسئولییەت بۆ هەردوولا، کە دوو کەس بە ڕەزامەندیی خۆیان خێزانێك پێکدەهێنن، تاڵیو ترشی ژیان پێکەوە دەچێژن، منداڵ دەخەنەوە، پێکەوە بەخێویان دەکەنو گەورەیان دەکەنو دەیان پەیوەندیی خزمایەتیو کۆمەڵایەتییان بۆ دروست دەبێت لەگەڵ کەسوکاری هەردوولادا، گەر ئەمە بە لەشفرۆشی بزانن دەبێ کاری سۆزانییەکان کە تەنها بۆ دەستخستنی بژێوی لەشی خۆیان دەخەنە بەردەست هەموو پیاوێك یان ئەوانەی لەشی خۆیان بۆ پارە پەیداکردن دەکەنە وەسیلەیەك بۆ پڕوپاگەندە بۆ شتومەکی کۆمپانیاکان بە چی بزانن؟ ئەوەندە بەسە بۆ زانینی نیازی گڵاوی ئەم کەسانە کە دژایەتی ژیانی هاوسەرێتیی دەکەنو دەیانەوێت بیڕوخێنن لە کاتێکدا کە ئێستا هەزارەها دەنگی دڵسۆز لە ڕۆژئاوادا بەرز بۆتەوە بۆ گەڕانەوە بۆ ئەو ژیانە پڕ خۆشەویستیو ئاسودەییە.

وانەزانی ئەوانەی ڕەخنە لە ئاوەها پەیوەندیی کردنێك دەگرن شتێکی پیرۆزتریان لابێت، بەڵکو ئەوانە بانگەشە بۆ بەرەڵڵایی سێکسو هاوبەشی سێکسو نێربازیو هەموو جۆرە پەیوەندییە سێکسییە ناگونجاوەکان دەکەنو بە ناگونجاوترین شێوەش، ئەوانە دەیانەوێت چەمکی شەرەفو شەرعێتییو مرۆڤانەییو ئەو جۆرە شتانە هیچ بەهایەکیان نەمێنێتو مرۆڤ زۆر لە ئاژەڵ خراپتر کاری سێکسی ئەنجام بدات، چونکە لە ناو ئاژەڵاندا نێربازیو سێکسی هاوڕەگەز نییە، بەڵکو لە نێوان نێرو مێدایەو هەندێك لە ئاژەڵو باڵندەکانیش یەك هاوسەر دەگرنو بە ئاشکراش کاری سێکسی ئەنجام نادەن.

پەیوەندیی ژنو مێردایەتی پیرۆزترین پەیوەندییە و لە داهێنانی ئایینە نەك مرۆڤ و ئاسوودەترین کەشو هەوایە بۆ ژیانی پیاو و ژن و گەشەی جەستەییو دەروونیو عەقڵی منداڵ، بەو بەڵگەیەش دەڵێم هاوسەرگرتن داهێنانی ئایینییە نەك هی مرۆڤ، چونکە ئەوەتا کاتێك مرۆڤ لە ئایین دوور دەکەوێتەوە ئەو پەیوندییە بەو پیرۆزییەی ناهێڵێتو هەڵیدەوەشێنێتەوەو بە لای کەسانی دەروون نەخۆشەوە بە لەشفرۆشی لەقەڵەم دەدرێتو کاری ئەو پیاوە ئایینییانەی کە سەرپەرشتی ئەنجامدانی ئەو گرێبەندە پیرۆزە دەکەن بە دەڵاڵی لە قەڵەم دەدەن.

خوا زەواجی بە (**میثاق غلیظ**) ناو بردووەو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت چاك بن لەگەڵ ژنەکانتاندا، چونکە ئێوە بە (**أمانة الله**) و (**كلمة الله**) ئەوانتان بۆ حەڵاڵ بووە، بڕوانە (**میثاق غلیظ**)، (**كلمة الله**) (**أمانة الله**) نەك بە کرێ وەکو چەپ و بێبڕواکان دەیڵێن.

کەسێك کە نەخۆش بێت تامی هەموو شتێك لە دەمیدا تاڵە، هەروەها گەر کەسێك تێگەیشتنی بۆ شتەکان هەڵە بێت شتە جوانەکان بە ناشیرین دەبینێت، وەکو بە عەرەبی دەڵێن:

**وكم من عائب قولا صحيحا وآفته من الفهم السقيم**

واتە: زۆر کەس هەیە ڕەخنە لە قسەی ڕاست دەگرێت، کێشەکەشی لە تێگەیشتنی لارو وێری خۆیدایە نەك لە قسەکەدا.

## فەلسەفەی مارەیی ئافرەت

مارەیی کرێ نییە وەکو هەندێك لێی تێدەگەن، بەڵکو زەمانەتێکە بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتیی، بۆ پابەندکردنی پیاو بەو گرێبەندە پیرۆزەوە، لە کاتێکەوە بۆ کاتێك و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، ئەگەر کۆمەڵگە ماددی بوو، خەڵکیی کەمتر بایەخیان دەدا بە بەها مەعنەوییەکان ئەوا ئەو مارەییە باشتر وایە زۆر بێت بۆ ئەوەی پیاو ناچار بکات پابەند بێت بە پەیمانەکانی و مەسئولیەتی ژیانی هاوسەرێتی هەڵبگرێت و بە چاوێکی سووك تەماشای ئەو پەیوەندییە نەکات، ئەگەر هاتوو لە حاڵەتێکدا پیاو نرخی ئەو ژیانە هاوسەرێتییەی نەزانی یان نەیتوانی مەسئولییەت هەڵبگرێت یان ژیانی هاوسەرێتییان لەبەر هەر هۆیەك تێکچوو ئەوا دوای جیابوونەوە ئەو ئافرەتە بە دەستی خاڵی لەو ماڵە نەیەتە دەرەوە کە ژیانی خۆی لەسەر داناوە، ئەگەر هەندێك لەم رۆژەوە یان لە کۆمەڵگەی شارەوە تەماشای ژیان بکەن کە زۆرێك لە ئافرەتان فەرمانبەرو کارمەندی دەوڵەتن و تا رادەیەك دەتوانن پشت بە خۆیان ببەستن و بە جیابوونەوە لە مێرد کێشەیەکی ئابووری وایان بۆ دروست نەبێت ئەوا ئەوپەڕی بەڵگەی کورتبینی و نەزانییە، چونکە ئیسلام شەریعەتێکە بۆ هەموو کاتێك و هەموو شوێنێك و هەموو کۆمەڵگەیەکە چ شاریی بێت یان لادێیی، چ خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار، دیارە کە لە ماوەی ئەو هەزارو چوارسەد ساڵەی رابردوودا ژنان ژیانیان یا لەسەر ماڵی باوك بووە یان لەسەر مێرد، جا ئەگەر ئەو مارەییەیان بۆ نەبڕایەتەوە زۆرێك لەوانە دەربەدەرو بێ بژێوی دەمانەوە یان پیاوان زۆر بە ئاسانی دەستیان لێهەڵدەگرتن بە تایبەت پیاوانی ناپابەند بە ئایین و لە خوا نەترس، بەڵام بەو مارەییە هەم پابەندی مێرد بەو ژیانەوە و هەم دوارۆژی خۆشیان ئەگەر بێتو لە مێردەکانیان جیا ببنەوە مسۆگەر دەکەن.

ئەمە راستییەکە مەگەر کەسێك چاوی لە ئاستیدا بنوقێنێت نەیبینێت، خوای گەورە بۆ بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرێتی زۆر شتی داناوە کە لە ناخ و سروشتی هەریەك لە ژن و پیاودا هەیە بۆ ئەوەی ناچاریان بکات بەردەوامی بە ژیانی هاوسەرێتی بدەن و هەریەکەو کۆمەڵێك وەرەقەی فشاری بە دەستەوەیە بۆ ئەوەی بەکاری بێنێت بەرامبەر هاوسەرەکەی کە ئەگەر بەوە نەبێت بەرامبەرەکەی پابەند نابێت بەو ژیانەوە.

بۆ نموونە ژن هەوەسی سێکسی لە پیاو کەمترەو دان بەخۆداگرتنی زیاترەو شەرمیشی زیاترە، لەبەرامبەردا پیاو هەوەسی زیاترەو ئارامگرتنی کەمترە، لەبەر ئەوەی رۆڵی پیاو لە ئەنجامدانی کاری سێکسیدا ئیجابییە، شەرمی کەمترەو داواکەر بە زۆری (گەر بە هەمیشەیی نەبێت) هەر ئەوە، ئەمەیە ناچاری دەکات مل بۆ زۆرێك لە داخوازییەکانی ژن بدات، لەبەرامبەریشدا پیاو، چونکە سەرچاوەی پەیداکردنی بژێوییە لە ماڵدا ئەمە دەبێتە وەرەقەیەکی فشار بە دەستیەوەو وادەکات ژن مل بۆ داوکارییەکانی پیاو بدات، هەر گۆڕانکارییەك لەم هاوکێشەیەدا زیان لە ژیانی هاوسەرێتیی دەدات ـ لە زۆربەی کاتدا ـ جا هەر ئەمەشە وایکردووە پیاوانی ئێستا زیاتر بیر لە خیانەتی هاوسەریی بکەنەوە، چونکە لە ماڵەوە هیچ وەرەقەیەکیان بەدەستەوە نەماوە بەرامبەر ژنەکانیان و ناتوانن وایان لێبکەن بێن بەدەم داواکانیانەوە، چونکە هەریەکەو لە رووی ئابوورییەوە سەربەخۆیە، ئەمەش لە زۆرێك لەو خێزانانەی دەچنە هەندەران بەدی دەکرێت کە زۆرجار ئەنجامەکەی بە لەیەك جیابوونەوە تەواو دەبێت.

بەڵێ تەنها زەواجی موتعە دەتوانی بڵێی کرێیە بەرامبەر بە رابواردن، چونکە ماوەی بەیەکەوە بوونەکە دیاریی کراوەو بۆی هەیە تەنها بۆ یەك جار رابواردن بێت، ئەم زەواجەش لە هەموو مەزهەبەکانی ئەهلی سوننەدا حەرامەو تەنها شیعە ئەنجامی دەدەن، ئەویش یان لە رقی حەزرەتی عومەردایە، کە وا دەزانن ئەو قەدەغەی کردووە یان وەکو وەسیلەیەك بۆ راکێشانی خەڵکی بۆ سەر مەزهەبەکەیان بەکاریان هێناوە، بەهەرحاڵ ئەمە بابەتێکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زۆر هەیە و تایبەتە بە رێژەیەکی زۆر کەم لە موسڵمانان و ناکرێ گشتگیر بکرێت بەسەر هەموویانەوە، تەنها ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە بیڵێین ئەوەیە کە مارەیی لە زەواجی هەمیشەییدا بە کرێ لەقەڵەم نادرێت، چونکە یەکەم ماوەی ئەو بەیەکەوە ژیانە نازانرێت و بۆی هەیە رۆژێکیش نەبێت و تەنانەت گەر پێش چوونە لای ژنەکەش تەڵاقیدا ئەوا ژن نیوەی ئەو مارەییەی

پێ دەبڕێ، دووەم ژن یان کەسوکاری ژن سەرپشکن لە دیاریکردنی بڕی یان جۆری ئەو مارەییەدا، بۆی هەیە شتێکی ماددی بێت، زۆر یان کەم بە مەیلی خۆیان، بۆشی هەیە شتێکی مەعنەویی بێت بە گوێرەی متمانەی کەسوکاری کچەکە یان ژنەکە بە پیاوە داخوازیکەرەکە.

## ژنهێنان و تەڵاق لە مەسیحییەتدا

مەسەلەی ژنهێنان لە مەسیحییەتدا بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیوە لە ئەنجامدا بە بڕیاری کەنیسە فرەژنی و تەڵاق قەدەغە کراوە ئەگینا لە ئەصڵی ئایینی مەسیحیدا هیچ دەقێك نییە ڕێگر بێت لەبەردەم فرەژنیدا تەنها قسەیەکی (پۆڵص) نەبێت کە دەڵێت: "باشتر وایە قەشەکان یەك ژن زیاتریان نەبێت"، واتە بۆ غەیری ئەوان قەیناکا، (بڕوانە نامەی یەکەمی پۆلس بۆ تیماوس).

یەکێك لە ڕەخنەکانی مارتن لۆتەر لە کەنیسەی کاسۆلیکی قەدەغەکردنی فرەژنی بوو.

نووسەری گەورە عەباس مەحمود عەققاد لە هەردوو کتێبی (**حقائق الإسلام واباطيل خصومه**)و (**المرأة في القرآن الكريم**)دا شایەتیی چەندین زاناو مێژووناسی ئەورووپی دەهێنێتەوە لەسەر حەڵاڵی فرەژنی لە مەسیحییەتدا دەڵی: ویستەر مارکی زانای بڕواپێکراو لە مێژووی ژنهێناندا دەڵێ (فرەژنی بە دانپێدانانی کەنیسە تاکو سەدەی حەڤدە مابوویەوەو زۆرجاریش دووبارە دەبوویە). وە دەڵێ: (دیار ماسدت)ی پاشای ئێرلەندە دوو ژن‌و دوو کەنیزەکی هەبوو، هەروەها شارلمان دوو ژن‌و چەندین کەنیزەکی هەبوو.

لە ساڵی 1650ز دوای ئاشتبوونەوەی وسنفالیا و دوای ئەوەی کەمیی ڕێژەی پیاوان دەرکەوت لە ئەنجامی شەڕی (30) ساڵەدا ئەنجومەنی فەرەنکییەکان لە نۆرمبرگ بڕیارێکی دەرکرد ڕێگای دەدا بە پیاو یەك ژن زیاتر بێنێت.

لەوەش زیاتر هەندێك لە تایەفە مەسیحییەکان فرەژنییان بە پێویست زانیوە، لە ساڵی 1531ز نامەعمەدانییەکان لە مۆنستەر بە ڕاشکاوی داوای ئەوەیان کرد کە پیاوی مەسیحی مافی خۆیەتی زیاد لە یەك ژنی هەبێت، مۆرمۆنەکان، کە تایەفەیەکی مەسیحین فرەژنی بە یاسایەکی خواوەندی پیرۆز دادەنێن.

گۆستاف لۆبۆن دەڵێت: "شوێنکەوتوانی مۆرمۆنی ئەمریکی کە باوەڕیان بە فرەژنی هەیە ئەم بیروباوەڕە ڕێی ئەوەی لێنەگرتن پێشکەون و لە شوێنکەوتوانیدا هی وا هەیە دە ژن دەخوازێت، لە کاتی سەرهەڵدانیاندا پرۆتستانەکان شەڕێکی بنەبڕکەریان لەگەڵدا کردن کە ناچاری کردن هەڵبێن بۆ ویلایەتەکانی ترو لە ماوەی پەنجا ساڵدا مەدەنییەتێکی گەشاوەیان دامەزراندو بە هەوڵ‌و ڕەنجی خۆیان پیشەسازییەکی پێشکەوتوو و کشتوکاڵی زۆرو کارگەی گەورەو شاری پێشکەوتوویان پێکهێنا".

پرۆفیسۆر جبری دەربارەی تێبینییەکانی خۆی لە ئەمەریکادا دەڵێت: مۆرمۆنەکان مەسیحین، باوەڕیان وایە کە کاسولیك‌و پرۆتستانت مەسیحیی ڕاستەقینە نین‌و ئەو مەسیحییەتە نانوێنن کە حەزرەتی مەسیح ویستوویەتی. ئەمانە جگە لەوەی کە حەزرەتی عیسا خۆی بە تەواوکەری پەیامەکەی موسا و پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل دەزانێت‌و بە ڕاشکاوی دەڵێ: من بۆ ئەوە نەهاتووم هیچ شتێك لە شەریعەتی پێغەمبەرانی پێش خۆم بگۆڕم "**لا تظنوا أني جئت لأنقض الناموس أوالأنبياء، ما جئت لأنقض بل لأكمل، فاني الحق أقول لكم: الى أن تزول السماء والأرض لايزول حرف واحد أو نقطة واحدة من الناموس حتى يكون الكل**"، **انجيل متى أصحاح** /67.

ئاشکرایە کە فرەژنی لای پەیامبەرانی بەنی ئیسرائیل‌و لەوەوپێش لای ئیبراهیم (درودی خوای لەسەر بێت) شتێکی ئاسایی بووەو بە قسەی تەورات تەنها سولەیمان (700) ژن‌و (300) کەنیزەکی هەبووەو داود (99) ژنی هەبووە، کەواتە عیسا کە بە قسەی خۆی تەواوکەری ئەو شەریعەتەیە چۆن فرەژنی قەدەغە دەکات؟ قەدەغەکردنی فرەژنی بە بڕیاری پیاوانی کەنیسە بوو نەك بە ڕێنمایی حەزرەتی عیسا.

پیاوانی ئایینی مەسیحی هەروەکو چۆن عەقیدەی مەسیحییەتیان ئالۆزکردۆتەوەو عەقیدەی یەکتاپەرستییان گۆڕی بە سێ خوایی و مەسەلەی فیداکاریو لەخاچدان و ژەمی پیرۆزیان داهێنا کە چەند شتێکی ئالۆزن و قابیلی تێگەیشتن نین، بە هەمان شێوە مەسەلەی هاوسەرێتیشیان ئالۆز کردۆتەوەو دەڵێن: "ئەوەی خوا گرێی بدات تەنها دەبێت ئەو بیکاتەوە"، واتە کورو کچ کە دەبنە هاوسەر تا یەکێکیان نەمرێت کەس ناتوانێ ئەو گرێبەندە هەڵوەشێنێتەوە، ئاشکرایە، کە ئەمەش ئالۆزکردنەوەی مەسەلەکەیەو هیچی تر، لەبەر ناواقیعی ئەم بۆچوونە مەسیحییەکان نەیانتوانیوە پابەند بن پێوەیو ناچار بوون مەسەلەی تەڵاقدان بە پارە بکەن کاتێك کە پێکەوەژیانی ژنو پیاو ئەستەم دەبێتو دەگاتە بنبەست، ئەگەر واشبێت کە گرێبەندیی ژنهێنان، کە گرێبەندێکە مرۆڤ پێی هەڵدەستێتو ئەنجامی دەدات بە کەس هەڵنەوەشێتەوە، کەواتە دەبێ هەرچی شتێك خوا کردوویەتی بە کەس دەستکاریی نەکرێتو ئەو کاتە کوشتنی ئاژەڵ حەرام بێت، چونکە خوا ژیانی پێداوەو بەو پێوەرەی مەسیحییەت بێت کەس بۆی نییە ژیانێك خوا داویەتی کۆتایی پێ بێنێت خوا خۆی نەبێت با هی ئاژەڵیش بێت! ئەمانە جگە لەو هەموو گۆڕانکارییانەی، کە پیاوانی ئایینی مەسیحی لە ئایینەکەیاندا ئەنجامیانداوە کە بە چاوخشاندنێك بەو کۆنگرە گێتیی هەرێمیانەی گرتوویانە قەوارەکەیت بۆ دەردەکەوێت. (لەمەودوا باسی دەکەین)

## ڕۆڵی ژن لە هەڵبژاردنی هاوسەر و بوارەکانی تردا

خوای گەورە دەفەرموێت: (**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْاْ بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ..**). واتە: ئەگەر ژنتان تەڵاق داو عیددەیان تەواو بوو ڕێگەیان لێمەگرن شوو بەو کەسەی خۆیان دەیانەوێت بکەن ئەگەر رازی بوون بەیەك.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (**لا تنكح الأيم حتى تستأمر ولا تنكح البكر حتى تستأذن، قالوا يا رسو ل الله وكيف اذنها؟ قال: ان تسكت). رواه بخاري ومسلم.**

واتە: بێوەژن بە بڕیاری خۆی شوو دەکات، واتە شووکردنی بە دەستی خۆیەتیو خۆی خۆی بەشوو دەدات، کچیش نادرێ بە شوو تا پرسی پێ نەکرێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گفتدانی کچ چۆنە، فەرمووی: بێدەنگ بوونی نیشانەی رازی بوونێتی.

لە فەرموودەکەی عائیشەشدا هاتووە: (عن **عائشة (رضي الله عنها) إنها قالت يا رسول الله ان البكر تستحي، قال رضاها صمتها**)، عائیشە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کچ شەرم دەکات، فەرمووی بێدەنگییەکەی نیشانەی رازی بوونێتی.( بخاري). بەو مەرجەی ئەو بێدەنگییەی لە ترساندا نەبێت، بەڵکو لە شەرما بێت.

**عن خنساء بنت خدام الأنصارية: ان أباها زوجها وهي ثيب فكرهت ذلك، فأتت رسول الله ﷺ فرد نكاحه**. واتە: خەنسای کچی خودام، دەڵێت باوکی بەمێردیدا (ئەوکاتە بێوەژن بووە)، بەڵام حەزی لێنەبوو، هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەرش هەڵیوەشاندەوە.

**عن أبن عباس: ان جارية بكر أتت النبي ﷺ فذكرت ان أباها زوجها وهي كارهة فخيرها، النبي ﷺ. أبو داود.**

واتە: لە ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: کچێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وتی: باوکی بە مێردی داوەو ئەو رازی نییە، پێغەمبەریش ﷺ سەرپشکی کردو شتەکەی دایە دەستی خۆی.

بەسەرهاتی ئەو کچەش کە هات بۆ لای پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکم دەیەوێت بە زۆر بمدا بە ئامۆزاکەمو دەیەوێت کەموکورتی ئەوم پێداپۆشێت، ئەگەر بەدڵم نەبێت بۆی هەیە زۆرم لێبکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی نەخێر، کچەکەش وتی: سوێند بەخوا تەنها ویستم بۆ کچانی دەربخەم کە باوکان بۆیان نییە بە زۆر بەمێردیان بدەن.

بڕوانە ئەم هەستەی لەم ئافرەتەدا هەیەو ئەم تێگەیشتنەی بۆ ئیسلام و ئەم سووربوونەی لەسەر دەرخستنی مافی ئافرەت لە هەڵبژاردنی هاوسەری خۆیاندا.

ئەوە بە نیسبەت ڕۆڵی ئافرەت لە هەڵبژاردنی هاوسەردا، لە بوارەکانی تری ژیانیشدا وەکو سیاسەت و زانست و کۆمەڵایەتیی و پەرستیاری و پزیشکی و کڕین و فرۆشتن و خاوەنداریێتیی.. هتد، سەدان نموونەمان هەیە بۆ ئافرەتی بلیمەت و هەڵکەوتوو کە شوێندەستیان دیارەو ئەوەندە بەسە کە هەموو ئەوانەی ژیاننامەی زانایان و خواپەرستان و بلیمەتەکانیان نووسیوە هەمیشە بەشێك لە کتێبەکانیان تەرخان کردووە بۆ ئافرەتە ناودارو بلیمەتەکانی و دونیای ئیسلام. ئەوە خەدیجەو فاتیمەو عائیشەو ئوم سەلەمەو حەفصەو زوبەیدەی ژنی هارونەڕەشیدو **شجرة** الدر و رابیعەی عەدەوی و خەنساو هەزارانی تر کە لێرەدا بوار نییە بۆ تۆمارکردنی ناوەکانیان.

لە مێژووی ئیسلامیدا روونە کە ئافرەت بەشداریی هەموو چالاکییە کۆمەڵایەتیی و تەنانەت سەربازی و سیاسییەکانیشی کردووەو ئەگەر لە سەردەمێکدا یان لە شوێنێکدا زۆر سنووردار کرابێت و خزێنرابێتە ناو ماڵەوە ئەوە وەکو وتمان داب و نەریتی کۆمەڵگە بووە کە پیاوسالاریی فەرزی کردووە نەك شەرع، ئەوەتا لە سەرەتای مێژووی ئیسلامدا ئافرەت چوون بۆ شەڕو برینپێچییان کردووەو تەنانەت فەرماندەیی لەشکریشیان کردووە (وەکو حەزرەتی عائیشە) و دەرس و دەوری مزگەوتیان هەبووە، ئافرەتی وا هەیە سەدەها قوتابی هەبووە و زۆربەیان پیاو بوون، لە کاتی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانیشدا چوون بۆ مزگەوت و گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەرو خەلیفەکانیشدا کردووەو بەرگرییان لە مافی خۆیان کردووەو رای خۆشیانیان دەربڕیوەو لە مەسەلەکان. کۆمەڵگای کوردەواری پێشینی خۆشمان کە زۆر پابەند بوون بە ئیسلامەوە دەموچاو داپۆشین نەبووەو ژنان لەگەڵ پیاواندا کشتوکاڵ و ماڵدارییان کردووە، لە زۆرێك لە سەردەمەکانی ئیسلامدا ئافرەت بە فیعلی حوکمڕانی کردووەو دەستی خستۆتە کاروباری دەوڵەتەوە بۆ نموونە (**شجرة الدر**) لە میسر.

## ژن لەم رۆژەدا ئامرازە بۆ خۆشییەکانی پیاو یان لە ئیسلامدا؟!

هەندێك کەس دەڵێن ژن هۆکارێك بووە بۆ تێربوون و ئامرازێك بووە بۆ خۆشییەکانی پیاوو هەمیشە لە ئامادەباشیدا بووە بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییە پڕ لە حەزەکانی پیاو!

ئەگەر کەمێك بە ئینصافەوە بڕوانین بۆ شتەکان زۆر بە روونی دەردەکەوێت کە ئەم قسەیە بەسەر ئەمڕۆدا دەچەسپێ نەك بەسەر ئیسلامدا، ئافرەت ئەمڕۆ بووەتە ئامرازێك بۆ رابواردنی پیاوو بەدەستهێنانی قازانجی ماددی و مامەڵە زیاتر لەگەڵ لاشەی ئافرەتی جواندا دەکرێت و بە هەموو شێوەیەك بەکار دەهێنرێت و لەژێر دروشمی فریودەری جۆراوجۆردا کە لە ئەنجامدا دەردەکەوێت بە پلەی یەکەم ئافرەت زەرەری لێکردووە.

نازانم ئەوانەی ئەم جۆرە قسانە دەکەن گێلن یان خۆیان لە گێلی دەدەن ئەگینا کەس هەیە نەزانێ ئافرەتی ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر بۆ مەبەستی سێکسی بەکار دێت! تەنها بەیەك چاوخشاندن بە سایتەکانی ئینتەرنێت و سەتەلایت و کەناڵەکانی گۆرانی و فیلمی سێکس و ڤیدیۆ سیدی و کتێبی سێکسیی چاپکراو بۆت دەردەکەوێت مرۆڤایەتی تا کوێی چەقیوە لە زۆنگاوی بەرەڵڵایی سێکسی و ئیباحیەتدا.

پێناچێ بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی مرۆڤ بەم رادەیەو بەم بەرەڵڵاییە سێکسی ئەنجامدا بێت، رەنگە لە هەندێك سەردەمدا لە هەندێك شوێندا بەرەڵڵایی سێکسی هەبووبێت، بەڵام لە هیچ سەردەمێکدا وەکو ئەم سەردەمە ئیباحیەتی سێکسی دونیای نەگرتۆتەوە.

هەندێك نووسەر دەڵێن لە کۆمەڵگا مەدەنی و مۆدێرنەکاندا سێکس کێشە نییە، بەم هۆیەوە توانیویانە بە سەر زۆرێك لە کێشە دەروونی و جەستییەکاندا زاڵ بن و ئەنجامیش کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی مەدەنی و مرۆڤی رێزداری داهێنەری تێدا ببینرێت و کەس بە هۆی سێکسەوە تووشی کەرامەت شکاندن نەبێت.

جا ئایا ئەمە وایە؟ هەر بەڕاستی سێکس لە ڕۆژئاوادا کێشە نییە؟ ئەی ئەو هەموو کچ ڕفاندنو ئیغتیصابو منداڵ ڕفاندنە چین؟ بڕۆ سەرژمێرییەکانی ئەمەریکا بخوێنەرەوە کە پێشکەتووترینیانە بزانە تەنها لە یەك سەعاتدا چەند کچ دەڕفێنرێتو چەند حاڵەتی ئیغتیصاب ڕوو دەدات!

بۆچی دوور بڕۆین، ئەوە سلێمانییەکەی لای خۆمان، لەوەتی ئازادی سێکسیی تێیدا سەپێنراوەو خەریکە وەکو ڕۆژئاوای لێدێت "گەر پێشی نەدابێتەوە". کچانو ژنان ناوێرن بە دڵنیایی و بەبێترس و بە تەنیا سواری تەکسی ببن، ڕێژەی ئیغتصاب کردن زیادی کردووە، ڕێژەی تەڵاق بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە، ئاستی زانستی قوتابی زۆر نزم بۆتەوە، ڕێژەی مەشروبخواردنەوەو جگەرەکێشان بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان کردووە، ئەمانە جگە لەو شتانەی تریش کە بەڕێوەن لە سەرهەڵدانی دیاردەی تلیاکخۆریو ئایدزو زیادبوونی ڕێژەی نەخۆشیی دەروونی لە گەنجانداو زیادبوونی ڕیژەی ئافرەتی شوونەکردوو و بێنازبوونی پیرو پەککەوتەکانو دەیان نەخۆشی کۆمەڵایەتی تر کە هەمووی خێرو بیری ئەم ئازادییەیە!

لێکۆڵینەوەو لۆژیكو واقیعیش دەیسەلمێنن کە هەستو سۆزی مرۆڤایەتیو تەندروستی دەروونیو عەقڵیو جەستەییش لە کۆمەڵگەی ئایینیدا زیاترە لە هی کۆمەڵگەی نائایینی، ئەویش بە کورتی لەبەر ئەوەی لە کۆمەڵگەی ئایینیدا کوڕ زووتر ژن دەهێنرێت، چونکە ڕێگایەکی تری دەست ناکەوێت بۆ تێرکردنی هەوەسی سێکسیو لە ئەنجامدا کچیش زووتر مێرد دەکاتو گەورەکچی شوونەکردوو یا نامێنێت یان زۆر کەم دەبێتەوە، هەروەها ڕێژەی خیانەتی هاوسەرێتیی زۆر کەم دەبێتەوە بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی نائایینیەوە کە لەبەر ئەوەی بوار زۆر ڕەخساوە بۆ ئەنجامدانی سێکس، گەنجان کەمتر ڕوو لە ژنهێنان دەکەن، ئەوان کە بە خۆڕایی بتوانن هەوەسی سێکسی خۆیان دامرکێننەوەو هەر ڕۆژەی لەگەڵ کەسێکدا ڕابوێرن بۆچی خۆیان بخەنە ژێر باری ئەو مەسئولییەتەوە، لە ئەنجامی ئەمەشدا کچی شوونەکردوو زیاد دەکاتو لە ئەنجامی تێکەڵی بێ سنووری پیاوو ژندا خیانەتی زەوجی زۆر دەبێتو ڕێژەی تەڵاقیش زیاد دەکات، ئەمانەش هەموو کاریگەریی نێگەتیڤیان هەیە لەسەر کۆمەڵگە لە ڕووی دەروونیو جەستەییو کۆمەڵایەتییەوەو کاریگەریی ڕاستەوخۆی دەبێت لەسەر زیادبوونی ڕێژەی تاوانو تلیاك خواردنو مەشروب خۆریو نەخۆشی سێکسیو دەروونیو.. هتد.

لە کۆمەڵگەی ئایینیدا بە تایبەت کۆمەڵگەی ئیسلامی، هانی ژنهێنانی زوو دەدرێت، بەڵام لە کۆمەڵگەی نائایینیدا وەکو ئەوانەی ئەمڕۆ زۆربەی شوێنەکانی دونیا کە نووسەر ناوی دەنێت کۆمەڵگەی مەدەنیو دەڵێ کێشەی سێکس تێیدا نییە بە پێچەوانەوەیە، چونکە لە ئەنجامی تێکەڵی بێسنوورو زیادبوونی کەناڵە سێکسییەکانی سەتەلایتو سایتە سێکسییەکانی ئینتەرنێت گەنجان هەمیشە لە حاڵەتێکی وروژانی سێکسیدا دەژینو خەیاڵی سێکس لە مێشکیان دوور ناکەوێتەوە، ئەمەش پاڵیان پێوەدەنێ بەرەو توندوتیژیو لادانی سێکسیو پەلاماردانی کچانو ڕفاندنیانو پەنابردنە بەر مادده سڕکەرەکانو مەشروب خواردنو جگەرە کێشانو پشتگوێ خستنی خوێندنو بەجێهێشتنی قوتابخانەو دەیان شتی تری لەو بابەتە نەك وەك ئەوەی ئەم نووسەرانە وڕێنەی پێوە دەکەنو وادەزانن باسی دونیایەکی تر دەکەن کە کەس نەیبینیێو ئاگاداری نەبووبێت.

## لە نێوان یاساکانی ئیسلام و ڕێبازەکانی تردا

هەندێك دەڵێن یاساکانی ئیسلام دەربارەی سێکس و لە ڕێکخستنی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاودا مرۆڤانە نین!

ئێمە لە وەڵامدا دەڵێین ئەگەر یاساکانی ئیسلام مرۆڤانە نەبن چ یاسایەك دەربارەی سێکس مرۆڤایەتییە؟ نێربازی یان ئاژەڵبازی پیاو؟ یان مێبازیی و ئاژەڵبازی ژن؟ یان هاوبەشی سێکسی وەکو شەریعەتی مەزدەك؟ یان بەرەڵڵایی سێکسی وەکو ئەمڕۆی ڕۆژئاوا کە تێیدا پیاو بە ناو یەك ژنی هەیەو لە ژێرەوە سەدان دۆست؟ یان ژنیش بە ڕەسمی یەك مێردی هەیەو لەژێرەوە سەدان دۆست؟

یا ئەوانەی ڕۆژئاوا کە ژنی وا هەیە سێ و چوار منداڵی بە دواوەیە، هەر یەکەو لە ڕەنگێك، هەریەکەو بەرەی پیاوێك، باوکەکانیان وەکو ئاژەڵ تەنیا ماوەیەك لەگەڵ ژنەکەدا ماونەتەوەو دوایی بەجێیان هێشتووەو ژنەکە وەکو مێینەی زۆربەی ئاژەڵان گیرۆدەی دەستی ئەو منداڵانە بووەو لەبەر ئەو موچەیە نەبێت کە میریی بۆ ئەو منداڵانەی بڕیوەتەوە، ئەویش صەد شەقی تێهەڵدەدان و بەرەڵڵای دەکردن!

یان یاسای بابلییەکان کە ئافرەت وەکو کەرەسەیەك وابووە بە دەستی پیاوەوە، بۆی هەبوو لە جیاتی قەرز بیدات بە خاوەن قەرزەکە؟

یان یاسای هندۆسەکان کە ژن وەکو کۆیلە دەکڕاو دەفرۆشراو دەبوایە دوای مردنی مێردەکەی بە زیندوێتیی بسوتێنرایە، هەندێك جار پێش سوتاندنی لاشەی مێردەکەی و هەندێك جاری تریش بە زیندوێتی دەخرایە چاڵەوە.

یان یاسای چینییەکان کە بە ڕای گەورەترین زانایان کە کۆنفوشیۆسە ژن یەکێکە لە سەرچاوەکانی بەدبەختی مرۆڤایەتی و بە چاوی سووك تەماشای ژن دەکراو پیاو بۆی هەبوو ژنەکەی خۆی بفرۆشێت ئەگەر پێویستی بکردایە.

یان یاسای یۆنانییەکان کە پێیان وابوو ژن هیچ کەڵکێکی نییە جگە لە پاراستنی ڕەگەزو بەڕێوەبردنی ناوماڵ نەبێت، هەر کاتێکیش منداڵێکی ناتەواوی بوایە دەیانکوشت و هەر ژنێکیش سکی زۆری بکردایە لە مێردەکەیان دەسەندو پیاوانی تر دەچوونە لای بۆ ئەوەی منداڵی زۆری بهێنایە بۆ نیشتمان بە قسەی خۆیان. گەورەترین فەیلەسوفیان کە (**ارسطو طالس**)ە، دەڵێت: "پیاو بۆ جوامێرترین ئیش دروست کراوە کە بیرکردنەوەیەو ژنیش بۆ وەچە خستنەوە".

یان یاسای ڕۆمانییەکان کە ئەوانیش لە سەرەتای هاتنیاندا وەکو یۆنانییەکان بە چاوێکی سووك تەماشای ئافرەتیان دەکردو پیاو یان باوك ئەوپەڕی ئازاد بوو لە هەر شتێکدا کە بیویستایە بیکات بە ژن و کچەکانی لە فرۆشتن و بەکرێدان و تەنانەت کوشتنیش، وەکو هەر کەرەستەیەکی تر کە لەبەردەستی پیاودا بوو تەماشای دەکرد.

یاسای ڕۆمانی ڕەگەزی مێینەی وەکو منداڵی و شێتی بە هۆیەك لە هۆیەکان لە دەستدانی شایستەیی (أهلیە) لە قەڵەم دەدا لە میرات و شایەتی و موڵکدارێتیی و کڕین و فرۆشتن. دواتریش کە ئافرەت دەسەڵاتی پەیدا کردو بەشداریی پیاوانی کرد لە کۆڕو کۆبوونەوەو دیاریکردنی پیاوانی سیاسەت و بڕیاری سیاسیدا جارێکی تر پیاوان ویستیان شتێکی کۆدەتا ئاسایان لێ بکەن و هەوڵ بدەن بیانگێڕنەوە دۆخی جارانیان، چونکە وایاندەزانی هەڵوەشانی ئیمپراتۆرییەتەکەیان بە بۆنەی بەرەڵڵایی ئافرەت و دەستێوەردانیان لە هەموو بوارەکانی ژیان بوو.

لە دوا دواییەکانی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆمانیدا بەرەڵڵایی سێکس و تەڵاق و زینا وا بڵاوبوویەوە کە بووبووە دیاردەیەکی بەرچاوی ئەو شارستانییەتە.

یان یاسای جولەکە کە وەکو وێل دیورات دەڵێت: بە لای جولەکەوە شایەتی سەد ژن ئینجا بە شایەتی پیاوێکی دەخوارد، هەموویان ئافرەتیان بە مایەی بەدبەختی مرۆڤایەتی دەزانی و فرەژنی سنووری نەبوو لەناویاندا و باوك دەسەڵاتی ڕەهای هەبوو هەرچی بە ژن و کچەکانی بکات و تەڵاقیش ئەوەندە ئاسایی بوو بە لایانەوە لەبەر بێ ئەرزشترین شت، ژنیان تەڵاق دەدا، تەنانەت گەر بهاتایە چێشتێکی ناخۆشی لێ بنایە یان چێشتێکی بسوتاندایە..

یان یاسای مەسیحییەت کە جگە لە کاردانەوەیەك بۆ باری کۆمەلاٌیەتی رۆمانییەکان هیچی تر نەبوو، لە قێزەون تەماشاکردنی سێکس و تۆمەتبارکردنی ئافرەت و هاندانی ژیانی زگورتێتی و قەدەغەکردنی تەلاٌق و.. هتد.

بروانە پۆلص چی دەلێت: "ئافرەت هۆی یەکەمی تاوانە، بۆیە ئەو لە گۆشەنیگایەکەوە ئەندامێکی ناتەواوە".

قدیس تروتلیان دەلێ: "ئافرەت دەرگای شەیتانە بۆ دلێ پیاو، تێکدەری وێنەی خوایە، (واتە پیاو)".

قدیس سۆستامیش دەلێ: "ژن بەلاٌیەکە ناچاری بیهێنی و نەخۆشییەکی حەزلێکراوەو مەترسی هەیە بۆ سەر مالٌ و خێزان و.. هتد".

لە سەدەی پێنجەمی زانستیشدا لە کۆنگرەی ماکۆن (مجمع ماکون) گفتوگۆیان لەسەر ئەوە بوو کە ئایا ژن تەنها لاشەیە یان رۆحی ئادەمی تێدایە؟ لە ئەنجامیشدا هاتنە سەر ئەوەی کە جگە لە دایکی مەسیح هەرچی ئافرەت هەیە رۆحی رزگاربووی تێدا نییە.

ئەمانە هەموو یاساکانی مرۆڤایەتییە بە درێژایی مێژوو کە ئێمە زۆر بە کورتی ئاماژەمان پێکرد بۆ ئەوەی بەراوردی بکەیت لەگەلٌ ئیسلامداو خۆت بڕیار بدەیت، کامیان مرۆڤانەترەو شیاوترە بە مرۆڤایەتی.

نووسەر نایەت ئەو شێوازەی بە شیاوی دەزانێت بۆ مرۆڤایەتی روونی بکاتەوە، بۆ ئەوەی بزانین ئەو کۆمەلگەیەی ئەو پێشنیازی دەکات لە رووی پەیوەندییە کۆمەلاٌیەتییەکانەوە چۆن دەبێت؟ ئەو تەنها دەیەوێت شێوازی ئیسلامیی لە رێکخستنی پەیوەندییە کۆمەلاٌیەتییەکان بڕوخێنێت، ئیتر بێ ئەوەی خۆی فکرەیەکی هەبێت دەربارەی بەدیلەکە (ئەلتەرناتیڤەکە)ی، هەروەکو کەسێك بینایەکی زۆر گەورە ببینێت بێ ئەوەی لێی ورد بێتەوەو لە ئەندازیاری بیناسازی شارەزا بێت رەخنەی لێبگرێت و داوای رووخاندنی بکات، بێ ئەوەی نەخشەی بینایەکی تر لە مێشکیدا هەبێت، یان بە روونی و بەرچاورۆشنی بزانێت چی دەوێت.

رێباز هەیە توانیبێتی وەکو ئیسلام پەیوەندییە کۆمەلاٌیەتییەکان رێك بخات؟ پەیوەندیی نێوان ژن و مێرد، دایك و باوك و مندالٌ، خزمایەتی، دراوسێیەتی، گەورەو بچووکی، پیرو گەنجی، هاوئایینێتی، هاونیشتمانی، هاومرۆڤایەتی؟ لە هەمووشی گرنگتر رێکخستنی پەیوەندیی نیوان مرۆڤ و پەروەردگاری؟

ئەم نووسەرانە دەیانەوێت چۆن پەیوەندییە سێکسییەکان رێك بخەن با پێمان بلێن، ئایا وەکو شیوعییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی کە جۆرێك لە زەواجیان داهێنا دوایی لەبەر کۆمەلێك کێشە کە لێی بوویەوە لێی پاشگەز بوونەوە، ئەویش زەواجی فیعلی و تەلاٌقی فیعلی بوو کە کورتەکەی ئەمەیە: ئەگەر کچ و کورێك لە مالێکدا پێکەوە ژیان ئەوە بە فیعلی دەبن بە ژن و مێرد، ئەگەر جیابوونەوەو هەریەکە چووە شارێکی تر یان خانوویەکی تر ئەوا لەیەك جیا بوونەتەوەو پێی دەوترێت تەلاٌقی فیعلی، بەلاٌم دوایی کۆمەلێك کێشەی لێ بوویەوە وەکو مەسەلەی مندالٌ و کێ بەخێوی بکات و بە ناوی کێوە بێت و میراتی کامیانی بۆ دەمێنێتەوەو چەند کێشەیەکی تر کە لە ئەنجامدا دەرکەوت زەواجێکی فاشیلەو ناچار گەڕانەوە سەر زەواجە ئایینییەکە.

ئەگەر ئەم پەیوەندییە سێکسی و کۆمەلاٌیەتییەی ئەمڕۆی رۆژئاوا بە گونجاوو شیاو دەزانن بۆ مرۆڤایەتی ئەوا با باش بزانن رۆژئاوا خۆی پەشیمانە لەو جۆرە پەیوەندییەو لەو جۆرە بەکارهێنانەو سەدان دەنگی شارەزاو پسپۆڕو دلسۆز رۆژانە بەرز دەبێتەوە بۆ ئەوەی رێگە لەو ئیباحیەتە بگیرێت و کۆمەلگە بگەڕێنرێتەوە بۆ دۆخی جارانی، هەر لەبەر ئەوەشە لە ئەلمانیا دالدەی خێزانە رۆژهەلاٌتییەکانیان دەدا بە تایبەت تورکەکان بۆ ئەوەی ئەلمانییەکان چاویان لێبکەن و خێزان پێکەوە بنێن.

## ئایا یاساكانی ئیسلام له بواری سێكسدا له خزمەت پیاودان ؟

هەندێك دەڵێن یاساكانی ئیسلام له بواری سێكسدا سەرتاپای لەبەرژەوەندیی پیاودایە! ئێمەش له وەڵامدا دەڵێین: یاساكانی ئیسلام نەك هەر بۆ بەرژەوەندیی پیاوو خزمەتكردنی پیاو نییە، بەڵكو ڕێكخەرە بۆ ئارەزووە سێكسییە بێ سنوورەكانی پیاوو ژن. لەم سەردەمەدا دەردەكەوێت پیاو له ژێر سایەی یاسا دەستكردەكاندا چ تەشقەڵەیەك بە ئافرەت دەگێڕێتو لەژێر ناوو لافیتەی جۆراو جۆردا چۆن فریوی دەدات.

قسەی نامەسئولانەو بێ بەڵگە هەموو كەسێك دەتوانێت بیكات، بەڵام گرنگ سەلماندنەكەیەتی نەك وتنەكەی.

كێ هەیە ئەو ڕاستییە نەزانێ كە پیاوی دیندار جگە لە خێزانەكەی خۆی لەگەڵ كەسی تردا سێكس ناكات؟ لەبەرامبەر ئەویشدا پیاوی بێ دین بۆی بكرێت هیچ هەلێك لە دەست ناداتو هەر كچێك یان ئافرەتێكی جوان ببینێت هەوڵ دەدات لە خشتەی ببات.

من لە هەموو كەسێك دەپرسم كە لە نەخۆشخانەو فەرمانگەكاندا كار دەكات، ئایا دیندارەكانن كە بە دوای ئافرەتی خەڵكدا دەگەڕێن یان بێدینەكان.. ئایا دكتۆرە دیندارەكان چاویان لە شوێن ئافرەتی نەخۆشو مورافیقی ئافرەتە یان دكتۆرە بێدینەكان.. ئایا كەس هەیە ئەو ڕاستییە نەزانێت كە گەنجی دیندار تەماشای ئافرەتان ناكاتو دوایان ناكەوێتو بە دوای زینادا ناگەڕێت، ئایا كەس هەیە نەزانێ تەنها خوێندكاری دیندار لە پەیمانگاو دانشگاكاندا خەریكی دڵداریو ڕاوە كچو شەڕ بە كچ فرۆشتن نییە. نازانم حەقیقەتێك ئەوەندە زەقو ئاشكرا بێت چۆن كەسانێك دەتوانن پێچەوانەی ئەوە بڵێن؟

ئاشكرایە كە كەس ئەوەندەی پیاوی دیندار جڵەوگیریی لە نەفسی خۆیو ئارەزووەكانی ناكات بە ڕادەیەك كە زۆرجار لەو شوێنانەی كە پیاوو ژن تێكەڵن پیاوی دیندار لەبەر خۆپاراستن لە تێكەڵیو سوعبەتو بەزمو ڕەزم لەگەڵ ئافرەتاندا بە ئاڵۆز تۆمەتبار دەكرێت. پیاو تا دیندار بێت زیاتر جڵەوی نەفسی خۆی دەگرێتو ڕێگە لە ئارەزووەكانی نەفس دەگرێتو لە حەرامەكان دووریان دەخاتەوە.

ئەگەر ئەوانەی ئیسلام تۆمەتبار دەكەن بەوەی كە تەشریعەكانی لە پێناوی پیاودایە باسی ئایینێك یان ڕێبازێكیان بكردایە كە خەڵكیی شوێنكەوتوانی نەبینیایەو هی شوێنێكی دوور یا سەردەمێكی دوور بوایە قەینەدەكردو دەتوانرا قسەی بۆ هەڵبەسترێت و بوختانی بۆ بكرێت، بەڵام كە باسی ئایینێك دەكەن هەزارو چوارسەد ساڵە لەناو میللەتەكەی خۆیانداییەو تاكو ئێستاش كاریگەریی لەسەر شوێنكەوتوانی وەكو خۆی بە بەهێزی ماوەتەوە چۆن دەتوانن ئەم هەموو بوختانەی بۆ هەڵبەستن؟ ئاخر هەیە نەزانێ پیاوی دیندار لە دەرەوەی ژیانی ژنو مێردایەتیی هیچ پەیوەندییەكی سێكسی ئەنجام نادات؟ لەبەرامبەر ئەویشدا پیاوی بێدین لە پشتسەری خێزانیەوە دەیان پەیوەندیی ناشەرعی هەیەو تێر خواردنی بۆ نییەو هەموو هۆشو فكری لای سێكسو ڕابواردنە.

ئایا خیانەتی زەوجی لەناو دینداراندا زیاترە یا لە ناو بێدینەكاندا؟ ئایا زۆڵ خستنەوە لە ناو كۆمەڵگەی دینداردا زۆرە یان لە كۆمەڵگە بێ دینەكان؟ ئیتر ئەم هەموو چەواشەكارییە لەپای چی؟! ئایا دیندارەكانن حەز دەكەن ئافرەت ڕووتو قووت بێت یان بێدینەكان؟ ئایا دیندارەكانن هانی تێكەڵیی نێرو مێ دەدەن یان بێدینەكان؟ ئایا دیندارەكانن هانی دڵداریو پەیوەندیی ناشەرعی لە دەرەوەی سنووری ژنو مێردایەتیدا دەدەن یا بێ دینەكان؟ كێیە بایەخ بە دایكو نەنكو پوورو خوشكو كچ دەدات، دیندارەكان یان بێ دینەكان؟

ئایینێك كە بەهەشت لە ژێر پێی دایكاندا دابنێتو چاكەكردن لەگەڵ دایكاندا بە مەرجی ڕازی بوونی خوا بزانێتو بەخێوكەری كچ بە ڕەفیقی پێغەمبەر ﷺ دابنێت تاوانبار دەكرێت بەوەی كە ژنی تەنها بۆ جەستەی دەوێت؟ ئایینێك كە لە كتێبە پیرۆزەكەیدا هاتووە خوا لە حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە گوێی لە گفتوگۆی ئەو ئافرەتە گرت كە لەگەڵ پێغەمبەردا قسەی دەكردو گوێی لە سكاڵاكەی بوو لە دەستی مێردەكەی بەوە تۆمەتبار دەكرێت كە ڕێزی ژنی لا نییە.

ئایینێك كه دوا وەسیەتی پێغەمبەرەكەی چاكە كردن بێت لەگەڵ ژناندا بەوە تاوانبار دەكرێت كە بە سووك تەماشای ئافرەت دەكات؟

ئایینێك كه ڕێگە نەدات پیاوان ئافرەتان لە خشتە ببەنو بە ئارەزووی خۆیان بێ قەیدو شەرتو بێ هیچ ڕێوڕەسمێك لەگەڵیاندا رابوێرن سوكایەتی دەكات بە ئافرەت؟

ئایینێك كە نزیكەی نیوەی ڕێنماییەكانی لە ڕێگەی ئافرەتەوە گەیشتۆتە دەست شوێنكەوتوانی بەوە تاوانبار دەكرێت كە ڕێز لە ئافرەت ناگرێت! ئەمانەو سەدان ئایەتو فەرموودەو هەڵوێستی تریش هەموو بەڵگەن لەسەر پلەو پایەو ڕێزی ئافرەت لە لای ئیسلام.

## ئەو رۆژئاواییانەی موسڵمان بوون

ڕاستییەك هەیە زۆر كەس لێی بێئاگایە ئەویش ئەوەیە كە ئەو رۆژئاواییو بیانیانەی موسڵمان بوون وەكو ئەوانەی لای خۆمان لە نەزانیو لەبەر بێ دەرامەتیو بۆ بەدەستهێنانی پەناهەندەییو بژێویی ئایینی خۆیانیان نەگۆڕیوە بەڵكو زۆربەی هەرەزۆری ئەوانە بەتایبەتی ئەوانەی لە سەدەی نۆزدەو سەرەتاو ناوەندەكانی سەدەی بیستەمدا موسڵمان بوون هەموو مامۆستاو خوێندەواری گەورەو سیاسیی گەورە گەورە بوونو لە ئەنجامی توێژینەوە ئیسلامیان هەڵبژاردووەو زۆرێكیان لە ئەنجامی ئەوەوە وەزیفەو پلەو پایەی سیاسیی خۆیانیان لە دەست داوە، بۆ نموونە (لیو بۆلد ڤایس) لە دایكبووی (1900ز) باڵوێزی ئەڵمانیا بوو لە پاكستانو جەزائیرو چەندین وڵاتی تر، كە پاش موسڵمانبوونی لەسەر كارەكەی لابرا. ئەو چەندین لێكۆڵینەوەو توێژینەوەی هەیە لەسەر ئیسلامو زۆرێكیش لە هەڵەكانی رۆژهەڵاتناسانی دەر خستووەو راستی كردۆتەوە، ئەمانە هەندێكن لە كتێبەكانی: وەرگێڕانی **صحيح البخاري، أصول الفقه**، ڕێگا بۆ مەككە، ئیسلام لە چوارڕیانی ڕێگاكاندا.

- جۆزیف كابری بیرمەندێكی ئیسپانییەو لە ساڵی 1969ز موسڵمان بوو ناوی خۆی نا یوسف عەلی كابری، لەگەڵ موسڵماناندا لە لۆس ئەنجلوس خوێندنگایەكی ئیسلامیی داناو چەندین كتێبی نووسیوەو ژیانی پێغەمبەری گۆڕیوەتە سەر زمانی ئیسپانی.
- هۆلین پۆل رۆژهەڵاتناسی گەورەی ئینگلیزی ساڵی 1914ز موسڵمان بوو، سێر جلال الدين لودر برنتون مامۆستا لە زانكۆی ئۆكسفۆردو یەكێك لە ئەشرافو ناسراوانی ئینگلیز بوو.
- ارشیبولد هاملتون یەكێك بوو لە پیاوانی دەوڵەتو بارۆنەكانی ئینگلتەرا، سەرۆكی كۆمەڵەی پارێزكاران بوو لە (سلزی) لە ساڵی 1923ز موسڵمان بووەو ناوی خۆی نا عەبدوڵڵا.
- نەسیم سوسە جولەكەیەكی عێراقی بوو لە ئەمەریكا خوێندنی تەواو كردبوو و ئەندام بوو لە (**المجمع العلمي العراقي**)و سەرچاوەیەك بوو لە شارستانێتیی عەرەبیو وادی رافیدەین، دوای موسڵمانبوونی ناوی خۆی نا ئەحمەد.
- ئیمساعیل ویسلوز یجریكی، زانایەكی كۆمەڵناسی پۆڵەندیو توێژەرەوەیەكی كۆمەڵایەتیو چاكسازی بوو، ساڵی 1900 لە خێزانێكی ناوداری پۆڵەندا لەدایك بووە.
- ئەلبرت هیلد براند فریدریك لە دایكبووی 1929 لە خێزانێكی پرۆتستانتی لە ئەڵمانیا، خاوەنی دكتۆرای فەخری لەبەراوردی ئایینەكان لە لەندەن، پاش موسڵمانبوونی ناوی خۆی نا (**علاء الدين شلبي**) ئەندازیاریش بوو، دەستی لە ئیشەكەی هەڵگرتو كەوتە بانگەواز بۆ ئیسلامو كتێبێكی هەیە بە ناوی (موسڵمانان وریابنەوە).
- پرۆفیسۆر هارون مستەفا لیون، زانایەكی زمانەوانیو جیۆلۆجی ئینگلیزی بوو، سكرتێری گشتیی كۆمەڵەی نێودەوڵەتی زانستی بنەماكانی زمانەكانو زانستەكانو هونەرە جوانەكان بوو لە ساڵی 1882 موسڵمان بوو.

- ئەلڤۆنس ئیتین دینیە، رۆژهەلاتناسێکی فەرەنسی و هونەرمەندێکی گەورە بوون لە ساڵی 1927 موسڵمان بوو ناوی خۆی نا (ناصرالدین)و کتێبی زۆری لەسەر ئیسلام نووسیوە، گرنگترینیان (موحەممەد لە ژیاننامەی پێغەمبەراندا)، (ژیانی عەرەبو ژیانی بیانی)، (تیشکێك لە رووناکی ئیسلام)، (ڕۆژهەلات لە بینینی رۆژئاواوە)و (حەج بۆ ماڵی خوا).

- رۆجیە گارودی، کە یەکێکە لە کۆڵەکەکانی فەلسەفەی وجودی لەم سەردەمەدا، لە کۆتایی سەدەی بیستدا موسڵمان بوو.

- ئیبراهمی خەلیل فیلوبوس، قەشەیەکی موژدەدەر هەلگری بەرزترین بڕوانامە بوو لە زانستی لاهوت لە کۆلێژی لاهوتی میسریو لە زانکۆی برنستۆنی ئەمەریکی کارو پیشەی شێواندنی ئیسلام بوو، بەلام لە ئەنجامدا بوو بە موسڵمانو ناوی خۆی نا (حاجی ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد)و کۆمەڵێك کتێبی نووسی لەسەر راستییەکانی ئیسلامو شێوازی کارکردنی رۆژهەلاتناسانو موژدەدەران دژی دین.

- هوبوهم: سیاسیی و موژدەدەرو توێژەرەوەی کۆمەلایەتی ئەڵمانی، دوای موسڵمانبوونی ناوی خۆی نا (موحەممەد ئەمان هوبوهم).

- ئارتەرکین: فەیلەسوفی گەورەی ئەمەریکی ساڵی 1961 لە نیۆیۆرك موسڵمانبوونی خۆی راگەیاند.

- عیسا عەبدو: ئابوریناسی گەورەی میسر، مەسیحی بوو، لە ئەنجامی توێژینەوە موسڵمان بوو.

- (موحەممەد نەجیب المطیع)ی میسری تاقە کوڕی نخلە باشا مطیع، لەدایکبووی ساڵی 1922، لەبەر ئەوەی تاقە کوڕو خۆشەویستو لە خێزانێکی گەورەی مەسیحی بوو باوکی بایەخێکی زۆری پیێ دەدا، بۆیە نەیخستە خوێندنگا میرییەکان بەڵکو دایە دەست گەورە قەشەکان وانەی پیێ بڵێتەوە، لەبەرامبەر ئەوەدا سیێ دۆنم لە زەوییە باشەکانی خۆی بەخشی بە کەنیسە، لەبەر ئەوە پیاوانی کەنیسەش هەموو توانای خۆیان خستە گەڕ بۆ پێگەیاندنی، خۆیشی منداڵێکی بلیمەت بوو، فێری زۆر زمان بوو، زانستی لاهوتو بەراوردی ئاینییەکانی خوێند، باوکیشی کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو لە هەموو زانستو بابەتێکی تێدا بوو، بۆ خۆهەڵنان پێکەوەی نابوو، ئەم کتێبخانەیە بوو بە کلیکی هیدایەت وەرگرتنی موحەممەد نەجیب، دوای ئەوە باوکی پێی زانی هەوڵێکی زۆریدا بۆ گێڕانەوەی بۆ سەر ئایینی مەسیحی، بەلام هەوڵەکانی بێهود بووە، لە داوییدا کە بیێ ئومێد بوو لێی، هەڕەشەی کوشتنی لێکرد ئەمەش هەڵهاتو بێبەش بوو لەو هەموو سامانەی باوکیو بە هەژاری ژیانی دەبردە سەر.

ئەمانە نموونەی هەندێکن لەوانەی کە بوون بە موسڵمان، هەموو وەکو بینیمان پیاوی گەورەو مامۆستای زانکۆو فەیلەسوفو رۆژهەلاتناسو سیاسیی و توێژەرو.. هتد، کە زۆربەیان یان کورسی وانە وتنەوەیان لەدەست دا یان کارو پلەو پایە دەوڵەتییەکە، بەلام ئەوانەی لە جیهانی ئیسلامییەوە دەبنە مەسیحی، زۆربەی هەرەزۆریان نەزانینو ئاستی خوێندەوارییان نزمەو پلەو پایەی کۆمەلایەتییان نزمە، یان بۆ بژێوی دەست لە دینەکەیان هەڵدەگرن یا بۆ پەناهەندەیی، یا بۆ هەندیێ مەبەستی نزمی تر.

## ڕەچاوکردنی مافی ژن لە سێکسدا

حەزم نەدەکرد باسی ئەم مەسەلەیە بکەم، بەلام لەبەر ئەوەی هەندێك کەس لە چوارچێوەی رەخنەگرتن لە هەڵوێستی ئیسلام لە ئافرەت دەیوروژێنن و دەڵێن: "لە هیچ یەکێك لە ئایەتو ریوایەتەکانی قورئاندا نابینین مافی چەشتنی سێکس بدات بە ژنو ژن وەك ئینسانێك مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت"

لەڕاستیدا ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەزانی ئەو کەسانەی ئەو قسەیە دەکەن و لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسانە لە خۆیانەوە شت دەڵێن بێئەوەی خۆیان ماندوو بکەن بۆ گەڕان بە دوای دەقەکاندا کە ئەمڕۆ زۆر سەخت نییە، چونکە هەر دەقێکت بوێت لە

ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە بە چەند چرکەیەك دەستت دەکەوێت، بەڵام ئەو نووسەرانە مەبەستیان نییە ئەو دەقانە ببینن، ئەوان تەنها مەبەستیان ناشیرین کردنی ئیسلامە بۆ چەواشەکردنی خەڵکیی نەك گەیشتن بە ڕاستی!.

لە وەڵامدا دەڵێین :

یەکەم: خوا دەفەرموێت: (**وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ) (البقرة: 228**). واتە بۆیان هەیە لە ماف وەکو ئەوەی کە لەسەریانە لە ئەرك.

ڕاڤەکەرانی قورئان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا باسی ئەوە دەکەن کە یەکێك لە مافەکانی ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە لە کاتی ئەنجامدانی کاری سێکسیدا لەسەری بووەستێت تا ئەویش چێژی خۆی وەردەگرێ و ئەو فەرموودەیە دەهێننەوە کە لە چەندین ڕێگەوە ریوایەت کراوە دەربارەی چاوەڕێ کردنی پیاو تا ژن دەگاتە چێژوەرگرتن.

دووەم: لە ئەنەسی کوڕی مالیك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: (**اذا جامع احدكم أهله فليصدقها ثم إذا قضي حاجته قبل ان تقضي حاجتها فلا يعجلها حتى تقضي حاجتها) مسند أبي يعلى**، فەرموودەی ژمارە (4200، 4201، 4270).

لە ریوایەتێکی تریشدا هاتووە: (**عن أنس بن مالك عن النبي قال: اذا غشي الرجل أهله فليصدقها فان قضى حاجته ولم تقض حاجتها فلا يعجلها) مصنف عبدالرزاق، جزء6، ص194**، ژمارەی فەرموودە (1468).

هەموو فەرموودەکان یەك مانایان هەیە ئەویش ئەوەیە: "ئەگەر کەسێکتان لەگەڵ ژنەکەیدا کاری سێکسی ئەنجامداو زووتر لێبوویەوە با لەسەری بووەستێت تا ئەویش دەگاتە چێژ وەرگرتن (ئۆرگازم)".

سێیەم: زۆربەی زانایانی شەرعناس باسی ئەم مەسەلەیان کردووەو وتوویانە یەکێك لە مافەکانی ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە کاری سێکسی لەگەڵدا ئەنجام بدات، بۆ نموونە ئیبن حەزم خاوەنی مەزهەبی **ظاهري، ابن تيمية، ابن القيم**، ئیمامی غەزالی و دەیان زانای گەورەی تر.

ئیبن حەزم دەفەرموێت: (**ويجبر على ذلك من أبى بالأدب لأنه أتى منكرا من العمل)، المحلى لابن حزم، ج10، ص40**.

واتە: هەر پیاوێك نەچێتە لای ژنەکەی دەبێ زۆری لێبکرێت و تەمێ بکرێت (**بالأدب أي بالتأديب**، واتە بە تەمێ کردن)، چونکە کارێکی نەگونجاو خراپی کردووە.

ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: (**يجب على الرجل ان يطأ زوجته بالمعروف، وهو من أوكد حقوقها عليه، أعظم من اطعامها**)، واتە: پێویستە لەسەر پیاو (بە زاراوەی شەرعی: فەرزە لەسەری) کە بچێتە لای خێزانی (کاری سێکسی لەگەڵدا ئەنجام بدات)، ئەوەش چەسپێنراوترین مافی ژنە بەسەر پیاوەوەو گەورەترە لە دابین کردنی بژێوی بۆی.

هەروەها دەڵێ: (**وطؤها واجب عليه عند أكثر العلماء وقد قيل: انه لا يجب الاكتفاء بالباعث الطبيعي، والصواب انه واجب كما دل عليه الكتاب والسنة والأصول، وقد قال النبي ﷺ لعبدالله بن عمر (رضي الله عنه) لما رآه يكثر الصوم والصلاة، ان لزوجك عليك حقا**)

واتە: ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ ژندا فەرزە لەسەر پیاو لای زۆربەی زانایان، دەشڵێن نابێ ئیکتیفا بکرێت بە پاڵنەری سروشتی (واتە دەبێ هەر ئافرەتەو بە گوێرەی ئامادەیی خۆی و ئارەزووکردنی لەگەڵیدا ئەنجام بدرێت، ڕاستتریش ئەوەیە، کە فەرزە بە گوێرەی بەڵگەکانی قورئان و فەرموودەو بنەما شەرعییەکان، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ کاتێك بینی عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس زۆر ڕۆژوو دەگرێت و شەونوێژ زۆر دەکات، فەرمووی (ان لاهلك عليك حقا)، واتە: خێزانەکەت (ژنەکەت) مافی هەیە بە سەرتەوە، واتە گەر خۆشت حەزت لێی نییەو ئارەزووت لێی نییە، دەبێ ڕەچاوی ژنەکەت بکەیت و مافی ئەو بەجێ بێنی، ئاشکراشە گەر پیاو لەبەر خاتری ژنەکەی ئەوە بکات دەبێ بیگەیەنێتە حاڵەتی چێژوەرگرتن ئەگینا وەکو هیچی نەکردبێت وایە.

لێرەشدا کە زانایان دەڵێین یەکێك لە مافەکانی ژن بەسەر پیاوەوە ئەوەیە کە سەرجێیی لەگەڵدا بکات لەبەر دوو هۆیە:

یەکەم: هەندێك پیاو وەکو زوهدو پشت هەڵکردن لە دونیا ویستوویانە ئەم کارە نەکەن.

دووەم: بۆ ئەو پیاوانەی کە زیاد لەیەك ژنیان هەیە، بۆ ئەوەی هیچکام لە ژنەکانیان پشتگوێ نەخەن، تەنانەت ئەگەر دڵیشیان پێیانەوە نەبێت، بۆ نموونە، بە بەردەوامی بچێتە لای ژنە بچووکەکەی یا ژنە جوانەکەی‌و ژنە گەورەکەی یان ناشیرینەکەی پشتگوێ بخات، (وەکو ئەوەی لە کوردەواریدا دەکرێت کە لە فرەژنیدا بە گوێی ئیسلام و لە رەچاوکردنی مافەکانیاندا بە گوێی هەواو نەفسی خۆیان دەکەن).

ئەم راستییە (واتە ئەم مافەی ژن) یارانی پێغەمبەر ﷺ بە باشیی لێی تێگەیشتبوون، ئەوەتا سەلمانی فارسی کە پێغەمبەر ﷺ کردی بە برا لەگەڵ (**أبو الدرداء**)دا پاش چەند رۆژێك بینی (**أبو الدرداء**) هەموو شەوی هەر خەریکی شەونوێژەو بە رۆژیش بەرۆژووە، داوای لێکرد ئەوەندە بەرۆژوو نەبێت‌و بە شەویش بخەوێت و ئەوەندە خۆی ماندوو نەکات. پێی وت: (**ان لعينيك عليك حقا وان لأهلك عليك حقاً، صم وأفطر، وصل ونم**)، واتە چاوەکانت مافیان هەیە بەسەرتەوە، خێزانەکەت مافی هەیە بەسەرتەوە، هەندێك رۆژان بەرۆژوو بەو هەندێکی تر مەیگرە، شەوان بشخەوەو نوێژیش بکە، کاتێك ئەم قسەیەی سەلمان گەیشتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (**لقد أشبع سلمان علما**)، واتە: سەلمان پڕ بووە لە زانست.

ئیمامی غەزالیش زیاتر ئەم مەسەلەیە روون دەکاتەوەو خاڵ لەسەر پیت دادەنێت‌و دەفەرموێ: (**اذا قضى الرجل وطره فليتمهل على أهله، حتى تقضي هي أيضا نهمتها، فان انزالها ربما يتأخر فيهيج شهوتها، ثم القعود عنها ايذاء لها والإختلاف في طبع الانزال يوجب التنافر مهما كان الزوج سابقا الى الأنزال، والتوافق في وقت الانزال الذ عندها، ليشتغل الرجل بنفسه عنها، فانها ربما تسحي وينبغي أن يأتيها في كل اربع ليال مرة، فهو أعدل اذعدد النساء اربعة، فجاز التأخير الى هذا الحد، نعم ينبغي ان يزيد أو ينقص بحسب حاجتها في التحصين، فان تحصينها واجب عليه، وان كان لايثبت المطالبة بالوطأ، فذلك لعسر المطالب والوفاء بها**)

واتە: ئەگەر پیاو چێژی خۆی وەرگرت‌و لێبوویەوە با بوەستێت لەسەر خێزانی تا ئەویش لێدەبێتەوەو چێژی خۆی وەردەگرێ، چونکە لەوانەیە هی ئەو دوابکەوێت‌و بە وروژاوی بمێنێتەوە، بەجێهێشتنیشی بەو شێوەیە ئازاری پێدەگەیەنێت، جیاوازییش لە سروشتی گەیشتن بە چێژ لە نێوان ژن‌و پیاودا دەبێتە هۆی لەیەك دوورکەوتنەوە، تا پیاوەکە زووتر بگاتە چێژ رقەکە زیاتر دەبێت، بەیەکەوە گەیشتن بە چێژ باشترو خۆشترە لای ژن، لەبەر ئەوەی پیاو بە خۆیەوە خەریك دەبێت‌و ئاگای لە ژنەکەی نامێنێت، چونکە لەوانەیە ژنەکە شەرم رێگەی لێبگرێت لە گەیشتن بە چێژ.

ئیمامی غەزالی زیاتر لەسەر مەسەلەکە دەدوێ و دەڵێت: پێویستە لەسەر پیاو لانی کەم چوار شەو جارێك لەگەڵ خێزانیدا جوت بێت، بۆی هەیە تا ئەم راددەیە دوای بخات، بەڵێ پێویستە زیاتر یا کەمتر بیکات بە پێی پێویستی ژنەکە بۆ خۆپاراستن، چونکە دامرکاندنەوەی شەهوەتی ژن پێویستە لەسەر پیاو.. هتد.

ئایا دوای ئەم‌هەموو بەڵگانە کەسێك قسەی دەمێنێت؟ نازانم ئێستا خوێنەری بەرێز چی بەو نووسەرانە دەڵێت؟! یا ئەو نووسەرانە خۆیان چی بە خوێنەران دەڵێن؟!.

چوارەم: شتێکی تریش کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام ئەم کارەی بە کارێکی هاوبەش داناوە لە نێوان پیاوو ژندا، ئەوەیە کە وشەی (جماع) بەکار دێنێت، وشەی جیماعیش پێی دەترێت (**الفاظ المشاركة**)، واتە وشەی بەشداریکردن کە لە نێوان دوو کەسدا ئەنجام دەدرێت‌و بەیەك کەس ئەنجام نادرێت.

ئەمەش خۆی لە خۆیدا رەچاوکردنی مافی ئافرەتە لەم مەسەلەیەدا.

## چوونە لای ژن لە دواوە

ئەم بابەتەش زیاتر بابەتێکی فیقهییە نەك هزری، بەڵام دیسانەوە لەبەر ئەوەی هەندێك کەس لە چوار چێوەی تاوانبارکردنی ئیسلام بە سێکسبازی دەیوروژێنن پێویستی کرد تیشکی بخەینە سەر و قسەی لەسەر بکەین.

بۆ زانینی رای ئیسلام دەربارەی هەر چەمکێك پێویستە هەموو ئەو ئایەتو فەرموودانەی دەربارەی ئەو چەمکە هاتوون کۆبکرێنەوەو لەگەڵ راڤەی زاناو پسپۆڕانی قورئانو فەرموودە و شەریعە، نەك لە روانگەی ئایەتێك یان فەرموودەیەك یان بەشێك لە ئایەتێك یان فەرموودەیەك رای ئیسلام باس بکرێت.

دەربارەی هەڵوێستی ئیسلامیش لە چوونە لای ژن لە دواوە، ئەگەر لە گریمانێکیشدا ئایەتەکان زۆر روونو ئاشکراو یەکلاکەرەوە نەبن، فەرموودەیەکی زۆر هەیە واتا و مەبەستەکانیان روون دەکاتەوە و هیچ بیانوویەك بەدەست ئەو کەسانەوە ناهێڵێت کە دەڵێن ئەم شتە حەرام نەکراوە، بەڵام ئەوەی کە بە وردی تەماشای قورئان بکات بە روونی حەرامیی ئەم مەسەلەیەی بۆ دەردەکەوێت..

ئەوانەی دەڵێن چوونە لای ژن لە دواوە دروستە پشت بە ئایەتی 223ی سورەتی **البقرة** دەبەستن کە دەفەرموێت (**نساؤكم حرث لكم فأتوا حرثكم أنّى شئتم**) واتە : خێزانەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوەو شوێنی چاندنی وەچەن جا بەهەر شێوەیەك دەتانەوێت تۆو بچێنن لە کێڵگەکەتان، بەڵام ئەوانەی کە دەیانەوێت ئەو کارە بە رەوا بزانن خۆیان گێل دەکەن لە ئاستی وشەی کێڵگەو تەنها ئاوڕ لە دەستەواژەی (أنى شئتم) دەدەنەوە، لەگەڵ ئەوەی، کە ئایەتەکە خۆی لە خۆیدا رێنیشاندەرە بۆ چۆنێتی ئەنجامدانی سەرجێیی و بەڵگەیە لەسەر نارەوایی چوونە لای ژن لە کونی دواوە ئایەتی (222) کە راستەوخۆ پێش ئەو ئایەتە دێت بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێت، کە چوونە لای ژن لە کونی دواوە حەرامە. ئایەتەکە دەفەرمووێت: **(وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ) (البقرة: 222)**، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی سوڕی مانگانەی ئافرەتان کە چۆن بکەن لەگەڵیاندا، ئەی موحەممەد بڵێ ئەوە ئازارێکە، لە ژنان دوورکەونەوە لە کاتی حەیزدا و سەرجێییان لەگەڵدا مەکەن تا پاك دەبنەوە، جا ئەگەر پاکبوونەوە ئینجا لەو شوێنەوە بچنە لایان کە خوا فەرمانی پێداون، واتە جێی حەیز، خوا تۆبەکارانو خۆ پاك راگرانی خۆش دەوێت.

ئەگەر بهاتایە چوونە لای ژن لە دواوە رەوا بووایە خوا نەیدەفەرموو دوور کەونەوە لە ژنان تا کاتی پاکبوونەوە بەڵکو روونی دەکردەوە کە تەنها لە پێشەوە ئەو کارە نەکەنو لە دواوە رێگە پێدراوە، بەڵام وەکو دەبینی بۆ ئەوەی بیانووی کەسانی دەروون نزمو بێ ئیرادە بە تەواوی ببڕێت دەفەرمووێت: (**فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء**) واتە: نزیکیان مەکەونەوە، پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەکانیدا سنووری ئەو شتەی دیاری کردووە، هیچی نەهێشتۆتەوە بۆ بیانووگران.

ئەگەر چوونە لای ژن لە کونی دواوە حەرام نەبوایە هیچ نەبوایە لە کاتی سووڕ مانگانەدا رێگەی پێدەدرا، بەڵام ئایەتو فەرموودەکان هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە لە کاتی حەیزدا پیاو دەبێت لە ژنەکەی دوورکەوێتەوە.

هەندێك وادەزانن ئەگەر ئەو ئایەتە لە ئەنجامی ئەوەی کە پیاوێك لە دواوە چوویێتە لای ژنەکەی دابەزیبێت ئەوە مانای وایە موسڵمانان ئەو کارەیان کردووە! ئاشکرایە ئەمە تێگەیشتنێکی زۆر سەقەت و ناتەواوە، چونکە قورئان ئەو رووداوەی قۆستۆتەوە بۆ حەرامکردنی ئەو رەفتارە.

گریمان ئایەتەکە لە ئەنجامی ئەوەی کە پیاوێك لە دواوە چووەتە لای ژنەکەی دابەزیبێت، ئەمە چ زیانێك دەگەیەنێت بە ئیسلام؟ ئایا ئەمە خاڵێکی ئیجابییە بۆ ئیسلام یان سلبی؟!

گرنگ ئەوەیە کە قورئان ئەو ئیشەی حەرام کردووەو رێگەی بە موسڵمانان نیشان داوە، کە لە کوێوە و چۆن سەرجێیی لەگەڵ ژنەکانیاندا بکەن، کە ئەویش تەنها شوێنی مندالبوونە نەك شوێنی پیسی کردن.

ئەگەر کەسێك بەڵگە بە شیعە بێنێتەوە ئەوە بەڵگەیەکی لاوازە، چونکە ئایەت و فەرموودەکان روون و ئاشکران، بەتایبەت فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بە راشکاوی ئەو کارە حەرام دەکات، شیعەش ئەگەر بە حەڵاڵی بزانن ئەوە لەبەر هەمان ئەو هۆیانەیە کە وا لە هەندێك نووسەر دەکات وا بزانێت حەڵاڵە: یەکەم وەرگرتنی ئایەتەکان بە قرتاوی و جیاکردنەوەیان لە چوارچێوەکەیان (السیاق العام) و دووەم لەبەر ئەوەیە کە زۆرێك لەو فەرموودانەی ئەهلی سوننەت ریوایەتی دەکەن رەتی دەکەنەوە، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی لە یارانی پێغەمبەرەوە ریوایەت کراون، هەڵوێستی ئەوانیش لە یارانی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم مەسەلەیە لای شیعەش بە شێوەیە نییە کە هەندێك لێی تێدەگەن، بەڵکو لای ئەوانیش کەراهەتی هەیە و لە ئیمامەکانیانەوە ریوایەت کراوە کە دەڵێن: **(لا يفعلها إلا أراذل شيعتنا)** واتە کەس ئەو ئیشە ناکات سووکترین و بێزراوترین شوێنکەوتوانمان نەبێت.

با پێکەوە ئەو ریوایەتەی لەسەر حەزرەتی عومەر هاتووە بخوێنینەوە و لێکی بدەینەوە :

**عن ابن عباس قال: جاء عمر بن خطاب الى رسول الله ﷺ فقال يا رسول الله هلكتُ، قال ما الذي أهلكك؟ قال: حولت رحلي البارحة، قال فلم يرد عليه شيئاً، قال: فاوحى الله الى رسول الله ﷺ هذه االآية: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) أقبل و أدبر واتق الدبر والحيضة.** لە ئیبنو عەبباسەوە هاتووە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب هاتە لای پەیامبەر و وتی: ئەی پەیامبەری خوا تیاچووم.

پێغەمبەر ﷺ پرسی: بە چی تیا چووی؟.

عومەر وتی: دوێنێ بارەکەم گواستەوە.

پێغەمبەر ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە، ابن عباس دەڵێت: خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند بەسەر پێغەمبەردا ﷺ: ژنەکانتان کێڵگەتانن، لەهەر کوێوە دەتانەوێ بیکێڵن، پێغەمبەریش ﷺ بەم شێوەیە روونی کردەوە: رواو روو، لەپشتەوە، خۆت لە کۆم و کاتی سوڕی مانگانە بپارێزە.

لە فەرمودەی تردا هاتووە، کە: پیاوێك لە پێغەمبەری پرسی دەربارەی لە دواوە هاتنە لای ژنان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر لە پشتەوە بۆ کونی پێشەوە بێت قەیناکا، بەڵام ئەگەر بۆ کونی دواوە بێت نەخێر، خوا شەرم لە راستی ناکات، لە کونی دواوە مەچنە لای ژنەکانتان.

**أخبرنا عبدالوهاب بن محمد بن الخطيب، أنا عبدالعزيز بن احمد الخلال، أنا أبوالعباس، أنا الربيع، أنا االشافعي أنا عمي محمد بن علي بن شافع أخبرنا علي بن السائب عن عمرو بن أُحيحة بن الجلاح، عن خزيمة بن ثابت: أن رجلا سأل النبي ﷺ عن اتيان النساء في أدبارهن، فقال النبي ﷺ: (في أيِّ الخرمتينَ، أو في أيِّ الخرزتين أو في الخصفتين أمن دبرها في قلبها فنعم، أم من دبرها في دبرها فلا، فان الله لايستحي من الحق، لاتأتوا النساء من أدبارهن).** ئەم فەرموودەیە ئیمامی شافیعی ریوایەتی کردووە و ئیمامی نەسائی لە **(الکبری)** 8992 و 8988 تەحاوی 43/3 و تەبەرانی 3734، 3735، 3744 و بەیهەقی 196/7، 197، 198 و 213/5 ئەحمەد 213/5 و کۆمەڵێکی تریش لە چەندین رێگەوە ریوایەتیان کردووە.

هەروەها پێغەمبەر دەفەرموێت **(ملعون من أتى أمرأة في دبرها)** واتە نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی لە کونی دواوە بچێتە لای ژنەکەی. بروانە تەفسیری ئەلبەغەوی لە تەفسیری هەمان ئایەتدا.

ئیمامی تەحاوی لە (معانی) **الآثار** 4613 دا دەفەرموێت: **فلما تواترت هذه الآثار عن النبى ﷺ بالنهي عن وطء المرأة في الدبر، ثم جاء عن أصحابه وتابعيهم ما يوافق ذلك وجب القول به، وترك ما يخالفه.** تەفسیری بەغەوی لە تەفسیری هەمان ئایەتدا. واتە: لەبەر ئەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر قەدەغەکردنی چوونە لای ژن لە کونی دواوە زۆرە و لە یارانی پێغەمبەر و تابیعین (ئەوانەی دوای سەحابە هاتوون)ەوە فەتوای زۆر هاتووە لەسەر هەمان شت، پێویستە بە حەرام بزانرێت و دەست هەڵگرتن لە پێچەوانەکەی.

کەواتە حوکمی چوونە لای ژن لە کونی دواوە بە لای پێغەمبەرەوە ﷺ حەرام بووە، ئیتر چۆن بێدەنگ دەبێت لەسەر پرسیارەکەی عومەر ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ، کەواتە ڕووداوەکە تەنها ئەوە هەڵدەگرێت کە پێغەمبەر ﷺ هێشتا حوکمی سەرجێی کردنی لەسەر شێوازی جۆراوجۆر پێنەگەیشتبوو بۆیە بێدەنگ بوو، کاتێك ئایەتەکە دابەزی بۆی شیکردەوەو فەرمووی لە پێشەوەو لە پاشەوە دەتوانی بیکەیت، بەڵام خۆت لە کۆمو کاتی حەیز بپارێزە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ: ئەگەر عومەر لە شوێنی ئاساییەوە چووەتە لای ژنەکەی ئیتر بۆچی بەو شێوەیە نارەحەت دەبێت؟

بۆ تێگەیشتن لەم مەسەلەیە دەبێ لە سروشتی ئەو کۆمەڵگەیە تێبگەین، کە پێغەمبەر ﷺ پێکیهێنابوو لە ڕووی هەستیاری موسڵمانانەوە بەرامبەر بە هەر شتێك کە بە گوناهیان زانیبێت، بە زانینی ئەو شتە گرێکوێرەکانمان بۆ دەکرێتەوە.

ئەگەر بزانین موسڵمانان گەیشتبوونە چ ئاستێك لە هەستیاری بەرامبەر گوناه لە ڕووی بەرزی پلەی ئیمانو پابەند بوون بە ڕێنماییەکانی خواو پێغەمبەرەوە کە بە بچووکترین گوناه لەشیان دەهاتە لەرزینو وایاندەزانی تیاچوون ئەو کاتە تێدەگەین بۆچی حەزرەتی عومەر وا بە هەڵەداوان چوو بۆ لای پێغەمبەرﷺ. ئەگەر بمانەوێت نموونە بێنینەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە سەدان نموونەمان لەبەر دەستدایەو لە بابەتەکە دەردەچین، من تەنها دوو نموونە دێنمەوە:

یەکەم: دوای دابەزینی ئایەتی **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لا تَشْعُرُونَ) (الحجرات : 2 )**، یەکێك لە یارانی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی سابتی کوڕی قەیس سێ ڕۆژ لە ماڵ نەهاتە دەرەوەو ئیشو کاری گریان بوو، تا پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پرسی، وتیان وەڵڵا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای دابەزینی ئەو ئایەتە چووەتە ماڵەوەو شەوو ڕۆژ دەگری و دەڵێت: من دەنگم بەرزەو ئەو هەڕەشەیە من دەگرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ ناردی بە دوایداو پێی فەرموو: ئایا ڕازی نابیت بە سەربەرزی بژیتو بە شەهیدی بمریت؟ وتی: بەڵێ ڕازی بوومو چیتر دەنگم بەرزتر ناکەمەوە لە دەنگی پێغەمبەر.

دووەم: ڕۆژێکیان ئەبوبەکری صدیق گەیشت بە سەحابەیەك، ناوی حەنزەڵە بوو، لێی پرسی: ئەی حەنزەڵە چۆنی (كيف أصبحت: چۆن ڕۆژت کردەوە)، ئەویش وتی (**اصبحت منفقاً**) واتە: بووم بە دووڕوو، وتی: چۆن؟ وتی: ئەو کاتانەی لە خزمەتی پێغەمبەردا دەبم باوەڕم بەرز دەبێتەوەو دەگەمە ئاستێك وادەزانم چاوم لە بەهەشتو بەهەشتییەکانە هاتوچۆی تێدا دەکەنو چاوم لە دۆزەخەو وا هەست دەکەم گوێم لە قیژەو هاوارییانە، بەڵام کاتێك دەگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵو منداڵ خەریکی دونیا دەبمو ئەو حاڵەتەم نامێنێت، ئەبوبەکر فەرمووی: بەخوا منیش هەروام، با بچین بۆ لای پێغەمبەر ﷺو ئەم شتەی پێ بڵێین. کاتێك دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ و بابەتەکەی بۆ باس دەکەن، دەفەرمووێت: سوێند بەخوا ئەگەر بە بەردەوامی بەو شێوەیە بن کە لای منن، بە ڕۆژی نیوەڕۆ مەلائیکە دەبیننو تەوقەتان لەگەڵدا دەکەن، بەڵام (**ساعة فساعة**) واتە: ساتە و سات، واتە مرۆڤ هەموو ساتێك لەیەك ئاستدا نابێتو ئەوەی ئێوە شتێکی ئاساییە.

ئەمانە دوو نموونەن لە هەزارەها نموونە لەسەر هەستیاری یارانی پێغەمبەر بەرامبەر بە بچووکترین گوناه.

ئەوانەی تامی خواناسیو خواپەرستییان نەچەشتووە، ناتوانن لە هەستو حاڵەتی دەروونی خواناسان تێبگەن و بزانن چۆن دەڕوانن بۆ کردەوەکانی خۆیانو چۆن بیردەکەنەوە.

یەکێك لە پیاوچاکان دەفەرمووێت: "(حسنات **الأبرار سيئات** المقربين) واتە: ئەو شتانەی پیاوچاکان بە کردەوەی چاکی دەزانن، ئەوانەی لە خواوە نزیکن بە گوناهی دەزانن.

هەروەها ناتوانن لەو حاڵەتانە تێبگەن کە پێی دەوترێ، حاڵەتی (**صفاء الروح**) واتە: پاکیو بێ خڵتەیی ڕۆح کە تێیدا مرۆڤ نەك هەر گوناهە بچووکەکانی بە لاوە زۆر گەورە دەبێت بەڵکو تەنانەت شتە حەڵاڵو ڕێگەپێدراوەکانیشی بە لاوە

قورسە وەکو نانخواردنو سەرجێیی کردن لەگەڵ ژنو قسەی دونیایی کردن و ..هتد، هەر ئەو حاڵەتەش بوو وای لە یەکێك لە سەحابەکان کرد لە پێغەمبەر ﷺ بپرسێت: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەهلی بەهەشت سەرجێیی دەکەن لەگەڵ ژنەکانیاندا. ئەویش فەرمووی: بەڵێ **(دحماً دحماً)**. واتە بە زۆرییش. ئەو سەحابەیە کە دەیبیست لە بەهەشتدا موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەرانو پیاوچاکاندانو خوا دەبینن وایزانیوە لەو حاڵەتانەدا مرۆڤ دەگاتە حاڵەتێکی رۆحیی وا کە دژە لەگەڵ ئەنجامدانی سێکسو ئەو جۆرە چالاکییانەدا، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئەوەی تێی بگەیەنێت کە ئەنجامدانی سێکس لە چوارچێوەی حەڵاڵدا دژ نییە لەگەڵ ئەو حاڵەتە رۆحییەی کە مرۆڤی تێدا دەبێت بۆیە فەرمووی: بەڵێ زۆریش.

لە گریمانێکدا ئەگەر راست بێتو حەزرەتی عومەر لە کونی دواوە چووبێتە لای ژنەکەی، ئایا پەنابردنی بۆ لای پێغەمبەر بەو شێوەیە و ئەو قسەیەی کە دەیکات ئەوە ناگەیەنێت کە چوونە لای ژن لە کونی دواوە لە ناو کۆمەڵگەی موسڵماناندا شتێکی قێزەونو ناشیرین بووە ؟! ئەگەر ئەو کارە شتێکی ئاسایی بووبێتو حەزرەتی عومەر حەزی لێکردبێت و لە مەککە خەڵکیی ئەنجامی دابێت، مانای وایە زیاد لە یەك جار ئەو کارەی کردووە، ئیتر چ پێویست دەکات بە هەڵەداوان بچێت بۆ لای پێغەمبەر و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا تیاچووم، چونکە دوێنێ شەو بارو هەوارم گواستبوویەوە.

ئایا ئەم ریوایەتەی خوارەوە بە راشکاوی ئەوە ناگەیەنێت کە چوونە لای ژن لە کونی دواوە شتێکی قێزەونو نائاسایی بووە ؟:

کابرایەك لە کونی دواوە دەچێتە لای ژنەکەیو خەڵکیی بە لایانەوە شتێکی نائاساییو ناشیرین دەبێت **(فأنكر الناس عليه ذلك)** واتە چوونە لای ژن لە کونی دواوە لە قۆناغی مەککەدا ئاسایی نەبووەو ئیماندارانو سەحابەکانی سەردەمی پەیامبەر لە کونی دواوە نەچوونەتە لای ژنەکانیان، چونکە بە شتێك دەوترێت ئاسایی کە خەڵکانێکی زۆر ئەنجامی بدەنو لە ئەنجامدا ببێتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیو خەڵکیی بە چاوێکی قێزەون تەماشای نەکەنو بە شتێکی ناشیرینی نەزانن، نەك شتێك یەك نەفەر یا دوو نەفەر ئەنجامیان دابێتو بە لای کۆمەڵگەوە ناشیرین بووبێتو بەر رەخنەی خەڵکیی کەوتبێت، یا ئەو کەسە خۆی لە خۆیەوەو بەبێ بوونی هیچ فشارێکی دەرەکی بچێت شتەکە بدرکێنێو نائارامیو نارەحەتی خۆی دەربڕێتو بە تاوانێکی گەورەی بزانێتو داوای حوکمی شەرع بکات لە بارەیەوە!

ئەگەر چوونە لای ژن لە کونی دواوە ئاسایی بوایە کەس نەدەچوو داوای حوکمی شەرعی بکات، بەڵکو هەروەکو چۆن لە پێشەوە دەیکرد، بەبێ هیچ هەراو هوریایەك بە هەمان شێوە لە دواوە دەیکرد و خۆیشی تێك نەدەدا.

ئەو فەتوایەی کە دەدرێتە پاڵ ئیبنو عومەر کە گوایە چوونە لای ژنی لە کونی دواوە بە حەڵاڵ زانیبێت لە چەندین شوێندا نافیع خۆیو سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ئەو شتەیان بە درۆ خستۆتەوەو لە ریوایەتێکیشدا، کە ئیمامی نەسائی ریوایەتی کردووە و شێخی ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بە حەرامو قێزەونی داناوە. ئەمەش دەقەکەیەتی: **(عن سعيد بن يسار قال: قلت لابن عمر: أنا نشتري الجواري فنحمض لهن، قال: وما التحميض؟ قلت: نأتيهن في أدبارهن. قال: أف، أوَ يفعل ذلك مسلم؟!)** واتە: سەعیدی کوڕی یەسار وتی: بە ئیبن عومەرم وت: ئێمە کەنیزك دەکڕینو لە کونی دواوە دەچینە لایان. ئەویش وتی: داوەشێن. ئایا موسڵمان شتی وا دەکات؟!.

کەواتە هەرچی فەتوایەك دەدرێتە پاڵ ئیبن عومەر، کە گوایە رای وابووبێ چوونە لای ژن لە کونی دواوە حەڵاڵە ئەوە هەمووی درۆو بوختانە یا نەزانینە.

لە عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە چاوی بە سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کەوتووەو وتوویەتی: ئەی باوکی عومەر ئەوە چییە دەڵێن نافیع ـ کۆیلەیەکی ئازادکراوی ئیبن عومەر بووە ـ دەڵێت عەبدوڵڵای کوڕی عومەر چوونە لای ژنی لە کونی دواوەی بە لاوە حەرام نەبووە. سالم وتی: ئەو درۆی کردو هەڵەی کرد، عەبدوڵڵا وتوویەتی لە دواوە بۆ کونی پێشەوە هیچی تێدا نییە.

قورتوبی ریوایەتێك باس دەكات لە سەر زمانی یەكێك لە یارانی پێغەمبەرەوە كە وتوویەتی: **كنا نجبي النساء:** واته ژنەكانمان لەسەردەم دەخست و سەرجێییمان لەگەڵدا دەكردن.

أ: (**يجبون النساء: يأتون زوجاتهم وهن مكبات على وجوههن**) واته: دەچوونە لای ژنەكانیان بە شێوەیەك كە ژنەكە لەسەر دەم كەوتبێت، نەك لە كونی دواوە.

ب — ئیبن عومەر بە نافیع دەڵێت: ئەی نافیع دەزانی ئەمە چۆن چۆنییە، ئێمەی قورەیش ژنانمان لەسەر دەم دەخستو سەرجێیمان لەگەڵدا دەكردن و ئەنسارییەكان ئەو كارەیان نەدەكرد، كاتێك چووینە مەدینەو ژنی ئەنساریمان خواست، ویستمان بە هەمان شێوە بچینە لایان.

## رۆڵی سێكس لە كۆمەڵگەی عەرەبیدا لە رووبەڕووبوونەوەی بانگەوازی ئیسلامیدا

گەورەترین كێشەی عەرەب بەرامبەر بە ئیسلام مەسەلەی بتپەرستیو چینایەتی بوو كە ئامادە نەبوون دەست لە بتەكانیان هەڵگرنو لەگەڵ كۆیلەو هەژارەكاندا وەكو یەكیان لێ بێتو جیاوازیی لە نێوانیاندا.

پەیامبەر هەر لە سەرەتاوە رووبەڕووی هەموو ئەو دابو نەریتو ئاكارە كۆمەڵایەتییانە بوویەوە كە لەناو مەككەدا باو بوون، وەكو مەسەلەی ستەمو زیناو سو خواردنو زیندەبەچاڵكردنو بەچاوی سووك تەماشاكردنی ئافرەتو درۆ و خیانەتو دزی.. هتد.

پەیامبەر ﷺ (13)ساڵ لە مەككە زیاتر بایەخی بە لایەنی عەقیدە دەدا، چونكە بناغە بوو بۆ دامەزراندنی كۆمەڵگەیەك بۆ ئەوەی باشتر سیستمو شەریعەتی ئیسلامی قبوڵ بكاتو پەیڕەوی لێبكات نەك وەكو هەندێك لە موسڵمانانی ئەمڕۆ كە دەیانەوێت لە رێگەی هێزو لە رێگەی دەسەلاتەوە سیستمی ئیسلامیی بەرپا بكەن بێ ئامادەكردنی میللەت بۆ قبوڵكردنی ئەو سیستمە، یان وا دەزانن گەر لە دەستووری دەوڵەتدا بنووسرێت ئیسلام تاقە سەرچاوە یا سەرەكیترین سەرچاوەی تەشریعە بەوە ئیسلام بەرپا دەكرێت، یا گەر بنووسن دینی رەسمی دەوڵەت ئیسلامە هەموو شتێك تەواوە.

ئەوەی كە لە هەموو شتێك زیاتر وای لە عەرەب دەكرد بە رووی پەیامبەردا ﷺ بچنەوە مەسەلە میتافیزیكییەكە بوو، مەسەلەی تاكو تەنهایی خوا، مەسەلەی بتپەرستی، زیندووبوونەوە دوای مردنو رزین لە خاكدا، مەسەلەی ناردنی بەشەر وەكو پەیامبەرێك لە لایەن خواوە..

قورسترین شت بە لای خەڵكی مەككەوە دەست هەڵگرتن بوو لە بتپەرستیو شیرك، پاشان مەسەلەی زیندوو بوونەوە.

دوای ئەمانە مەسەلە چینایەتییەكە بوو كە سەرانی قورەیش نەیاندەویست لەگەڵ كۆیلەكانیاندا یەكسان بكرێنەوە.

بەڵام مەسەلەی زیناو مەشروبخواردنو سوخواردنو قوماركردنو ئەم شتە كۆمەڵایەتییانە لە هیچ سەرچاوەیەكدا نەهاتووە كە بە تەنها بووبێتە ئاستەنگێك لەبەردەم بانگەوازەكەی پەیامبەردا، ئەوەتا قورئان بخوێنەرەوە بزانە وایە یان نا، بە تایبەت سورەتە مەككییەكان، بزانە هەموو كێشەی عەرەب مەسەلەی بتپەرستیو زیندووبوونەوە نەبووە؟ ئەمە پێچەوانەی كۆمەڵگەی ئەمڕۆیە كە لەبەر سێكسو مەشروبو فەساد خەڵكیی ئیسلام رەت دەكەنەوە یا بەگژیدا دەچنەوە!!

كۆمەڵگەی عەرەبی پێش ئیسلام سێكس مەسەلەیەكی بەرچاوو ئاشكرا نەبووە تێیدا، ئەوە زیاتر كێشەی فارسو رۆمەكان بووە نەك عەرەب. بەڵێ عەرەب زیناو فەسادی ئەخلاقییان تێدا هەبووە، بەڵام یەكەمزۆر كەمتر لە میللەتانی تری وەكو فارسو رۆمو دووەمیش ئەو مومارەسە سێكسییانە ئاستەنگ نەبوون لەبەردەم بانگەوازەكەی پەیامبەر، بەڵكو عاقڵانی عەرەب رێنماییەكانی ئیسلامیان دەربارەی رێكخستنی هەوەسی سێكس بە لایەنێكی ئیجابی لە قەڵەم دەداو نەبیستراوە هیچ كەسێك لەبەر ئەو مەسەلەیە ئیسلامی رەت كردبێتەوە، یا دژی وەستابێت.

ئەوەی کە کێشە نەبووە لەبەردەم عەرەبدا بۆ وەرگرتن یا رەتکردنەوەی ئیسلام مەسەلەی سێکس بووە، نەك لەبەر ئەوەی، کە ئیسلام رێگەی بۆ سێکس والآ کردووە، چونکە ئاشکرایە کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو مومارەسە سێکسییانەی لە ناو عەرەبدا هەبوو قەدەغەی کرد و سنووری بۆ دانا، بەڵکو ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عەرەب کۆمەڵگەیەکی سێکسی نەبوون، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، کە وەکو لەمەوبەر وتمان مەسەلەی عەقیدەو بیروباوەڕ بە لای خەڵکی مەککەوە زۆر گرنگتر بوو لە مەسەلەکانی تر پاشان مەسەلەی چینایەتیی و کۆمەڵایەتیی، ئەمەش سروشتی هەموو کۆمەڵگەیەکی پارێزکارە بە پێچەوانەی کۆمەڵگە مەدەنییەکانەوە کە مەسەلەی سێکس و رابواردنەکانی جەستە گەورەترین ئاستەنگن لەبەردەمیاندا بۆ وەرگرتنی ئایین بە تایبەت ئایینێك کە سنوور بۆ سێکس دابنێت، دەستبەرداری گەنجانی موسڵمانان لە ئیسلام گەورەترین بەڵگەیە لەسەر کاریگەریی سێکس لەم سەردەمەدا.

## مومارەسەی سێکس لە نێوان ئیسلام و سەردەمی جاهیلی

بۆ ئەوەی قەوارەی ئەو جیاوازییەی نێوان ئیسلام و سەردەمی جاهیلی و پاشان قەوارەی ئەو گۆڕانکارییەی ئیسلام کردوویەتی لەو کۆمەڵگەیە بە تایبەتی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بە گشتیی بزانین باسی شێوەکانی ژنهێنانی سەردەمی جاهیلی دەکەین پاشان باسی ئەو جۆرانە دەکەین کە ئیسلام بە دەسکارییەوە هێشتوونیەتەوە:

شێوەکانی مومارەسەکردنی سێکس لە سەردەمی جاهیلیدا:

دکتۆر جمال محمد فقی رسول الباجوری لە کتێبی (**المرأة في الفكرة الإسلامي**) بەرگی یەکەم (ل33)دا بەم شێوەیە باس دەکات: سێکس کردن لە ناو عەرەبدا چەند شێوەیەکی هەبوو، عوروەی کوڕی زوبەیر تەنها چوار جۆریانی لە عائیشەوە گێڕاوەتەوە:

1ـ ژنهێنانی ئەمڕۆی خەڵکی: پیاو دەچووە خوازبێنی کچی پیاوێك، مارەییەکەی بۆ دەبڕییەوەو دەیخواست.

2ـ **الإستبضاع:** پیاوی وا هەبوو دوای پاك بوونەوەی ژنەکەی لە خوێنی مانگانە پێی دەوت: بنێرە بە دوای فلآنە پیاودا با لەگەڵتدا جووت بێت، پاشان مێردەکەی نەدەچووە لای تاوەکو دووگیانیی لەو پیاوە دەردەکەوت، پاش ئەوە بیویستایە دەچووە لای ژنەکەی.

3ـ **نكاح الرهط:** کۆمەڵێك پیاو (کەمتر لە دە کەس) کۆ دەبوونەوەو دەچوونە لای ئافرەتێك هەموویان کاری سێکسییان لەگەڵدا ئەنجامدەدا، ئەگەر دووگیان بوایەو منداڵی بوایە دەینارد بە شوێن هەموویانداو کەسیان بۆی نەبوو بچی بەدەمیەوە تا هەر هەموویان کۆ دەبوونەوە لای و پێی دەگوتن، خۆتان لە مەسەلەکە ئاگادارن و وا ئێستا منداڵم بووە، فلآنە کەس ـ ناوی یەکێکیانی دەبرد ـ ئەوە منداڵی تۆیە، ئەویش دەیکردە منداڵی خۆی و بۆی نەبوو رەتی کاتەوە.

4ـ **البغاء:** کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوان دەچوونە لای ژنێك و هەموویان سێکسیان لەگەڵدا دەکردو رێی لە کەس نەدەگرت ئەوانەش سۆزانییەکان بوون کە لە سەر دەرگاکانیان ئالآیان هەڵدەکرد بۆ ئەوەی بناسرێن و هەر کەسێك بیویستایە دەچووە لایان، ئەگەر یەکێك لەو ژنانە سکی بوایە پیاوانیان کۆ دەکردەوەو بانگی قیافەناسێکیان دەکرد بۆ ئەوەی بیدا بەسەر یەکێکیاندا، بەهەر کەسێکیشیان بدرایە بۆی نەبوو رەتی کاتەوەو دەبووە منداڵی ئەو.. عائیشە دەفەرموێت کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات هەموو ئەو جۆرانەی بەتاڵ کردەوە، تەنها ئەم شێوەیە نەبێت کە ئەمڕۆ خەڵکی دەیکەن. (**بخاري**).

جگە لەو چوار شێوەیە ئەمانەی تریش هەبوون:

5ـ نیکاح الشغار: ئەویش ژن بە ژنە، بەبێ ئەوەی هیچ مارەییەك هەبێت لە نێوانیاندا، دوو پیاو رێکدەکەوتن لە نێوان خۆیاندا کە هەریەکەیان کچی خۆی یا خوشکی خۆی بدا بەوی تر بێ مارەیی.

6ـ **نكاح المتعة:** ئەویش ژنهێنانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، ئەگەر ماوەکە تەواو بوو بەبێ تەڵاق لەیەك جیا دەبنەوە().

7ـ **نكاح الخدن والصداقة:** واتە سێکس کردنی ژێراو ژێر، عەرەب لە کاتی نەفامیدا دەیانگوت: هەرچی شاراوە بوو هیچی تێدا نییەو هەرچیش ئاشکرا بوو ئەوە ناشیاوەو سەرزەنشت دەکرێت.

8ـ **نكاح الضيزن أو المقت:** ئەویش ئەوەیە کوڕ باوەژنی خۆی دەخواست، گەر باوکی تەڵاقی بدایە یا بمردایە، بە کوڕەکەی دەگوترا (المقتّی)، ئەوسی کوڕی حەجەر لە سەرزەنشتی ئەم جۆرە زەواجەدا دەڵێت:

**والفارسية فيهم غير منكرة فكلهم لابيه ضيزن.**

9- نكاح البدل: واتە ژن گۆڕینەوە، پیاوێك بە پیاوێکی تری دەگوت دەست لە ژنەکەت هەڵگرە بۆم منیش دەست لە ژنەکەم هەڵدەگرم بۆتو سەریشت دەدەمەوە.

10ـ **نكاح الاستيلاء أو الإغتصاب:** واتە: دەست بەسەراگرتن، ئەویش بەوەیە کە پیاوێك لە ڕێگای هێزەوە دەست بگرێت بەسەر ژنێکدا، ئیتر چ لە شەڕدا بێت یا بە ڕفاندن.

ئەمانە ئەو شێوازانەن کە لەسەردەمی نەفامیدا باو بوون، با بزانین ئیسلام کامیانی هێشتۆتەوەو بەرگی شەرعی بە بەراکردووە.

**ئەو ڕێگایانەی کە ئیسلام هێشتنییەوە بۆ ئەنجامدانی سێکس،** ئەو ژنهێنانەیە کە لە خاڵی یەکەمدا باس کراوە لەگەڵ هەندێك دەستکاریدا کە ئەویش بریتییە لە مەرجی ڕازی بوونی کچ و سەربەخۆیی بێوەژن، بوونی شایەت، ئاشکراکردنو مارەیی.

دووەم: ئەو کەنیزەکەی کە دەیکرێت یەکسەر بۆی حەڵاڵ دەبێت سێکسی لەگەڵدا بکات، دواتریش بە درێژی باسی ئەم مەسەلەیە دەکەین، ئەما زەواجی موتعە، یا ژنهێنانی کاتی، ئەمە لە لای هەموو مەزهەبە سوننییەکان کە زیاد لە (90٪) موسڵمانان پێك دێنن حەرامەو وەکو زینا وایە، تەنها لای شیعە نەبێت حەڵاڵە ئەویش لەبەر چەند هۆیەك کە هەندێکمان باس کردو ئەوانی تریش لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین.

ژن بە ژنیش (نكاح الشغار): ئەمە بە دەقی فەرموودە و بە ڕاشکاوی قەدەغە کراوە، چونکە ئەو شێوەیەی لەناو عەرەبەدا بەرپا کراوە دوو مەرجی سەرەکی زەواجی تێدا نییە لەوانەی کە شەریعەتی ئیسلام دایناوە، یەکەم ڕەزامەندی ژنەکە، دووەم مارەیی، ئەگەر لە کوردستانیشدا مەلاکان کردویانە ئەوە یەکێکە لەو بوارانەی کە مەلای کورد ئیسلامیان گونجاندووە لەگەڵ ویستی زۆرداردا ئیتر چ ئەو زۆردارە دابونەریتی کۆمەڵایەتی بێت، یان ویستی دەسەڵاتدار بووبێت. ئەم مەسەلەیەش (واتە: ڕۆڵی مەلای کورد لە گەیاندنی ئیسلامدا)، بابەتێکی سەربەخۆیەو لێکۆڵینەوەی تایبەتی دەوێت.

## لە نێوان زەواج و لەشفرۆشیدا

زەواج کە ئەو جۆرە نووسەرانە بە لەشفرۆشیی دادەنێن و جیای ناکەنەوە لە سۆزانێتی بریتییە لە گرێبەندێکی کۆمەڵایەتیی کە لە ڕێوڕەسمێکی شکۆداردا بە شایەتیی چەندین کەس ئەنجام دەدرێتو دوایی دەبێ ئاشکرا بکرێتو لەکاتی گواستنەوەی ژندا ئاهەنگی شکۆداری بۆ دەگێڕدرێتو لە کاتی مارەبڕیندا بەرگێکی پیرۆزی بەبەردا دەکرێتو پیاو کە داواکەرە دیاریی لەگەڵ خۆیدا دەبات بۆ ژنو ئەڵقە، کە هێمای بەیەکەوە بەسترانە دەکەنە دەستی یەك.

ئەوەی ئەم گرێبەندە کۆمەڵایەتییە کە کەم مامەڵە هەیە بەم پیرۆزییەو شکۆمەندییە ئەنجام بدرێت جیا نەکاتەوە لە ژیانی مەلهاکانو کاری سۆزانییەکان، وەکو ئەوە وایە جیاوازی لە نێوان کڕینو فرۆشتنو دزیو ڕوتاندنەوەدا نەکات، یا جیاوازی لە نێوان شت بەقەرز وەرگرتنو زەوتکردندا نەکات.بەڵکو بگرە جیاوازییەکە زۆ زیاتریشە!

## سێكس لە نێوان ئیسلام و ڕۆژئـاوادا

لێرەدا پێویستە چەند ڕاستییەك بۆ خوێنەر بخەمە ڕوو بۆ ئەوەی بە بەرچاو ڕۆشنی مامەڵە لەگەڵ شتەكاندا بكات:

یەكەم: ئەو ڕەخنانەی لە هەڵوێستی ئیسلام لە مەسەلەی سێكسو لە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەگیرێت هی سەردەمانی كۆنی مەسیحییەكانە، ئەو سەردەمەی كە مەسیحییەت بە چاوێكی قێزەونەوە سەیری سێكسو ئافرەتی دەكردو ژنی بە سەرچاوەی شەڕو خراپە دەزانیو هانی ژیانی زگورتێتی دەداو كاری سێكسییان لەگەڵ ڕۆحانییەتدا بە دوو شتی پێچەوانەو دژ بەیەك دادەناو باسكردنی سێكس شتێكی قێزەون بوو.

دووەم: ئەم بارودۆخەی ئێستا ڕۆژئاوا لە ڕووی بەرەڵڵایی سێكسییەوە كاردانەوەیەك بوو بۆ ئەو كەبتەی مەسیحییەت دەیكرد لەسەر سێكس و هەروەك چۆن هەڵوێستی مەسیحییەت لە سێكسو لە ئافرەت كاردانەوەیەك بوو بۆ بەرەڵڵایی سێكسو نقوم بوونی ڕۆمییەكان لە ڕابواردنە دونیاییەكاندا بەهەمان شێوە بەرەڵڵایی سێكسی ئەمڕۆ كاردانەوەیە بۆ ئەو كەبتە جنسییەی مەسیحییەت فەرزی كردبوو.

هەڵوێستی ئیسلام لە سێكس مام ناوەندییە لە نێوان ئەو دووەدا، نە باوەڕی بە خەفەكردن (كبت) هەیە وە نە بە بەرەڵڵایی سێكسی.

كەواتە ئەگەر لە سەردەمی زاڵی مەسیحییەت بەسەر كۆمەڵگەدا ئیسلام بەوە تاوانبار بكرایە كە ڕێگەی بە فرەژنی داوەو پێغەمبەرەكەی ﷺ فرەژنیی كردووە، دەبوایە ئێستا بەوە تاوانبار بكرێت كە سێكسی سنوردار كردووەو ڕێگەی ئازادی (لە ڕاستیدا: بەرەڵڵایی) سێكسی نەداوە، بەڵام سەیر لەوەدایە كە ئەم نووسەرانەی لای ئێمە بەبێ شەرمانە لە كاتێكدا كە باوەڕیان بە ئازادی ڕەهای سێكس هەیە بە هەموو شێوەكانیەوە ڕەخنە لەو شێوە سنورداركراوەی ئیسلام دەگرنو بە ئایینی پیاوی هەوەسبازی لە قەڵەم دەدەن.

سێیەم: شتێكی بەڵگەنەویستە كە هەموو شتەكانی ڕۆژئاوا باش نییە بەڵكو زۆر شتی خراپی تێدایە، لەوانە: ئایدز، سفلس، جگەرەكێشان و مەشروب خواردنی ژنان، نێربازی، خۆكوژی، بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە دەروونییەكان، هەڵوەشانی خێزانو دەیان شتی تر.

لەبەرامبەر ئەوەشدا هەموو شتەكانی لای خۆمان خراپ نییەو شتی باشی زۆرمان هەیە، لەوانە: پتەویی خێزان و پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لە خزمایەتیو دراوسێیەتیو ڕێزی دایكو باوكو نەنكو باپیرو دەستگرتن بە منداڵانەوەو بەردەوامی ئەو پەیوەندییە بۆ دوای ژنهێنانی كوڕو شووكردنی كچ، هەروەها نەبوونی دیاردەی مەشروبخۆریو جگەرەكێشی لە ناو ژناندا، نەبوونی ئایدزو سفلسو تلیاكخۆریو دەیان شتی تر.

كەواتە دەبێ لێكۆڵینەوەی زانستی بێلایەنمان هەبێت دوور لە كاریگەریی هیچ ئایدۆلۆژیایەكی پێش وەخت بۆ ئەوەی دیراسەی ئەو دیاردە كۆمەڵایەتییانە بكاتو باشو خراپیان لەیەك جیا بكاتەوەو ئەو لایەنانە كە پێویستە وەربگیرێت لە ڕۆژئاوا جیا بكرێنەوە لەوانەی كە نابێ ڕێگەی هاتنیان بۆ وڵاتەكانمان بدرێت.

چوارەم: دەبێ ئاگامان لە بەخۆداچوونەوەكانی ڕۆژئاوای پێشكەوتوو بێتو ئەو لێكۆڵینەوەو توێژینەوە زانستییانەی لەوێ كراوە دەربارەی دیاردە جیاجیاكانی كۆمەڵگە ئاگامان لێیان بێت بۆ ئەوەی لەو شوێنەوە دەست پێ بكەین كە ئەوان گەیشتوونیەتێ، نەك لە سفرەوەو ئێمەش بە هەمان هەڵەی ئەواندا بڕۆین.

بۆ نموونە ئەوان بیری ناسیۆنالیستییان وەلاوە ناوە كەچی لای خۆمان تازەبەدوا نەك هەر برەو بە ناسیۆنالیستی دەدەین، بەڵكو پەرپیوینەتەوە بۆ ئەوپەڕەكەی كە شۆفێنزمییە.

ئەمڕۆ لە ڕۆژئاوادا لێكۆڵینەوەو توێژینەوەی زۆر هەیە دەربارەی هۆكارەكانی هەڵوەشانی خێزانو ئیجابیاتو سلبیاتی تێكەڵیی كوڕو كچ لە قۆناغەكانی سەرەتاییو ناوەندییو ئامادەییو زانكۆدا و چەندین بابەتی تر، كە پێویستە لێپرساوانو ڕۆشنبیرانی كورد ئاگایان لێیان بێت بۆ ئەوەی هەڵەكانیان دووبارە نەكەینەوە.. ئێستا لە ڕۆژئاوا دەنگی زۆر بەرز بۆتەوە

بۆ گەڕانەوە بۆ ژیانی خێزانیو گەڕانەوەی ژن بۆ ماڵەوە، ئەویش لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییە نالەبارەی تێی کەوتوونو هەرچی دەکەن ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، کەچی لای خۆمان تازە بەتازە دەمانەوێت خێزان هەڵوەشێنینەوە.

## جیاوازیی نێوان قورئان و تەورات و ئینجیل

ئەوەی کە دەڵێت پێغەمبەری ئیسلام سوودی لە تەورات و ئایینەکانی تر وەرگرتووە، ئەوە:

1ـ پێش هەموو شتێك ئەو کەسە باوەڕی بەوە نییە کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ نێردراوی خوا بێتو قورئان کتێبێکی ئاسمانی بێت لە لایەن خواوە دابەزیبێت.

2ـ جیاوازیی لە نێوان زانیارییەکانی ناو قورئانو تەورات نازانێ، چونکە هەر کەسێك ئەو دووە بخوێنێتەوە دەزانێ جیاوازیی نێوانیان ئەوەندە زۆرە کە هەرگیز نابێت تەورات سەرچاوەیەك بێت بۆ قورئان، چونکە جیاوازییەکان لەیەك شتدا نینو لەیەك بابەتدا نین، بەڵکو لە عەقیدەو بیروباوەڕو ڕووداوە مێژووییەکانو شەریعەتو مەنزومەی ئەخلاقیو.. هتد، تێڕوانینی قورئان جیاوازە لە هی تەورات دەربارەی خواو سیفەتەکانی، دەربارەی فریشتەکانی، دەربارەی ڕۆژی دوایی، دەربارەی پەیامبەرانو دەربارەی ئادەمو حەواو چۆنێتی دەرهاتنیان لە بەهەشت، دەربارەی ئافرەت، دەربارەی گێتیو ڕووداوەکانی.. هتد.

هەروەها جیاوازیی هەیە لە نێوان ئیسلامو یەهودییەتدا لە ڕووی شەریعەتەوە تەنانەت لە ڕووی بەها ئەخلاقییەکانیشەوە، بۆ نموونە:

جوولەکە سوو خواردن لە نێوان خۆیاندا بە حەرامو لەگەڵ خەڵکی تردا بە حەڵاڵ دەزانن، هەروەها خواردنی ماڵی غەیری جوولەکە بە ڕەوا دەبینن لە کاتێکدا کە ئیسلام سوو وەرگرتنی لە هەموو کەسێك حەرام کردووەو خواردنی ماڵی هەموو کەسێکی بە حەرام داناوە، چ موسڵمان بێت یا نا موسڵمان، مەگەر ئەو دەسکەوتانەی لە شەڕدا دەست دەخرێن.

ئەو هەموو جیاوازییەی نێوان قورئانو تەورات تەنها یەك دەلالەتی هەیە ئەویش ئەوەیە کە قورئان لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەرگیراوە غەیری تەورات کە ئاگای لە هەڵەکانی ناو تەورات هەیە، کە ئەویش خوایە.

بەڵێ تەورات لە بنەڕەتدا کتێبی خوایە، بەڵام جوولەکە لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان دەستکارییان کردووەو بە گوێرەی مەیلو ئارەزوو بەرژەوەندی خۆیان گۆڕانکارییان تێدا کردووە، هەروەکو چۆن ئێستا عەلمانییەکانی ناو ئوممەتی ئیسلامی دەیانەوێت ماناو دەلالەتەکانی قورئان بگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ ویستو ئارەزووی خۆیانو لایەنە دەسەڵاتدارەکاندا بیگونجێنن!

هەر لەبەر ئەو دەستێوەردانە بووە خوا پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی خەڵکیی لە عەقیدەو ڕێنمایی پێغەمبەراندا کردوویانە ڕاستی بکەنەوە، بەڵام کە قورئان دوا پەیامە بۆ مرۆڤایەتی خوا پەیمانی داوە بیپارێزێ، بەڵام ماوەی جارێك نوێکەرەوەیەك دەنێرێت بۆ ئەوەی ئەو گۆڕانە و تێکچوونەی لە تێگەیشتنی خەڵکیدا ڕوویداوە بەرامبەر بە ئیسلام ڕاستی بکەنەوەو بیگێڕنەوە سەر بناغەکەی خۆی هەروەکو چۆن کتێبخانەیەك لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنان و دەستکاری کردنی، شوێنی کتێبەکان دەگۆڕێن و تێکەڵ دەبن، بە هەمان شێوە زۆرجار چەمکە ئیسلامییەکان لای موسڵمانان دەشێوێنو پێویست بە کەسانێك دەکات شتەکان بخەنەوە جێی خۆیانو بە گوێرەی گرنگییان ڕیزیان بکەنەوە.

3ـ هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیاوازیی لە نێوان عەقیدەو شەریعەتدا نازانێت، نازانێت ئەوەی گۆڕانکاریی بەسەردا دێت شەریعەتە نەك بیروباوەڕو هەواڵە مێژووییەکان، شەریعەت لە زەمانێکەوە بۆ زەمانێکی تر بە گوێرەی پێویستییەکانی مرۆڤ دەگۆڕێت نەك عەقیدەو هەواڵی میللەتانی پێشوو.

باسی ژیانی پێغەمبەران بریتییە لە گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان کە دەبێ وەکو خۆیان بگێڕدرێنەوەو پەیوەندیی بە گۆڕانی کاتو شوێنەوە نییە، لەوانەیە لێکدانەوەی ڕووداوەکان بگۆڕێت لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بە گوێرەی باکگراوندی

کەسەکان وەکو چۆن ئێستا مارکسییەکان مێژوو لە روانگەیەکی ماددیی رووت‌و ناسیۆنالیستەکان لە روانگەیەکی ناسیۆنالیستی‌و فرۆیدییەکان لە روانگەیەکی سێکسییەوە دەخوێننەوە.

4ـ کەسێك کەمێك زانیاری‌و لۆژیك‌و ئینصافی هەبێت دەزانێت کە جیاوازیی لە نێوان قورئان‌و تەوراتدا بەلگەیە لەسەر ئەمانەی خوارەوە:

أ ـ تەورات سەرچاوەی قورئان نییە.

ب ـ قەوارەی ئەو گۆڕانکارییەی جوولەکە کردوویانە لە تەوراتدا زۆر گەورەیە.

ج ـ قەوارەی ئەو چاکسازیی‌و راستکردنەوانەی قورئان کردوویەتی لە بوارەکانی عەقیدەو رووداوە مێژوویەکان‌و ئەخلاق‌و بەهاکاندا زۆر زۆرە.

5ـ دیارە کە هەریەك لە شوێنکەوتوانی قورئان‌و تەورات دەڵێن کتێبەکەمان لە لای خواوەیەو گۆڕانکاریی بە سەردا نەهاتووە، ئێمەش دەڵێین ئەوە عەرزو ئەوە گەز، ئەوە قورئان‌و ئەوەش تەورات با بیانخەینە ژێر تیشکی زانستەکان بزانین کامیان خۆی دەگرێت لەبەردەم ئەو زانستانەدا بە تایبەت زانستی فەلەك‌و شوێنەوارو مێژوو و پزیشکی‌و جوگرافیاو بایۆلۆژیاو.. هتد.

پاشان با بێین لە رووی لۆژیك‌و زانستی ئەخلاقەوە تەماشای بکەین بزانین ئەو شتانەی تەورات داویەتە پاڵ پێغەمبەران لەگەڵ سروشتی پێغەمبەرایەتیدا دەگونجێت؟

گومانم نییە لەوەی هەر زانایەکی خاوەن ئینصاف ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بکات بۆی دەردەکەوێت کە تەنها قورئان کتێبی دەستکاری نەکراوی خوایەو هەرچی ئەوانی تر هەیە هەموو دەستکاریی کراون.

باسی ژیانی پێغەمبەران شتی مێژوویین کە نابێ لە گێڕانەوەیاندا دەستکاریی بکرێن‌و پەیوەندیی بە شوێن‌و سەردەمەوە نییە.

قورئان ئەو گۆڕانکارییانەی جوولەکەی خستەڕوو کە لە تەوراتدا ئەنجامیان دابوو، لە جێی ئەواندا راستییەکانی دەرخستووە، واتە: قورئان بریتییە لە راستکردنەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی جوولەکە لە بواری عەقیدەو بیرو بۆچوون‌و بەها ئەخلاقییەکاندا کردبوویان، عەقیدەیەك‌و بینینێکی نوێ‌و راستی هێنایە کایەوە دەربارەی خوا، پەیامبەران، فریشتەکان، ئادەم‌و حەوا، ئافرەت، گێتی‌و بوونەوەرو رووداوە مێژوویەکان و.. هتد.

پێغەمبەر ﷺ ئەم شتانەی رووبەڕووی جوولەکە دەکردەوەو وەڵامیان نەبوو، گەر هەبوایە درێغییان نەدەکرد.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە زانایانی یەهود ئەو راستیانەیان لە شوێنکەوتووەکانیان دەشاردەوەو ناڕەحەت بوون بەوەی قورئان دەیخستنە روو، لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە کە قورئان لە دەوری مەککیدا باسی چیرۆکی پێغەمبەرانی کردووەو لە مەدینەدا گفتوگۆی لەگەڵ جوولەکەکاندا کردووە، واتە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان هێشتا تێکەڵی جوولەکەی نەکردبوو، قورئان بە جوولەکە دەڵێت: ئێوە دەستکاری تەوراتتان کردووە نەك ئەوان بە (محمد) بڵێن تۆ تەوراتەکەی ئێمەت گۆڕیوە، قورئان لە زۆر شوێندا داوای لە جوولەکە دەکرد کە تەوراتە راستەقینەکە بێنن‌و بیخوێننەوە بزانن ئەوانەی من دەیڵێم وایە یان نا، بەڵام ئەوان هیچ وەڵامێکیان پێ نەبوو، (**قُلْ فَأْتوا بِالتَوْرَاةِ فاتلوهَا إن كُنتُمْ صَادِقِينَ**) (**آل عمران: 93**).

هەرکەسێك کەمێك ئینصاف‌و لۆژیکی هەبێت دەزانێ کە هەرگیز نابێت تەورات سەرچاوە بێت بۆ قورئان ئەمە یەك، دووەمیش ئەوەیە کە تێڕوانینی قورئان گونجاوترە لەگەڵ پلەو پایەو سروشتی کاری پەیامبەراندا کە هەڵبژاردەی خوان‌و کەسانی چاکەسازن‌و نێردراون بۆ چاك کردنی کۆمەڵگەی خۆیان، بەڵام ئەگەر بێتو لە روانگەی تەوراتەوە تەماشای بکەیت دەبینی کەسانی ستەمکارو بەدڕەوشت‌و بتپەرست بوون، ئەم سیفەتانەش نەك شیاوی هەڵبژێردراوانی خوا نین بەڵکو شیاوی کەسانی ئاساییش نین.

بۆ نموونە یەعقوب فێڵی لە عیسۆی براگەورەی کرد بۆ ئەوەی بەرەکەتی باوکی تەنها بەر خۆی بکەوێت، داود فێڵ لە یەکێك لە سەربازەکانی بۆ ئەوەی بیدا بە کوشتو ژنەکەی بخوازێتو چەندین شتی تر کە لەمەودوا کەمێ بە درێژتر باسی دەکەین.

تەورات (یان راستتر: عەهدی کۆن) نەك تەنها لە باسی پەیامبەراندا جیاوازە لە قورئان بەڵکو لە زۆربەی شتەکانی تریشدا وەکو تێڕوانین بۆ خواو سیفەتەکانی کە چەندین سیفەتی ناشیاوی وەکو نەزانیو هەڵەکردنو پەشیمان بوونەوەو لاوازیو ستەمو دڵڕەقیو دەمارگیریو ماندووبوونو چەندین شتی تر دەداتە پاڵ خوا کە قورئان هەمووی رەت دەکاتەوەو بیروبۆچونێکی تر لە جێگەیدا دادەنێت کە خوا بێبەریی دەکات لەو هەموو کەموکورتیيانە.

هەروەها مەسەلەی رۆژی دواییو بەهەشتو دۆزەخ لە تەوراتدا باسی نییەو سزاو پاداشت تەنها لەم دونیایەدایە نەك لە رۆژی دوایی، جا بۆ ئەوەی خوێنەر بۆی دەرکەوێت کە نووسەر لە خۆیەوە قسە دەکاتو هیچ بەڵگەیەکی زانستیی بە دەستەوە نییەو تەنها لە رقی ئیسلامدا هەر شتێك دژو پێچەوانەی ئیسلام بێت بە راستی دەزانێت بە کورتی باسی تەورات (یا راستتر بڵێین: کتێبی پیرۆز)و بەشەکانیو مێژووی نووسینیانو ئەوانەی نووسیویانەتەوە و زانیارییەکانی ناوی دەربارەی خواو پێغەمبەرانو رۆژی دواییو شەریعەتو رووداوە مێژووییەکان و ..... هتد.

## کتێبی پیرۆز

پێش ئەوەی باسی ئەوە بکەین کە تەورات کەی نووسراوەتەوەو کێ نوسیویەتیو چی تێدایە پێویستە بە کورتی پێناسەیەکی کتێبی پیرۆز بکەین، بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر ئاگاداری مەسەلەکە بێتو بە بەرچاو روونی مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

کتێبی پیرۆز لە دوو بەش پێك دێت: 1 -**العهد القديم**، **2 – العهد الجديد**.

**العهد القديم:** بریتییە لە کتێبەکانی یەهود (اسفار اليهود)و تەورات (کە لە پێنج بەش پێك دێت) بەشێکە لەو کتێبانە، عەهدی کۆن بە هەموویەوە بە لای پرۆتستانتەکانەوە (39) سیفر (کتێب یا بەش)ە، بەڵام کاسۆلیکەکان حەوتی تری بۆ زیاد دەکەنو دەبنە (46)، هەندێك جار کە دەگوترێت تەورات مەبەست لە هەموو سیفرەکانی عەهدی قەدیمە نەك تەنها (5) سیفرەکەی تەورات کە بە سەر حەزرەتی موسادا دابەزیوە، ئەویش لەبەر گرنگی تەوراتو لەبەر ئەوەی حەزرەتی موسا گەورەترین سەرکردەی جوولەکەیەو مێژووی راستەقینەیان لەوەوە دەست پێ دەکات، تەوراتیش بە مانای شەریعەت یا رێنماییە ئایینییەکان دێت.

عەدی کۆن بە لای جوولەکەو مەسیحییەکانیشەوە پیرۆزە، بەڵام هەموویان کۆك نین لەسەر هەموو سیفرەکانی، چونکە هەندێك لە زانایانی جوولەکە هەندێ سیفر زیاد دەکەن بۆ عەهدی کۆن ئەوانی تر پێی رازی نین، بە نیسبەت مەسیحییەکانیشەوە جیاوازیی هەیە لە نێوانیاندا، وەکو وتمان بە لای پرۆتستانتەوە (39) سیفرن، بەڵام کاسۆلیك حەوتی تری بۆ زیاد دەکەن کە دەکاتە (46).

عەهدی کۆن کە پرۆتستانت باوەڕیان پێیەتی سێ بەشە:

<u>بەشی یەکەم</u>: تەورات: لە پێنج سیفر پێکهاتووە:

تکوين (دروست بوون)، الخروج (دەرچوون یان چوونە دەرەوە)، اللاويون (لاوییەکان یا ئەحبارەکان)، العدد (ژمارە)، **التثنية** (دووبارەبوونەوە)، ئەم پێنجەش پێیان دەگوترێت سیفرەکانی موسا.

<u>بەشی دووەم</u>: سیفری پەیامبەران، ئەمیش دوو جۆرە:

1ـ سیفرەکانی پەیامبەرانی پێشوو، ئەمانەش شەشن، (یوشع بن نون، قازییەکان، صەموئیلی یەکەم، صەموئیلی دووەم، پاشایانی یەکەم، پاشایانی دووەم).

2ـ سیفرەکانی پەیامبەرە دواییەکان (ئەوانەی لە دواییدا هاتوون): ئەمانەش (15) دانەن، (ئەشعیا، ارمیا، حەزقیال، هوشەع، یوئیل، عاموس، عوبەدیا، یونان (یونس)، میخا، ناحوم، حەبەققوق، صەفەنیا، حەجا، زەکەریا و مەلاخی).

بەشی سێیەم: نووسینەکان (الکتابات) ئەمانەش سێ بەشن:

1ـ نووسینە مەزنەکان: ئەمانە دەگرنەوە: مەزامیر (زەبور)، پەندەکان (پەندەکانی سولێمان)، أیوب.

2ـ پێنج گۆڤارەکە (المجلات الخمس) ئەمانە دەگرێتەوە: سرودی سرودەکان، راعوث، شیوەن (شیوەنی ئیرمیا) **(مراثی ارمیا)**، جامیعە، ئەستێر.

3ـ کتێبەکان: ئەمانە دەگرێتەوە: دانیال، عەزرا، نەحمیا، هەواڵەکانی رۆژانی یەکەم، هەواڵەکانی رۆژانی دووەم().

کۆی هەموویان دەکاتە (39) سیفر، بەڵام کاسۆلیکەکان حەوتی تری بۆ زیاد دەکەن کە ئەمانەن: (تۆبیا، یەهودێت، حیکمەت (دانایی)، یەسوعی کوڕی سیراخ، باروخ، مەککابییەکانی یەکەمو مەککابییەکانی دووەم) هەروەها لە ناوەکانیشیاندا جیاوازن: لە جیاتی صەموئیلی یەکەم و دووەمو پاشایانی یەکەمو پاشایانی دووەم، دەڵێن: پاشایانی یەکەمو دووەمو سێیەمو چوارەم. هەندێك لە زانایانی جوولەکە سیفری جامیعەو سرودی سرودەکان بە بەشێك لە عەهدی کۆن نازانن.

سامرییەکانیش (تایەفەیەکن لە جوولەکە بە رەچەڵەك ناگەڕێتەوە سەر بەنی ئیسرائیل)، تەنها باوەڕیان بە پێنج سیفرەکەی موسا هەیە وەکو کتێبی پیرۆزو هەندێکیش لەو سامرییانە (سیفری قازییەکان)و (سیفری یوشەع)یش بە بەشێك لە کتێبی پیرۆز دادەنێن.

کاسۆلیکەکانیش ئەو (46) سیفرە بە شێوەیەکی تر دابەش دەکەنو دەیانکەن بە پێنج بەشەوە:

1ـ پێنج سیفرەکەی موسا کە شەریعەتەکەشی تێدایە.

2ـ سیفرە مێژووییەکان (16) دانەن کە ئەمانەن: (یوشەع، قازییەکان، راعوث، پاشایانی یەکەمو دووەم، عەزرا، نەحمیا، تۆبیا، ئەستێر، یەهودیت، مەککابییەکانی یەکەمو دووەم).

3ـ سیفرە شیعرییەکان: شەشن: "ئەیوب، مزمارەکان، سیفرەکانی سلێمان کە سیانن: (پەندەکانو جامیعە (کۆکەرەوە)و سرودی سرودەکان)و شیوەنەکانی ارمیا".

4ـ سیفرەکانی پەیامبەران، کە (17) دانەن: ئەشعیا، ارمیا، باروخ، حزقیال، دانیال، هوشەع، یوئیل، عاموس، عوبەدیا، یونان، میخا، ناحوم، حەبەققوق، صەفەنیا، حەجا، زەکەریاو مەلاخی.

5ـ سیفرە فێرکارییەکان: دوو دانەن: سیفری دانایی‌و سیفری یەسوعی کوڕی سیراخ.

**عەهدی نوێ (انجیل):**

وشەی ئنجیل (تگۆسپڵ) لە یۆنانیدا واتە: ئەو شیرینییەی دەدرێ بەو کەسەی موژدەیەکت بۆ بێنێت، حەزرەتی عیساش بە مانای موژدەدەری رزگاری بەکاری دەهێنا، ئێستاش بە مانای موژدە بەکار دەهێنرێت.

عەهدی نوێ (ئینجیل) لە (27) سیفر پێك دێتو دەکرێت بە سێ شەوە:

1-بەشی یەکەم: سیفرە مێژووییەکان، ئەمەش پێك دێت لە چوار ئینجیلەکەو نامەی کارەکانی نێردراوان (أعمال الرسل) کە لۆقا نووسیویەتەوە، بەم سیفرانەش دەوترێت مێژوویی لەبەر ئەوەی باسی ژیانی حەزرەتی عیساو ئامۆژگارییەکانو موعجیزەکانی دەکات، (أعمال الرسل)ەکەش باسی ژیانی مامۆستایانی مەسیحییەت دەکات بە تایبەت پۆڵس.

2ـ بەشی دووەم: سیفرە فێرکارییەکان (**الأسفار التعلیمیة**): کە (21) نامەیە، بەم شێوەیە:

14 نامە پوڵس نووسیویەتی.

3 نامە یۆحەننا نووسیویەتی.

2 نامە پوترس نووسیویەتی.

1 نامە یعقوب نووسیویەتی.

1 نامە یەهودا نووسیویەتی.

## نووسەرانی عەهدی کۆن و کاتی نووسینیان

سیفرەکانی عەهدی کۆن دەدرێنە پاڵ نووسەرەکانیان، کە گوایە هەریەك لەو سیفرانە ئەو کەسە نووسیویەتی کە بە ناویەوەیەتی، بۆ نموونە، پێنج سیفرەکەی تەورات دەدرێتە پاڵ موسا، سیفری ئەشعیا دەدرێتە پاڵ ئەشعیاو سیفری ارمیا ارمیا و سیفری باروخ باروخ و سیفری دانیال دانیال و.. هتد، بەڵام لە راستیدا وانییەو ئەوانەی ئەم سیفرانەیان دراوەتە پاڵ، زۆربەیان خۆیان نەیاننوسیوەو لە سەردەمی خۆیاندا نەنووسراوەتەوە، هەندێك لەو ناوانە هەر لە بنەڕەتدا بوونیان نییە، هەندێك لەو سیفرانە داستان و ئەفسانەو گۆرانیی فۆلکلۆرین دراونەتە پاڵ هەندێك لە پەیامبەرانی یەهود.

لە راستیشدا جوولەکە دوای ئەوەی کە لایاندا لە عەقیدەی پەیامبەران و سروشت و رەوشتیان گۆڕا ئەو کتێبانەیان گۆڕی کە لەگەڵ بیرو بۆچوون و سروشت و رەوشتی خۆیاندا نەدەگونجاو لە جێی ئەوە ئەو شتانەیان دانا کە لەگەڵ مەیل و بەرژەوەندیی خۆیاندا دەگونجێت، بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە چەند شتێکە لەوانە:

1ـ کاتی خۆی وەکو لە سیفری خروجدا هاتووە حەزرەتی موسا نوسخەیەکی تەوراتی نووسیەوەو لەگەڵ دوو لەوحەکەدا خستویەتە ناو تابوتەوەو هەڵگیراوە، پاش ماوەیەکی زۆر بەنی ئیسرائیل گۆڕانیان بەسەردا هات و بێباوەڕی و بەدڕەوشتییەکی زۆریان تێدا بڵاو بوویەوە تا سەردەمی حەزرەتی سولەیمان هات و تابووتەکە دەرهێنرا، بینییان تەوراتەکەی تێدا نییەو تەنها دوو لەوحەکەی تێدا ماوەتەوە وەکو لە سیفری پادشایانی یەکەمدا دەڵێت: "لە تابوتەکەدا جگە لەو دوو لەوحە بەردیییەی کە موسا تێیدا دانابوو لە حۆریب ـ ئەو کاتەی پەروەردگار پەیمانی دا بە بەنی ئیسرائیل لەکاتی دەرچونیان لە میسر ـ هیچی تری تێدا نەبوو"، ملوك **الأول** 8: 9.

دوای سلێمان رووداوێکی زۆر گرنگ روویدا کار گەیشتە هەڵگەڕانەوە لە ئایینی یەکتاپەرستی و رووکردنەوە بتپەرستی و پەرستنی خوایەکانی میللەتە دراوسێکان، (بیت المقدس) چەندین جار رووبەڕووی تالان و وێرانکاری بوویەوەو لە پاڵ (بیت المقدس)دا شوێنی قوربانیی سەربڕین بۆ بتەکان دروستکراو باسی تەورات چیتر لە ئارادا نەما، دوای رووخانی مەملەکەتی ئیسرائیل لە باکوری فەڵەستین، مەملەکەتی یەهودا کە لە باشوور بوو ئەویش تووشی فەسادو ستەمکاری و نائارامی بوو، زۆربەی فەرمانڕەوایانی مەیلیان بە لای بێباوەڕی و فەساددا بوو، تا پێش رووخانی ئەو مەملەکەتە پادشایەك هات بە ناوی (یوشیا) لە ساڵی (629 ـ 598)ی پێش زایین، ویستی بگەڕێتەوە بۆ دینداری و شوێنکەوتنی تەورات و بە هیوای ئەوەی وڵاتەکەی لە تیاچوون بپارێزێت، لەو کاتەدا زانایەکی جوولەکە بە ناوی (حلقیا) ئەم هەواڵەی قۆستەوەو پاش (17) ساڵ لە فەرمانڕەوایی یوشیا ئیدیعای ئەوەی کرد کە نوسخەیەکی تەوراتی دۆزیوەتەوەو دای بە (شاڤان)ی نووسەر.

توێژەرەکان ئەو ئیدیعایەی حلقیا رەت دەکەنەوەو بە راستی نازانن، چونکە بە لۆژیکی نازانن کە تەورات ئەو هەموو ماوەیە لە (بیت المقدس)دا بێت و کەس پێی نەزانیبێ و نەیبینیبێ، تەنانەت لە ماوەی ئەو (17) ساڵەی فەرمانڕەوایی یوشیا کە زۆر مەبەستی بوو شەریعەتی تەورات بەرپا بکات کەس بە شوێنەکەی نەزانیبێ، زۆرێك لەو توێژەرەوانە وای بۆ دەچن کە حلقیا ئەو هەلەی قۆستبێتەوەو مەیلی یوشیای بۆ گەڕانەوە بۆ تەورات بەهەل زانیبێت بۆ نووسینەوەی ئەو کتێبەو ناوی تەوراتی لێ بنێت، شایانی باسە وێل دیورانت ئەو بۆچوونە دەچەسپێنێ کە دەڵێ: شەریعەتی موسا جگە لە دە ئامۆژگارییەکە هیچی تری نەماوەتەوە[1].

---

[1] قصة الحضارة: ج2، ص271.

## بەڵگە لە تەوراتەوە

ئەمانەش هەندێك بەڵگەن لە خودی ئەو پێنج سیفرەی تەورات، كە دەیسەلمێنن، تەورات بە ماوەیەكی زۆر دوای مردنی حەزرەتی موسا نووسراوەتەوە:

- لە سیفری دووبارە بوونەوەدا ئەمە هاتووە: "موسا بەندەی پەروەردگار لە خاكی موئابدا مردو هیچ مرۆڤێك، تا ئەمڕۆ نازانێ قەبرەكەی لە كوێیە". ئاشكرایە كە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەم قسەیە بە ماوەیەكی زۆر دوای مردنی موسا نووسرابێت.

- لە هەمان سیفردا هاتووە كە: "پاش موسا هیچ پێغەمبەرێكی تر وەكو ئەو نەهاتووە". ئەم قسەیەش بە ماوەیەكی زۆر دوای موسا نەبێت ناوترێت.

- لە سیفری بەدیهێنان (دروست بوون)دا هاتووە: "ئەوانە ئەو پاشایانەن كە لە خاكی ئەدومدا فەرمانڕەواییان كردووە"، ئەم دەستەواژەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم سیفرانە یان لە كاتی فەرمانڕەوایی پاشایانی بەنی ئیسرائیلیدا یان پاش ئەوان نووسراوەتەوە، شایانی باسیشە سەردەمی پاشایانی بەنی ئیسرائیل بە چەند سەدەیەك دوای حەزرەتی موسا بووە.

بەمانەدا دەردەكەوێت كە سیفرەكانی تەورات ئەوانەی سەردەمی موسا نین، بەڵكو دوای ئەو نووسراونەتەوەو دراونەتە پاڵ ئەو، توێژەر دەربارەی سیفری دەرچوون دەڵێت: ئەم سیفرە كە دەیخوێنینەوە لە ناو كتێبی پیرۆزدا بۆمان دەردەكەوێت كە بە ماوەیەكی زۆر دوای موسا نووسراوەتەوە لەبەر ئەو هەموو رووداوانەی كە تێیدایە كە هەمووی بە ماوەیەكی زۆر دوای موسا روویان داوە، لەوانەیە نەوە دوای نەوە لەبەریان كردبێت‌و گێڕابێتیانەوە هەروەكو ئەو شتانەی كە تا ئێستا لە بۆنە ئایینییەكاندا (بۆ نموونە جەژنی فەسح) دەخوێنرێتەوە.

- ئێچ. جی. وێڵسی مێژوونووسی ئینگلیزی دەڵێت: سیفرەكانی عەهدی كۆن بۆ یەكەمجار لە بابل كۆكراوەتەوەو لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا دەركەوتووە. هۆی ئەمەش دەگێڕێتەوە بۆ بە دیل بردنیان بۆ بابل، چونكە جوولەكە پێش ئەوەی بە دیل ببرێن بۆ بابل گەلێكی یەكگرتوو و شارستانی نەبوون‌و خوێندەوارییان زۆر كەم بوو، بە درێژایی ماوەی پێش بەدیلبوونیان نەبینرابوو لەناو جوولەكەدا سیفرەكان بخوێنرێنەوە، بەڵام ئەو رووداوە یەكی خستن‌و كردنی بە شارستانی‌و وای لێكردن هەست بكەن بە پێویستی كۆكردنەوەی مێژووەكەیان‌و گەشەدان بە داب‌و نەریتیان‌و نووسینەوەی سیفرەكان بۆ پاراستنیان لە داهاتوودا. كاتێك گەڕانەوە لە دیلیی زۆر جیاواز بوون لەو كاتەی دەركران لە فەڵەستین.

هەروەها وێڵس زیاتر ئەم مەسەلەیە روون دەكاتەوەو دەڵێ: تاقە راستییەك كە هەڵدەهێنجرێت لە كتێبی پیرۆز ئەوەیە كە جوولەكە كاتێك چوون بۆ بابل گەلێكی نەزان‌و كێوی بوون، بەڵام كە گەڕانەوە شارستانی بوو بوون، كە دەركران گەلێكی ناڕێك‌و ناكۆك بوون، هۆشێكی نیشتمانی بەیەكەوە نەیدەبەستنەوە، گەڕانەوە بە گیانێكی نەتەوەیی بەهێزەوە لەگەڵ مەیلێكی زۆر بۆ خۆدووركرتن، كە دەرچوون (لە فەڵەستین) وێژەو هونەرێكی زانراویان نەبوو لە نێوانیاندا، باشترین بەڵگەش رانەهاتنیان بوو لەسەر خوێندنەوەی هیچ كتێبێك، بەڵام كە گەڕانەوە بۆ فەڵەستین بەشێكی زۆر لە (عەهدی كۆن)یان پێبوو، ئاشكراشە كە جوولەكە دوای ئەوەی رزگاریان بوو لە دەست پاشا ستەمكارەكانیان‌و لە سیاسەت دوور كەوتنەوە، لە كەش‌و هەوای بابلدا ژیان، كە هاندەری چالاكیی فیكری بوو، ژیری‌و هۆشی جوولەكە هەنگاوێكی زۆری بەرەو پێش نا.

ئەمە رای زانایانی رۆژئاوایە دەربارەی ئەو بارودۆخەی جوولەكەی تێدا بوو دوای موساو چۆنێتی دەستكردنیان بە نووسینەوەی عەهدی كۆن، كە نزیكەی (8 ـ 9) سەدەیەك دوای موسایە، ئیتر ئەو قسەیەی كە نووسەر (وەكو هەموو قسەكانی تر) لە خۆیەوە دەیكات كە گوایە تەورات جوولەكە دەستكارییان نەكردووە بەڵكو پێغەمبەر گۆڕیویەتی، هیچ بنەماو حەقیقەتێكی نییەو دەركەوت لە گیرفانی خۆیەوە دەریهێناوە!

نامەوێ لەوە زیاتر درێژە بدەم بەم باسە، خوێنەر دەتوانێت لە كتێبی (**اظهار الحق**)ی رحمەتوڵڵای هندی یا كتێبی (الیهودیە)ی دكتۆر ئەحمەد شەلەبی بیخوێنێتەوە، بەڵام ئەوەندە دەڵێم كە جیاوازیی نێوان مەسیحییەكان لە ناو خۆیانداو

لەگەڵ جوولەکەشدا دەربارەی سیفرەکانی عەهدی کۆن و ناوەڕۆکی ئەو سیفرانەو هەواڵو را دژ بە یەکەکانی ناو ئەو سیفرانە بەسن وەکو بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە ئەو کتێبانە قسەی خوا نین و لە لایەن پەیامبەرانی بەنی ئیسرائیلەوە نەنووسراونەتەوە، شایانی باسیشە هیچ کام لەم بەش (سیفر)انەی عەهدی کۆن و تازەش سەنەدێکیان نییەو هەر ئەوەندە دەزانرێت لە پڕێکداو لە سەردەمێکی دوور لە سەردەمی خاوەنەکەی بە نوسراوی کەوتونەتە بەردەستی خەڵکی، لە کاتێکدا کتێبێك بۆ ئەوەی بیسەلمێنی کە پیرۆزەو لە لایەن خواوەیە دەبێ زنجیرەی ئەوانەی گێڕاویانەتەوە چ لەبەرو چ بە نووسین زانرابێت وەکو ئەوەی لەگەڵ قورئاندا کراوە، ئەمە جگە لەوەی کە عەهدی کۆن بەو زمانە کە پێی دابەزیوە کەس نەیبینیوە.

سفیرەکانی تری (عەهدی کۆن) هەمان شتن، زۆربەی هەرەزۆریان (ئەگەر نەڵێین هەموویان) لە لایەن کەسانێکی ترەوە نووسراون نەك لە لایەن ئەوانەی دراونەتە پاڵیان و ئەوانەی نووسیویانەتەوە زۆر دوای ئەوانە هاتوون کە دراوەتە پاڵیان، نووسەرە رۆژئاواییەکان ئەم راستییەشیان سەلماندووە.

هەندێکیان دەڵێن سیفری یوشەع ئیرمیا نووسیویەتەوەو لە نێوان یوشەع و ئیرمیادا زیاد لە هەشت سەدە هەیە، هەندێکی تریان دەڵێن صەمۆئیل نووسیویەتییەوەو هەندێکی تریش دەڵێن فینحاس نووسیویەتییەوە.

سیفری قازییەکانیش هەندێك لە نووسەرە رۆژئاواییەکان دەیدەنە پاڵ حزقیال، هەندێکی تر دەیدەنە پاڵ عەزراو هەندێکی تریش فینحاس، لە نێوان عەزراو فینحاسیشدا زیاد لە نۆ (9) سەدە هەیە.

سفیری دانیالیش هەرگیز نابێ ئەو کاتە نووسرابێت کە دانیال تێیدا ژیاوە واتە کاتی کەوتنی بابل لەسەر دەستی کۆرشی فارسی ساڵی (538)ی پێش زاین، بەڵکو دەبێ بە سێ تا چوار سەدە دوای ئەوە نووسرابێتەوە لەبەر ئەم هۆیانە:

1ـ ئەم سیفرە وشەی مەکدۆنی تێدایە لە کاتێکدا کە جوولەکە لە کاتی بە دیل گرتنیاندا لە لایەن بابلییەکانەوە هێشتا تێکەڵی یۆنانییەکانیان نەکردبوو، هیچ وشەیەکی یۆنانی بەرگوێیان نەکەوتبوو.

2ـ باسی کلدانییەکانی تێدایە لە کاتێکدا کە نابێ شتی وا بگوترێت لە لایەن کەسێکەوە کە پێش سەردەمی ئیسکەندەری مەکدۆنی ژیابێ، واتە: دانیال پێش ئەسکەندەری مەکدۆنی ژیاوە کەچی سیفرەکەی باسی ئەسکەندەرو وشەی مەکدۆنی تێدایە.

3ـ زۆرێك لە قسەکانی ئیرمیاو حزقیال و زەکەریای تێدایە لە کاتێکدا کە ئەم سێیە کاتی بەدیل گرتنیان لە لایەن بابلییەکانەوە نەهاتبوونە کایەوە.

وێڵ دیۆرانت دەربارەی مێژووی نووسینی سیفرەکانی عەهدی کۆن دەڵێت: "چۆن ئەم سیفرانە نوسراونەتەوە؟ کەی نووسراونەتەوە؟ لە لایەن کێوە نووسراونەوە؟".

ئەمە پرسیارێکە هەزاران بەرگی لەسەر نووسراوە، بەڵام ئێمە بەیەك بڕگە یەکلایی دەکەینەوە: زاناکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کۆنترین بەش لە بەشەکانی تەورات سیفری دروست بوون (بەدیهێنان ـ تکوین)ە، کە هەندێکی لە مەملەکەتی یەهوداو هەندێکیشی لە مەملەکەتی ئیسرائیل نووسراونەتەوە، پاش کەوتنی هەردوو دەوڵەتەکەی جوولەکە (یەهودا لە باشوورو ئیسرائیل لە باکووری فەڵەستین) هەردوو نووسراوەکە رێکخراون، بۆچوونی زاڵ ئەوەیە کە سیفری دووبارەبوونەوە (**التثنية**) لە نووسینی عەزرایە، وادەردەکەوێت کە پێنج بەشەکەی تەورات ساڵی (300) پێش زایین ئەم شێوەیەی ئێستای خۆی وەرگرتبێت.

بە هەمان شێوە هەموو سیفرەکانی تر کە لە هەر یەکێکیان دەکۆڵێتەوە دەبینی بە ماوەیەکی زۆر دوای ئەو کەسە نووسراوەتەوە کە دراوەتە پاڵی.

ئەمە دەربارەی نووسەرانی عەهدی کۆن و مێژووی نووسینەوەیان کە بە شایەتی توێژەرو مێژوونووسان دەردەکەوت بە چەندین سەدە دوای خاوەنەکانیان نووسراونەتەوە.

به نیسبەت بیروباوەڕی عەهدی كۆن دەربارەی خواو پەیدابوونی مرۆڤو ئادەمو حەواو ڕۆژی دوایىو ئافرەتو رووداوە مێژووییەكانو مەسەلە زانستییەكان داوا لە خوێنەر دەكەین بگەڕێتەوە بۆ ئەو دوو كتێبەی كە كراونەتە كوردیو لە كتێبخانەكاندا دەست دەكەون.

1ـ با كتێبی پیرۆز بدوێت: نووسینی عەبدوڕڕەحمان دیمەشقییەو وەرگێڕانی داود عیسا داودی.

2ـ كتێبە پیرۆزەكان لەبەر ڕۆشنایی زانستی نوێدا، نوسینی زانای فەرەنسی دكتۆر مۆریس بۆكای كە بەراوردێكە لە نێوان تەوراتو ئینجیلو قورئاندا.

كورتەی بیروباوەڕی تەورات دەربارەی پێغەمبەران ئەوەیە كە ئەوانە كەسانی ستەمكارو خراپەكارو فێڵبازو زیناكارو بەدڕەوشتو بتپەرست بوون!!

**لوط** مەشوربی خواردووەو زینای لەگەڵ دوو كچی خۆیدا كردووە، (تكوین 19: 30).

داود زینای لەگەڵ ژنی سەربازێكیدا كردووەو دوایی ناردوویەتە بەرەكانی شەڕو پیلانی بە كوشتانی بۆ داناوەو داویی ژنەكەی بردووە بۆ خۆی. (صموئیل 11: 2 ـ 5).

هەر لە ماڵی داود پێغەمبەردا كوڕێكی داود بە ناوی (ئەمنون) خوشكێكی خۆی كە ناوی **(ثامار)** بوو لاقە دەكات (صەموئیلی دووەم 134: 14).

سولەیمان پێغەمبەر حەوسەد (700) ژنو سێسەد (300) كەنیزەكی دەبیّو هەندێك لەو ژنانەی بتپەرست دەبنو دڵی رادەكێشن بە لای بتپەرستیداو پەیكەر بۆ بتی ژنەكانی دادەتاشیّو خۆیشی لە كۆتایی ژیانیدا دەچێتە سەر ئایینی بتپەرستی، (ملوكی یەكەم 11: 3 ـ 5).

یەهودا زینا لەگەڵ **(ثامار)**ی بوكیدا دەكات! (تكوین 38: 15).

یەعقوب فێڵ لە باوكیو خیانەت لە عسیۆی برای دەكاتو بەرەكەتی باوكی تەنها بۆ خۆی دەبات.

خاڵی یەعقوب فێڵ لە یەعقوب دەكاتو حەوت ساڵ خزمەتكاریی پێدەكات بۆ ئەوەی (راحیل)ی كچی بداتیّ دوای ئەوە نایداتیّو (لیئە)ی كچە گەورەی پێدەدات، ئەویش رازی نابیّو حەوت ساڵی تر خزمەتكاری دەكات تا (راحیلی) دەداتیّ!

موسا فەرمان بە بەنی ئیسرائیلییەكان دەدات زێڕو كەرەسەی دراوسیّو هاوماڵەكانیان بە ئەمانەت وەرگرنو دوایی لەگەڵ خۆیاندا لە كاتی دەرچوون لە میسردا بیبەن!!

هارون لە خشڵو زێڕو زیوەكانی بەنی ئیسرائیل گوێرەكەیەك دروست دەكاتو بە گەلەكەی دەڵێت ئەوە خوای ئێوەیە بیپەرستن، (خروج 32: 2 ـ 4).

ئەییوب هەمیشە دەم بە گلەیی بووە بەرامبەر بە خواو رەخنەی لێگرتووە! (أیوب).

سولەیمان شیعری جنسی بەسەر ئافرەتێكدا دەڵێت! (نشید **الأنشاد**).

داود دووسەد (200) پارچە پێستی زەكەری فەلەستینییەكان دەكاتە مارەیی یەكێك لە ژنەكانی! (صموئیلی یەكەم 18: 25 ـ 27).

ئەمانە هەندێكن لەو شتانەی كتێبی پیرۆز دەربارەی پەیامبەران دەیڵێت! ئایا ئەمانە رەفتاری ئەو كەسانەن كە بانگەشەیان بۆ خواپەرستیو چاكسازییو رەوشت بەرزی كردووە؟

لێرەدا یا دەبیّ گاورو جوولەكەكان بڵێن ئەو شتانەی دراونەتە پاڵ ئەو پەیامبەرانە راست نینو هەڵبەستراون، كە ئەمەش داننانە بەوەی كە كتێبی پیرۆز دەسكاری كراوە، یا دەبیّ بڵێن كتێبی پیرۆز راستەو دەستكاری نەكراوە، ئەوكاتەش دەبیّ دان بە ستەمكاریو بێڕەوشتیو فێڵبازی پێشەواو پێشەنگەكانیاندا بنێن! لە هەردوو حاڵەتەكەشدا دەبیّ دەمیان لە ئاستی قورئانو پێغەمبەری ئیسلام دابخەن، چونكە دەركەوت ماڵەكەیان لە شووشە ناسكترە بۆیە چیتر نابیّ بەرد بهاون بۆ ماڵی خەڵكی!

## هەندێك لە كۆنگرەكانی مەسیحییەت و بڕیارەكانیان

ئەمانەی خوارەوەش هەندێكن لەو كۆنگرانەی كە مەسیحییەكان بەستوویانە كە بە روونی شوێندەستی مەسیحییەكان دەردەخات لەسەر ئایینی مەسیحی:

1ـ مەجمەعی نیقیە ساڵی 325ز لە بڕیارەكانی:

أ ـ بڕیاردانی سێ خوایی و خوایەتی حەزرەتی عیساو هێنانی بۆ سەر زەوی بۆ ئەوەی ئەو گوناهەی ئادەم كردوویەتی لەسەر شانی نەوەكانی لاببات.

ب ـ رێگەنەدان بەو قەشانەی ژنەكانیان دەمرێت ژنی تر بێنن.

ج ـ ئەو كتێبانە هەڵبژێردران كە لەگەڵ ئەو بڕیارانەی سەرەوەدا دەگونجێن و لەناوبردنی ئەوانی تر.

2ـ مجمع القسطنطینیة: 381ز بڕیاردرا، كە (روح القدس) خوایە.

3ـ مجمع افسیس الأول 431ز بڕیاریداكە عیسا یەك سروشتو یەك ویستی هەیە (**طبیعة واحدة ومشیئة واحدة**)، مەریەمیش دایكی خوایە.

4ـ مجمع روما 869 بڕیاریدا: (ڕوح القدس) لە باوكو كوڕەوە هەڵقوڵاوە، نەك تەنها لە باوكەوە.

5ـ مجمع القسطنطینیة 879ز بڕیاریدا (روح القدس) تەنها لە باوكەوە هەڵقوڵاوە. لێرەدا كەنیسە دابەش بوو بە دوو بەشەوە، كەنیسەی رۆژئاوا كە بنكەكەی رۆمایەو كەنیسەی رۆژهەڵات لە قوستەنتینیە (ئەستەمبول) و چیتر دانیان بە بڕیارەكانی یەكتریدا نەدەنا.

6ـ مجمع رۆما 1225ز بڕیار درا، كە كەنیسەی پاپایی دەسەڵاتی بەخشین (عفو)ی هەیەو ئازادە لەوەی بە كێی دەدات.

7ـ مجمع رۆما 1869ز بڕیار درا، كە پاپا مەعصومە (واتە گوناه و هەڵە ناكات و پارێزراوە لە هەڵەو تاوان).

8ـ لە مەجمەعی ساڵی 1964ز بڕیاردرا كە جوولەكە بێتاوانن لە هەڵواسینی عیسا، ئەو قەناعەتەی، كە بە درێژایی 1964 ساڵ هەیانبوو لەسەر ئەوەی كە جوولەكە دەستی هەبووە لە كوشتنی عیساداو بە درێژایی ئەو ماوەیە شەڕو ئاژاوەو چەوساندنەوە هەبووە لە نێوانیانداو بە بڕیارێكی پاپایی و لە ژێر فشاری جوولەكەو سیاسییەكاندا هەموو ئەو شتانە كەڕەتی سفر كران.

ئەمانە هەندێكبوون لەو گۆڕانكارییانەی لە مەسیحییەتدا كراوە گەر دەتەوێت بە درێژیی بیزانی دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ:

- **مقارنة الأدیان: المسحیة د. أحمد شلبي.**
- **محمد أبو زهرة: محاضرات في النصرانیة.**
- **محمد فؤاد الهاشمي: الأدیان في كفة المیزان.**
- **محمد عبدة: الإسلام والنصرالنیة مع العلم الحدیث.**
- **اظهار الحق: رحمة الله الهندي.** ئەمانەو دەیان كتێبی تر.

## بیروباوەڕی تەورات دەربارەی خوا

ئەمەش هەندێك لەو سیفەتانەی تەورات دەیداتە پاڵ خوا:

یەعوب زۆرانبازی لەگەڵ خوادا دەكات! (تكوين 32: 26 ـ 32).

خوا ماندوو دەبێ (خروج 31: 17).

خوا وەك سەرخۆش لە خەو هەڵدەستێ (مزمور 44: 24، 78: 65).

خوا شت لەبیر دەكات (مزور 10: 12، 13: 1، خروج 8: 1، مراثی 5: 20).

خوا غەمبار دەبێ و پەشیمان دەبێتەوە. (تكوين 6: 6 ـ 7، خروج 32: 14).

خوا چەپڵە لێدەدات! (خرقیا 21: 17، 22: 13).

خوا فەرمان بە دزی دەدات (خروج 3: 21 ـ 22، 11: 2 ـ 3، 12: 35 ـ 36).

خوا دوعای ماڵ وێرانبوون لەخۆی دەكات. (ارمیا 10: 17).

خوا ستەم دەكات (أیوب 19: 6 ـ 8).

داود گوتی: بەسەر خوادا قیژاندم، ئەویش لە پەیكەرەكەیەوە گوێ بیستم بوو، هاوارو قیژەكەم چووە ناو گوێچكەكانی، دوكەڵێك لە لوتیەوە بەرز بووەوە، ئاگرێك لە دەمیەوە هاتە دەرەوە، پشكۆیەك لە لێویەوە داگیرسا.. ئاسمانەكان نەوی بوون و دابەزین، تەم و مژ لە ژێر قاچەكانیدا بوو. سواری دارمێو بوو فڕی، لەسەر باڵی با بینرا، لەبەر توڕەیی خوا لە بۆنی لوتی بناغەكانی (مسكونە) بەدەركەوت. (صموئیل دووەم 22: 7 ـ 11).

## بیروباوەڕی تەورات یا عەهدی كۆن دەربارەی ئافرەت

ـ حەوا بووە هۆی فریوخواردنی ئادەم و لە بەهەشت دەرچوونی، (تكوين 3: 16).

ـ ئافرەت لە حەیزدا پیس و گڵاوە و نابێ بچیتە لای (لاوی 15: 19 ـ 20).

ـ گەر ژن دووگیان بوو كوڕی بوو حەوت ڕۆژ پیس دەبێ، گەر كچیشی بوو دوو هەفتە. (لاوی 12: 20).

ـ ئازاری منداڵبوون تۆڵەی فریودانی حەوایە بۆ ئادەم (تكوين 3: 16).

ـ ژن خراپەكارە (زەكەریا 5: 7).

تەورات باوەڕی بە زیندووبوونەوە نییە،سزاو پاداشتیش تەنها لەم دونیایەدایە. (أیوب 7: 9، 14: 14)

ئەمانە و دەیان مەسەلەی زانستی و تەشریعی و عەقیدەیی و مێژوویی تر كە هەموو جیاوازن لە قورئان.

بە كورتی ئاماژەمان پێدا بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت كە:

یەكەم: تەورات بە هیچ شێوەیەك ناشێت وەكو سەرچاوەیەك بۆ قورئان.

دووەم: تەورات و عەهدی كۆن زۆر دوای سەردەمی ئەو پەیامبەرانەی بەناویانەوەیە نووسراوەتەوە كە هەندێك جار دەگاتە نۆ سەدە.

سێهەم: ئەو دەستكارییانەی كراوە و ئەو گۆڕانكارییەی بەسەریدا هاتووە زۆر زۆرە.

## قابیل و هابیل لە نێوان تەورات و قورئاندا

تەورات دەڵێت شەڕی نێوان قابیل و هابیل لەسەر ژن بوو، کە گوایە خوشکەکەی قابیل جوان بوو، خوشکەکەی هابیل ناشیرین بوو، بۆیە قابیل رازی نەبوو خوشکەکەی خۆی بدات بە هابیل و ئەوەی ئەو بخوازێت بۆیە بڕیاری کوشتنی دا، بەڵام قورئان بە ئاشکرا دەفەرموێت قابیل و هابیل هەریەکەو قوربانییەکیان پێشکەش کرد، ئەوەی هابیل وەرگیراو ئەوەی قابیل وەرنەگیرا، بۆیە رقی هەستاو بڕیاری کوشتنی هابیلی دا.

هەندێك لە راڤەکەرانی قورئانیش ئەم ریوایەتەی تەوراتیان هێناوەتەوە کە تەورات باسی کردوە، بەڵام ئەمانە پێیان دەوترێت (ئیسرائیلیات) کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: نە باوەڕی پێ بکەن نە بە درۆی بخەنەوە، ئەڵبەتە ئەگەر پێچەوانەی قورئان نەبوو، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی قورئان بوو ئەوا هەر لە رێگاوە رەتدەکرێتەوە، ئەم چیرۆکەش یەکێکە لەوانەی کە پێچەوانەی قورئان و پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکیشە.

یەکەم: لەگەڵ قورئاندا ناکۆکە لەوەی کە قورئان دەفەرموێت لەسەر وەرگرتنی قوربانییەکەی هابیل و وەرنەگرتنی ئەوەی قابیل بوو، نەك لەسەر ژن.

دووەم: لەگەڵ لۆژیکدا بەوەی کە ئەگەر هابیل ئامادە بێت دەست لە ژیان هەڵبگرێت و بەرگریی لە خۆی نەکات چۆن دەست لە ژنێك هەڵناگرێت؟ ئەگەر ئەو ئەوەندە سوور بێت لەسەر ئەو ژنە چۆن لێدەگەڕێ قابیل وا بە ئاسانی بیکوژێت.

سێهەم: ئەگەر لە شەریعەتی ئەو کاتەدا کچی ئەم سك بۆ کوڕی ئەو سکەی تر بووبێت مانای وایە هەموو کوڕ و کچێکی هەرسکێك هەر لە منداڵییەوە لەسەر ئەوە پەروەردە کراون کە خوشك و برای یەکن بۆ یەك ناشێن، ئیتر نەفسیان بۆ یەکتری ناچێت، وەکو ئەوەی کە ئێستا دەیبینین هیچ برایەك بە تەمای خوشکی خۆی نییە، مەگەر کەسانی دەروون نەخۆش و فیترەت شێواو وەکو مارکسییەکان کە دەیانەوێت ئەو نەریت و شەریعەتە بڕوخێنن.

ئەمە راستیی رووداوەکەیەو خوای گەورە هێناویەتەوە وەکو نموونەیەك لەسەر کەسانی خواپەرست و راستگۆ و کەسانی دونیاپەرست و فێڵباز.

لێرەشدا سەیر نییە ئەگەر زانایانی جولەکە ئەو حیکایەتەیان هەڵبەستبێت مادەم ئەوان ئافرەت بە سەرچاوەی هەموو خراپەیەك بزانن.

بەڵام نە قورئان وە نە فەرموودەی راستی پەیامبەر ﷺ هیچ ئاماژەیەك بە مەسەلەی ئافرەت نادەن و تەنها دەیگێڕنەوە بۆ رق و حەسادەت و هیچی تر، هەر ئەو نەخۆشییەی کە ئیبلیسی لە رێ دەرکردو بوو بە مایەی کێشە بۆ مرۆڤایەتی تا رۆژی قیامەت.

لە تەفسیری (ابن **كثير**)دا هاتووە (ج2 ل46) لە باسی قابیل و هابیلدا کە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك بە سەنەدی خۆی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: "خوا کوڕەکانی ئادەمی بە نموونە بۆ ئێوە هێناوەتەوە دوای چاکەکەیان بکەون و خراپەکەیان بە جێ بهێڵن".

ئیبن عەبباسیش ریوایەتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کە تێیدا هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە بۆ کێبڕکێ لەسەر ئافرەت بەڵکو تەنها شتەکە دەگێڕێتەوە بۆ رق و حەسادەت، دەفەرموێت: جارێکیان هەردوو کوڕەکەی ئادەم دانیشتبوون وتیان با سەرو قوربانی پێشکەش بکەین بزانین خوا هی کامان وەردەگرێت، ئەو کاتەش وابوو گەر کەسێك قوربانییەکی پێشکەش بکردایەو وەربگیرایە ئاگرێك دەهات و دەیسوتاند، ئەگەر وەرنەگیرایە ئاگرەکە دەکوژایەوە، قوربانییەکانیان پێشکەش کرد، یەکێکیان خاوەنی مەڕ و ماڵات بوو ئەوی تریشیان جوتیار بوو، ئەوەیان کە خاوەنی مەڕەکە بوو باشترینیانی پێشکەش کرد و ئەوەی تریشیان جۆرێکی هاکەزایی لە کشتوکاڵەکەی خۆی پێشکەش کرد، ئاگرەکە هات و مەڕەکەی سوتاند و ئەوی تریانی بەجێ هێشت، ئەوەی کە قوربانییەکەی وەرنەگیرابوو بەوی تریانی وت: دەتەوێت لەناو خەڵکیدا بگەڕێین و بزانن کە قوربانییەکەی

تۆ وەرگیراوەو ئەوەی من رەتکراوەتەوە، نە بەخوا نابێ خەڵکی ئەوە بڵێن، دەبێ بتکوژم، ئەویش لە وەڵامدا وتی: تاوانی من چییە خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ (انما یتقبل الله من المتقین).

ئایەتەکانیش کە دەیانخوێنینەوە تەنها وتووێژی نێوان دوو کەس دەبینی، کە یەکێکیان خواپەرستو راستگۆو لەخواترس و دوارۆژویستە، ئەوی تریشیان حەسوودو دونیاویستو لەخوا نەترسە، ئیتر نە باسی ئافرەتی تێدایەو نە هیچ. کەواتە چۆن ئەو حیکایەتەی تەورات (با هەندێك لە راڤەکەرانی قورئانیش هێنابێتیانەوە)، دەکرێ بە ماڵ بەسەر قورئانەوەو پاشانیش دەکرێتە مایەی توانجو رەخنەلێگرتنو گاڵتە پێکردن؟!

واقعی مرۆڤایەتیش ئەوە دەردەخات کە شەری پلەوپایە زۆر زیاترە لە وەی کە لە سەر ئافرەت دەکرێ، جا چ پلەوپایەی مادديی بێت یان مەعنەوی وەکو رێزو پلەو پایەی کۆمەڵایەتی و ..هتد.

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە ئەو کێشەیە لەسەر ئافرەت نەبووە خودی حیکایەتەکەیە کە چەندین شتی دژبەیەکی تێدایە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە دەڵێ: شەریعەتی ئەوکاتە وابوو کە حەوا بە هەر سکێك کچو کوڕێکی بووەو کچی ئەم سکی لە کوڕی ئەو سك مارە دەکرد، کەواتە ئەمە دابونەریتی ئەو کاتە بووە، لەولاشەوە دەڵێ: قابیل وتوویەتی من ئەم کچەیانم دەوێت، تا ئادەم پێی وتووە ئەوە خوشکتە، واتە تا ئەوکاتە قابیل نەیزانیوە ئەوە خوشکەکەیەتی، ئەمەش مەسەلەیەکە بە عەقڵەوە ناچێتو پێچەوانەی واقیعە، گریمان قابیل تا ئەو کاتە نەیزانیبوو ئەوە خوشکێتی بۆی ناشێتو لێی حەرامە، بۆیە داوای دەکرد، ئەی دوایی کە ئەوەی زانی بۆچی هەر سوور بوو لەسەری؟

لە کۆتاییدا دەڵێین: هۆی کوشتنی هابیل هەرچییەك بێت گرنگ ئەوەیە کە قورئان سەرزەنشتی هەڵوێستی قابیل دەکاتو ستایشی هەڵوێستی هابیل دەکات، مەبدەئی لێبوردن بە لایەوە باشترو لەبەرترە لە مەبدەئی تۆڵەسەندنەوە، چ جای ستەمکردن، فەرموودەکەی پێغەمبەریش ﷺ روونە لە هاندانی باوەڕداران بۆ هەڵگرتنی شوێن پێی هابیل نەك قابیل، لەوەش گرنگتر ئەوەیە، کە قورئان ئەو رووداوە دەکاتە بۆنەیەك بۆ ناشیرینکردنی خوێن رشتن بە ناحەقو ستەم کردن، ئەمانەش هەموو لە ئیجابیاتی رینماییە قورئانییەکانن.

ئەگەر قورئان هیچ رێنماییەكو تەشریعێکی تێدا نەبوایە بۆ حەرامکردنو ناشیرینکردنی ستەمو کوشتنی ناڕەوا تەنها ئەم دیمەنەی بەس بوو.

خوا یەك سەرچاوەیی مرۆڤی کردۆتە هۆکارێك بۆ ئەوەی مرۆڤەکان رێزی یەك بگرنو ستەم لەیەك نەکەنو کەسیان خۆیان لەوی تر بە باشتر نەزانن، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەموو ناکۆکیو شەڕو ئاژاوەو رکەبەرایەتییە لە نێوان مرۆڤەکاندا روو دەدات ئەی ئەگەر بهاتبایە هەر لە سەرەتاوە بەری دوو پیاوو ژنی جیاواز بونایە حاڵیان چۆن دەبوو؟!

## حەقیقەتی چیرۆکی ئیبراهیمو هاجەرو ئیسماعیل

ئەگەر مێژووی ئیبراهیمو ئیسماعیل لە تەوراتەوە وەرگرین ئەوا دەبێ چاوەڕوانی وێنەیەکی هاوشێوەی ئەو وێنانە بین کە نووسەرانی تەورات کێشاویانە بۆ پێغەمبەرانی تر وەکو لوطو هارونو داودو سولەیمانو یەعقوبو.. هتد.

ئەوان ئەگەر بەرامبەر پەیامبەرانی خۆیان ئەو شتانەیان نووسیبێتو ناوی کتێبی پیرۆزیان لێنابێت، دەبێ چی دەربارەی حەزرەتی ئیسماعیل بڵێن کە باوەگەورەی پەیامبەری ئیسلامەو ئەو هەموو رقەیان لێیە ؟!

لەبەر ئەوەی ئەو کتێبانە دەسکاری کراون ئێمە ئاوڕیان لێنادەینەوەو پشتیان پێ نابەستین، بەڵکو لە روانگەی قورئانەوە تەماشایان دەکەینو ژیانیان دەخوێنینەوە، زۆریش لەسەر حەزرەتی ئیبراهیم نادوێین بۆ ئەوەی نووسینەکە درێژ نەبێتەوە، تەنها لەو خاڵەوە دەست پێ دەکەین کە هاجەر دێنێتو دەبێتە خێزانی:

ئاشکرایە لە مێژووی ئیبراهیم دا کە سارای ژنی تەمەنی گەورە بووەو منداڵی نەدەبوو، بۆیە بەزەیی بە مێردەکەیدا هاتەوەو ئەو کەنیزەکەی کە فیرعەونی میسر دابوویێ پێیبەخشی بە هیوای ئەوەی کە منداڵی لێ ببێت، بەوەش هاجەر حەڵاڵ دەبێت بۆ ئیبراهیم، ئەوە بوو هاجەر ئیسماعیلی بوو، ساراش هەر لە پاداشتی ئەو لێبوردەییو ئەو هەموو

هەڵوێستەی هەیبوو بەرامبەر بە ئیبراهیمو بەشداریکردنی لە تاڵیو ترشیدا خوا پەیمانی منداڵێکی دایێ، دوای ئەوە خوا فەرمان دەدا بە ئیبراهیم کە هاجەرو ئیسماعیل لەگەڵ خۆیدا ببات بۆ کەعبەو ئاوەدانی بکاتەوە بۆ ئەوەی شوێنکەوتوانی دوا پەیامبەر رووی تێبکەن، ئەوەشی کە دەڵێت سارا لەبەر ئیرەیی و حەسادەت داوای لە ئیبراهیم کردووە هاجەرو کوڕەکەی دوور بخاتەوە لەگەڵ لۆژیك وسروشتی ئەم مەسەلەیەدا ناگونجێت، چونکە ئەگەر مەسەلە دوورخستنەوەی هاجەرو ئیسماعیل بوایە لەبەرچاوی سارا ئەوا دەیتوانی لە هەمان شاردا خانوویەکی جیایان بۆ دروست بکات، یا هیچ نەبێت لە شارێکی نزیکی ئەو شارەی خۆیاندا نیشتەجێیان بکات، بەڵام بێتو بیانداتە بەرو ئەو هەموو بیابانەیان پێ ببڕێتو لەو چۆڵەوانییە بێ ئاوییەدا دایان بنێت، ئەوە بە عەقڵی هیچ کەسێکەوە ناچێت کە ئیبراهیم لەسەر داواکاریی سارا ئەو کارەی کردبێت،سروشتی پیاویش وایە کە ئەگەر لەوەبەر منداڵی نەبووبێت و بە پیری خوا منداڵی بداتێ زۆری خۆش دەوێت و زۆر بە تەنگییەوە دەبێت و پارێزگاریی لێدەکات نەك بچێت لە چۆڵەوانییەکدا فڕێی بدات، ئەگەر ئەوە بە فەرمانێکی خوایی نەبێت هیچ کەسێك شتی وا ناکات، چونکە ئەوە وەکو حوکمی لەسێدارەدانە بۆیان.

قورئان بە جوانی باسی ئەم مەسەلەیە دەکات لەسەر زمانی ئیبراهیمو بە هیچ شێوەیەك بۆنی ئەوەی لێناکرێت کە لەبەر سارا ئەو کارەی کردبێت: (**رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ) (إبراهيم: 37)**.

واتە: ئەی پەروەردگار، من هەندێك لە نەوەکەی خۆمم لە شیوێکی بێ ئاوو شینایی دانا لای ماڵە پیرۆزەکەت بۆ ئەوەی تۆ بپەرستن، خوایە دڵی خەڵکیی وا لێبکە سۆزی ببێ بۆ لایان و لە هەموو بەروبومێکیش رۆزییان بدە بۆ ئەوەی سوپاسگوزاریت بکەن.

گۆڕینی قیبلەبەرەو کەعبەو گێڕانی ئەو کارانەی ئیبراهیمو ئیسماعیل و هاجەر کردویانە بە بەشێك لە دروشمەکانی حەج بەڵگەن لە سەر ئەوەی کە خوای گەورە لە ئەزەلەوە بڕیاری داوە مەککە بکات بە دوا رووگەی بڕواداران‌و حەج کردنیش لە مزگەوتی ئەقصاوە بگۆڕێ بۆ مەککەو ئاوی زەمزەم و (**حجر الأسود**)یش بکاتە دوو موعجیزەی ئەم ئایینەو بەڵگە لەسەر راستیی و گەورەیی رووداوەکان.

ئاوی زەمزەم کە ئەوەندە هەزار ساڵە لەو شوێنە بیابانەدا هەڵقوڵاوەو بەشی ئەو هەموو ملیۆنە حاجییە دەکاتو نەکەم دەکاتو نە وشك دەبێتەوە، نە پەیوەندی بە وشکەساڵیو نە بە بارانەساڵەوە هەیەو ئاوەکەی جیاوازە لە هی هەموو بیرێك ئایا بەڵگەی راستیی ئەم ئایینەو پەیامبەرەکەی نییە؟

هەروەها (**حجر الأسود**)، کە پەیامبەری ئیسلام دەفەرموێت: لە بەهەشتەوە هێنراوەو ئەمڕۆ زانست دەیسەلمێنێت کە لە رەگەزی بەردی سەرزەوی نییە، بەڵگەیەکی تر نییە لەسەر راستیی ئەم ئایینە؟

کەواتە مەسەلەی هاتنی ئیبراهیمو هاجەرو ئیسماعیل بە بڕیارێکی خوا بووەو بۆ مەبەستێکی ئاوەها گەورە بووە نەك لەبەر ئیرەیی بردن‌و حەسادەتی ژنێك کە وای لێبکات زۆر لە پیاوێکی وا پیر بکات سەدان کیلۆمەتر بە پێ یا بە وڵاخ ببڕێت بۆ ئەوەی ئەو ژن‌و منداڵەی لێ دوور بخاتەوە!

ئایا ئەگەر ئەوە رەفتاری سارا بێت خوا پاداشتی دەداتەوەو فریشتەکانی بۆ دەنێرێت پێی رابگەیەنن کە کەسێکی خاوەن پلەو پایەیە؟ (**وَامْرَأَتُهُ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِن وَرَاء إِسْحَاقَ يَعْقُوب* قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَاْ عَجُوزٌ وَهَـذَا بَعْلِي شَيْخاً إِنَّ هَـذَا لَشَيْءٌ عَجِيب* قَالُواْ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ رَحْمَتُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الْبَيْتِ إِنَّهُ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ) (هود:** 71 ـ 73).

سروشتی پیرەژن وایە گەر خۆی منداڵی نەبێ و لە منداڵ بوون هیوا بڕاو بووبێ منداڵی هەوێکەی زۆر خۆش دەوێتو وەکو منداڵی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، دوایی کەی ژن ئەوەندە دەسەڵاتدار بووە ئەو هەموو فەرمانە بەسەر پیاودا بکات، بە تایبەت ئەگەر پیریش بووبێ و نەزۆکیش بێت؟ بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆرجار ژنە گەنجەکە بە تایبەت گەر منداڵی بووبێ

قسەی خۆی بەسەر مێردەکەیدا زاڵ دەکاتو ستەم لە ژنە گەورەکە دەکاتو وا لە مێردەکەی دەکات ژنە گەورەکە فەرامۆش بکاتو مافی پێشێل بکات، کەواتە مەسەلەی چوونی ئیبراهیم لە فەڵەستینەوە بۆ مەککە تەنها بۆ ئەوە بوو بەردی بناغەی دوا ئایینی خوا لەوێدا دابنێت، دوور لە مەڵبەندی یەهودییەتو مەسیحییەت، بۆ ئەوەی ململانێ لەسەر ئەو مەڵبەندە روو نەدات و بە تەنها خواپەرستیی تێدا بکرێتو شیرکو هاوبەشی تێدا بۆ خوا قەرار نەدرێت، وەکو ئەوەی کە جوولەکەو مەسیحی دەیکەنو پەرستگاکانیان پڕ کردووە لە بتو پەیکەر.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هەرچەند لە قورئاندا باسی هۆی بردنی هاجەرو ئیسماعیل بۆ مەککە ناکاتو تەنها ئاماژە بەوە دەدات کە حەزرەتی ئیبراهیم وتوویەتی: ئەی پەروەردگار من لە نەوەکەی خۆمم نیشتەجێ کرد لە شوێنێکی وشکی بێ دەغڵو دان، پەروەردگارا وا بکە دڵی خەڵکانێك بچێ بە لایانداو رۆزییان بدە لەبەروبوومەکان بۆ ئەوەی شوکرانەبژێر بن، لەم پاڕانەوەی ئیبراهیم لە دوای بەجێهێشتنی هاجەرو ئیسماعیل لەو دۆڵە وشکەدا دەردەکەوێت کە ئەمە لە ئەنجامی پابەندبوونی ئیبراهیم بە فەرمانی خواوە بووە نەك بۆ رازی کردنی سارای ژنی، چونکە ئەگەر ئەمیان بوایە ئەوە دەبوو بە ستەمو ئەو کاتە دەبوایە ئیبراهیم رووی نەبوایە بەو شێوەیە لە خوا بپاڕێتەوە، بەڵکو دەبوایە داوای لێخۆشبوونی لە خوا بکردایە، کە لەبەر قسەی سارای ژنی ئەم ژنو منداڵەی تووشی ئەو زەحمەتە کردووەو لەو بیابانە چۆڵەدا دایناونو بیگوتایە خوایە لێم خۆشبە لەبەر ناچاری ئەم کارەم کردووەو دەسەڵاتی ژنەکەمم نەبووە.. هتد.

وەکو وتم قورئان باسی هۆی بردنەکە ناکات، بەڵام مێژوونووسانو هەندێك لە راڤەکەرانی قورئان ئەو قسەیەی تەورات دەگێڕنەوە کە گوایە هاجەر دوای ئەوەی منداڵی دەبێت فیز بەسەر سارادا دەکاتو ساراش لە ئەنجامدا ئیرەیی دەیگرێتو توڕە دەبێتو بە ئیبراهیم دەڵێ هاجەرو منداڵەکەیم لێ دوور بخەرەوە و نابێ لەیەك شاردا لەگەڵمدا بژین.

گریمان ئەم قسەیە راست بێ، چی تێدایە، ئەمە سروشتی مرۆڤە کە ئیرەیی و حەسادەت لە نێوان هاوشێوەکاندا هەیە (دوو ژن لە ماڵێکدا، دوو دکتۆر لە نەخۆشخانەیەکدا، دوو سیاسیی، دوو ئەندازیار، دوو مامۆستا.. هتد).

خوای گەورەش بیەوێت شتێك بکات هۆیەکانی بۆ دەڕەخسێنێ، ئەم تووڕەبوونەی سارا وا دەکات ئیبراهیم بکەوێتە بیری ئەوەی کە ئەم ژنو منداڵە لە سارا دوور خاتەوەو بە جددی دەکەوێتە بیری ئەوەی، کە شوێنێکیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەمەش چەند شتێك دەردەخات:

یەکەم: وەفای حەزرەتی ئیبراهیم بۆ سارای ژنی، کە ئەو کەنیزەکەی پێ بەخشی بە هیوای ئەوەی منداڵی لێ ببێت.

دووەم: نەجابەتی ئیبراهیم لەوەی کە نەهات وەکو ئەوەی پیاوانی لەخوا نەترسو بێویژدانو بێوەفا دەیکەن دەست لە ژنە پیرە نەزۆکەکەی هەڵگرێت لەبەر خاتری ژنە گەنجە جوانەکەی کە منداڵی لێ بووە، بەڵکو مەبەستی بوو دڵی سارا راگرێتو رەچاوی باری دەروونیی بکات.

ئەمەش یەکێك بوو لە خاڵە ئیجابییەکانی حەزرەتی ئیبراهیم، دوای ئەوەی ماوەیەك لە بیری ئەوەدا دەبێت کە شوێنێك بۆ هاجەرو سارا داین بکات، هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن خوای گەورە بە ئیلهام پێی راگەیاند کە بیانبات بۆ مەککەو هەندێکیش دەڵێن خوا حەزرەتی جبرەئیلی بۆ ناردو پێی راگەیاند کە بەرەو مەککە بیانبات.

هەموو ریوایەتە ئیسلامییە راستەکان باسی ئەوە دەکەن کە ئەوەی بە ئیبراهیمی وت بچێت بۆ مەککە خوای گەورە بوو ئەویش بۆ ئەوەی مەککە بکاتە دواقیبلەی بڕواداڕانو خواپەرستان، ئیبراهیمیش هاجەرو ئیسماعیلی بێ ئاوو نان بەجێنەهێشت بەڵکو ئاوو خواردنی لا دانانو پێشی راگەیاندن کە خوا فەرمانی پێداوە لەوێ دایان بنێتو خواش فەرامۆشیان ناکات... هاجەریش کە ئەمە دەبیستێت لە ئیبراهیم دڵنیا دەبێت.

پاشان ئیبراهیم تەنها هاجەری نەبردووە بۆ ئەو شوێنە چۆڵو وشکە بەڵکو جگەرگۆشە تاقانەکەشی لەگەڵدا بردووە کە دوای ماوەیەکی زۆر لە چاوەڕێکردن خوا پێی بەخشیوە، کەواتە ئەگەر ئەوە فەرمانی راستەوخۆی خوا نەبێت چۆن پیاوێکی وا پیر کوڕە تاقانە کۆرپەکەی دەبات لەو شوێنە چۆڵەدا دایدەنێت؟

زیندوراگرتنی جموجوڵەکانی هاجەرو هاتوچۆکردنی لە نێوان سەفا و مەروەداو دانانی ئەو هاتوچۆیە بە یەکێك لە دروشمو بنەماکانی حەج گەورەترین رێزلێنانە لە هاجەر.

چ گەورەییەك لەوە گەورەتر، چ رێزێك لەوە زیاتر کە هاتوچۆیەکی بێ مەبەستی ئافرەتێك بۆ دۆزینەوەی ئاو بکرێتە یەکێك لە دروشمەکانی خوا و یەکێك لە بنەماکانی حەج کە یەکێکە لە پێنج بنەماکانی ئیسلام **(إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا)**.

چ کەسێك هەیە لە مێژوودا ئەوەندەی هاجەر یاد بکرێتەوە؟ ئایا هیچ موسڵمانێك هەیە نەزانێت هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە زیندووکردنەوەی یادی هاجەرە کە رۆژێك لە رۆژان چەند هەزار ساڵ لەمەوبەر لە نێوان ئەو دوو گردەدا هاتوچۆی کردووە بۆ پەیداکردنی ئاو بۆ کۆرپەکەی؟ ئایا ئەمە بە سووك تەماشاکردنی هاجەرە یا رێزلێنانێکە لە سەرووی هەموو رێزلێنانێکەوە، جگە لەوەش پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ئەگەر میسرتان کەوتە ژێر دەست لەگەڵ خەڵکەکەیدا بە جوانی رەفتار بکەن، چونکە هاجەرەی دایکتان لەوانە.

بە هەمان شێوە هەڵقوڵانی ئاوی زەمزەم لەو چۆڵەوانییەدا دیسانەوە بە گەورەترین رێزلێنان دەژمێردرێت بۆ هاجەرو ئیسماعیل.

ئەگەر هاجەر بێ رێز بووایە لای خوا و پەیامبەری خوا بەو شێوەیە کردەوەکانی زیندوو رانەدەگیران بەڵکو پەردەیەك دادەدرایەوە بەسەر ناویدا و هەر باس نەدەکرا نەك بەو شێوەیە یاد بکرێتەوە.

ئایا ئایینێك رەفتاری ئافرەتێك بکاتە دروشمەکانی پەرستشی، تاوانبار دەکرێت بەوەی کە رێزی لە ئافرەت نەناوە، یان رێزی لەو ئافرەتە نەناوە؟

دەربارەی سەردانەکانی ئیبراهیم بۆ ماڵی ئیسماعیل لە مەککەو فەرماندانی بە ئیسماعیل بە تەڵاقدانی ژنی یەکەمیو راگرتنی ژنی دووەمی دەڵێین:

ئاشکرایە کە ئەم زانیارییانە لە قورئاندا نەهاتوون، تەنانەت فەرموودەی صەحیحیشی لەسەر نییە، تەنها ئەوەیە کە مێژوو نووسانی وەك (ئیبن کەسیر)و (ئیبن ئەسیر) ئاماژەیان پێداوە.

من لەو رووەوە ئەمە بە نامەعقوول دەبینم لەبەر ئەوەی کە مەعقول نییە ئیبراهیم لەو تەمەنەدا لە شامەوە بێت بۆ مەککە بۆ بینینی ئیسماعیل پاشان ئەوەندە چاوەڕێی نەکات تا دێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ شام مەگەر ئیسماعیل لە دەرەوەی مەککە بووبێتو کاتی گەڕانەوەی نەزانرابێت.

بە نیسبەت پێشنیازکردنی تەڵاقدانی ژنی یەکەمو هێشتنەوەی ژنی دووەم جێی خۆیەتی چونکە ژنی یەکەم ناشوکرو نانەجیب بوو، ژنی دووەم شوکرانەبژێرو رەسەن و میوانپەروەر بوو.

لە سەرجەمی ئەو ئایەتو فەرموودانەدا دەردەکەوێت کە ئیبراهیم هیچ لەو کارانەی لە خۆیەوە نەکردووەو هەمووی یان بە وەحی راستەوخۆ یا بە ئیلهام لە لایەن خواوە کردووە، ئەوەتا کاتێك هاجەرو ئیسماعیل لەو چۆڵەوانییەدا بەجێ دێڵێ هاجەر لێی دەپرسێ ئەی ئیبراهیم کێ فەرمانی پێ داوی لە ئەرزێکی وشکی بێ ئاوو دەغڵو دانو چۆڵدا بەجێمان بێڵێ؟ دەڵێ: پەروەردگار فەرمانی پێکردووم، هاجەریش دەڵێت: کەواتە خوا فەرامۆشمان ناکاتو بزرمان ناکات.

لەراستیشدا هەروا بوو خوا نەك هەر بزری نەکردن بەڵکو کردنیە سەرچاوەی تیرەیەکی عەرەبو گەورەی عەرەب کە پێیان دەوترێت **(العرب المستعربة)**و شوێنەکەشیانی کردە چەقی زەویو جێی زیارەتگای ساڵانەی ملیۆنەها کەسو ناونیشانی زیندوو راگرت.

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئیبراهیم نە شتی ناشەرعی لەگەڵ هاجەردا کردووە وە نە ستەمی لێکردووە، بەڵکو بە شێوەیەکی رەسمیو ئاشکرا بووەو بە گوێرەی شەرعو رێو رەسمو عورفی ئەو کاتە بووەو بردنیشیان بۆ مەککە بە فەرمانی خوا بووە بۆ

ئاوەدانکردنەوەی ئەو ناوچەیە و بنیاتنانی ماڵی خوا و زیارەتگای موسڵمانان، ئەمانەش گەورەترین شەرەف بوون بۆ هاجەرو ئیسماعیل (سەلامی خوایان لێ بێت).

## یوسف و ژنی عەزیز

خوتبەخوێن و بانگخوازە ئیسلامییەکان زۆرجار چیرۆکی یوسف پێغەمبەر باس دەکەن وەکو نموونەیەك لە سەر خۆڕاگری بەرامبەر بە داوەکانی شەیتان بۆ فریودانی گەنجان و یوسف پێغەمبەر وەکو نموونەیەك لەسەر ئەو مەسەلەیە باس دەکەن، هەندێك کەس دەیانەوێت لە نرخی ئەم مەسەلەیە کەم کەنەوەو لە نرخی نەچوونی یوسف بەدەم ژنەکەی عەزیزی میسرەوە کە داوای ئەنجامدانی کاری سێکسی لێکرد کەم دەکەنەوە بەو بیانووەی گوایە سەرەتا یوسفیش ویستی ئەو کارە بکات، بەڵام خوا بەڵگەیەکی پێ نیشان دا ئەویش دوای ئەوە دەستی لەو کارە هەڵگرت.

ئێمە لێرەدا گفتوگۆ لەسەر ئەو شتە ناکەین، کە نیشانی یوسف درا کە ئایا باوکی خۆی بینی پەنجەی دەگەزێت یان حەزرەتی ئیبراهیمی بینی بەڵکو ئەوەندە دەڵێین کە بینینی ئەو شتە لە نرخی دان بەخۆداگرتنی یوسف کەم ناکاتەوە، چونکە ئەگەر راست بێت یوسف وروژابێت و ویستبێتی ئەو کارە بکات هەرگیز بە بینینی باوکی دەستی لەو کارە هەڵنەدەگرت، چونکە یەکەم ئەوە تەنها هاتنە پێش چاوی بوو و دەیتوانی ئاوڕی لێنەداتەوە، دووەمیش ئەو کەسانەی کە لە رووی سێکسییی دەوروژێن هەوڵ دەدەن هەرچییەك لەو شتانەی کە رێگرە لەبەردەمیاندا لە ئایین و داب و نەریت و عەیبەو ئەو شتانە لە بیری خۆیانی ببەنەوەو ئەگەر شتێکی واش هاتە خەیاڵیان یان پێش چاویان هەوڵ ئەدەن لە خەیاڵی خۆیانی دەرکەن و لە پێش چاوی خۆیانی دوور بخەنەوە. سێهەم : ئەگەر ئەو هەڵوێستەی یوسف زاتی و بە ویستی خۆی نەبوایە خوا ستایشی نەدەکرد و پاداشتی لەسەری نەدەدایەوە.

با بێین ئایەتەکان شی بکەینەوەو راڤەیان بکەین:

قورئانی پیرۆز دەربارەی یوسف و ژنی عەزیز دەفەرموێت: (**وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نَّفْسِه وَغَلَّقَت الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللّه إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ* وَلَقَدْ هَمَّتْ بِه وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّه كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاء إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ**) (**یوسف: 23 ـ 24**).

**واتە** :ئەو ئافرەتەی یوسف لە ماڵیدا بوو هەوڵی دا یوسف لە خشتە ببات و دڵی راکێشێت بە لای خۆیدا و دەرگاکانی داخست و وتی وەرە با سەرجێیی بکەین، یوسف وتی پەنا دەگرم بەخوا لە کردنی ئاوها کارێك مێردەکەت رێزی لێگرتووم (خیانەتی لێناکەم)، ستەمکاران سەرفراز نابن.

دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەڵێین:

یەکەم: بە وردبوونەوە لەو رووداوە بە روونی دەردەکەوێت کە ئەو هەوڵەی ژنی عەزیزی میصر (کە دەڵێن ناوی زلێخا بووە)، یەکەم جاری نەبووە بۆ لەخشتەبردنی یوسف، بەڵکو دەبێ بە ماوەیەکی زۆر بە راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ئەو هەوڵەی دابێت تا گەیشتۆتە ئەو راددەیەی کە ئیتر پەتی صەبری پچڕاوەو تەقی لە گیانی کردووەو لە ئەنجامدا پەردەی شەرم و حەیای لە رووی خۆی داماڵیوەو بەو شێوە زەق و راستەوخۆیە داوای لە یوسف کردووە ئەو کارەی لەگەڵدا ئەنجام بدات، یوسفیش بە درێژایی ئەو ماوەیە دانی بە خۆیدا گرتووەو خۆی بە دەستەوە نەداوەو چاکەی مێردی ئەو ژنەی هەر لەبەرچاو بووە (**وَرَاوَدَتْهُ الَّتِي هُوَ فِي بَيْتِهَا عَن نفْسِهِ وَغَلَّقَتِ الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ اللّهِ إِنَّهُ رَبِّي أَحْسَنَ مَثْوَايَ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ**) (**یوسف:** 23).

دووەم: چاودێریی خوا دەردەخات بۆ ئەو بەندانەی کە پەنای بۆ دەبەن و هەوڵی دوورکەوتنەوە دەدەن لەو شتانەی لێی قەدەغە کردوون، بە شێوەیەك کە ئەگەر لە کاتێکدا لاوازیی (کە سروشتی مرۆڤە) رووی تێکردن ئەو فریایان دەکەوێت و دەیانپارێزێت لە کەوتنە گوناهو هەڵەوە، ئەمەشە مانای عیصمەت کە خوا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، کە بە مانای پاراستن

دێت، ئایەتەکەش بە ڕاشکاوی ئەم دوو ڕاستییە دەخاتە ڕوو: (..**كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاء إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ**). واتە: بەو شێوەیە خراپەو گوناهی لێ دوور دەخەینەوە، ئەو لە بەندە پاککراوەکانمانە.

کەواتە حەزرەتی یوسف دەشێ بۆ ئەوەی بکرێتە پێشەنگ بۆ هەموو ئەو گەنجانەی کە بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە بەوەی کە:

یەکەم: زیندانیکردنیان پێ خۆشتر بێت لە بەدەمەوەچوونی ئارەزووەکانی نەفس ئەگەر بێ فەرمانی خوای تێدا بێت.

دووەم: بە تەنها پشت بە توانا و هێزی خۆیان نەبەستن بۆ بەرەنگاربوونەوەی داخوازییەکانی نەفسو پیلانەکانی شەیتان بەڵکو پشت بە پەروەردگاریان ببەستنو دان بە لاوازی خۆیاندا بنێنو داوای کۆمەکی لە خوا بکەن.

سێیەم: بەوەفابن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە چاکەیان لەگەڵدا دەکەنو خیانەتیان لێ نەکەن.

## خیانەتی خێزانی لوط پێغەمبەر ئایینی بوو یا ئەخلاقی

قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الحجر)دا دەفەرمووێت: (**قَالُواْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ * إِلاَّ آلَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ * إِلاَّ امْرَأَتَهُ قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ الْغَابِرِينَ**).

واتە:ئێمە نێردراوین بۆ سەر هۆزێکی زۆر تاوانبار، کەسوکاری لو **ط** نەبێت کە هەموویان ڕزگار دەکەین جگە لە ژنەکەی کە بڕیارمان داوە لە ڕیزی تیاچووەکاندا بمێنێتەوە.

بە کورتی مانای ئایەتەکان وایە: سزاکە تووشی ژنەکەشت دەبێت، نەك ژنەکەت تووشی ئەو ڕەفتارە بووە واتە بکەر سزاکەیە نەك ژنەکە.

ئایەتەکانی تریش هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ژنەکەی **لوط** تووشی ئەو ڕەفتارە نەبووە، چونکە ئەو خەڵکە پشتیان لە ژنان هەڵکردبوو وە لەگەڵ پیاواندا ئەو کارەیان دەکرد! (**إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ النِّسَاء) (الأعراف : 81 )** واتە: ئێوە لە جیاتی ژنان دەچنە لای پیاوان. (**أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ * وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ) (الشعراء : 165ـ 166)** ماناکەی ڕوونە: واتە ئێوە لەگەڵ نێرینەکاندا ڕادەبوێرنو واز لە ژنەکانتان دێنن.

(**قَالُواْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَق وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ) (هود : 79)** واتە: تۆ باش دەزانی کە ئێمە هیچ کارێکمان بەسەر کچەکانتەوە نییەو باشیش دەزانی ئێمە چیمان دەوێ ـ واتە نێربازی لەگەڵ میوانەکانتدا ـ

کەواتە قەومی **لوط** نێربازییان تەنها لەگەڵ پیاواندا دەکرد نەك لەگەڵ ژنەکاندا، تەنانەت ئامادە نەبوون لەگەڵ کچانیشدا ئەو کارە بکەن چ جای پیرە ژنێکی وەك خێزانی لوط.

دەربارەی خیانەتی خێزانی لوطیش بە مانای خیانەتی زەوجی نایە بەڵکو خیانەت بەو مانایەیە کە لەسەر ئایینی گەلەکەی خۆیان بوو و دینی مێردەکەی قەبوڵ نەکردبوو و بەرگری لە گەلە کافرەکەی دەکرد و دژی مێردەکەی دەوەستا، چونکە ئەگەر مەبەست لە خیانەت ئەو ڕەفتارە بووایە ئەی خیانەتی ژنی نوح چیبوو کە لە هەمان ئایەتدا پێکەوە باسکراون (ئاشکرایە کە ژنی نوح بەدڕەوشت نەبوو بەڵکو بێباوەڕ بوو).

پاشان هەموو دەزانین کە خیانەت تەنها بە مانای خیانەتی زەوجی نایەت بەڵکو خیانەتی نەتەوەیی هەیە، خیانەتی نیشتمانی هەیە، خیانەتی سیاسی هەیە، خیانەتی ماڵیی هەیە، خیانەتی برادەر لە برادەر هەیە، خیانەتی ئەدەبی و زانستی هەیە وەك ئەوەی، کە زۆرێك لەم نووسەرانە دەیکەنو دەقەکان بە پێچەوانەوە ڕاڤە دەکەن یا بە درۆ ئاماژە بە سەرچاوە دەدەن

بیَ ئەوەی شتی وا لەو سەرچاوەیەدا هەبیێت یان ڕووداوێك كە پێچەوانە بگێڕێتەوە یا هەوڵی چەواشەكردنی خوێنەر بدات، یان دەق دزین لە خەڵكی.

خیانەتی ژنانی هەندیَ لە پێغەمبەرانیش لەو ڕووەوە بووە كە لەسەر ئایینی گەلەكەیان ماونەتەوەو پشتی مێردەكانیان نەگرتووەو پیلانیان دژی مێردەكانیان گێڕاوە، ئەگەرنا ئەگەر خیانەتی زەوجی بووایە دەبووایە یەكسەر تەڵاقیان بدانایەو یەك ڕۆژیش لەگەڵیاندا نەمانایەتەوە، چونكە بناغەی بانگەوازی پەیامبەران دوای یەكتاپەرستی بۆ ڕەوشتبەرزی بوو كە داوێنپاكی بەشێكی گرنگە لێی، نەدەبوو لە كاتێكدا كە خەڵكیان بانگ دەكرد بۆ ئەو ڕەوشتە بەرزانە ماڵی خۆیان مۆڵگەی بیَ ئەخلاقی بێت.

مانەوەی ئەو پەیامبەرانەش لەگەڵ ژنەكانیاندا ئەوە دەردەخات كە مرۆڤ ئازادە لە بیروباوەڕداو عەقیدە بە زۆر ناسەپێنریَ بەسەر كەسدا خواش لە قورئاندا كە بە نموونە هێناونیەتەوە لەسەر بیَ باوەڕان بۆ ئەوەیە كە باوەڕداران بزانن باوەڕهێنان بە خوا بە زۆر نابێت، ئەوە ژنانی هەندێك پێغەمبەرانن لەگەڵ ئەوەی كە ژنی پێغەمبەریش بوون هەر لەسەر بیَ باوەڕی خۆیان ماونەتەوە لەگەڵ ئەوەی هەموو هۆیەكانی باوەڕهێنانیان لەبەر دەستا بووە، لەولاشەوە ئاسیای ژنی فیرعەون لەگەڵ ئەوەی كە ژنی سەرسەختترین دوژمنی خوا بووو هەموو خەڵكیی مێردەكەیان دەپەرست ئەو باوەڕی بەخوا هێناو زەبرو زەنگی فیرعەون نەیترساندو دوای موسا پێغەمبەر ـ علیه السلام ـ كەوت.

لە واقیعی خۆشماندا بە دەگمەن دەبینی كەسێك لەسەر جیاوازیی بیروڕا ژن تەڵاق بدات لە كاتێكدا كە كەس نییە ڕازی بێت ڕۆژێك لەگەڵ ژنێكدا بژی كە خیانەتی زەوجی لێبكاتو پەیوەندیی لەگەڵ پیاوی تردا هەبێت مەگەر كەسانی بیَ غیرەتو بیَ شەرەف یان گەواد كە بژێوی خۆی لە ڕێگەی كۆئەندامی سێكسیی ژنەكەیەوە بە دەست بێنێت. ئەمە بە نیسبەت كەسانی سادەو هاكەزاییەوە چ جای كەسانی وەكو پەیامبەران كە پەیامی چاككردنی كۆمەڵگەیان پێیەو بۆ ڕیشەكێشكردنی فەسادو بەدڕەوشتی تێدەكۆشن.

لە شەرعی ئیسلامیشدا پیاوی بڕوادارو داوێنپاك نابێت ژنی داوێنپیسو زیناكەر بخوازێت مەگەر كەسێك تۆبەی نەسوحی كردبێتو بەڕاستی گەڕابێتەوە بۆ لای خوا، ئەو جۆرە ئافرەتانە لە عورفیشدا زۆر بە زەحمەت شوو دەكەن، چونكە كەس ئامادە نییە ئەو جۆرە ئافرەتانە بخوازێت با لە شەرعیشدا حەڵاڵ بێت...

خاڵێكی تر لەسەر ئەوەی كە خیانەتی ژنی لوط لە ڕووی ئەخلاقییەوە نەبووە جگە لەوەی كە وەك لەمەوبەر وتمان لەگەڵ ژنی نوحدا پێكەوە باس كراون كە ئەو نەناسرابوو بە داوێن پیسی، بەڵكو پەیوەندیی بە باوەڕهێنانو نەهێنانەوە هەبووە، باسكردنی ئاسیای ژنی فیرعەون لەبەرامبەریاندا كە وەك وتمان ژنی پیاوێكی بێباوەڕی ستەمكار بووە كە خۆی بە خوا زانیوە لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕی بە خوا هێناوەو گوێی بە دەسەڵاتو زەبرو زەنگی مێردەكەی نەداوە.

لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە كە ئایەتەكە بە ڕاشكاوی باسی كوفرو ئیمان دەكات نەك باسی ڕەوشتو ئاكار: **(ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَةَ نُوحٍ وَامْرَأَةَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئاً وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ) (التحريم : 10 )، (وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِّلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَةَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِندَكَ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ) (التحريم : 11)**.

## مێردمنداڵانی بەهەشت

ئەو ئایەتانەی لەسەر مێردمنداڵانی بەهەشتو هەرچی ئایەتی تریش هەیە لەو بارەیەوە هەمووی بۆ ڕێزلێنانە لە بەهەشتییانو خزمەتکردنیانە، ئەمەش ڕێوڕەسمێکە لە دونیاشدا بەرپا دەکرێت، بۆ نموونە ئوتێلە پلە یەکەکانو چێشتخانە پلە یەکەکان هەوڵ دەدەن کوڕی گەنجو جوانو پاكو خاوێن بەکاربێنن بۆ خزمەتکردنی میوانەکان، کەسیش نەیوتووە ئەو گەنجانە بۆ ئەوە دانراون میوانەکان لەگەڵیاندا رابوێرن، شاراوەش نییە لای کەسانی خاوەن عەقڵو ژیریو تێگەیشتن کە دیمەنی جوانو شوێنی پاكو ئاوو هەوای خۆشو خەڵکی پاکوتەمیزو جوانو جلوبەرگ پاكو خاوێن چەند کاریگەریی ئیجابییان لەسەر دەروونی مرۆڤ هەیە، ئەم شتانەش هەموو لە بەهەشتدا بە باشترین شێوە ئامادە کراون.

لە بەهەشتدا کەس بە چاوی خیانەت بۆ کەس ناڕوانێت، بۆیە ئەو مێردمنداڵانەی بەهەشت نە خۆیان بە چاوی خیانەتەوە دەڕوانن بۆ ئەوانەی خزمەتیان دەکەن وە نە بەهەشتییان بەو چاوەوە بۆیان دەڕوانن بەڵکو هەریەکەو بەو شتەی پێی دراوە زۆر رازییەو چاوی نابڕێتە هیچ شتێك جگە لەوەی، کە بۆی دانراوە.

کەم کەسم بینیوە بە گوێرەی پێویست لەو ئایەتانە ورد بووبێتەوە کە باسی بەهەشت دەکەن، زۆر کەس لەو ئایەتانەیان کۆڵیوەتەوە کە باسی سزای دۆزەخ دەکەنو بەڵگەیان لێوە دەرهێناوە کە دەبێ ئەو قورئانە لەلای خواوە بێت، چونکە مومکین نییە پێغەبەری ئیسلام ﷺیان هیچ کەسێکی تری ئەو سەردەمەو سەدان سەدەش دوای ئەو سەردەمە ئەو راستییانەیان زانیبێت، بۆ نموونە ئەو ئایەتەی باسی نوێکردنەوەی پێست دەکات بۆ چەشتنی سزا کە زانست سەلماندوویەتی پێست جێگەی هەستە دەمارەکانەو ئەگەر بێتو لابرێت ئەوانەی ژێرەوەی هەست بە ئازار ناکەن، بۆیە دەبینی لە سووتاوی پلە سێدا کە هەموو چینەکانی پێستی تێدا دەسووتێت نەخۆش هەست بە هیچ ئازارێك ناکا لە کاتێکدا کە سووتاوی پلە یەكو دوو ئازاری زۆر زۆرە. دەتوانم بڵێم کەسم نەبینیوە بەو شێوەیە توێژینەوەیەکی ئەو ئایەتانەی کردبێت کە باسی بەهەشت دەکەن لە رووی دەروونیو لە رووی پێوەرەکانی بەختەوەرییەوە.

من بەش بەحاڵی خۆم هەوڵم داوە لە هەموو ئەو ئایەتانە ورد ببمەوە کە باسی بەهەشت دەکەنو بۆم دەرکەوتووە، کە ئەم ئایەتانە زۆر زیاتر لەو ئایەتانەی کە باسی سزای دۆزەخ دەکەن بەڵگەن لەسەر سەرچاوە خواییەکەی ئەم قورئانە و ئەگەر بێتو ئایەتەکانی باسی بەهەشت کۆبکەیتەوەو ریزیان بکەیتو لێیان ورد ببیتەوە دەبینی تاکو ئێستا هیچ کەسێك و دەستووری هیچ دەوڵەتێك و هیچ دەروونناسێك یان کۆمەڵناسێك نەیتوانیوە بەو شێوەیە کە قورئان رەگەزەکانی بەختەوەریی کۆکردۆتەوە کۆی بکاتەوە یان پەی پێ ببات، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت لە بابەتەکە دەردەچمو زۆر لێرەدا بە درێژیی باسی ئەو ئایەتانەم دەکرد و ئەو راستییەم دەسەلماند، بەلام لێرەدا تەنها ئەوەندە دەڵێم کە بوونی مێردمنداڵی زۆر جوان کە دەڵێی مروارین بۆ خزمەتکردنی بەهەشتییان چ لە ماڵەکانیاندا یان لە کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا یەکێکە لەو رەگەزانەی دەبنە مایەی بەختەوەری بۆیان.

## ڕەخنە لە بەهەشت

شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییە بێدینەکان گاڵتە بە بەهەشت بکەن، چونکە ئەوان لە بناغەوە باوەڕیان بەخوا نییە ئیتر چۆن باوەڕیان بە بەهەشت هەیە؟ ئاشکراشە کە باوەڕیان بە خوا نییە، چونکە کەسێك کە باوەڕی بە خوایەك هەبێت کە زانیاریو دەسەڵاتی ئەوەندە زۆر بێت ئەم گێتییە دروست بکاتو ئەم هەموو یاساو نهێنییانەی تێدا دابنێت هەرگیز گاڵتەی پێ ناکات، چونکە ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت کە هەموو کارەکانی پڕ لە حیکمەتو داناییە با ئێمەش پەی پێ نەبەینو دەرکی نەکەین.

ئەگەر هیچ شتێك مرۆڤی هان نەدایە بۆ بیرکردنەوەو باوەڕهێنان بە خوا دەبوایە بەهەشت هانی بدایە، چونکە شتێك نییە لە دەست بدرێت.

هەواڵدان بە بوونی ژیانێکی هەتا هەتایی، پڕ لە خۆشی، بێ نەخۆشیو ناخۆشی، بێ خەمو خەفەت، بێ بێزاربوون، پڕ لە ڕێزو حورمەت، شایانی ئەوە نییە کە مرۆڤ بە جددیی بیری لێ بکاتەوە، بە تایبەتی ئەگەر بێتو ئەو هەواڵانە لە لایەن کەسانێکەوە درابێتن کە ناسراو بن بە ڕاستگۆییو ڕەوشت بەرزییو جوامێری.

شایانی باسە خۆشییەکانی بەهەشت تەنها هەستیو جەستەیی نین، بەڵکو زۆرێکی دەروونیو مەعنەوییە، حۆریی یەکێکن لە نیعمەتەکانی بەهەشتو بینینی خواو بە دەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا گەورەترین نیعمەتی بەهەشتە **(و رضوان من الله اكبر)**.

ئەگەر پەیامبەری ئیسلام خۆی خاوەنی ئەم ئایینە بووایەو قورئان لە دانانی خۆی بووایەو پیاوێکی دونیاییو شەهوانی بووایە و بیرۆکەی بەهەشت لە دانانی خۆی بوایە بۆچی سنوری بۆ سێکس دادەناو زینای حەرام دەکرد و نێربازیی حەرام دەکرد بەرامبەر شتێك کە خۆی دەیزانی ڕاست نییە و بوونی نییە؟ دەبوایە لە جیاتی ئەوەی بە خەڵکیی بڵێت جڵەوی نەفسی خۆتان بگرنو دان بە خۆتاندا بگرنو لە ڕێگای ناشەرعییەوە سێکس ئەنجام مەدەن دەرگای بۆ واڵا بکردنایە بۆ ئەوەی زیاتر دوای بکەونو خۆیشی بواری ڕابواردنی زیاتر دەبوو لە جیاتی (10) بێوەژن سەدان کچو کەنیزەکی لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوەو بە خۆی نەدەگوت ئێستا بەدوا نابێ ژنی تر بێنی یان ئەم ژنانەت بگۆڕییەوە بە ژنی تر بەڵکو دەرگای بۆ خۆیو شوێنکەوتوانی دەخستە سەر پشتو مادام عەرەب وەك ئەمنووسەرانە دەڵێن گەلێکی سێکسین کەواتە ئەم بانگەوازە لەوەی مەزدەك زیاتر لە فارس جێی دەبوویەوە لەناویاندا!! ئەمە سروشتی ئەو بانگەوازانەیە کە خاوەنەکانیان دونیایین یان فێڵبازن، زەمینە خۆش دەکەن بۆ ڕابواردنی دونیایی خۆیانو شوێنکەوتوانیان نەك داوایان لێبکەن جڵەوگیری لە ئارەزووەکانی نەفس بکەن.

ئەگەر موحەممەد ﷺ ڕاستگۆ نەبووایەو کەسێکی دونیایی بووایە وەك هەموو دونیا پەرستەکان دەیگوت ئەوەی لەبەردەستاندایە مەیگۆڕنەوە بە شتی نادیارو هەل لە دەستی خۆتان مەدەن!

نازانم بوونی پەری لە بەهەشتدا بۆچی جێی ڕەخنەی ئەم نووسەرانەیە، ئەی دەکرێ بەهەشت هەموو هۆیەکی خۆشو بەختەوەری تێدابێت پەیوەندیی جنسی تێدا نەبێت، یان ڕەگەزی ئافرەتی تێدا نەبێت، ئەوە نییە گۆران جوانی سروشت دەبەستێتەوە بە بوونی ئافرەت کە دەڵێ:

ئەمانە هەموو جوانو شیرینن ڕۆشنکەرەوەی شەقامی ژینن

بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز بێ ڕووناکییە بێ بزەی ئازیز

ئەم نووسەرانە باوەڕیان بە بەهەشت نییەو باوەڕیان بە خوا نییە بۆیە ڕەخنە دەگرن، ڕەخنەکەشیان لەبەر ئەوە نییە کە پەریی زۆری تێدایە بۆ پیاوان ئەگینا خۆیان لەم دونیایەدا مانعیان نییە نەك لەگەڵ حەفتا بەڵکو لەگەڵ سەدان ئافرەتیشدا ڕابوێرن، ئەم کەسانە جددی نین لە ڕەخنە گرتندا ئەگینا چ پیاوێك هەیە لاریی لەوە هەبێت چەندین ئافرەتی جوانی پێ ببەخشرێت، یا چ کەسێك هەیە پێویستیی پیاو بۆ ئافرەت نەزانێتو گرنگی ئافرەت یا جنس لە ژیانی پیاودا نەزانێ،

ئافرەتان گەر رەخنە لە بوونی دەیان حۆریی بۆ پیاوان بگرن تا رادەدەیەك مافیان دەدەینێ تا ئەو کاتەی وێنەی راستەقینەی بەهەشتو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتیان بۆ دەکێشرێ ئەوکاتە ئیتر بۆیان دەردەکەوێت هەموو کەسێك لە بەهەشتدا ئەوەندە زیاتر لە ئیستیحقاقاتی خۆی پێ دەدرێت نەك هەر خۆی بە مەغدور نازانێت بەڵکو ئەوەندە بە زۆری دەزانێت کە بە سیفەتەکانی (غفور، شکور) ستایشی خوا بکات کە یەکەمیان بە مانای زۆر بەخشندەو لێبوردە دێتو دووەمیان بە کەسێك دەوترێت کە پاداشێکی زۆر گەورە بەرامبەر کردەوەیەکی زۆر کەم بداتەوە.

شتێکی تر لێرەدا دەربارەی بەهەشت بیڵێم ئەوەیە کە نەك تەنها شێوازی باسکردنی بەهەشت سەرچاوە خواییەکەی قورئان دەسەلمێنێت بەڵکو تەنانەت شێوازی سەلماندنی زیندووبوونەوە کە زۆرجار پێش باسکردنی بەهەشت دێت دیسانەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە دانراوی موحەممەد ﷺ خۆی نییە و دەبێ سەرچاوەکەی کەسێك بێت زۆر لەسەر رووی مرۆڤەوە بێت.

نامەوێت لەوە زیاتر لەسەر باسکردنی بەهەشت بڕۆم تەنها ئەوەندە دەڵێم کە ئەو کەسانەی بە جددی بیری لێناکەنەوە یان گاڵتەی پێ دەکەن لە رۆژی دواییدا حەسرەتو پەشیمانییان بێ ئەنداز دەبێت، ئەو کاتەش پەشیمانی بە دەردی کەس ناخوات.

## پەیوەندیی نێوان سەردەمی مەککی و مەدەنی

هەندێك کەس وادەزانن قورئانی مەککی باسی مەسەلە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و ئابووری و شارستانییەکانی تێدا نییەو ئەو شتانە دوای کۆچکردن بۆ مەککە لە قورئاندا باسیان هاتووە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو لە نەزانییەوە سەرچاوەی گرتووە ئەگینا بە لێکۆڵینەوەیەکی بە پەلە دەردەکەوێت کە خوای گەورە هەر لە مەککەدا زیناو ستەم و خەڵك کوشتنی حەرام کردووەو هەڕەشەی توندی لەو کەسانە کردووە، کە زینا دەکەن یا ستەم دەکەن یا خەڵك بە ناحەق دەکوژن، بەڵام سزا دونیاییەکەی خستۆتە مەدینە، کە موسڵمانان دەسەڵاتیان پەیدا کردوە و حکومەتیان پێکەوە ناوە، چونکە سزای دونیایی دەسەڵاتی پێویستە بۆ جێبەجێ کردنی.

ئەوەتا لە سورەتی (**الأنعام**)دا کە مەککییە بە راشکاوی دەفەرموێت: **"قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ.."**. (**الأنعام**: 151). (**الإسرا** ئایەتی: 23 تا 39) بخوێنەرەوە، بزانە چەند بابەتی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ئەخلاقیو شارستانی لە خۆ گرتووە, لە باسی یەکتاپەرستییەوە دەست پێ دەکات بۆ چاکە لەگەڵ دایكو باوك و خزمانو هەژارو لێقەوماوان و پاشان هاندانی یارمەتی خەڵکی و ئیسراف نەکردن لە پارە خەرج کردنداو رەزیلی نەکردن و منداڵ نەکوشتن لەبەر هەژاری و زینا نەکردن و خەڵك نەکوشتن بە ناحەق و نزیك نەکەوتنەوە لە ماڵی هەتیوو فێڵ نەکردن لە کێشان و پێوانەداو لە خۆوە قسە نەکردن لە شتێکدا کە ئاگات لێ نەبێ و شارەزاییت تێدا نییە و فیز نەکردن بە سەر خەڵکیدا و پۆز لێنەدان بە سەر زەویدا.

ئەمانە هەموو لەم سورەتەدا باس کراوە، ئەمانە هەمووی بابەتی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و شارستانین کە لە مەککەدا باسکراون.

لە سورەتی (**المؤمنون**)یشدا کە دیسانەوە سورەتێکی مەکییە باسی هەندێك رەوشتی باوەڕداران دەکات کە بریتین لە نوێژ کردن و دڕۆنە کردنو زەکات دانو زینانەکردنو پاراستنی پەیمانو ئەمانەتو پارێزگاری کردن لە نوێژ و هتد. بڕوانە **المؤمنون** (1 تا 11).

لە سورەتی فورقانیشدا دیسانەوە باسی رەوشتی بڕواداران دەکات و دەفەرموێت بڕواداران لە سەر خۆو بێ فیز بەسەر زەویدا دەڕۆن و دان بە خۆیاندا دەگرن بەرامبەر نەفامی نەفامان و دەست بڵاوی و رەزیلی ناکەن لە پارە خەرج کردن و لە هەموو کردەوەیەکیاندا مام ناوەندن, کەس بە ناحەق ناکوژن, زینا ناکەن, شایەتی بە درۆ نادەن, درۆ ناکەن و قسەی نابەجێ

ناکەن, فیز زلی ناکەن و ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بە سەردا بخوێنرێت مل کەچ دەبن و چاویان لە ئاستیدا داناخەن و گوێیانی لێکەر ناکەن. الفرقان /63 تا 276. لە سورەتی ئەنعامیشدا کە سورەتێکی مەککی یە دیسانەوە ئایەتگەلێکی زۆری تێدایە لە سەرزەنشت کردنی خوو رەوشتی ناشیرین و ناڕەواو ستەم و هتد.

ئەمانە هەندێك نموونە بوون لە قورئان ئەگینا گەر قورئان بە وردی بخوێنیتەوە دەبینی چەند جەخت لە سەر مەسەلە ئەخلاقی و کۆمەلآیەتی و عیبادی و ئابوری و شارستانییەکان دەکات لە پاڵ مەسەلە عەقیدەییەکەدا، بەلآم چ دەڵێی بە خەڵکی نەزان کە لە خۆیانەوە قسە دەکەن و بێ بەڵگە تۆمەت ریز دەکەن، خواش هەر لە مەککەدا دەفەرموێت: **"وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً" (الإسراء: 36).**

دەربارەی بابەتی مێژووییش لە قورئانی مەککی دا دەڵێین:

مەگەر هەر لە مەککەدا نییە خوا باسی پێغەمبەران دەکات هەر لە ئادەمەوە تا عیسا؟ مەگەر ئەمانە بابەتی مێژوویی نین؟ مەگەر هەر لە مەککەدا نییە خوا باسی قەومی **لوط** دەکات کە لە سەر نێربازی لە ناو بران یا قەومی شوعەیب، کە لە سەر فێڵ و ترازوبازی لە ناو بران؟

مەگەر بەشێکی زۆری قورئانی مەککی چیرۆکی پێغەمبەران نییە؟

مەگەر قورئانی مەککی بە درێژی باسی چیرۆکی موسا و بەنی ئیسرائیل ناکات؟

کاتێك موسڵمانان چوونە مەدینە زانیارییەکی تەواویان دەربارەی هەموو پێغەمبەران و ئایینەکان هەبوو بە تایبەت مەسیحیەت و یەهودییەت بۆ ئەوەی ئامادەی وەلآمدانەوەی هەموو پرسیارێکی جولەکە و گاورەکان بن.

جیاوازی نێوان قورئانی مەککی و مەدەنی لەم رووەوە ئەوەیە کە قورئانی مەککی چیرۆکی پێغەمبەرانی گێڕاوەتەوە بە تەواوی بە تایبەت چیرۆکی بەنی ئیسرائیل و بە تایبەتتریش لە دوای حەزرەتی موساوە، بەلآم قورئانی مەدەنی بریتییە لە گفتوگۆ و موجادەلە لەگەڵ جولەکەدا و دەرخستنی هەڵوێستیان لە پێغەمبەران و بانگ کردنیان بۆ ئیسلام، هەروەها موناقەشەی مەسیحیەت و چۆنێتی گۆڕینی عەقیدەی یەکتا پەرستی و بانگکردنیان بۆ ئیسلام.

ئەم میتۆدە (منهج) قورئانیەش پێویستە هەموو کەسێك بیگرێتە بەر, یەکەم شارەزایی پەیدا کردن دەربارەی رێبازێك یان مەسەلەیەك پاشان گفتوگۆکردن لەگەڵ خاوەنەکەیدا.

هەروەها بەشێکی زۆری قورئانی مەککی باسی مەسەلە ئەخلاقی و کۆمەلآیەتی و عەقیدەییەکانە ئیتر چ رەخنە گرتن بێت لە داب و نەریت و ئاکاری جاهیلی سەردەمی پێغەمبەر یان لە هی سەردەمی پێغەمبەرانی تر وە یا هاندانی باوەڕداران بێت لە سەر ئاکاری جوان و داب و نەریتی جوان.

لە سیرەی پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێت) دوو نموونە دێنینەوە کە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ بانگەشە بۆ یەکتاپەرستی و دەست هەڵگرتن لە بتپەرستی خەڵکی بانگ کردووە بۆ رەوشتی جوان و دەست هەلگرتن لە رەوشت و نەریتی ناشیرین: یەکەم قسەکانی جەعفەری کوڕی ئەبوتالب لە حەبەشە لەبەردەم نەجاشیدا، دووەم قسەکانی ئەبوسفیان بوو لەبەردەم هێرقلی رۆمدا لە شام, یەکەمیان شایەتی موسڵمانێکە کە جەعفەرە دووەمیان شایەتی بێباوەڕێکە کە ئەبوسوفیانی سەرۆکی قورەیشە.

ئەوەتا هەردووکیان دەڵێن موحەممەد پیاوێکی راستگۆی داوێن پاکی رابوردوو پاکە و بانگمان دەکات بۆ خوا پەرستی, درۆ نە کردن, خیانەت نە کردن, بەجێ هێنانی پەیوەندیی خزمایەتی, ستەم نەکردن, نەخواردنی ماڵی خەڵکی بەناحەق, شایەتی بە درۆنەدان , مەشروب نەخواردنەوەو.. هتد.

ئەمەش لە هەموو کتێبەکانی سیرە و مێژوودا ئاماژەیان پێدراوە.

کەواتە هەر لە مەککە موسڵمانان و بێباوەڕەکانیش دەیانزانی خوا چی پێ خۆشە و چی پێ نا خۆشە, لایەنە تەشریعیەکەش مایەوە بۆ مەدینە بۆ دوای پەیدا کردنی دەسەلآت.

لە مەککەدا خوا دەفەرموێت باوەڕداران زینا ناکەن، چونکە کارێکی خراپ و ڕێگایەکی چەوتە و مایەی تووڕەیی خوایە, لە مەدینەشدا حوکمی شەرعی بۆ زیناکەران دانرا لە دونیادا.

لە مەککەدا خوا دەفەرموێت پیاو کوشتن بە ناحەق حەرامە و کارێکی خراپە و مایەی نارەزایی خوایە و کوشتنی کەسێك بە ناحەق وەکو کوشتنی هەموو مرۆڤەکان وایە, لە مەدینەدا حوکمی پیاوکوژ لە دونیادا دەدرێت کە ئەگەر لە دەستی ئەنقەست بێت بکوژ بکوژرێتەوە، ئەگەر بە دەستی ئەنقەست نەبوو وە بە هەڵە بوو فدییە بدات.

لە مەککەدا دەڵێ ماڵی خەڵك بە ناحەق خواردن حەرامەو نابێ بڕوادار بیکات، لە مەدینەشدا حوکمی دزی و دەست گرتن بە سەر ماڵی خەڵکیدا دراوە.

لە مەککەدا باسی چیرۆکی حەزرەتی موسا دەکات لەو کاتەی لە دایك دەبێت تا لە میسر دەردەچێت و دەگاتە شام و پاشان باسی داود و سلێمان و زەکەریاو یەحیاو عیساو هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل دەکات، لە مەدینەشدا دەکەوێتە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ جولەکەو گاورەکانداو هەوڵەکانیان دەخاتە ڕوو لە گۆڕینی کتێبی پیرۆزو پیلان گێڕان بۆ پێغەمبەران و کوشتنی هەندێکیان و دەربەدەر کردنی هەندێکی تریان و گۆڕینی عەقیدەی یەکتاپەرستی و هەڵبەستنی درۆ بەدەم پێغەمبەرانەوە و هتد.

کەواتە قورئانی مەککی و مەدەنی لە یەك دانەبڕابوون، بەڵکو تەواوکەری یەکتر بوون و هیچ دژایەتی و ناڕێکییەك لە نێوانیاندا نییە، بەڵام هەندێ کەس نایزانن.

## باسی بەهەشت لە نێوان سەردەمی مەککەو مەدینەدا

ـ قورئانی مەککی زیاتر لە قورئانی مەدەنی باسی بەهەشتی تێدایە ئەویش لەبەر ئەوەی باسی بەهەشتو دۆزەخ مەسەلەیەکی عەقیدەییە و باسی عەقیدەش زیاتر لە مەککەدا بوو، مەدینە زیاتر سەردەمی دابەزینی شەریعەت بوو، لەبەر ئەوەی کە ئیسلام لە مەیدانی بانگەوازەوە گوێزرایەوە بۆ مەیدانی دەوڵەتو کۆمەڵگە، ئەم دووەش پێویستی بە تەشریعات هەبوو.

بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە ئەمانەی خوارەوەیە:

1- ناوی ڕۆژی قیامەت، یان یەکێك لە گرنگترین ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت لە (18) سورەتی قورئان نراوە، (3) دانە لەوانە لە مەدینە دابەزیون.

2- ناوی بەهەشت (**الجنة**) لە نزیکەی (145) شوێندا هاتووە (55)یان لە مەدینەو (90)یان لە مەککە.

3- وشەی حور (حۆری) لە (4) شوێندا هاتووە، (3) لە مەککەو یەکیان لە مەدینە.

ـ باسی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ بە دوو شێوە هاتووە لە قورئاندا:

1- باسی سەلماندنی ڕۆژی دوایی لە ڕێگەی بەڵگەی عەقڵییەوە، ئەمە دەتوانین بڵێین (95٪)ی لە مەککەدا دابەزیوە چونکە خەڵکی مەککە باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نەبوو.

2- باسی خۆشییەکانی بەهەشتو ناڕەحەتییەکانی دۆزەخ، ئەمیشیان دیسانەوە زۆربەی لە مەککەدا دابەزیوە وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا.

ـ بەڵام بە نیسبەت فەرمودەکانی پێغەمبەرەوە بە پێچەوانەوەیە، زۆربەی هەرە زۆری فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هی سەردەمی مەدینەیە، چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامیی پێگەیشتبوو و پێغەمبەر ﷺ پرسیاری زۆری لێدەکرا دەربارەی هەموو شتێك.

لە مەککەدا زیاتر لایەنە عەقیدەییەکە مەبەست بوو، خەڵکیش زیاتر لەو لایەنەوە پرسیاریان دەکرد، بۆ نموونە: لە مەککەدا باوەڕ بە ڕۆژی دوایی دانەمەزرابوو، جگە لە موسڵمانان کە ژمارەیان کەم بوو، کەس باوەڕی پێی نەبوو بۆیە پرسیارەکان لەسەر بوونو نەبوونی ڕۆژی دوایی بوو نەك لەسەر وردەکارییەکانی بەهەشتو دۆزەخ، بۆ نموونە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (یس) بە ئاشکرا ئەم مەسەلەیەمان بۆ روون دەکاتەوە: **(أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ من نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ * وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ *قلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ * الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ * أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ * إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ * فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) (يس :77 – 83).**

ئەم چەند ئایەتە سروشتی قۆناغی مەککەمان بۆ دەردەخاتو نموونەیەکە لەسەر سەلماندنی زیندووبوونەوە لە ڕێگەی بەڵگە عەقڵییەکانەوە.

بەڵام لە قۆناغی مەدینەدا وا نەبووە، چونکە خەڵکیی باوەڕیان دامەزرابوو، ئیتر جێی خۆی بوو پرسیار لە وردەکارییەکان بکرێت نەك لە ئەسڵی مەسەلەکان.

ـ دەبێ ئەوە بزانین کە زانایانی فەرمووودەناسیی تا رادەیەك ئاسانکارییان کردووە لە قبوڵکردنی ئەو فەرمووودانەی باسی هاندانو ترساندنیان تێدایە (الترغيب والترهيب) لەو روانگەیەوە کە گوایە ئەمانە باوەڕ پێهێنانیان زەرەرێك نادات بەڵکو زیاتر وا لە موسڵمانان دەکات هەوڵبدەن بۆ ڕۆژی دوایی، بۆیە رایان وابووە هیچی تێدا نییە گەر کار بە فەرموودەی لاواز بکرێت، بەڵام بە نیسبەت عەقیدەو حەڵاڵو حەرامەوە وا نەبوونو سەختگیرییان کردووە لە وەرگرتنو رەتکردنەوەی فەرموودەدا و فەرموودەی راستیش نەبووایە قەبوڵیان نەدەکرد، چونکە بوارەکەی هەستیارترە.

لەبەر ئەوە ئەو فەرمووودانەی کە لە بواری هاندانو ترساندندا هاتوون کەمتر دەشێن بۆ ئەوەی بە بەڵگە بهێنرێنەوە بۆ سەلماندنی راستییەکان بەڵکو دەبێت زیاتر پشت بە قورئانو فەرموودەی راست ببەسترێت.

## حیجاب لە نێوان ئاکارە باوەڕدا

مەسەلەی حیجاب مشتومڕی زۆری لەسەرە کە ئایا فەرزە لەسەر ئافرەت یا ن نا، ئەگەر فەرزە شێوەکەی چۆنەو سنوورەکەی چەندە، جاران قسە لەسەر فەرزبوون و فەرزنەبوونی نەدەکرا بەڵکو زیاتر قسە لە سەر چەندی و چۆنێتییەکەی دەکرا بەڵام ئێستا خەڵکانێك پەیدا بوون بە ناوی ئیسلامەوە قسە دەکەن و گومان لە فەرز بوونی حیجاب دەکەن، بۆیە بە پێویستمان زانی کەمێك قسەی لەسەر بکەین و راو بۆچوونی خۆمانی لەسەر دەربڕین:

وشەی حیجاب لە قورئانی پیرۆزدا لە حەوت شوێندا هاتووە و لە هیچ کامیاندا بۆ پۆشاکی ئافرەت نەهاتووە بەڵکو بە مانای تر هاتووە وەکو لە خوارەوە باسی دەکەین:

1ـ **"وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرآنَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ حِجَاباً مَّسْتُوراً"**. (الإسراء: 45). "حجابا" لێرەدا بە بەربەست راڤە کراوە.

2ـ **"فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَاباً فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَراً سَوِيّاً"**. (مريم: 17). (حجابا) لێرەدا بە گوم بوون لەبەرچاو یان چوونە شوێنێك کە نەبینرێت راڤە کراوە.

3ـ ئایەتی: **(فَقَالَ إِنِّي أَحْبَبْتُ حُبَّ الْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّى تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ)** (ص: 32). بە مانای ڕۆژ ئاوابوون یان ونبوونی ئەسپەکان لەبەرچاو راڤە کراوە.

چوار ئایەکەتەکەی تریش موفەسیرەکان بە بەربەستو پەردەپۆش راڤەیان کردووەو کەس باسی پۆشاکی ئافرەتی نەکردووە بەڵکو هەرچی زانا هەیە لە ئایەتەکانی سورەتی نوور و ئەحزابدا باسی ئەو مەسەلەیان کردووە.

ئەم چوار ئایەتەش ئەمانەن :

**1– (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ..) (الأحزاب: 53).**

**2– (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْياً أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ...) شورى 51.**

**3– (وَبَيْنَهُمَا حِجَابٌ وَعَلَى الأَعْرَافِ رِجَالٌ يَعْرِفُونَ كُلاًّ بِسِيمَاهُمْ...)الاعراف 46.**

**4– (وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ) (فصلت: 5).**

لە کتێبە فیقهییە کۆنەکاندا باسی حیجاب لە ژێر ناوی (**ستر العورة**)و (**عورة الرجل والمرأة**) لە باسی نوێژدا باس کراوە، لە لایەن موفەسیرەکانیشەوە لە ئایەتەکانی سورەتی نور و ئەحزابدا باس کراوە.

ئایەتەکەی سوورەتی ئەحزابیش کە دەفەرموێت: **"... وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ..."** (أحزاب 53) بە مانای پەردەپۆش دێتو تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەرو جلو بەرگ ناگرێتەوە.

کەواتە زاراوەی حیجاب کە ئێستا بەکار دەهێنرێت بە مانای ئەو پەردەپۆشو بەربەستە نییە کە لە قورئاندا هاتووە بەڵکو بۆ ئەو جلە بە کار دێت کە ئێستا ئافرەتانی پابەند بە ئیسلامەوە لەبەری دەکەنو حیجاب بە مانای پەردەپۆش تایبەت بووە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت).

دەربارەی پۆشاکی ئافرەتو ئەو ئایەتو فەرمودانەی لەسەری دەدوێن شتی زۆر نوسراوە، بەڵام بە لای منەوە کتێبی (**تحرير المرأة في عصر الرسالة**)ی نوسینی (**دكتور عبدالحليم أبو شقة**) بە تەواوی مافی خۆی داوەتیو لە دوو بەرگی سێهەمو چوارەمدا (لە کۆی شەش بەرگ) بە درێژی باسی کردووە.

ئەو ئایەتانەی کە باسی حیجابو پۆشاکی ئافرەتی باوەڕدار دەکەن ئەمانەن:

1ـ ئایەتی 31ی سورەتی نور کە دەفەرموێت: **"قُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاء بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاء ولا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ". (النور31).**

واتە: ئەی موحەممەد بە ئافرەتە باوەڕدارەکان بڵێ چاویان داپۆشن (سەیری پیاوان نەکەن)و عەورەتیان بپارێزن (زینا نەکەن) و جوانییان دەرنەخەن مەگەر ئەوە نەبێ کە دەردەکەوێت (واتە ناشاردرێتەوە وەکو دەستو پێو دەموچاو) و با چارشێوەکانیان دادەنەوە بەسەر قەدو ملیاندا (واتە دەمو چاویان دانەپۆشن قەیناکات کە نابێ پیاوانی نا مەحرەم سەرنجیان بدەن).

**"ولا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إلاّ لِبُعُولَتِهِنَّ"** با زینەتو جوانییان دەرنەخەن تەنها بۆ مێردەکانیان نەبێ (کە هەموو لەش دەگرێتەوە) ئەوانەی تریش کە ئایەتەکە باسیان دەکات ئەگەر مابەینی ئەژنۆو ناوکی ئافرەت ببینن قەیناکات، ئەوانەش بریتین لە: باوك، باوکی مێرد، کوڕی مێرد، برا، برازا، خوشکەزا، ئافرەتانی خۆیان (واتە موسڵمانان نەك ئافرەتی ناموسڵمان، چونکە لەوانەیە باسیان بکەن لای پیاوەکان یاوەکو ئەمڕۆ بە مۆبایل وێنەیان بگرن)، کەنیزەکەکانیان (نەك

کۆیلەکانیان)، ئەو پیاوانەی کە نیازیان بە ئافرەت نەماوەو وەکو پیرو پەککەوتوو پیاوی گێلو نەزان کە عەورەتی ئافرەت سەرنجیان راناکێشێتو ئەو شتانە نافامن.

**"وَلا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ"**، با پێیان نەکوتن بە زەویدا بە توندی بۆ ئەوەی بزانرێت خشڵو پاوانیان لە پێدایە یان لە ژێر جلەکانیاندایە.

2ـ ئایەتی 59 لە سورەتی ئەحزاب:

**"يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاء الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَن يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً"**. (الأحزاب: **59**) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ، بڵێ بە هاوسەرو کچەکانت و ژنانی بڕواداران با باڵاپۆشەکانیان (ئەوەی کە بەسەر جلەوە دەپۆشرێت) دابدەنەوە بەسەر خۆیاندا، ئەوە باشترە بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو ئازار نەدرێن، خوا بەخشندەو بە بەزەییە.

ئایەتی 53 لە سورەتی **الأحزاب** تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوەو بە مانای پەردەپۆش دێت:

**"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَداً إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيماً"**. (الأحزاب: **53**)

**" وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعاً فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ"**. واتە: ئەگەر داوای شتێکتان لێکردن ئەوا لە پشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن ئەوە پاکترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش.

ئەمانە ئەو سێ ئایەتانەن کە باسی جلو بەرگو پۆشاکی ئافرەت دەکەنو هیچ دژایەتییەك یا لێك نەچوونێك لە نێوانیاندا نییە تا پێویست بکات بڵێین ئەمیان نەسخکەرەوەی ئەوی ترە، بەڵکو هەریەکەو لە حاڵەتێك دەدەوێت.

ئایەتی (31 نوور) باسی پۆشاکی ئافرەت لە ناو کۆڕو مەجلیسە گشتییەکاندا دەکات، لەو شوێنانەی کە پیاو و ژنان تێکەڵن. بەڵام لە ئایەتی (59ی ئەحزاب)دا باسی پۆشاکی ئافرەتان دەکات لە کاتی چوونە دەرەوەدا بە تایبەت لەو کاتانەی یا لەو شوێنانەی کە گومانی ئەوەیان لێدەکرێت کە کەسانی دەروون نزمی لیبڕێت و بیەوێت دەست درێژییان بکاتە سەر، یان رێیان لێبگرێت وەکو لە هۆی دابەزینی ئایەتەکەدا هاتووە، ئەم پۆشاکەش زیادەیە لەسەرئەوەی لە سوورەتی نور دا هاتووە، هەر لەبەرئەوەشە جیاوزای لە نێوان زانایاندا دروست بووە کە ئایا ئافرەت بچێتە دەرەوە پێویستە دەموچاوی داپۆشێ یان نا.

ئایەتی (53)ی ئەحزاب، تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێ بێت)، ئەویش بریتییە لە دادانەوەی پەردەپۆش لە نێوان خێزانەکانی پێغەمبەرو پیاوانی نامەحرەمدا، ئەمەش بە مەبەستی زیاتر پاراستنی ماڵی پێغەمبەرە ﷺ و بۆ بەدیهێنانی ئەو مەبەستەیە کە لەم ئایەتەدا هاتووە، کە دەفەرموێت: **"... إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيراً"** (الأحزاب: **33**) واتە: خوا دەیەوێت پیسی و ناپاکیتان لەسەر لابدات، وە لەگەڵ ئەم ئایەتانەدا دەیان فەرمودەی (صحیح) هەیە کە وەکو راڤەیەك وان بۆیان و بەبێ خوێندنەوەیان ناتوانرێ وێنەیەکی تەواو بۆ ئەم مەسەلەیە بکێشرێت.

لەم سێ ئایەتەدا دەبینی ژنانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) لە هەموو ئافرەتان زیاتر داوایان لێکراوە پۆشتە بن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە فەرمانی پۆشتە بوونی ئافرەت بۆ پاراستنو رێزلێنان بووە نەك بۆ کۆت کردنیان.

## دا پۆشینی دەم وچاو

مشتومڕ هەیە لە نێوان زاناکاندا کە ئایا داپۆشینی دەموچاو پێویستە یان نا، زۆربەی زانایانی جیهانی ئیسلامی لەسەر ئەو رایەن کە داپۆشینی فەرز نییە، هەر کەسێکیش دەیەوێت بە درێژی راکانیان بخوێنێتەوە یا بگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی فیقھ یان ئەو کتێبانەی بە تایبەت لەسەر ئافرەت و حیجابی ئافرەت نووسراون، کە بە دەیان و سەدانن، لەو شوێنانەش کە داپۆشینی دەموچاوی ئافرەت بە واجب دەزانن، زاناکان لە بابی (**سد الذريعة**) واتە داخستنی هۆیەکانی زیناوە ئەو بۆچونەیان هەڵبژاردووە، کە ئەم بابەتەش واتە (**سد الذريعة**) وەکو لە سەرەتادا باسمان کردووە زۆر لە زانایان زیادەڕەوییەکی زۆریان تێدا کردووەو هەندێك جار داب و نەریتی کۆمەڵگە رۆڵی تێدا بینیوە، ئەو داب و نەریتەی کە لە ئەنجامی پیاوسالارییەوە دروست بوون نەك لە ئەنجامی شەرع سالارییەوە، ئەگینا ئایەت و فەرموودەکان روونن لەسەر دانەپۆشینی ئەو شوێنانەی، کە بە دەرەوەن وەکو دەست و پێ و دەمو چاو (**وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنّ**) واتە: با ئافرەتان جوانییان دەرنەخەن بۆ کەسی نامەحرەم تەنها ئەو شوێنانە نەبێت کە دەردەکەون (وەکو دەست و پێ و دەم و چاو)، با چارشێوەکانیان دادەنەوە بەسەر قەدو ملیاندا، واتە: دەموچاویان دانەپۆشن قەیناکات، فەرموودەکەی پێغەمبەریش ﷺ کە بە ئەسمای کچی ئەبوبەکر دەفەرموێت: هەر کاتێك ئافرەت پێگەیشت (بالَق بوو) نابێ بێجگە لە دەست و دەموچاوی شوێنی تری ببینرێ، روونە.

نووسەری کتێبی سێکس و شەرع دەربارەی ئایەتی (59)ی ئەحزاب دەڵێت:

<u>یەکەم:</u> لە حوکمی ئایەتی (59)ی ئەحزابدا ئەوە بەرجەستە دەکەین کە حیجاب بۆ ئەوە نەسەپێنرا تا هەوەسی پیاو لە لەخشتەبردنی ژنان بپارێزێت، چونکە کەنیزەکەکان لەبارتر بوون بۆ لەخشتەبردن لە ئازادەکان بەڵکو بۆ قوولکردنەوەی جیاوازیی چینایەتییەو پێداگرتنێکی ئیلاهییانەیە بۆ دوو چینی جیاواز لە ئیسلامدا، چینی ئازادەکان و چینی کۆیلەکان.

<u>دووەم:</u> لەبەر ئەوەی ئەم ئایەتە بۆ جیاکردنەوەی ئازادەکان لە کەنیزەکەکان دابەزیوە کەواتە بە نەمانی کەنیزەك دەبێ یاسای ئایەتەکەش نەمێنێ و یاسای حیجاب رابگیرێ.

<u>سێیەم:</u> جارێك دەڵێت: ئەم ئایەتە ئایەتی (31)ی سورەتی (نور)ی سڕیوەتەوە (نەسخ کردووە)، جارێکیش دەڵێت حوکمی ئەم ئایەتە بە نەمانی کەنیزەك دەبێ بووەستێت و ئیشی پێ نەکرێت.

<u>چوارەم:</u> ئیسلام کەنیزەك بە ئینسان نازانێت و لە پلە چواردا دایناوە.

<u>پێنجەم:</u> دەڵێ: بە دەرکەوتنی حوکمی ئەم ئایەتە لە ئیسلامدا ئارەزووە سێکسییەکان نەك هەر دانەمرکایەوە بەڵکو زیاتر پەرەیان سەند.

<u>لە وەڵامدا دەڵێین:</u>

<u>یەکەم:</u> بۆ تێگەیشتن لە حوکمی هەر ئایەتێك دەبێ لەو بارودۆخە تێبگەین کە تێیدا دابەزیوە بۆ ئەوەی چۆنێتی بەرپاکردنی بزانین.

ئەم ئایەتە بە روونی دەری دەخات، کە لە کۆمەڵگەی ئەوکاتەی مەدینەدا کە دەورووبەری ساڵی شەشەمی کۆچی بوو، لە کاتێکدا کە هەموو عەرەب پەلاماری مەدینەیان دابوو و مەدینە دووروویەکی زۆری تێدا بوو موسڵمانان نەیاندەتوانی دەستیان بۆ ببەن لەبەر زۆری ئەوان و ناسکی بارودۆخی موسڵمانان، خەڵکانێك هەبوون دەستدرێژییان دەکردە سەر کەنیزەکەکان لە رێگەو بانەکاندا بە تایبەت بە شەوان وەك لە هۆی دابەزینی ئایەتەکەدا هاتووە و ژنە ئازادەکان بۆ ئەوەی دەستدرێژییان نەکرێتە سەر دەیانگوت ئێمە ئازادین.

لێرەدا ئایەتەکە وەك قۆناغی یەکەم بۆ رێگرتن لە دەستدرێژی کردنە سەر ژنان و کچانی باوەڕدار فەرمانیان پێدەکات کە خۆیان بپۆشن بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو پەلامار نەدرێن یان رێیان پێ نەگیرێت.

ئایەتەکە دەفەرمویێت: (ئەی پێغەمبەری خوا بڵێ بە ژنەکانت و کچەکانت و ژنانی باوەڕداران کە باڵاپۆشەکانیان بدەن بەسەر سەرو ملیاندا بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو ئازار نەدرێن)، ئاشکرایە لێرەدا کە موسڵمانان ئەو دەسەلاتە زۆرەیان نەبووە لەو کاتەدا رێگە لەو گەنجە بەدڕەوشت و دووڕووانە بگرن لە دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتان بۆیە تەنها ئەوەندەیان پێکراوە کە فەرمان بە ژنان و کچانی خۆیان بدەن خۆیان داپۆشن بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو بزانرێت کە کەسوکاریان هەیە.

ئەمەش لە ئایەتەکانی (57و 58)ی ئەحزابدا بە روونی دەردەکەوێت، خوا دەفەرموێت: **(إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَاباً مُّهِيناً* وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ بِغَيْرِ مَا اكْتَسَبُوا فَقَدِ احْتَمَلُوا بُهْتَاناً وَإِثْماً مُّبِيناً) (الأحزاب: 57 ـ 58)**. واتە: ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن خوا لە دونیاو لە قیامەتا نەفرەتی لێکردوون و سزایەکی بۆ ئامادە کردوون، کە سووک و ریسوایان بکات، ئەوانەی ئازاری پیاوان و ژنانی بڕوادار دەدەن بێ ئەوەی خراپەیان لەگەڵدا کردبن بوختان و تاوانێکی ئاشکرایان کردووە.

ئینجا لە ئایەتی (59)دا فەرمان بە پێغەمبەرو بڕواداران دەدات کە بە ژنەکانیان بڵێن باڵاپۆشەکانیان دابدەنەوە بەسەر سەرو ملیاندا بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو ئازار نەدرێن، پاشان لە ئایەتی (60)ی ئەحزابدا هەڕەشەیان لێدەکات کە ئەگەر ئەو دووڕووانە دەست هەڵنەگرن لەو کارانە خوا موسڵمانانیان بەسەرا زاڵ دەکات و لە مەدینە دەریان دەکەن. **(لَئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلاً) (الأحزاب: 60)**.

**لنغرينك بهم: لنسلطنك عليهم**: زاڵت دەکەین بەسەریاندا.

لێرەدا بە روونی دەردەکەوێت کە ئەو کاتەی ئایەتی (59)ی ئەحزاب دابەزیوە موسڵمانان دەسەلاتی تەواویان بەسەر مەدینەدا نەبووەو نەیانتوانیوە لە دووڕووەکان و ئاژاوەگێڕەکان بپێچنەوەو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکەن و رێگرییان لێ بکەن، کەواتە شتێکی سروشتییە لەو قۆناغەدا تەنها فەرمان بە بڕواداران بدرێت کە خۆیان بپارێزن و یەك لایەنە خۆیان لە رێگەی ئەوانە دوور بخەنەوە، ئەمەش لە واقیعی خۆماندا بە ئاشکرا دەبینین، هەر شارێك زیاد لە یەك لایەنی تێدابێت هەر لایەنە دەسەلاتی بەسەر لایەنگرانی خۆیدا هەیەو بە سەر لایەنگرانی لایەنەکانی تردا نییەتی.

ئەمە واقیعی مەدینە بووە لەو کاتەدا، موسڵمانان توانیویانە تەنها دەست بەسەر لایەنگرانی خۆیاندا بگرن.

<u>دووەم:</u> مێژووی ئیسلام دەری دەخات کە دوای پەیداکردنی دەسەلاتی تەواو بەسەر مەدینەدا ئەو دیاردەیە نەماو هەر کەسێك پەلاماری هەر ئافرەتێکی بدایە چ ئازاد بووایە یان کەنیزەك سزا دەدرا، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە شتەکە تەنها مەسەلەی کات بووەو ئەمە یەکێك بوو لە قۆناغەکانی پاککردنەوەی کۆمەڵگە لە فەساد و بەدڕەوشتی، ئەمەش بەڵگەیەکە لەسەر واقیعییەتی قورئان بەوەی کە تەکلیفێکی لە موسڵمانان نەدەکرد و ئەرکێکی نەدەخستنە سەر کە لە توانایاندا نەبێت، وەك چۆن لە مەککەدا حەرامی زیناو مەشروب رادەگەیەنێ بەڵام حوکمە شەرعییە دونیاییەکەی باس ناکات، چونکە لە توانای موسڵماندا نەبوو ئەنجامی بدەن، ئەمەش خاڵێکە پێویستە موسڵمانان رەچاوی بکەن، لە کاتێکدا کە لاوازن و دەسەلاتیان بەدەست نییە دەتوانن باسی حوکمی شتەکان بکەن بە حەڵاڵ یان بە حەرامی، بەڵام نابێ لەو کاتەدا هەوڵی بەرپاکردنی ئەو حوکمە بدەن، بۆ نموونە بۆیان نییە داری حەد لە کەسێك بدەن کە زینا دەکات، بەڵام دەتوانن بڵێن ئەمە حەرامەو حوکمەکەی لە شەرعدا ئەوەیە.

<u>سێیەم:</u> جیاوازی جلی کەنیزەك لە ژنە ئازادەکان بە پلەی یەکەم بۆ رەچاوکردنی باری کەنیزەکەکان بوو، کە بڕیاریان بە دەست خۆیان نەبووەو کارەکەر بوون و هەمیشە خەریکی ئیش بوون و نەدەکرا وەکو خانمە ئازادەکان خۆیان داپۆشن، جیاوازیی جلوبەرگیش بە گوێرەی ئیش و پلەوپایەی کۆمەلایەتی شتێکی رەچاوکراوە لە هەموو کۆمەڵگە کۆن و نوێیەکاندا و کەس نکوڵی لێناکات مەگەر کەسانی نەزان یان نیازپیس، ئەوەتا دەبینی لە نەخۆشخانەکاندا جلی دکتۆرو پەرستارو کارگوزار هەمووی لەیەك جیایە، رەچاوکردنی بارودۆخی کۆیلەو کەنیزەك تەنها لە داپۆشینی حیجابدا نەبووە بەڵکو لە سزادانیشدا بووە، ئەوەتا سزای کەنیزەك یان کۆیلە گەر زینا بکەن نیوەی سزای ئازادەکانە..

**چوارەم:** قورئان کە ڕێپێگرتنی ئافرەتە بڕوادارەکان بە ئازاردان دادەنێت لەوانەیە خەڵکانی تر بە ئازاری نەزانن بەڵکو بە پێچەوانەوە لەوانەیە زۆرێك لە کەنیزەکەکان خۆیان ئەوەیان پێ خۆش بووبێ کە کوڕان ڕێیان پێ بگرن‌و لەسەر ڕێیان بووەستن‌و قسەیان لەگەڵدا بکەن‌و دەستیان بۆ ببەن، ئەگینا گەر وا نەبووایە هەروەك چۆن ژنە ئازادەکان شکاتیان لای پێغەمبەر و مێردەکانیان دەکرد بەهەمان شێوە ئەوانیش شکاتیان لای ئاغاکانیان دەکرد، بەڵام کە ئەمە رووی نەداوە مانای وایە ئەوانیش ئەو شتەیان پێ ناخۆش نەبووە.

ئەمە لە رۆژگاری ئەمڕۆشدا بە زەقی دەیبینین، دەبینی زۆرێك لەو کچانەی پابەند نین بە رێنماییەکانی ئیسلامەوەو حیجاب لەبەر ناکەن پێیان خۆشە کوڕان لەسەر ڕێیان بووەستن لە کاتێکدا کە کچ‌و ژنی حیجاب لەبەر ئەوە بە ئازاردان دەزانن‌و پێیان ناخۆشە.

**پێنجەم:** مەرج نییە هەموو ئەو کەنیزەك‌و کۆیلانە موسڵمان بوو بن بەڵکو بۆی هەیە هەریەکە و شوێنکەوتووی ئایینێك بووبن بۆیە خۆداپۆشین فەرز نەکراوە بەسەریاندا بۆ ئەوەی یەکەم شتێکیان بەسەردا فەرز نەکرێت کە باوەڕیان پێی نییەو وێنەی ئافرەتە بڕوادارەکان ناشیرین نەکەن لەبەرچاو خەڵکیدا.

بەڵگەیەك لەسەر ئەم قسەیە ئەبولوئلوئە فەیروزی بکوژی حەزرەتی عومەرە کە تا سەردەمی عومەر لە مەدینەدا بووەو لەسەر ئایینی مەجوسی خۆی بوو بێ ئەوەی زۆری لێبکرێت ببێتە موسڵمان، جا لەبەر ئەوەی ئەو کەنیزەك‌و کۆیلانە هەریەکەو هی شوێنێك بوون و هەریەکەو لەسەر ئایینێك بوون، وەك چۆن ئەمڕۆ وڵاتە عەرەبییەکان پڕن لە سریلانکی‌و فلیپینی‌و..... هتد و نەدەکرا حیجابیان بە سەردا فەرز بکرێت.

**شەشەم:** بنەمایەکی زانستی هەیە دەڵێت: (العبرة بعموم النص لا بخصوص السبب) واتە پەندو وانە لە مانا گشتییەکەی دەقەکەدایە نەك لە هۆو بۆنەی وتنی، واتە ئایەتێك گەر لە بۆنەیەکدا دابەزیبێت تەنها بۆ ئەو بۆنەیە نییە بەڵکو بۆ هەموو حاڵەتێکە کە بشوبهێ بە حاڵەتی دابەزینی ئایەتەکە.

لێرەشدا ئایەتی دادانەوەی باڵاپۆش بەسەر سەروملدا بۆ حاڵەتێکە کە گەنجی بەدڕەوشت لە ڕێی کچاندا دەوەستێت‌و شەڕیان پێ دەفرۆشی نەك تەنها ئەو حاڵەتەی کە ئایەتەکە باسی لێوە دەکات، کەواتە حوکمی ئایەتەکە بە بەردەوامی دەمێنێتەوە مادەم ئەمە هەبێت لە کۆمەڵگەکاندا، وەك لەمەوبەریش وتم ئەم ئایەتە بۆ چوونە دەرەوەیە لە هەر شوێن‌و کاتێکدا کە مەترسی هەبێت لەسەر ژنان.

**حەوتەم:** ئەو قسانەشی کە دەڵێت ئەم ئایەتە نەسخ کەرەوەی ئایەتی (31)ی سورەتی نورە یا سەلمێنراوە کە ئایەتێکی ئیلاهی نییە جورئەت و بێبڕوایی بێوێنەی نووسەر دەردەخات، جا ئەگەر سەلماندنی ئیلاهی نەبوونی ئایەتەکان ئەوەندە ئاسان بووایە ئێستا قورئان داری بەسەر بەردەوە نەمابوو و ناوی لە کولەکەی تەڕیشدا نەمابوو نەك هەزارو چوار سەد ساڵ بەرامبەر ئەم هەموو هێرشە دڕندانانە وەك چیاکانی هەورامان بووەستێت‌و پێتێکی لە جێی خۆی نەگۆڕێت.

هەر نووسەر خۆی لە شوێنێکدا دەڵێت ئایەتی (31)ی نور بۆ حاڵەتێکی دائیمی‌و بەردەوامەو (59)ی ئەحزاب کاتییەو بەستراوەتەوە بە بوونی کەنیزەکەوە، ئەگەر وابێت چۆن ئایەتێك کە بەسترابێت بە حاڵەتێکی کاتییەوە دەشێت وەکو نەسخکەرەوە بۆ ئایەتێك کە حوکمەکەی هەمیشەیی‌و بەردەوام بێت، ئەمەیە نموونەی بەرجەستەی نەزانی و پەشێوی لە بیرکردنەوەدا!!.

**هەشتەم:** دەربارەی ئەو قسەیەش، کە دەڵێت: دەرکەوتنی حوکمی ئەم ئایەتە ئارەزووە سێکسییەکانی دانەمرکانەوە بەڵکو زیاتر پەرەیان سەند دەڵێین: ئەوەی کەمترین ئاشنایی هەبێت بە مێژووی ئیسلام یان کەمێك ئینسافی هەبێت ئەم قسەیە ناکات، چونکە هەموو بەڵگەکانی مێژوو و واقیعی موسڵمانان‌و واقیعی ناموسڵمانانیش بەڵگەن لەسەر هەڵەی ئەم بۆچوونەو لە لاپەڕەکانی داهاتووشدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم راستییە.

## حیجاب و زینا و لادانی سێکسی

ئەوانەی کە بانگەشە بۆ نەهێشتنی حیجاب و تێکەڵ کردنی نێرو مێ دەکەن لە هەموو ئاستەکانی خوێندن و لە هەموو شوێنەکاندا بەو بیانووەوە دەیکەن کە گوایە ئەو بۆیەك دەرکەوتن و تێکەڵییە لەو چاوچنۆکییە سێکسییە رزگاریان دەکات و وایان لێدەکات بە شێوەیەکی ئاسایی تەماشای یەکتر بکەن و رێژەی زینا و لادانی سێکسییش کەم دەکاتەوە!

دەپرسین:

کام بەلگە سەلماندویەتی کە لادانی سێکسی لەو شوێنانەی ئافرەت بە توندی داپۆشراوە زیاترە؟ بڕیاری پەرلەمانەکانی ئەوروپا لەسەر مارەبڕینی نێر لە نێر و مێ لە مێ؟!

ئایا دیاردەی نێربازی لە عەرەبستاندا زۆرە یا لە ئەوروپا؟

دەبوایە ئەوانەی ئەو قسانە دەکەن چەند نموونەیەکمان بۆ بێننەوە لەسەر راستی قسەکانیان لەگەڵ ئامارو بەڵگەنامەدا، چونکە وەکی تر و بەتەماشاکردنێکی سەر پێیی هەموو کەسێك دەزانێت لادانی سێکسی لە رۆژئاوای ئازادیدا زیاترە لە رۆژهەلاتی ئافرەت داپۆشراو بە راددەیەك کە ئەمڕۆ لە ژێر فشاری نێربازەکاندا زاراوەی "لادانی سێکسی" گۆڕاوەتەوە بە سێکس لەگەڵ هاوشێوەدا.

کەسێك گەر برسیی بێت بە بینینی خواردنی خۆش, یا بە بۆنکردنی خواردنی خۆش ئایا ئیشتهای زیاتر دەبێت یان برسێتیەکەی دەرەوێتەوە؟

کەس نییە نەزانێت، کە دیمەن و بۆنی خواردن چ کاریگەرییەکی هەیە لە سەر ئارەزووکردنی ئەو خواردنە بە تایبەت لە سەر کەسێك، کە برسیی بێت یان ماوەیەك بێت خواردنی خۆشی نەخوارد بێت, سێکسیش بە هەمان شێوە, بە بیر لێکردنەوە و تەماشاکردن و وردبونەوەی پیاوو ژن لە یەکتر زیاتر دەوروژێن.

زیادبوونی رێژەی منداڵی ناشەرعیش بەڵگەیە لە سەر زیادبوونی پەیوەندیی ناشەرعی لەو کۆمەڵگانەی کە پیاو و ژن تێیدا بە بێ قەید و مەرج تێکەڵن و ئافرەت جوانی خۆی دەردەخات.

ئایا ئەو کەسانەی تەماشای فیلمی سێکسیی دەکەن خرۆشاندنی سێکسییان زیاترە یا ئەوانەی تەماشا ناکەن و کاتیان بە شتی ترەوە بەسەر دەبەن؟

ئایا ئافرەتێك سنگی بە دەرەوە بێت زیاتر سەرنجی پیاو رادەکێشێت یان ئافرەتێکی سنگ داپۆشراو؟

ئافرەتێك جلێکی تەنکی تەسکی لەبەردا بێت و سمت و سنگی دەرپەڕاندبێت زیاتر پیاو دەوروژێنێت یان ئافرەتێك جلێکی پان و پۆڕ و ئەستوری لەبەردا بێت؟

ئەمە چ لۆژیکێکە کە دەڵێن ئافرەت تا پۆشتەتر بێت زینا و لادانی سێکسیی زیاتر دەبێت!

واقع شایەتە لە سەر ئەوەی کە دوای دابەزینی ئەو ئایەتانەی فەرمان بە پۆشتەیی ئافرەت و چاو داخستنی پیاو و ئافرەت و حەرامکردنی زینا دەدات، دیاردەی زینا ئەوەندە کەم بوویەوە بە درێژایی ئەو چەند ساڵەی پێغەمبەر لە مەدینەو خەلیفە راشیدەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردران.

بەو قسانە بێت دەبوایە لە ئەوروپاو ئەمریکا نە حاڵەتی ئیغتصاب رووی بدایە وەنە نێربازیی, بەلام واقیع پێچەوانەی ئەمەیە, دەقیقەیەك تێناپەڕێت لە ئەمریکا ئەگەر چەند کچێك ئیغتصاب نەکرێن یان چەند منالێك نەڕفێنرێن و کاری سێکسی و توندوتیژییان لەگەڵدا نەکرێت ئیتر چ کوڕ بێت یان کچ.

لادانی سێکسی کاتێك زیاد دەکات کە مرۆڤ بوروژێنرێت و بواری دامرکاندنەوەی نەبێت لە رێگای ئاساییەوە, بەلام ئەگەر وروژاندن نەبێت یان بواری سروشتی هەبێت بۆ دامرکاندنەوەی ئەو هەوەسە لادانی سێکسی روو نادات مەگەر ئەو کەسە لە رووی دەروونییەوە نەخۆش بێت.

## هەڵوێستی ئیسلام لە کۆیلایەتی

ئیسلام ئایینێکی واقعییە نەك میسالی، ئەگەر دانی ناوە بە جیاوازیی چینایەتیدا ئەوە واقیعییەتی ئەو دەسەلمێنێت، هیچ کاتێکیش هیچ کۆمەلگەیەکی بەشەری نەبووەو نابێت بێ جیاوازی لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵدا، هیچ فەرمانگەیەك بەرێوە ناچێت بە بێ بوونی چەند چینێك تێیدا چ جای کۆمەلگا، بەلام لەگەڵ ئەوەی کە ئیسلام دانی بە جیاوازیی چینایەتیدا ناوە رێگەی لە ستەم گرتووەو زۆر بە گوناهێکی گەورەی لە قەڵەم داوە، هانی بروادارانی داوە بۆ یارمەتیدانی یەکتر، ئەوەتا زەکاتی لەسەر دەوڵەمەندەکان فەرز کردووە، حەرامی کردووە، کەس لەبەر هەژاری و نەبوونی دزی بکات، نەهی کردووە لە حەسادەت بردن، هەروەها فیززلیی حەرام کردوە.

ئەمەیە جیاوازیی نێوان ئیسلامو هەندێك لەو رێبازانەی تر کە داوای نەمانی جیاوازیی لە نێوان چینو توێژەکانی کۆمەلگە دەکەن، ئیسلام ئایینێکی واقعیە و چارەسەری واقعیی دادەنێت بۆ کێشەکانی کۆمەڵو بە شێوەیەکی زۆر مرۆڤانە پەیوەندییەکانی نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەلگە رێك دەخات و هەوڵ دەدات ئەو جیاوازییە بۆ تەواو کردن بێت نەك بۆ ناکۆکیو دووبەرەکی لە نێوانیاندا بۆ نموونە پەیوەندیی نێوان ژنو پیاو، ئیسلام دان بە جیاوازییە بایۆلۆژییو فسیۆلۆژیو دەروونییەکانی نێوانیان دەنێت، پەیوەندییەکانی نێوانیانو ئەركو مافەکانیان لەسەر ئەو بناغەیە رێك دەخات، بەلام زۆرێك لە رێبازەکانی تر یان ناواقعیو میسالین، دەیانەوێت هیچ جیاوازییەك لە نێوان چینو توێژە جیاوازەکاندا نەمێنێت کە ئەوە هەرگیز روو نادات و ژیان بەو شێوەیە بەرێوە ناچێت، وەکو کورد دەڵێت: "من ئاغاو تۆ ئاغا کێ جێمان بۆ راخا". هەندێکی تریش ئیش لەسەر قووڵ کردنەوەی ئەو جیاوازییانە دەکەن بە رادەیەك کە ببێتە مایەی ئیستغلالو کۆیلایەتی هەرچەندە ناوی کۆیلایەتی لێنەنرێت.

ئەمەی دەربارەی ئیسلامو چۆنێتی ئاراستەکردنی جیاوازییە سروشتییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵ یان چینەکانی کۆمەڵ و چارسەرکردنی کێشەکان شتێکی تیۆریو پیاهەڵدانی بێ بنەما نییە، بەڵکو ئەگەر بە قووڵی لێکۆڵینەوە لە هەرکام لەو شتانە بکەیت راستی ئەم قسەیە دەردەخات.

چارەسەری کێشەی کۆیلەو کۆیلایەتی یەکێکە لە بەڵگەکانی ئەم قسەیەمان: کاتێك ئیسلام هات کۆیلایەتی وەکو دابونەریتێکی کۆمەلایەتی لە هەموو دونیادا رەگی داکوتابوو بە شێوەیەك لە بن دەرهێنانی بە (کن فیکون)ێك شتێکی زۆر ئەستەم بوو، ئەوەتا لە کوردستاندا هەرچی هێزی پەروەردەییو رۆشنبیریی و راگەیاندنو یاسایی هەیە خراوەتە کار هێشتا هەندێك دابونەریت بنەبڕ نەکراوە.

دکتۆرەکان لە هەموو بۆنەو بە هەموو نەخۆشێك، کە سەردانیان دەکات دەڵێن ددان دەرهاتن پەیوەندیی بە سکچوونی منداڵەوە نییە، کەچی خەڵکیی هەر لەو باوەڕەدان کە هۆیەکی سەرەکی سکچوون دان هاتنە! ئەمە ئەگەر بۆ مەسەلەیەك کە بە بەڵگەی زانستیی بۆ خەڵکی دەسەلمێنرێت، کە هەڵەیە ئینجا بنەبڕ نابێت چ جای شتە کۆمەلایەتییەکان.

کەواتە پێش هەموو شتێك دەبێ دان بەوەدا بنێین کە هەندێك دابونەریتی کۆمەلایەتی بە ئاسایی ریشەکێش ناکرێت بە تایبەت ئەگەر بێتو بەرژەوەندیی هەندێك چینو توێژی کاریگەر لە کۆمەلگەدا لە مانەوەی ئەو نەریتەدا بێت.

کۆیلایەتی یەکێك بوو لەو نەریتە رەگداکوتاوانەی ناو کۆمەلگە لە سەرانسەری جیهاندا کە بەرژەوەندیی دەسەلاتدارو سەرمایەدارەکان لە مانەوەیدا بوو، ئەمە یەکێك بوو لە هۆیەکانی مانەوەی کۆیلایەتی لەناو کۆمەلگەی ئیسلامیدا سەرەڕای ئەو هەموو رێگایانەی ئیسلام گرتنیەبەر بۆ بنەبڕکردنی.

یەکێك لە کێشەکانی مێژووی ئیسلام ئەوەیە کە رێنماییەکان دەزگایان بۆ دانەنرابوو بۆ بەرپاکردنیان (نەکرابوونە موئەسەساتی)، هەرچەند ئەمە لە داهێنانی ئەم سەردەمەیە و دەکرێ ئەمڕۆ شەریعەتناسان ئەنجامی بدەن. ئەمەش یەکێکە

لەو بەڵگانەی کە موسڵمانان دەتوانن سوود لە داهێنانەکانی مرۆڤ وەربگرن لە بواری تەشریع و ئیدارەو بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت و کۆمەڵگە.

بۆ نموونە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێ) هەر کە بوو بە خەلیفە کۆمەڵێك بنەمای دانا بۆ چۆنێتی مامەڵە کردن لەگەڵ کێشەکانو بەڕێوەبردنی دەوڵەتو ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدارو میللەت، ئەگەر یەکەم وتار بخوێنیتەوە دوای بەیعەت پێدانی یان ئەو ڕێنماییانەی بۆ سەرلەشکرەکان کردویەتی بخوێنیتەوە بۆت دەردەکەوێت کە زۆر بنەمای داناوە بۆ حوکمرانی، بەڵام چونکە نەکراوەتە دەستوور، بەرپاکردنی لە داوی خۆی دەکەوتە سەر ڕادەی پابەندبوونی خەلیفە بە شەرعو ئاستی تێگەیشتنو خوێندەوارییەکەی.

هەروەها زۆرێك لە هەڵوێستو قسەو کردەوەکانی خەلیفە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) هەموو بە بنەما دادەنرێن بۆ حوکمێکی دادپەروەرانە، بەڵام چونکە نەکراونەتە دەستوورێك، بەرپاکردنیان دوای خۆی کەوتبووە سەر خودی ئەو خەلیفەیەی کە هاتووە.

هەندێك نموونە لە ئیشەکانی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت):

- هاندانی خەڵکی بۆ پێچانەوە لە خەلیفەو دەسەڵاتدارانو لێپرسینەوەیان.
- بڕینەوەی موچە بۆ پیرو پەککەوتەی ناو کۆمەڵگە بە تایبەت غەیرە موسڵمانەکان.
- پێچانەوەی لە والیەکان دەربارەی ئەو سەروەتو سامانەی کۆیان کردبویەوەو داهێنانی بیرۆکەی (من **أين لك هذا**).

لێرەوە گرنگی نووسینەوەی دەستوورو داهێنانی لیژنەکانی بەدواداچوونو بە دەزگایی کردنی ڕێنمایی‌و بنەما دەستوریەکان دەدەکەوێت کە داهێنانی مرۆڤەو سوود لێوەرگرتنی یارمەتی بەدیهێنانی مەبەستەکانی ئیسلام دەدات لەبەرپاکردنی دادپەروەریدا کە چەندین ئایەتو فەرمودە لەسەر گرنگی گەورەییەکەی.

ئەم پێشەکییەم بە پێویست زانی بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی ئیسلام لە کۆیلایەتی و هۆی بنەبڕنەکردنی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا لەگەڵ ئەو هەموو ڕێوشوێنەی ئیسلام گرتویەتەبەر بۆ ئەو مەبەستە.

ئەگەر تەماشای سەرجەم ئایەتو فەرمودەو کردەوەکانی پەیامبەر بکەیت بۆت دەردەکەوێت کە ئیسلام دەیویست دیاردەی کۆیلایەتی نەهێڵێت، سەرەتا هاتووە هەرچی ڕێگا هەیە بۆ بەکۆیلەکردن هەمووی داخستووە، یەك ڕێگە نەبێت کە دیلی شەڕە، ئەویش لەبەرئەوەی یەکەم بەرامبەرەکان ئەو کارەیان دەکردو دیلی موسڵمانانیان دەکردە کۆیلە.

دووەم: بە کۆیلە بوونی دیل هۆیەك بوو بۆ تێکەڵ بوونی لەناو کۆمەڵگەدا، ئەمەش هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ موسڵمان بوونی زۆرێکیان، دواییش دەیانتوانی خۆیان ئازاد بکەن ئەگەر لە شوێنی خۆیاندا تواناو دەسەڵاتیان هەبوو بێت، یان کەسانێك هەبونایە ڕزگاریان بکەن.

هەنگاوی دووەم ئەوە بوو هەرچی ڕێگا هەبوو بۆ ئازاد کردنی کۆیلە گرتیەبەرو ئەو نەریتەی لە ناو برد کە کۆیلەی هەتا هەتایە بە کۆیلایەتی دەهێشتەوە، دەبینی ئازاد کردنی کۆیلە یەکێك بووە لە سڕینەرەوەکانی (**كفّارة**) زۆرێك لە گوناهەکان , بۆ نموونە: پیاو کوشتن بە هەڵە, ڕۆژووشکاندن لە ڕەمەزاندا, زیهار (کەسێك بە ژنەکەی بووتایە تۆ وەکو دایکمی), ئەمانەو چەندین شتی تر، کە ماوەی باسکردنی نییە, تەنانەت سوێندشکاندنیش یەکێك لە کەففارەکانی ئازاد کردنی کۆیلە بوو، ئەمە گەورە ترین ڕێگا بوو بۆ ئازاد کردنی کۆیلە.

ڕێگایەکی تر ئەوە بوو کە کۆیلە دەیتوانی ئازادی خۆی بکڕێتەوە، خاوەن کۆیلەش بۆی نەبوو ئەو داخوازییەی ڕەت کاتەوە ئەگینا دادگا ئەو کارەی بۆ دەکرد.

کەنیزەك منداڵی بوایە ئۆتۆماتیکی ئازاد دەبوو.

لە هەمووش گرنگتر ئازاد کردنی کۆیلە یەکێك بوو لە جۆرەکانی عیبادەتو چاکە کردن و پاداشتی زۆری لە سەر دانرابوو، بۆیە دەوڵەمەندی وا هەبووە دەیان کۆیلەی کڕیوە و ئازادی کردوون, هی واش هەبووە دەوڵەمەند نەبووە، بەڵام هەموو جارێك لە خۆی و ماڵ و منداڵی خۆی گرتۆتەوە و پارەی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی کۆیلەی پێ ئازاد بکات.

پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت **"من اعتق رقبة مسلمة اعتق الله بكل عضو منه عضوا من النار"**. واتە هەرکەسێك کۆیلەیەك لە کۆیلایەتی رزگار بکات خوا بە هەر ئەندامێکی ئەو کۆیلەیە ئەندامێکی ئەم لە ئاگر رزگار دەکات، ئەم هەنگاوانە پێکەوە, واتە کەم کردنەوەی رێگاکانی بە کۆیلە بوون و زیاد کردنی رێگاکانی ئازاد بوون پێیان دەوترێت: **"تضييق المدخل و توسيع المخرج"**، واتە تەسککردنەوەی چوونە ژوورەوە (بۆ کۆیلایەتی) و فراوانکردنی چوونە دەرەوە (لە کۆیلایەتی), لە کاتێکدا کە پێش ئیسلام بە پێچەوانەوە بوو، واتە رێگاکانی بە کۆیلە کردن زۆر بوون، بەڵام رێگاکانی دەرچوون لە کۆیلایەتی تەسك‌و کەم بوون یا هەر نەبوون، لە پێش ئیسلامدا قەرزارێك نەیتوانیبایە قەرزەکەی بداتەوە دەکرایە کۆیلە لە جیاتی ئەو قەرزە، کەسێك دەسەڵاتی هەبوایە هەڵکوتێتە سەر کۆمەڵێك بە ئاسانی دەیکردنە کۆیلە، شەڕی وا هەبووە هەر بە مەبەستی بە کۆیلەکردنی خەڵکی بووە.. ئەمانەو دەیان شتی تر رێگە بوون بۆ بەکۆیلەکردنی خەڵکی، لەبەرامبەر ئەوەشدا رێگەی رزگاربوونیان زۆر کەم بوو مەگەر کەسێك لەبەر بەرژەوەندییەکی گەورە کەسێکی ئازاد بکردایە وەکو ئەوەی عەنتەرەی کوڕی شەداد کاتێك هێرشیان بۆ هێنان باوکی وتی عەنتەرە پەلاماریان بدە، عەنتەرە وتی کۆیلە هونەری پەلاماردان نازانێت، وتی پەلاماریان بدەو ئازادی، ئەوسا عەنتەرە پەلاماری دوژمنی داو شکاندنی.

ئەمە بە نیسبەت رێگاکانی نەهێشتنی کۆیلایەتی، وەکو دەبینی یەکێك بووە لە مەبەستەکانی ئیسلام (**مقاصد الشريعة**) کە دەبوایە موسڵمانان بە جێی بێنن، بەڵام ئیتر بۆ بەتەواوی بەجێ نەهێنراوە؟ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بە دەزگایی نەکردنی ئەم رێنماییانە ئەویش لەبەرئەوەی کە وەکو وتمان بە دەزگایی کردن داهێنانێکی نوێیەو لە ئەنجامی تەجرەبەیەکی زۆرەوە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووەو نەك هەر دژی ئیسلام نییە، بەڵکو رێگەیەکە بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکانی ئیسلام، ئەمانەش ئەو بوارانەن کە بۆ مرۆڤ بەجێهێڵراوە کۆششی تێدا بکەن‌و پەرەی پێبدەن.

لە سەرجەمی ئەو هەموو شتانەوە (**إجراءات**) دەردەکەوێت، کە ئیسلام لەگەڵ نەمانی کۆیلایەتیدایە، بەڵام بۆچی وەکو شتەکانی تر کە حەرامی کردن فەرمانێکی حەرام کردنی دەرنەکرد؟ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کۆیلایەتی لەوکاتەدا سیستمێکی نێودەوڵەتی بوو، پەیوندی بە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتانیشەوە هەبوو، بە تەنها بەیەك لایەنە لە لایەن ئیسلامەوە نەدەکرا قەدەغە بکرێت، چونکە ئەوکاتە دەبوو دیلی موسڵمان بکرێ بە کۆیلە لای دوژمنان‌و دیلی ئەوان یان ئازاد بکرێ کە ئەمەش ناهاوتایە لەگەڵ ئیشی بەرامبەردا یان دەبوو لە زیندانیدا بمێنێتەوە تا بە شێوازێك لە شێوازەکان ئازاد دەکرا، رەنگە کەسیش نکوڵی لەوە نەکات، کە پیاو کۆیلە بێت لای خێزانێك و بە ئازادی بێت‌و بڕواو تێکەڵاوی خەڵکیی بکات‌و بتوانێت لە زۆرێك لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشدار بێت زۆر لەوە باشترە لە زینداندا برزێت، بە تایبەت ئەگەر بزانێت مامەڵەی کۆیلە چۆنە لەناو موسڵماناندا و هەلی ئازادبوونیش زۆرە چ بە توانای خۆی یان بە رێگایەکی تر لەو رێگایانەی کە ئومێدو هیوای دەبەخشی بە هەموو کۆیلەیەك، کەواتە مەسەلەی قەدەغەکردنی کۆیلایەتی بەیەك لایەنە نەدەدرا، بەڵکو پێویستی بە پەیمانامەیەکی نێودەوڵەتی هەبوو کە هەموو وڵاتان مۆری بکەن‌و پابەندبن پێوەی، ئەم هەلەش تا پێش چەند دەیەیەك لەمەوبەر پێش نەهاتبوو، ئێستاش کە ئەو هەلە رەخساوە ئیسلام یەکەمین لایەنە مۆری دەکات، چونکە یەکێك لە مەبەستە گرنگەکانی بەجێ دەهێنێت.

وتمان ئیسلام بە هەموو شێوەیەك هەوڵی داوە کۆیلایەتی نەهێڵێت، نەمانی کۆیلایەتی یەکێکە لە مەبەستەکانی شەریعەت, بەڵام نەهێشتنی بە بڕیارێك مومکین نەبوو، چونکە نەریتێکی باوی نێو هەموو گەلانی دونیا بوو، نەدەبوو بە یەك لایەن کۆتایی پێ بهێنرێت، بەڵکو هاوکاریی هەموانی دەویست, کەواتە تا ئەوکاتەی مرۆڤایەتی دەگاتە ئەو قەناعەتەی کۆیلایەتی نەهێڵێت دەبێ چارەسەرێکی تری بۆ بدۆزرێتەوە, ئەویش بریتی بوو لە گۆڕینی مامەڵەی کۆیلە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

ئەمەش بابەتێکە ئێستا لە سەری دەدوێین, بۆ باشتر تێگەیشتن لە هەڵوێستی ئیسلام پێم خۆشە نموونەیەك باس بکەم کە دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دەراز لە کتێبی (**نظرات في الإسلام**) لە بەشی (**الإسلام و الرق**)دا باسی کردووە، نووسەر کۆیلایەتی دەشوبهێنێت بە خانویەك کۆمەڵێك خەڵکی تیابێت و گڕی گرتبێت, ئیسلام یەکەم جار هاتووە بەربەستی داناوە لەبەردەم ئاگرەکەدا بۆ ئەوەی زیاتر تەشەنە نەکات و شوێنی تریش نەگرێتەوە, ئینجا هاتووە هەرچی دەرگاو پەنجەرە هەیە کردویەتەوە بۆ ئەوەی هەر کەسێك توانای دەرچوونی هەیە خۆی لەو ئاگرە دەرباز بکات و دەیان هۆی یاریدەدەری بۆ هێناون بۆ دەرکردنیان لەو ئاگرە, دەمێنێتەوە ئەوانەی توانای دەرچوونیان نییەو لە ناو خانوەکەدا ماونەتەوە, ئیسلام هاتووە ئاوی ساردی بە سەردا کردون و گڕوتینی ئاگرەکەی لە سەر کەمکردونەتەوەو نەیهێشتووە بسووتێن.

واتە: ئیسلام دوای ئەوەی کە هاتووە هەموو رێگەیەکی گرتۆتەبەر بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی کۆمەڵێك رێنمایی داناوە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ کۆیلەدا، کە ئەگەر بەرپا بکرێت زۆرێك لە کارگوزاری فەرمانگە و خزمەتکارانی ماڵان و سەربازانی دەوڵەت خۆزگەیان پێ دەبەن.

ئەمڕۆ کۆیلایەتی هەر ناوەکەی و هەندێك لە روکەشەکەی گۆڕاوە، ئەگینا زۆر چین و توێژ هەن لە کۆمەڵگەدا لە کۆیلە خراپتر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

ئەو رێنماییانەی ئیسلام دایناوە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ کۆیلەدا ئەگەر بهاتبایە دەزگای تایبەتی بۆ دابنرایە بۆ کاریگەر کردنیان هیچ کۆیلەیەك لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ستەمی لێنەدەکراو ئەو هەموو کەنیزەك و کۆیلانە لە کۆشکەکانی هەندێك دەسەڵاتداراندا نەدەبینران بە ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر کۆیلایەتی لە بەین دەبرا.

ئەمەش هەندێك لەو رێنماییانە:

یەکەم: کۆیلەو کەنیزەك نابێ بە بەندەکەم بانگ بکرێت بەڵکو بە کوڕەکەم یان کچەکەم، یان لاوەکەم بانگ بکرێن (**لایقل احدکم عبدي و لكن قولوا فتاي و فتاتي**).

دووەم: دەبێ لە وەی کە ئاغاکەیان یان سەروەرەکەیان دەیخوات و لەبەر دەکات بخوا و لەبەربکات. سێیەم: نابێ ئیشێکیان بە سەردا بدات لە توانایاندا نەبێ, ئەگەر شتێکی وای کرد یارمەتییان بدات.

**عن المعرور بن سويد قال: رايت أبا ذر (رضي الله عنه), وعليه حلة, وعلي غلامه مثلها, فسألته عن ذلك, فذكر أنه ساب رجلا على عهد رسول الله ﷺفعيره بأمه, فقال النبي ﷺ: "إنك امرؤ فيك جاهلية, هم إخوانكم و خولكم, جعلهم الله تحت أيديكم, فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل, و ليلبسه مما يلبس, ولا تكلفوهم مايغلبهم, فإن كلفتموهم فأعينوهم". متفق عليه/ رياض الصالحين، باب: فضل الإحسان الى المملوك.**

واتە: مەعروری کوڕی سوەید دەڵێت: ئەبوزەڕی غەفاریم بینی جلێکی لەبەر بوو کۆیلەکەیشی هەمان جلی لەبەردا بوو, لێم پرسی ئەوە چۆن خۆت و کۆیلەکەت یەك جلتان لەبەردایە؟ وتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (سەلامی خوای لێ بێت) دەمەقاڵێیەکم لەگەڵ پیاوێکدا بوو بە دایکی هەڵمسەنگاند (وتویەتی کوڕی کۆیلە یان کوڕی دایك رەش: واتە کۆیلە) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێی وت: تۆ پیاوێکی نەفامییت تێدایە, ئەوانە براتانن خوا خستونیەتە ژێر دەستتان, هەر کەسێکتان برایەکی لە ژێر دەستدا بوو لەو خواردنەی بداتێ کە خۆی دەیخوات، لەو جلەی لەبەر بکات کە خۆی لەبەری دەکات، کارێکیان بە سەردا مەدەن لە توانایاندا نەبێت، ئەگەر پێشتان کردن یارمەتییان بدەن.

چوارەم: نابێ هانیان بدات یان زۆریان لێبکات بۆ کاری ناشەرعی ئەگەر بۆ پارە پەیدا کردنیش بێت, (**ولا تكرهوا فتياتكم على البغاء أن أردن تحصنا**).

پێنجەم: نابێت لێیان بدات (**من ضرب غلاما له حدا لم ياته, أو لطمه, فان كفارته ان يعتقه**). (**رواه مسلم ـ رياض الصالحين ـ باب النهي عن تعذيب العبد**).

شەشەم: ئەگەر ویستیان ئازادیی خۆیان بکڕنەوە بۆی نیە بەر هەڵستیان بکات.

حەوتەم: رێگای فێربوون و زانست وەرگرتنیان لێ نەگرێت.

**عن أبي موسى الأشعري قال: قال رسول الله ﷺ: "ثلاثة له أجران:... ورجل كانت له أمة فأدبها فأحسن تأديبها, وعلمها فأحسن تعليمها, ثم اعتقها فتزوجها, فله أجران". متفق عليه / رياض الصالحين/ باب فضل المملوك الذى يؤدي حق الله وحق مواليه.**

واتە: سێ کەس دوو جار پاداشت دەدەرێنەوە یان پاداشتەکەیان دوو بەرامبەرە، سێهەمیان: کەسێك کەنیزەکێکی هەبێت پەروەردەیەکی باشی بکات و زانستی فێر بکات و پاشان ئازادی بکات و بیخوازێت دوو پاداشتی هەیە.

بە کورتی ئیسلام بۆ ئەوانەی کە بە کۆیلایەتی دەمانەوە کۆمەڵێك ڕێنمایی دانابوو کە باری کۆیلایەتیەکەیان لە سەر سووك بکات تا ئەو کاتەی بواری ئازاد کردنیان دێت.

ئەگەر هەر مومارەسەیەك کرابێت پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلام ئەوە هەڵەی موسڵمانان و کەمی پابەندیی ئەو کەسانەیە بە ڕێنماییەکانی ئیسلامەوە و زیادەڕەوییە لە بەکارهێنانی مافێکدا کە پێیان درا بوو, ئەمەش لە شەرعدا پێی دەگوترێت (التعسف فی استعمال الحق).

خاڵێکی تر ئەوەیە کە کۆیلایەتی تایبەت نەبوو بە ژنانەوە، بەڵکو پیاو و ژنیشی دەگرتەوە, ڕێنماییەکانی ئیسلامیش بەرامبەر بە کۆیلە دیسانەوە پیاو و ژن دەگرێتەوە, بگرە بەرامبەر کەنیزەك زیاتر هانی بڕواداران دەدات چاکەیان لەگەڵ بکەن، ئەگەر لە مەسەلەی حیجابدا چاو پۆشییەك کراوە ئەوە بۆ ڕەچاوکردنی بارو دۆخی کەنیزەکە لە کۆمەڵگەدا، چونکە بمانەوێت و نەمانەوێت باری کۆمەڵایەتی کاریگەریی بەجێ دێڵێت لەسەر ڕەفتار و ئاکاری مرۆڤ و هەر بارەو جۆرێك ڕەفتار و هەڵسوکەوت دەخوازێت, ئەوانەشی کە ڕەخنە لە ئیسلام دەگرن لەم ڕووەوە بە زۆریی کەسانی نەزان و بێدەسەڵاتی ناو کۆمەڵگەن, هەر ئەو کەسانە کە دەوڵەمەند دەبن یا دەسەڵات پەیدا دەکەن هەموو هەڵسوکەوتێکیان دەگۆڕێت و زۆر زیاتر لە خەڵکانی تر پێ لەسەر خۆ جیاکردنەوە دادەگرن لە توێژەکانی تری کۆمەڵگە، هەروەها جۆری جل و بەرگیش کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ، ئەمانە هەموو حاشا هەڵنەگرن.

واقعی کۆنە مارکسیەکانی تازە بۆرجوا شایەتن لەسەر ئەم قسەیە.

شتێکی تر کە لێرەدا بە گرنگی دەزانم باسی بکەم ئەوەیە کە ئەم جیاوازییانە تەنها لەم دونیایەدایە، ئەگینا پلەو پایەی ڕۆژی دوایی بە کردەوەی چاکە نەك بە ماڵ و دەسەڵات، وەکو خوای گەورە دەفەرموویت: **"إن أكرمكم عند الله أتقاكم"**. واتە: بەڕێزترینتان لای خوا ئەوانەتانن کە لە خوا زیاتر دەترسن و زیاتر خۆیان لە گوناه دەپارێزن. پێغەمبەریش دەفەرمویت: **"إن الله لا ينظر الى صوركم ولا الى أجسامكم ولكن ينظر الى قلوبكم واعمالكم"**.، دەفەرمویت: **"رب أشعث مدفوع بالأبواب لو أقسم على الله لأبره"**. واتە: لەوانەیە سەر و قژ تۆزاوییەك کە خەڵکی دەرگای لێ ناکەنەوە ئەوەندە لای خوا بەڕێزە گەر سوێند لە سەر خوا بخوات بۆ هەرشتێك خوا بۆی جێ بەجێ بکات. حەزرەتی عومەریش دەفەرموویت: **"عز الدنيا بالمال و عز الاخرة بصالح الاعمال"**. واتە: پلەو پایەی ئەم دونیایە بە سەروەت و سامان بە دەست دەهێنرێت, هی دوارۆژیش بە کردەوەی چاك... لە ئەنجامی ئەم ڕێنماییانە و ئەم پێوەرە ئیمانیانەوە دەبینی لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا زۆر لە کۆیلە و کەنیزەك هەڵکەوتوون و کەسانی زۆر گەورەو گرنگیان لێدەرچووە چ لە رووی زانستەوە، چ لە رووی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە و کۆمەڵگەی ئیسلامی ڕێگر نەبووە لەبەردەم سەرکەوتنیاندا، ئەوەتا بیلالی حەبەشی و صوهەیب و سەلمان و سەدان کۆیلەی تر هەموو پلەو پایەیان لە زۆرێك لە سەرانی قورەیش زیاتر بوو، جێگەشیان لە دڵی موسڵماناندا لای کەس شاراوە نییە, بیلال لە دوای هەموو بانگێك باس دەکرێت و سەلمان لەگەڵ ئەهلی بەیتی پێغەمبەردا سەلامی بۆ دەنێردرێت.

زۆرێکیش لە گەورەزانایانی تابعییەکان کۆیلە بوون، زۆرێکیش لە والی و میرەکانی موسڵمانانیش هەر کۆیلە بوون، زۆرێکیش لە خەلیفەو دەسەڵاتدارانی موسڵمانان دایکیان کەنیزەك بووەو خاوەنی قسەی یەکەم بووە لە کۆشکدا، ئەگەر بهاتایە قورئان کۆیلایەتی بسەپاندایە و برەوی پێ بدایە و ڕێگای ئازاد کردنیانی داخستایە ڕەنگە ئەوکاتە کەسێك گەر

بیگوتایە ئەم قورئانە بۆ سەردەمێکی تایبەت هاتووە و تا ئەبەد نیە تا رادەیەك جێی خۆی بوو, بەلأم کە ئیسلام هەموو هەوڵەکان دەخاتە گەڕ بۆ ئازاد کردنی کۆیلە کە دەرئەنجامی ئەو جۆرە هەولأنە نەمانی کۆیلایەتییە ئەو کاتە چۆن پێی دەگوترێت بۆ تا ئەبەد نییە.

مەحوی دەڵێت:

چرایەك نووری بێچوونی مومیددی بێ دەبێ وابێ

چرایەك نووری قودرەت خۆشی کا، بۆ تا ئەبەد مانە

ئەو قسەیەی کە دەڵێ مادەم قورئان بە راشکاوی کۆیلایەتی حەرام نەکردووە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە نە ئەزەلی و نە ئەبەدییە وەکو ئەوە وایە ئەگەر رۆژێك لە رۆژان هەژار لە سەر زەوی نەما یان کەس نەما زەکاتی پێ بشێت بڵێن مادەم قورئان باسی هەژار و زەکات دەکات کەواتە بۆ ئەم سەردەمە ناشێت! ئیسلام ئایینی خوایە و ئەو بڕیاری داوە تا رۆژی قیامەت بڕ بکات و هەرچی کێشەیەکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتی هەیە لەو رۆژەی هاتۆتە سەر زەوی تا رۆژی قیامەت بتوانێت چارەسەری بکات, ئەگەر هەر کێشەیەك بنەبڕ بوو ئەوا مەبەستی ئیسلام بە دەست دەهێنرێت.

بۆ نموونە ئەگەر کوشتار و ستەم لە سەر زەوی نەمێنێت نابێت بڵێین مادەم کوشتار و ستەم نەماوە لە سەر زەوی کەواتە قورئان بۆ ئەم رۆژە ناشێت، چونکە باسی سزای بکوژان و ستەمکاران دەکات, لە کاتێکدا کە هەموومان دەزانین نەمانی ستەم و کوشتار مەبەستی ئیسلام دەستەبەر دەکات.

هەروەها بە نسبەت زینا و خیانەت و دووڕوویی و بەدڕەوشتی و هتد کە قورئان دژایەتیان دەکات ئەگەر نەمان ئەوا مەبەستەکانی قورئان بە دەست دێنن، هەڵوێستی ئیسلام لە کۆیلە خاڵێکی سپی و گەشە بە نێو چەوانی ئیسلامەوە نەك خاڵێکی رەش، چونکە لە کاتێکدا ئیسلام پرۆژەی ئازادکردنی کۆیلەو چاککردنی بارودۆخی ژیانیان و گێڕانەوەی ئەو مرۆڤایەتییەی کە لێیان سەندرابوویەوە هەڵکرد بە شەریعەت لە گۆماوی سەرلێشێواوی و نەفامیدا تا بینەقاقای چەقیبوو.

کەسێك گەر بە ئینصاف بێت و مەبەستی گەیشتنە حەقیقەت و راستی بێت دەبێ پێش هەموو شتێك بارودۆخی ئەوکاتە بزانێت کە ئیسلام تێیدا هات و ئەو سیستمە کۆمەڵایەتیی و ئایینییانەی زاڵ بوون بە سەر کۆمەڵگەدا لە مامەڵەکردن لەگەڵ چەمك و شتە جیا جیاکاندا، لەوانە ژن و کۆیلە و هەژار و هەتیوو کەسانی بێ سەرپەرشت و بێ پشت و پەنا بزانێت و ئینجا تەماشای رێنماییەکانی ئیسلام بکات لە هەوڵی لابردنی ئەو ستەمە کۆمەڵایەتییە لەسەریان و چاککردنی باری ژیانیان و نەهێشتنی ئەو جیاوازییە چینایەتییە و بە لایەنی کەمەوە نەهێشتنی ستەم بە هۆی جیاوازیی رەگەز و چینایەتی و هتد.

هەموو ئەو ئایەت و فەرمودانەی باسی ئازادکردنی کۆیلە و چاککردنی مامەڵە لەگەڵیاندا دەکات هەڵە و بوختانی ئەو نووسەرانە دەردەخات کە دەڵێن ئیسلام جیاوازیی چینایەتی قوڵتر دەکاتەوە و هەتا ئەبەد دەیهێڵێتەوە، بەڵکو وەك لەمەودوا دەیبینی ئیسلام دەیان رێگای گرتۆتەبەر بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و دەیان رێنمایی داناوە بۆ چاککردنی مامەڵە لەگەڵیاندا و بەرزکردنەوەی پلەوپایەیان لە کۆمەڵگەدا، تەنها ئەوەندەش بەسە کە بانگدەری پێغەمبەر ﷺ بیلالی حەبەشی بوو کە هەموو دەزانین قولەرەشێکی کۆیلە بوو، هەموو موسڵمانان بە بانگی ئەو روویان دەکردە مزگەوت و تا ئێستاش دوای هەموو بانگێك یاد دەکرێتەوە.

بەڵگەی لەمەش گەورەتر لەسەر هەوڵی ئیسلام بۆ نەهێشتنی جیاوازیی چینایەتی داخوازیی قوڕەیشییەکان بوو لە پێغەمبەر ﷺ کە ئەگەر دەیەوێت بڕوای پێ بێنن و شوێنی بکەون با ئەو کۆیلانە لە خۆی دوور بخاتەوە یان لانی کەم لە یەك مەجلیسدا کۆیان نەکاتەوە و پاشان فەرمانی خوا بە پێغەمبەر کە بە گوێیان نەکات و ئەو کۆیلانە لە خۆی دوور نەخاتەوە و پشتگوێیان نەخات ئیتر سەرانی قوڕەیشیش ئارەزووی خۆیانە باوەڕ دێنن یان نا: (**وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً * وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء...) (الكهف :28–29)**. ئەمانە و چەندین دەقی ترو

گەیشتنی کۆیلەکان لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بە بەرزترین پلەکانی زانستیو کۆمەلایەتیو سیاسیو سەربازی هەموو بەڵگەی ئاشکران لەسەر ئەوەی کە ئیسلام هەوڵی داوە ئەو جیاوازییە چینایەتییە نەهێڵێت، ئەمە راستییەکە لەوە روونترە کە پێویست بە سەلماندنی بکات، بەڵام دەڵێی چی بە نووسەرێکی نەزان یەوێت پێچەوانەی ئەم راستییانە بە ناو گەنجانی میللەتەکەیدا بڵاو بکاتەوەو خیانەت لە راستی بکاتو خەڵکی چەواشە بکات.

ئەگەر هەموو ئەو دەقو رێنماییانەش بخەینە ئەو لاوە، باوەش گرتنەوەی کۆیلەو کەنیزەکەکان بۆ ئیسلامو رازی بوون چەشتنی ئەو هەموو ئەشکەنجەو ئازارە لە پێناویدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەکێك لە پەیامو ئامانجەکانی ئیسلام رزگارکردنی مرۆڤ بوو لە کۆیلایەتی، ئەوەتا یەکەم شەهیدی ئیسلام کەنیزەکێك بوو بە ناوی (سومەییە)و هێمای خۆڕاگرییو خۆبەختکردن بوو بۆ ئیسلامو هەتا دونیا مابێت باس دەکرێت، لە پیاوانیشدا بیلالو عەمارو یاسری باوکیو سوهەیبو... هتد، ئەم راستییە کۆیلەکانو سەرانی قورەیشیش لە یەکەم رۆژەوە لێی گەیشتبوونو یەکێك لە رەخنەکانی سەرانی قورەیش لە پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو کە نەك هەر جیاوازی نێوان کۆیلەو سەرانی قورەیشی نەهێشتبوو، بەڵکو ئەو کۆیلانەی کە پێشتر بڕوایان هێنا بە پێغەمبەر ﷺو دوای کەوتن زۆر لە پێش ئەو گەورەپیاوانەوە بوون کە لە دواییدا موسڵمان بوون.

ئیسلام پێش ئەوە کۆیلەکان لە رووی کۆمەلایەتییەوە ئازاد بکا لە رووی دەروونیو کەسایەتییەوە ئازادی دەکردنو وای لێدەکردن کە بڕوایان بە خۆیان هەبێت، لە رووی کۆمەلایەتیشەوە ئەوە دەکەوتە سەر توانا و دەسەلاتو هەنگاوی کردەوەیی زۆری بۆ نرابوو کە لە مەودوا بە درێژتر باسی دەکەین...

ئیسلام ئایینێکە لەبەر واقیعییەتی خۆی پلە بە پلە خەڵکیی بەرز دەکردەوە، نموونەیەك لە سەر ئەم قسەیە، زەیدی کوڕی حاریسەیە کە کوڕێکی کۆیلە بوو پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد و پاشان پورزایەکی خۆی کە لە ناودارەکانی قورەیش بوو لێ مارەکرد و پاشانیش کردییە یەکەم سەرکردەی لەشکرێك کە جەعفەری ئامۆزایو خالیدی کوڕی وەلیدی تێدابوو.

## هەندێك لە حیکمەتەکانی جیاکردنەوەی پۆشاکی ئافرەتە ئازادەکان لە کەنیزەکەکان

لەوانەیە هەندێك بڵێن ئەگەر راستە ئیسلام دەیەوێت جیاوازیی چینایەتی نەهێڵێت بۆچی پۆشاکی ئافرەتە ئازادەکانی لە هی کەنیزەکەکان جیا کردۆتەوە؟. لە وەلامدا دەڵێین:

یەکەم: وەك ئاشکرایەو شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە جیاکردنەوەی جلوبەرگ هەمیشە بۆ سووکایەتیکردن بە چینێكو بەرزکردنەوەی چینێکی تر نییە بەڵکو لە هەر شوێنێدا رۆڵێك دەبینێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتیی جلوبەرگ پەیوەندییەکی راستەوخۆی هەیە بە باری کۆمەلایەتیو ئایینیو زانستیو نەتەوەو شوێنو تەمەنو جۆری ئیشوکاری مرۆڤو... هتد.

زۆر جار جلوبەرگیش جۆرە رەفتارێك فەرز دەکات بە سەر مرۆڤدا کە ئەگەر گونجاو نەبێت لەگەڵ باری کۆمەلایەتی ئەو کەسەدا جۆرە دووفاقییەك دروست دەکات لە کەسایەتیو هەڵسوکەوتیدا، بۆ نموونە گەر کارگوزاران قاتی چاکەتو پانتۆڵی گرانبەها لەبەر بکەنو بۆینباخی دوا مۆدێل ببەستنو پێلاوی تازەی بە نرخ لەپێ بکەن شیرازەی فەرمانگەکان دەشێوێت، نە بەڕێوەبەرو فەرمانبەرەکان روویان دێت تەکلیفی ئیشیان لێ بکەن، نە ئەوانەی سەردانی ئەو فەرمانگانە دەکەن بۆ ئیشوکاری خۆیان دەیانناسنەوە یا جورئەتی ئەوەیان دەبێ تەکلیفێکیان لێ بکەن، هەموو یەکسەر داوایان لێدەکەن کە جلی کارگوزاری لەبەر بکەن، هەروەها خزمەتکاران کە لە مالاندا خزمەت دەکەن گەر جلی گرانی دوا مۆدێل لەبەر بکەننە کەس لێیان قبوڵ دەکاتو نە خۆیان دەتوانن ئیشەکانیان بە رێکوپێکی بکەن.

کەواتە شتێکی ئاساییە کە جلوبەرگی کەنیزەك و ژنە ئازادەکان جیاواز بێت، کەنیزەکەکان کە ئیشوکاریان خزمەتکارییە دەبێ جیا بکرێنەوە لەوانەی کە خزمەتیان دەکەن، هەر کەسێکیش نکوڵی لەم شتە بکات ئەوا نکوڵی لە راستی دەکات.

دووەم: ئەگەر بهاتایە ئەو جیاکردنەوانە نەبووایە کەس بیری لەوە نەدەکردەوە هەوڵ بۆ ئازادکردنی خۆی بدات یان حەز بە ئازادی بکات، بۆ نموونە ئەگەر موچەو پلەوپایەی هەڵگری بڕوانامەیەکی دکتۆرا وەك موچەو ڕێزو پلەوپایەی کارگوزارێك بێت کەس ناچێت خۆی ماندوو بکاتو شەو بدات بەدەم ڕۆژەوەو ڕۆژ بدات بەدەم شەوەوەو بخوێنێتو خۆی لە خۆشییەکانی ژیان بێبەش بکات بۆ ئەوەی پلەی زانستیی بەرز بەدەست بهێنێت.

کاتێك کە دانیشگاکان ڕێگە نادەن بە هەڵگری بڕوانامەی لیسانس وانە بڵێتەوە لە کۆلێژەکاندا بە مەبەستی ئەوە نییە ستەم لە هەڵگرانی ئەو بڕوانامانە بکەن، بەڵکو بە مەبەستی ئەوەیە کە ئاستی زانکۆکانیان بەرز بکەنەوەو هانی خەڵکیی بدەن پلەی زانستیی بەرزتر بەدەست بێنن.

هەمان شت بە نیسبەت کۆیلەو کەنیزەکەوە ئەگەر بهاتایە هەموو جیاوازییەکان نەهێڵرانایە کەس بیری لە ئازادبوون نەدەکردەوەو هەوڵی بۆ نەدەدا.

ئەو جیاوازیکردنە ئەگەر لە کۆمەڵگەیەکدا بووایە ڕێگەی بە ڕزگاربوونی کۆیلەکان نەدایەو بە هەمیشەیی لە ژێر باری کۆیلایەتیدا بیهێشتنایەتەوە جێی خۆی بوو ڕەخنەی لێ بگیرێت، بەڵام لە ڕێبازێکدا کە هانی ڕزگارکردنی کۆیلە دەداتو ئاسانکاریی بۆ دەکات زۆر نارەوایە گەر ڕەخنەی لێبگیرێت، شایانی باسیشە ئیسلام لە هەموو ئاینو ڕێبازێکی تر زیاتر هانی چاککردنی ڕەوشی کۆیلایەتی داوە وەك پێشتر سەلماندمان.

سێیەم: ئەگەر حیجابی کەنیزەکەکان لە هی ژنە ئازادەکان زیاتر بووایە ئەو کاتە هەر ئەوانەی کە ئێستا ئەم ڕەخنانە دەگرن ڕەخنەی زیاتریان لە ئیسلام دەگرتو ئەوەیان دەکردە بەڵگەیەك لەسەر چەوساندنەوەی کۆیلەکانو ئەو جلەیان بە مۆرێك لە قەڵەم دەدا کە دەدرا لە کۆیلە بۆ ئەوەی چیتر نەتوانێت ئازاد بێتو ڕەخنەی ئەوەشیان لێدەگرت کە گوایە ئیسلام ڕەچاوی بارودۆخی کۆیلەکانی نەکردووەو شتێکی بەسەردا فەرز کردوون کە لە توانایاندا نییە (لەبەر ئەوەی کە ئازاد نین لە بڕیارياندا)و تووشی کێشەی کردوونو تۆمەتباریان دەکرد بەوەی کە بڕیارەکانی خۆی تەنها بەسەر چینە لاوازەکاندا دەسەپێنێت.

چوارەم: ئەگەر حیجابی کەنیزەکەکان زیاتر بووایە ئەو کاتە نەیارانی ئیسلام دەیانگوت حیجاب جلی کۆیلایەتییەو بۆ کەسانی ئازاد ناشێتو هەر کەسێك لەبەری بکردایە لەم سەردەمەدا گاڵتەیان پێدەکردو تاوانباریان دەکرد بەوەی کە دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆیلایەتی.

ئێستا کە حیجاب جلی ئازادەکان بووە، ئەوانەی لەبەری دەکەن تاوانبار دەکرێن بەوەی کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی تاریکی، ئەی ئەگەر جلی کۆیلەکان بووایە چییان دەوت؟!

پێنجەم: کاتێك کۆیلایەتی نەدەما وەك ئەمڕۆ ئەو کاتە دەیانوت حیجاب بۆ سەردەمی کۆیلایەتی بووەو بۆ ئافرەتە کۆیلەکان بووە، مادەم ئەمڕۆ کۆیلایەتی نەماوە کەواتە حیجابیش فەرز نییەو سەردەمی بەسەرچووە.

نووسەری سێکس و شەرع یەکێکە لە وانەی کە دەڵێت بە نەمانی کۆیلایەتی حوکمی ئەم ئایەتە بەسەرچووە لەگەڵ ئەوەی کە ئایەتەکە باسی کەنیزەكو ئافرەتی ئازادی تێدا نییەو حوکمەکەی بۆ کاتی چوونە دەرەوەیەو بۆ کاتێکە کە ئافرەت مەترسیی ئەوەی هەبێت کە کەسانی بەدڕەوشت ڕێگەیان پێبگرن، ئەمە لە کاتێکدا کە ئایەتەکە بە ڕاشکاوی باسی ئەوە دەکات کە بناسرێنەوە بۆ ئەوەی ئازار نەدرێن، واتە مەبەستی ئایەتەکە ئازارنەدانی ئافرەتە بڕوادارەکانە نەك جیاکردنەوەیان لە کەنیزەکەکان.

ئەگەر ئایەتەکە بیوتایە خۆتان داپۆشن بۆ ئەوەی جیا بکرێنەوە لە کەنیزەکەکان و باسی ئازاردانی تێدا نەبووایە دەمانوت بەڵێ مەبەستی ئایەتەکە جیاکردنەوەی ئازادەکانە لە کەنیزەکەکان و ئەو کاتە نووسەر یا هەر کەسێکی تر بۆی هەبوو بڵێت مادەم ئێستا کەنیزەك نەماوە کەواتە حیجاب بۆ ئافرەت پێویست نییەو ئەوە ئایەتێکی کاتیی بوو بۆ سەردەمێکی دیاریکراو، بەڵام کە دەڵێت خۆتان داپۆشن بۆ ئەوەی بناسرێن و بزانرێت ئێوە کەسانی بڕوادارن و داوێنپیسیی ناکەن ئەو کاتە ئەگەری ئازاردانتان لە لایەن گەنج و کەسانی بەدڕەوشتەوە کەمترە دەزانین کە ئەم ئایەتە کاتی نییە و بۆ هەموو سەردەمێکە، چونکە لە هەموو کاتێك و لە هەموو سەردەمێك و لە هەموو شوێنێکدا کەسانێك هەن کە بە دوای حەرامدا بگەڕێن و چاو لە ناموسی خەڵکی بکەن.

## کۆیلایەتی لە نێوان ئیسلام و ڕێبازەکانی تردا

ئیسلام وەکو عباس محمود العقاد دەڵێت: **"شرع العتق ولم یشرع الرق"**. واتە یاسای بۆ ئازادکردنی کۆیلەدا هێنا نەك بۆ بە کۆیلەکردن, تەشریعاتی بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و چاك کردنی بارودۆخی ژیانیان هێنا نەك بۆ بە کۆیلەکردنی ئازادەکان.

لەبەر گرنگی قسەکانی عەقاد پێم خۆشە هەندێکی وەرگێرمە سەر کوردی و لێرەدا بینووسم، دەڵێت: "ئیسلام تەشریعی بۆ ئازاد کردنی کۆیلە داناوە نەك بۆ کۆیلە کردنی ئازادەکان، چونکە کۆیلایەتی پێش ئیسلام لە هەموو یاسا دەستکرد و ئایینییەکاندا بە هەموو شێوەکانیەوە ڕێگای پێ درابوو, کۆیلەی دیلی شەڕ, کۆیلەی هەڵکوتینە سەر یەکتر لە نێوان هۆزەکاندا، کۆیلەی کڕین و فرۆشتن و کۆیلەی قەرز و قەرزدانەوەو هتد.

ئایینی یەهودیش ڕێگەی پێدەدا, کە مەسیحیەتیش هات کۆیلایەتی ڕێگەپێدراو بوو و حەرامی نەکرد, تەنانەت نەیڕوانییە حەرام کردنی لە داهاتوودا، پۆڵس فەرمانی بە کۆیلەکان دەدا کە چۆن بە گوێی مەسیح دەکەن ئاوها بە گوێی ئاغاکانیان بکەن و لە نامەکەیدا بۆ خەڵکی ئەفسیس دەڵێت: **"أیها العبید ! اطیعوا سادتکم حسب الجسد بخوف و رعدة في کل بساطة قلوبکم کما للمسیح, و لا بخدمة العین لمن یرضي الناس بل کعبید للمسیح عاملین مشیئة الله من القلب خادمین بنیة صالحة کما للرب لیس للناس! عالمین أن مهما عمل کل واحد من الخیر فذلك ینا له من الرب عبدا کان أم حرا"**.

بوترسیش وەسیەتێکی لەم شێوەیەی هەیە و باوکانی کەنیسەش هەموویان ئەو گوێڕایەڵییەی کۆیلە بۆ ئاغاکانیان فەرز کردووە، چونکە کۆیلایەتی سڕەرەوە (کفارە)یە بۆ گوناهەکانی مرۆڤ کۆیلەکان ئەنجامی دەدەن.

فەیلەسوفی قدیس (تۆمای ئەکوینی) ڕاو دیدی فەلسەفەی زیاد کرد بۆ ڕای سەرۆکە ئایینیەکان و هیچ ڕێگیرییەکی لە کۆیلایەتی نەکرد، بەڵکو بە شتێکی باشی زانی, چونکە لە سەر بۆچوونی ئەرستۆی مامۆستای, کۆیلایەتی حاڵەتێکە لەو حاڵەتە سروشتیانەی هەندێك خەڵکیی لەسەر بەدیهێنراون و پێچەوانەی ئاین نییە گەر مرۆڤ ڕازیی بێت بە کەمترین بەش لە دونیا.

ڕێبازی ئەرستۆش لە کۆیلایەتیدا ئەوەیە کە بەشێك لە خەڵکی بۆ کۆیلایەتی بەدیهێنراون، چونکە ئەوان وەکو ئەو ئامێرانە ئیش دەکەن کە ئازادە خاوەن هزرو ئیرادەکان بەکاریان دێنن. ئەوانە ئامێری زیندوون لە ئیشکردندا دەخرێنە پاڵ ئامێرە بێ گیانەکان.

ئەفلاتونیش کە مامۆستای ئەرستۆ بوو لەسەر ئەو قەناعەتە بوو کە لە کۆمارییە بێوێنەکەیدا دەبێ کۆیلەکان مافی (هاووڵاتێتی)یان نەبێت و زۆریان لێبکرێت بۆ ملکەچی ئاغا ئازادەکانیان و هەر کەسێك سنووری بەرامبەر ئاغاکەی بەزاند دەبێ دەوڵەت بیداتە دەستی ئاغاکەی بۆ ئەوەی سزای بدات.

شارستانییەتی یۆنانیش هەروەکو چۆن کۆیلایەتی تایبەتی شەرعاندبوو هەروەهال کۆیلایەتی گشتیشی داهێنابوو، ئەوە بوو پەیکەرەکان لە ئاسیای بچووك کۆیلەی تایبەتییان بۆ دابین کرا بوو و ئیشیان خزمەت کردنو پاسەوانی بوو، مافی پەرستش و ئەنجامدانی کارە ئایینیەکانیشیان نەبوو.

بەو شێوەیە سەدە دوای سەدە ئەم سیستمە وەکو خۆی مابوویەوە لە نێوان گەلانی هەر سێ کیشوەرەکەدا (ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپا)، زیاتر لە ناو ئەو کۆمەڵگایانەدا بلاو دەبوویەوە کە شارستانی بوونو ئەو کۆچەرییانەی لە سەر شەڕو لەوەڕگا دەژیان، بەڵام لە ناو ئەو کۆمەڵگە کشاوەرزییانەی لە کەناری روبارە گەورەکان وەکو شیوەکانی روباری نیلو شیوەکانی رووبارە هیندییەکان کەمتر بوو، بەڵام ئەوە هەیە کە لە ناو گەلانی هیندستاندا سیستمی چینایەتی بەکار دەهێنرا کە تێیدا چینێك تایبەت بوو بۆ بێگاری کردن **(الطبقة المسخرة أو المنبوذة)** کە لە رووی پلەوپایەی کۆمەڵایەتی و مافی مرۆڤایەتییەوە لە ریزی کۆیلەدا بوون.

ئەمە حاڵی جیهان بوو لە کاتی سەرهەڵدانی بانگەوزای ئیسلامیدا، کەسێك نەبوو رەخنە لەم حاڵەتە بگرێت یان هەست بکات بە پێویستی ئەنجامدانی گۆڕانکاریی لەم سیستمەدا، چ ئەوانەی کۆیلەیان تێدا زۆر بوو یان ئەوانەی کۆیلەیان تێدا کەم بوو، جا لەو وڵاتانەی کۆیلەیان تێدا زۆر بوو، بارودۆخی کۆمەڵایەتیو ئابوری وابەستە بوو بە ئیشی کۆیلەکانەوە لە ماڵانو کێڵگەکانو شوێنە گشتییەکاندا و گۆڕینی ئەم بارودۆخە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات، گەر بە خەیاڵی کەسێکیشدا هاتبیت گۆڕینی لە ماوەی شەو و رۆژێکدا لە توانای کەسدا نەبوو، لەو وڵاتانەی کە کۆیلەی تێدا کەم بوو کێشەیەکی گرنگو بەپەلە نەبوو تاوی کێشەی کۆیلایەتی بێتو وا لە لایەنە پەیوەندیدارەکان بکات بیر لە گۆڕینی یان راستکردنەوەی بکەنەوە.

ژمارەی کۆیلەکان لە نیوەدوورگەی عەرەبیدا زۆر کەم بوو لە چاو گەلە شارستانیەتەکاندا بە رادەیەك کە ژمارەیان لە ناو موسڵمانە پێشینەکاندا ئەوەندە کەم بوو بە پەنجەی دەستەکان دەژمێردرا، بە شێوەیەك کە شتێکی سەیر نەدەبوو ئەگەر ئەم ئایینە تازەیە ئاوڕی لێنەدایەتەوەو وەکو خۆی بیهێشتایەتەوە.

لەگەڵ ئەوەی کۆیلایەتی لەو سەردەمەداو بەو ژمارە کەمە لە نیوە دوورگەی عەرەبدا حاڵەتێك نەبوو جێی سەرنجی کەس بێت یان وای کردبێت کەس بیر لە گۆڕینی یان راستکردنەوەی بکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام بەجێی نەهێشت و پشتگوێی نەخستو دوای نەخست لەبەر کەمی و بێبایەخییەکەی، بەڵکو هەروەکو شتە کۆمەڵایەتیو ئەخلاقیەکانی تر دەستی کرد بە چاك کردنی ئەوەی چاککردن هەڵدەگرێتو زەمینە خۆشکردن بۆ چاکسازی تر لەگەڵ ئەوانەی کاتیان نەهاتووە.

ئێمە حەز دەکەین ئەوەی ئیسلام کردی لەم مەسەلەیدا پێش چواردە سەدە لە چەند وشەیەکدا کورت بکەینەوە:

ئیسلام هەموو کۆیلایەتییەکی حەرام کرد تەنها ئەوەی لێ هێشتەوە لە ئەمرۆ رێگەی پێدراوە، مرۆڤایەتی لەو رۆژەوە دوای ئەوەی ئیسلام هێنای شتێکی تازەی نەهێناوە لەم بوارەدا.

ئەوەی ئیسلام هێشتییەوە لە کۆیلایەتی ئەوەیە کە گەلە شارستانییەکان لە سەری رێککەوتن لە قەدەغەکردنی کۆیلایەتی لە سەدەی هەژدەیەمەوە تا ئەمرۆ، چونکە ئەو نەتەوانەی رێککەوتن لەسەر نەهێشتنی کۆیلایەتی رێگە بە بەدیل گرتن و هێشتنەوەی خەڵکی لە دیلیدا تا رێککەوتننامەی گۆڕینەوەی دیل یان قەرەبوودانەوەیان دەبەستریٚ.

ئەمەش هەموو ئەوە بوو کە ئیسلام لە کۆیلایەتی یان بە دەستەواژەیەکی راستتر دیلێتی، هێشتییەوە.

پاشان عەقاد دوای ئەوەی باسی ئەو رێگایانە دەکات کە قورئان دایناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلە دەڵێت: "کەواتە ئیسلام ئازادکردنی کۆیلەی داهێنا، ئەمما سیستمی کۆیلایەتی ئەوە پێش ئیسلام داهێنراوە، ئیسلام هەموو رێگاکانی قەدەغە کردو تەنها ئەوەی لێ هێشتەوە کە ئەمرۆ رێگەی پێدراوە لە سیستمی دیلکردنی شەڕکەراندا و بەکارهێنانیانو کارپێکردنیان لە لایەن ئەوانەی بە دیلیان دەگرن، لەگەڵ ئەوەشدا پێش بەدیهاتنی ئەو یاسا نێودەوڵەتییانەی کە ئازادکردنی دیلەکان دەخاتە ئەستۆی دەوڵەتەکانیانەوە ئیسلام ئەو کارەی کردووەو لەگەڵیشیدا هەوڵی خستۆتە گەڕ بۆ ئەوەی تاکەکانی کۆمەڵ لە لایەن خۆیانەوە هەستن بە ئازادکردنی ئەو کۆیلانەی کە لەبەر دەستیاندان.

بەم کارەی ئیسلام ناگوترێ کەمە، یان زۆرە، بەڵکو دەگوترێ ئەوە تاقە شتێك بوو کە دەتوانرا بکرێت لەبەرەنگاربوونەوەی سستمی کۆیلایەتی و هەموو نەتەوەکانی دونیا نەیانتوانیوە لەوە باشتر بکەن تا ئێستا.

پاشان دەڵێت: ڕێنماییەکانی ئیسلام دەربارەی کۆیلایەتی پێشێلکراوە، لە نێوان پێشێلکەراندا زۆرێك لە موسڵمانان بوون، بەڵام هێشتا لەگەڵ ئەو سەرپێچیە گەورەیەشدا لە نرخی ئەوە کەم ناکاتەوە لە جیاوازیی نێوان ڕەفتاری موسڵمانانو شوێنکەوتووی ئایینەکانی تر بەرامبەر بە کۆیلەکان.

شایانی باسە کاتێك عەقاد ئەمەی نووسیوە هێشتا بەندیخانەی گوانتانامۆ دروست نەکرابوو جا ئەگەر ئەم بەندیخانەیەی ببیستایە ئاخۆ چی دەنووسی!

بەندیخانەیەك کە ئێستا لەبەر هێزو دەسەڵاتی ئەمریکا زۆر کەس ناوێرێت قسەی لەسەر بکات ڕۆژێك دێت دەبێتە خاڵێکی زۆر ڕەش بە نێوچاوانی شارستانی ڕۆژئاواوە.

کۆمەڵێك شەرکەر خۆیان داوەتە دەستەوە، کەسیان بەشدار نەبووە لە ڕوخاندنی دوو باڵەخانە بازرگانیەکەی ئەمریکادا، مامەڵەیەك دەکرێن تاکو ئێستا وێنەی نەبووە لە وەحشیگەرێتیو سوکایەتی کردن بە مرۆڤایەتی مرۆڤ، بە ڕادەیەك کە مرۆڤ تەزوو بە لەشیدا دێت کە دەیبیستێت، بارودۆخێك کە هیچ کۆیلەیەك لە مێژوودا نەیبینیوەو بەسەریدا نەهاتووە.

بازرگانی شمەكو کۆیلەو کەنیزەك تایبەت نەبووە بە جیهانی ئیسلامییەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەم دیاردەیە لە جیهانی ئیسلامیدا زۆر زۆر کەمتر بووە لە شوێنەکانی تری جیهان، ئەویش لە ئەنجامی ئەو ڕێنماییانەی کە ئیسلام هێناویەتی دەربارەی کۆیلایەتیو ئەو ڕێگایانەی گرتوویەتییە بەر بۆ نەهێشتنی کۆیلایەتی، گەورەترین بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە ئەوەیە کە لە هەموو کتێبە شەرعییەکاندا سەرباسێك هەیە بە ناوی (عتق) واتە ئازادکردنی کۆیلەو بەڵام سەرباسێك نییە بە ناوی (الرق) واتە بە کۆیلە کردن.

ئەمە لە ڕووی تیۆرییەوە، لە ڕوی واقیعیشەوە ئەوە ئەم وڵاتانەی دەوروپشت و کوردستانی خۆمان کە تا ئەم دواییەش لە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا بووە (بەو هەموو کەموکوڕیەشەوە) چەند سەدەیەکیشە کۆیلایەتی تێدا نەماوە، پێش ئەوەی بە بڕیارێکی نێونەتەوەیی کۆیلایەتی قەدەغە بکرێت بە چەندین سەدە کۆیلایەتی لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامیدا نەماوە.

ئیسلام بە درێژایی مێژووی خۆی کارێکی بەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەدیوە کە هەڵمەتی تایبەتی بەرپا بکات بۆ بە کۆیلەکردنی خەڵك وەکو ئەوەی ئەوروپییەکان کردویانە، گەر دەشتەوێت چۆنێتی گەیشتنی ئەو ڕەشپێستانە بۆ ئەمەریکا بزانیت و بزانی ئەو هەموو ڕەشپێستەی لە ئەمەریکای باکورو ئەوروپان لە کوێوە هاتوون کتێبی ڕەگوریشە **(الجذور)**ی ئەلیکس هیلی بخوێنەرەوە.

ئەگەر بازرگانی بە کۆیلە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بەو شێوەیە بوایە یان هەر هەبوایە ئێستا دەیان ڕەشپێست لە وڵاتی خۆمانو لە تورکیا دەبینرا کە تا نزیکەی شەش سەد سەدە حوکمڕانی جیهانی ئیسلامی دەکرد وەکو ئەوەی لە ڕۆژئاوادا دەبینرێ، ئەوەتا تەنها لەو دوو سێ سەدەی ڕابردوودا ڕۆژئاواییەکان ملیۆنەها خەڵکیان لە ئەفەریقاوە بە زۆر بردووە بۆ ئەمەریکاو ئەوروپاو لەوێ بازرگانییان پێوە کردوون.

خاڵێکی تر کە پێویستە لەسەر کۆیلایەتی بیڵێم لێرەدا ئەوەیە کە دوژمنانی ئیسلام بەو شێوەیە ئەم مەسەلەیەیان نەوروژاندووە، چونکە دەزانن هەڵوێستی ئیسلام لە هەموو ئایینەکانو ڕێبازو شارستانیەتەکان باشترەو ئەوەی ئیسلام کردوویەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کۆیلایەتی هیچ ئایینو ڕێبازو دەوڵەتو شارسیتانێتیو تەنانەت فەیلەسوفەکانیش نەیانکردووە.

بەشێك لە ماڵی زەکات تەرخان کراوە بۆ ڕزگارکردنی دیلو کۆیلە **(وفي الرقاب)** ئەمە وەکو مەسئولیەتی دەوڵەت، وەکو مەسئولیەتی تاکەکانیش ئیسلام ئیکتیفای بە هاندانی موسڵمانان بۆ ئازادکردنی کۆیلە نەکردووە بەڵکو کردویەتیە

سەرەوەی زۆرێك لەو گوناهانەی كە رۆژانە خەڵكیی دەیكەن، لەوانە كوشتنی بە هەڵەو سوێند شكاندن و رۆژوو شكاندن لە رەمەزانداو هتد.

## ئیسلامو بەكارهێنانی هێز بۆ گەیشتنە ئامانجەكان

لێرەدا حاڵەتێك هەیە زۆر لە حاڵەتی هەڵوێستی ئیسلام دەچێ لە كۆیلایەتی، ئەویش باوەڕی ئیسلامە بە هێز بۆ گەیشتنە ئامانجەكان بە تایبەت دەسەڵات یان هەر ئامانجێكی تر بە شێوەیەكی گشتی، گومانی تێدا نییە كە ئیسلام زۆر باسی جیهاد دەكاتو هێز وەكو هۆیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانی شتێكی دان پێدانراوە، بەڵام ئایا جیهادو بەكارهێنانی هێز خۆی لە خۆیدا مەبەستو ئامانجە یان هۆكارو وەسیلەیە.

یا بە شێوەیەكی تر بپرسین: ئایا بە لای ئیسلامەوە هێز تاقە رێگەیە بۆ گەیشتن بە مەبەست یان باشترین رێگەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر پێویستە بۆ ئەو لایەنە ئیسلامییانەی كە دەیانوێت لە رێگەی دیموكراسییەوە بگەنە ئامانجو رێگەی ئاشتی بگرنە بەر بۆ گەیشتنە مەبەست، چونكە ناكرێت ئەم رێگەیە هەڵبژێرن پێش ئەوەی هەڵوێستی ئیسلام یەكلایی نەكەنەوە، ئەمەش وای كردووە لە بەرامبەرەكان باوەڕیان پێ نەكەنو متمانەیان پێ نەكەن، دەبێ ئیسلامییەكان لەسەر ئەم مەسەلەیە توێژینەوەو لێكۆڵینەوەی ورد بكەن پێش ئەوەی بەشداریی هیچ پرۆسەیەكی سیاسی بكەن.

ئەوەندەی من لێی تێگەیشتووم لە سەرجەم ئایەتو فەرمودەو كردارەكانی پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) ئەوەیە كە هێز یان جیهاد یان قیتال گرنگ نییە چ وشەیەك بەكاربێنی باشترینی رێگاكان یا هۆیەكان نییە بە لای ئیسلامەوە بۆ گەیشتن بە مەبەست، تا رێگەی عەقڵو دانوستانو ئاشتی وەستابێت پەنای نەبردۆتە بەر هێز بۆ گەیشتنە ئامانج، ئەوەتا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) كە سەرۆكی دەوڵەت بوو هیچ داواكارییەكی قورەیشییەكانی رەت نەكردۆتەوە بۆ ئاشتی، ئەگەر ئەوان هەنگاوێك بەرەوپێش هاتبن ئەم دوو هەنگاو بەرەوپێش چووە، خواش دەفەرموویت: **"وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ.."**. (الأنفال: **61**). پەیماننامەی ئاشتی حودەیبییەش بەڵگەیەكە لە سەر ئەم قسەیە، دەبینی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەدەستهێنانی ئاشتی ئامادەبوو دەست لە زۆر شت هەڵبگرێت بە رادەیەك كە هەموو یارانی سەرسام بوون لەو رێككەوتنامەیەو بە جۆرێك لە دەست هەڵگرتن و دابەزین (تنازل)ی بزانن.

هەروەها پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرموویت: **"دعیت فی الجاهلیه الی حلف لودعیت فی الإسلام الی مثله لأجبت"**. واتە: لە سەردەمی جاهیلیدا بانگهێشت كرام بۆ رێككەوتننامەیەك گەر لە ئیسلامدا بانگهێشت بكرێم بۆ شتێكی لەو جۆرە قبوڵی دەكەمو دەچم بەدەمیەوە. مەبەستی لەو رێككەوتننامەیەش (حلف **الفضول**)بوو كە لە ماڵی (عبدالله بن جدعان)دا بەسترا بۆ نەهێشتنی ستەم و گێڕانەوەی مافی ستەم لێكراوان.

هەروەها هێشتنەوەی ئەو رێككەوتننامەیەی لە نێوان عەرەبدا هەبوو دەربارەی ئەو مانگانەو ئەو شوێنانەی كە كوشتاری تێدا قەدەغە بوو (أشهر الحرم) و (بیت الحرام: كعبە) وەكو خۆیو قەدەغەكردنی دەستكاری كردنیانو گۆڕانكاری تێدا كردنیان لە لایەن ئەمو ئەوەوە، هەندێكن لەو بەڵگانەی كە دەیسەلمێنن ئیسلام هۆكاری ئاشتیو دانوستانو گفتوگۆو رێككەوتننامەی ئاشتیانەی پێ لە پێشترە لە بەكارهێنانی هێز تەنانەت ئەگەر خۆشی بەهێزتر بوو بێت.

سەر رۆشنایی ئەم راستیانە دەڵێین: ئایا ئەگەر خەڵكیی رێككەون لە نێوان خۆیاندا لە رێگای ئاشتیانەوە كێشەكانیان چارەسەر بكەن یان هەوڵ بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانیان بدەن یان تەنانەت بۆ گەیشتنە دەسەڵات, ئیسلام ئەمەی پێ قەبوڵ و پەسەندە یان نا؟ من لەو باوەڕەدام گەر مرۆڤایەتی بگەنە رێككەوتنامەیەك لە نێوان خۆیاندا بۆ راماڵینی چەك و نەهێشتنی توندوتیژی لە نێوان خۆیانداو گرتنی رێورەسمی ئاشتیانە بۆ گەیشتنە ئامانجەكانیان ئیسلام پێشوازیی لێدەكات و پەسندی دەكات، چونكە ئەمە لەگەڵ رۆحی ئیسلامدا زیاتر دەگونجێت و مەبەستەكانی بە دەست دێنێت.

هەرچەند ئەمە لە خەیاڵەوە نزیکترە تا واقیعو دەتوانی بڵێی مەحاڵە، بەهەرحاڵ ئەم توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی زیاتر لیَ دەدوێت.

## فرەژنی وەك ئەزموونێکی ئیسلامیی

لە سەرەتای کتێبەکەماندا بە بەڵگەوە باسی ئەو گۆڕانکارییانەمان کرد کە ئیسلام کردویەتی لە تێڕوانین بۆ ئافرەت و مامەڵەکردن لەگەڵیدا, بۆیە بەپێویستی نازانم لێرەدا دووبارەی بکەمەوەو هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەوە دەڵێت با بەڵگە بێنێتەوە.

ئەوانەی رەخنە لە فرەژنی دەگرن لە ئیسلامدا یان بە شێوەیەکی گشتی رەخنە لە شەریعەتی ئیسلام دەگرن کەسانێکن یان هەر باوەڕیان بەخوا نییە، یان باوەڕیان بە بوونی هەیە، بەڵام خواناسێکی راستەقینە نین و نازانن کە خوا زاتێکی زاناو داناو بە دەسەڵات و رەوا و بە بەزەییە.. هتد، یان باوەڕیان بەوە نییە کە ئیسلام ئایینی خوایە، باوەڕیشیان بە رۆژی دوایی نییە، ئەگینا هەر کەسێك باوەڕی بە هەرکام لەو شتانەی سەرەوە هەبێت رەخنە لە هیچ شتێکی ئیسلام ناگرێت.

ئەمە وەکو بنەمایەك بۆ باسەکەمان پێویستە بە تایبەت خواناسی و باوەڕبوون بە رۆژی دوایی و بەوەی کە ئیسلام ئایینی خوایە، چونکە ئیسلام هەر تەشریعێکی دانابێت یا هەر رێنماییەکی مرۆڤی کردبێت تەنها ئەم دونیایەی رەچاو نەکردووە، بەڵکو بەپلەی یەکەم رۆژی دوایی رەچاو کردووە کە ئاییندەی مرۆڤ لەوێدایە و ژیانی راستەقینەی لەوێ دەست پێدەکات، چونکە بیَ کۆتاییە (**وان الدارة الاخرة لهي الحيوان**) واتە: رۆژی دوایی یان ژیانی ئاخیرەت ژیانی راستەقینەیە، ئەم دونیایە کاتییە و بە کێڵگەی ئەو دونیایەی تر دادەنرێت (**الدنيا مزرعة الاخرة**) نرخی ئەم دونیایە لە چاو ئەو دونیایەدا باڵە مێشولەیەك نیە (**لو كانت الدنيا تعدل عندالله جناح بعوضة ما سقى فيها كافرا شربة ماء**). واتە گەر دونیا لای خوا باڵە مێشولەیەکی بهێنایە قومە ئاوێکی نەدەدایە بیَ بڕواکان، خواش دەفەرموویت: **"وابتغ فيما آتاك الله الدار الاخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا"**. **(القصص)** واتە لەوەی کە خوا پێی داوی ژیانی ئەو دونیا مسۆگەر بکە و ئەم دونیایەشت لە بیر نەچێت واتە ژیانی ئەم دونیایە ئەوەندە کەم و بیَ ئەرزشە لە چاو ژیانی دوارۆژدا کە ئەگەر مرۆڤ بە راستیی دەرکی بکات لەوانەیە ئەم دونیایە پشت گویَ بخات و فەرامۆشی بکات بۆیە خوا دەفەرموویت لە بیری مەکە.

پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموویت لەم دونیایەدا وەکو رێبوارێکین، صەیدی هەورامیش شعرێکی هەیە بە ناوی (یاران دێوانە)، تێیدا ئەم دونیایە دەشوبهێنیَ بە پردێك و ئەو کەسانەی خانوو لە سەر ئەم پردە دروست دەکەن و پاشان دڵیشی پیَ خۆش دەکەن بە دێوانە لە قەڵەمیان دەداو سەری سوورِ دەمێنێت لەوانەی کە لە سەر پرد خانوو دروست دەکەن و دڵی پیَ خۆش دەکەن.

ژیانی دونیا لە چاو ژیانی دوا رۆژدا لە ژیانی ناو ئەو کەشتییە کەمتر و بیَ ئەرزشترە کە پەناهەندەکانی رۆژهەڵات پێی دەپەڕنەوە بۆ رۆژئاوا.

هەر وەکو چۆن ئەو رێبوارانەی ناو کەشتییە کە دان بە خۆیاندا دەگرن و هەر چۆنێك بووە ئەو چەند رۆژە دەگوزەرێنن بە هیوای ئەوەی بگەنە ئەورووپاو لە ویَ کۆڵ و بار دابنێن, ژیانی دونیاش وەکو ژیانی ئەو کەشتییەیە و کەمتریش، هەرچۆنێك بێت دەبێت بگوزەرێت و مرۆڤ دەبیَ هەموو سەختی و نارەحەتییەکی قبوڵ بکات بۆ ئەوەی بە سەلامەتی بگاتە ئەو دونیا کە ژیانی راستەقینە دەست پێدەکات.

ئەمەیە تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژیانی ئەم دونیایە و ژیانی رۆژی دوایی, بۆیە هەرچی تەشریعێکی داناوە بۆ مرۆڤ بە پلەی یەکەم بەرژەوەندیی رۆژی دوایی لەبەرچاو گرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو تەشریعەکانی بەرژەوەندیی دونیاییشی تێدایە بۆ مرۆڤ و ژیانی ئەم دونیایەی بە جۆرێك بۆ رێك دەخات کە لێرەش بەختەوەر بێت و مافەکانی خۆی بە دەست بێنێت و ژیانێکی ئاسودە بژیت.

دەبوایە مرۆڤتەنها لەبەر بەدەستهێنانی بەختەوەریی دوا رۆژ بوایە دوای ئیسلام بکەوتایە، تەنانەت ئەگەر ئەم ژیانەشی وەکو دۆزەخ بوایە، چونکە کاتییە و زۆر کورتە لە چاو رۆژی دواییداو یەك لە سەر ملیۆنیش نییە لە رووی چەندێتی و چۆنێتییەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خوا مرۆڤ دەناسێ و دەزانێ کە کورت بین و کەم هیمەتە شەریعەتەکەی بە جۆرێك بۆ ناردووە کە ژیانی ئەم دونیایەشی رێك بخات و بەختەوەری بکات ئەوەتا قورئان دەفەرموویت: **(وَلَوْلَا أَن يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً لَجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِالرَّحْمَنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفاً مِّن فَضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ * وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَاباً وَسُرُراً عَلَيْهَا يَتَّكِؤُونَ * وَزُخْرُفاً وَإِن كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ) (الزخرف : 33 – 35)** واتە: گەر لەبەرئەوە نەبوایە کە هەموو خەڵکیی وەکو یەك بێباوەڕ دەبوون ئەوانەی باوەڕیان بە خوا نەدەهێنا لەم دنیایەدا خانووەکانمان وا بۆ دروست دەکردن کە سەقف و قادرمەکانیان زیو بوایەو چەند نهۆمبوایەو دەرگاکانیان هەموو بە زەخرەفەی جوان رازێنرابایەوە, ئینجا ئەمانە هەمووی رابواردنی ئەم دونیایەنو رۆژی دوایی لای خوا بۆ پارێزکارانە، واتە ئەگەر وامان بکردایە بۆ بێباوەڕەکان لەبەر خۆشی ئەم دونیایە هەموو خەڵکیی بێباوەڕ دەبوون.

ئەوەتا خوا ئەوەشی نەکردووە خەڵکی پشتیان لە رۆژی دوایی کردووەو روویان لەم دونیایە ناوە، ئەی ئەگەر وای بکردایە چیان دەکرد، سوپاس بۆ ئەو خوایە کە ئەمەی نەکردووە.

وەکو وتمان لە روانگەی ئیسلامەوە ئەم دونیایە کاتییەو هەر چۆنێك بووە مرۆڤ دەیگوزەرێنێ، بەڵام ژیانی دوارۆژ نەبڕاوە و بێکۆتاییە و تەواو بوونی بۆ نییە, کەواتە مرۆڤ گەر لەبەردەم دوو حاڵەتدا بێت، یەکێکیان زیان بەم دونیایەی بگەیەنێت و قازانج بە رۆژی دوایی و ئەوی تریان قازانجی ئەم دونیایەو زیانی رۆژی دوایی تێدابێت بێ سێ و دوو دەبێ یەکەمیان هەڵبژێرێت، ئەم بنەمایە کلیلی چارەسەر کردنی ئەم کێشەیەیە. رەنگە بپرسی چۆن؟ ئێستا پێت دەڵێم:

وەکو ئاشکرایە لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ و لە ئاییندەشدا بە هەمیشەیی ژمارەی ژنان زیاتر بووە لە پیاوان ئەویش لەبەر چەندین هۆ گرنگترینیان شەڕە کە بە زۆریی پیاوانی تێدا دەکوژرێت تەنها لە شەڕی جیهانی یەکەم و دووەمدا زیاد لە (50) ملیۆن کەس کوژراون کە زۆربەی هەرە زۆریان پیاو بوون) بە رادەیەك کە کۆمەڵگەی وا بووە رێژەی ئافرەت بۆ پیاو گەیشتۆتە چوار بە یەك.

ئاشکراشە کە ئەمە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە دروست دەکات بەوەی کە لە هەر سێ و چوار کچدا یەکێکیان هەلی شوو کردنیان دەبێت و ئەوانی تر هەروا دەمێننەوە, لێرەدا یا دەبێ هەر پیاوەی زیاد لە یەك ژن بێنێت بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە، یا دەبێ هەر پیاوەو ژنێك بێنێت و ئەوانی تر بە بێ مێرد بمێننەوە.

ئەوانەشی کە هەلی مێردکردنیان نابێت یان دەبێت تا ماون دان بە خۆیاندا بگرن کە ئەمەش زۆر سەختە و فشارێکی دەروونیی زۆریان لە سەر دروست دەکات و بە هەموو کەسێك ناکرێت، چونکە مەسەلەی سێکس مەسەلەیەکی غەریزەییەو هەموو کەسێك ناتوانێت جڵەوی نەفسی خۆی بکات و شەهوەتەکەی کەبت بکات، یا دەبێ لە رێگەی ترەوەو لە دەرەوەی بازنەی ژن و مێردایەتیدا ئەو کارە ئەنجام بدەن و ئەو هەوەسەیان دامرکێننەوە, ئەم کارەش یان دەبێ لەگەڵ پیاوی ژندارا بیکەن کە ئەمەش وەکو فرەژنیی لێدێت و خراپتریش، یان دەبێت لەگەڵ کوڕی گەنجدا کە ئەمەش وا دەکات کوڕان پشت لە ژنهێنان هەڵکەن و لە رێگەی ناشەرعیەوە شەهوەتی خۆیان تێرکەن، ئەمەش خۆی لە خۆیدا رێژەی ژن خواستن کەمتر دەکاتەوەو ئەوەندەی تر ژمارەی کچانی شوونەکردوو زیاد دەکات و بەوە فەسادێکی زۆر لە کۆمەڵگەدا بڵاو دەبێتەوەو رێژەی خێزان پێکەوەنان بە تەواوی دادەبەزێت.

ئەم کارەش، واتە دامرکانەوەی هەوەسی سێکسی لە دەرەوەی بازنەی ژن و مێردایەتێدا لە رووی شەرعەوە حەرامە وزینایە و خوا بە فاحشەو رێگای خراپ ناوزەدی دەکات و لەو دونیاش سزای سەختی بۆ زیناکەران داناوە، واتە لە روانگەی ئیسلامەوە زینا هەم لەم دونیایەدا زیانی زۆرە, چ بۆ تاکەکانی کۆمەڵ, چ بۆ کۆمەڵگە بە گشتیی، هەم لە رۆژی دواییشدا دەبێتە مایەی سزادان و چوونە دۆزەخ.

کەواتە لێرەدا یان دەبێ ئەو ئافرەتە زیادانە یان تا ماون دان بە خۆیاندا بگرن و جڵەوی هەوەسەکانی خۆیان بگرن، یا دەبێ لە دەرەوەی بازنەی ژن و مێردایەتیدا ئەو هەوەسە دامرکێننەوە، بەمەش هەم خۆیان توشی گوناهێکی گەورە دەکەن و ژیانی دوارۆژی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە و بەر هەڕەشەو سزای خوا دەکەون، هەم کۆمەڵگە بەرەو فەساد دەبەن و پیاوانی ژندار تووشی خیانەتی زەوجی دەکەن و گەنجان لە ژنهێنان دەرەوێننەوە، ئەمەش دیسانەوە زیانێکی کۆمەڵایەتی زۆری تێدایە، یا چارەسەری سێهەم هەڵبژێرن ئەویش ئەوەیە کە لەگەڵ ژنێکی تردا هاوبەش بن لە یەك پیاودا، ئەمەی سێهەمیش خاڵیی نییە لە لایەنی سلبی، بەڵام هەمموو ئەو سلبیەتانە لە چاو کەوتنە تاوانی زیناوە کە قیامەتی مرۆڤ دەسووتێنێت کێشی باڵە مێشولەیەکی نیە و لە چاو زیانە دونیاییەکانی تریش کە لەگەڵ ئەگەری یەکەم و دووەمدا باسمان کرد دیسانەوە هیچ نییە.

لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە کە هەڵبژاردنی ئەگەری دووەم, واتە زینا کردن و خاڵی کردنەوەی ئەو هەوەسە لە دەرەوەی بازنەی ژن و مێردایەتیدا, هەموو داخوازییە دەروونییەکانی ئافرەت تێر ناکات، چونکە زەواج بە نسبەت ئافرەتەوە تەنها سێکسی نییە و بۆ دامرکاندنەوەی هەوەسە سێکسییەکان نییە, بەڵکو غەریزەی دایکایەتی و حەزی ئافرەت بۆ منداڵ هێنان و بە دایك بوون کەمتر نییە لە غەریزەی سێکسی بۆیە دەگوترێت ئافرەت لە ژیانیدا دوو رۆژ زۆر گرنگە, ئەو رۆژەی کە شوو دەکات و مێینەیی خۆی دەسەلمێنێت، ئەو رۆژەی کە منداڵی دەبێت و دایکایەتی خۆی دەسەلمێنێت.

جگە لە غەریزەی دایکایەتی کە لە زەواجدا بە باشترین و ئارامترین شێوە بە دەست دەهێنرێت مەسەلەی سرەوتن و ئۆقرە گرتن و حەوانەوەی دەروونیی یەکێکن لە داخوازییەکانی مرۆڤ بە گشتیی و ئافرەت بە تایبەتی کە ئەمیش دیسانەوە لە زەواجدا بە باشترین شێوە دەستەبەر دەکرێت.

کەواتە ئافرەت کە شوو ناکات تەنها دامرکاندنەوەی هەوەسە سێکسیەکەی لە دەست نادات بەڵکو سرەوتن و ئۆقرە گرتن و ئارامیش لە دەست دەدات، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەو هەستەی بۆی دروست دەبێت بەوەی کە کەسێکی خوازراو و ویستراو نەبووە لە لایەن پیاوەوە تا ماوە ئازاری دەروونی دەدات و برینێکی قووڵ لە ناخیدا دروست دەکات.

زەواج پێش ئەوەی داخوازییەکی بەدەنی بێت داخوازییەکی رۆحی و دەروونییە، ئەوەی لە دەرەوەی بازنەی ژن و مێردایەتیدا هەوەسە سێکسیەکانی خۆی دادەمرکێنێتەوە داخوازییەکانی رۆح و دەروونی بێ وەڵامدانەوە دەمێننەوە و کەلێنێکی گەورە لە ژیانیدا بەجێ دەمێنێت، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە فرەژنی بە پلەی یەکەم بۆ چارەسەر کردنی کێشەیەکی گەورەیە و بۆ ژن تەشریع کراوە پێش ئەوەی بۆ پیاو تەشریع بکرێت, واتە بۆ چارەسەر کردنی ئەو رێژە زیادەی لە ئافرەتدا روو دەدات و ئەو دەرئەنجامە خراپانەی لێوەی سەرچاوە دەگرن.

ئەوانەی کە دەیانەوێت رێگە لە فرەژنی بگرن ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە رۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەننەم نییە و باوەڕیان بە حەرام و حەڵاڵ نییە و گوێیان لە بڵاو بوونەوەی زینا و هەڵوەشانی خێزان نییە و گوێیان لە لایەنە رۆحی و دەروونیەکەی زەواج نییە و تەنها مەبەستیان لایەنە جەستەییەکەو هەوەسە سێکسیەکەیە.

لێرەوە واقعییەتی شەریعەتی ئیسلام بە رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی هەموو تاکەکانی کۆمەڵ دەردەکەوێت.

ئەوانەی کە دەڵێن با فرەژنی (وەکو چارەسەرێك) نەمێنێت ئەوانە تەنها بەرژەوەندیی ئەو ئافرەتانە لەبەرچاو دەگرن کە مێردیان هەیە, ئەوانەشیان کە مێردیان نەکردووە یان مێردیان مردووەو گەنجن و هەوەسی سێکسییان ماوە بێبەش بن لە ژیانی ژن و مێردایەتی, جا یان دان بە خۆیاندا بگرن و لە ململانێیەکی دەروونیی سەختدا بژین، یا رێگای ناشەرعی بگرنەبەر بۆ دامرکانەوەی ئەو ئارەزووە، ئاشکراشە کە هەر دوو حاڵەتەکە چەند کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی لێ دەبێتەوە.

ئەمە یەکێك لەو حاڵەتانەی کە دەخوازێ پیاو لە یەك ژن زیاتری هەبێت و چەند ژنێك بەشداربن لە یەك پیاودا, حاڵەتی تریش هەیە دەخوازێ پیاو لە یەك ژن زیاتر بێنێت لەوانە: کەسێك ژنەکەی نەزۆك بێت و حەزی لە منداڵ بێ, یان دەبێ ژنی

یەکەمی تەلاق بدات و ژنێکی تر بێنێت, ئاشکراشە لێرەدا کە ژنی یەکەم زەرەری زۆری پێدەکەوێت, یان دابنیشێت بە دیار ئەو ژنەوە و خۆی مەحروم بکات لە منداڵ کە یەکێکە لە خۆشییەکانی ژیان, ئەمەش بە هەموو کەسێك ناکرێت و هەموو کەسێك ئامادە نییە بەو شێوەیە دەست لەبەرژەوەندییەکانی خۆی و داخوازییە دەروونی و رۆحییەکانی خۆی هەڵگرێت، یان چارەسەری سێهەم ئەوەیە کە ئەم ژنە بهێڵێتەوە و ژنێکی تری بە سەردا بێنێت، بە لای هەموو کەسێکی بە ئینصافەوە ئەمیانە چاکترین چارەسەرە.

کەسێك ژنەکەی نەخۆشییەکی وای هەبێت رێگربێت لەبەردەم ئەنجامدانی کاری سێکسییدا, پیاوەکە چی بکات؟ دان بە خۆیدا بگرێت و ئەو هەوەسەی خۆی بکوژێت, ئەمە کارێکە کەم کەس دەتوانێت بیکات, لەوانەیە لە هەزار کەسێکدا یەکێك بتوانێت ئەمە بکات، یان دەست لەم ژنە هەڵبگرێت و بەو نەخۆشیە بەجێی بهێڵێت و لێی جیابێتەوە و ژنی تر بێنێت، یان بیهێڵێتەوە لەگەڵ خۆیداو بچێت لە ژێرەوە لەگەڵ ژنانی تردا بە ناشەرعی رابوێرێت و بە حەرامی چاو ببرێتە ژن و کچی خەڵکی و هەر شەوەو هەر رۆژەی لەگەڵ یەکێکدا کاری سێکسی بکات، یان بیهێڵێتەوە و بچێت ژنێکی تر بێنێت و مەسئولیەتی هەر دوو ژنەکە هەڵبگرێت.

ئاشکرایە کە لە رووی ئینسانییەوە رێگای یەکەم لە هەمووی باشترە، بەڵام چارەسەرێکی کردەیی (عەمەلی) نییە و زۆر بە دەگمەن خەڵك هەیە بتوانن ئەو کارە بکەن و ئەوە شتێکی واقیعی نییە.

کەواتە دەمێنێتەوە لە هەمووی کەم زیانتر ئەویش ئەوەیە کە لە سەر سوننەتی خواو پێغەمبەر ﷺ ژنێکی تر بێنێت و دەست لەوی تر هەڵنەگرێت و پیویستیەکانیشی جێبەجێ بکات.

زۆربەی پیاو ئارەزوو و توانای سێکسییان لە ژنان زیاترەو تا تەمەنێکی زۆر درێژتر دەتوانن کاری سێکسی ئەنجام بدەن و تواناو دەسەڵاتیشیان هەیە، ئەمانە چی بکەن؟

لە ژێرەوە بە دوای دامرکاندنەوەی ئەو هەوەسەدا بچن و هەر رۆژە و لەگەڵ ئافرەتی تردا بە ناشەرعی پەیوەندیی بکەن وەکو زۆرێك لە دەسەڵاتدارەکانی ئێستا دەیکەن یان یەك دوو ژنی تر بێنن و بە شێوەیەکی ئاشکراو لە سەر شەرعی خوا و بەحەڵاڵی ئەو هەوەسە تێر بکەن؟ من گومانم نییە لەوەی کە کەسانی بە ئینصاف ئەم چارەسەرەیان لا باشترە لەوانی تر.

بەنسبەت پیاوی دیندارەوە ئەوە گومانی تێدا نییە کە یان ئەم چارسەرە هەڵدەبژێرێت (فرەژنی) یا دان بە خۆیدا دەگرێت و وەکو هەموو گەنجێکی بڕوادار کە توانای ژنهێنانی نییە بۆ بە دەست هێنانی رەزامەندیی خوا و بەهەشت دان بە خۆیدا دەگرێت و خۆی لە حەرام دەپارێزێت.

## فرەژنی یان فرەدەنكی

ئەگەر بهاتایە ئەو پیاوانەی رەخنە لە فرەژنی دەگرن خۆیان ئیكتفایان بە یەك ژن بكردایە، یان مولحیدو بێ بڕواكان خۆیان لە ژێرەوە دەیان دەنكیان هەیەو بە شێوەیەكی ناشەرعی لەگەڵیاندا رادەبوێرن.

هیچ ئایینێك فرەژنی بە حەرام دانەناوە تەنانەت ئایینی مەسیحیش كە تا سەدەی 17ی زایینی مەسیحییەكان فرەژنییان تێدا بووە، ئێشتاش تایەفەی مۆرمۆن لە ئەمریكا كە تایەفەكی مەسیحین باوەڕیان بە فرەژنی هەیەو ئەگەر دەوڵەت رێگەیان لێنەگرێت ئەنجامی دەدەن و موژدەدەرانی مەسیحی لە زۆر ناوچەی ئەفەریقا كە فرەژنی تێدا باوە رێگە لە فرەژنی ناگرن، نەوەكو ئەو ئەفەریقیانە دەست لە مەسیحیەت هەڵگرن.

ئەوانەش كە باوەڕیان بە هیچ ئایینێك نییەو باوەڕیان بە حەرامو حەڵاڵ نییە زۆر ئاساییە بە لایانەوە هەر رۆژێ لەگەڵ ئافرەتێكدا رابوێرن.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ: مادەم هەرچی پیاو هەیە ئیكتیفا بەیەك ژن ناكات، ئیتر بۆچی رەخنە لە فرەژنی دەگیرێت؟ كامیان باشترە ئەوپەڕی چوار ژن یان سەدان دەنك؟

پەیوەندییەكی ئاشكرای ئەخلاقی لە چوارچێوەی خێزاندا لەگەڵ ئەوپەڕی چوار ژندا یان پەیوەندیی نهێنی لەگەڵ دەیانو سەدان دەنكدا؟

ژنێك ناوو ژمارەی ئەو ئافرەتانە بزانێت كە مێردەكەی لەگەڵیاندا دەژی یان ژنێك ناوو ژمارەی ئەو ئافرەتانەی مێردەكەی ژێراوژێر و بێ ئاگاداری لەگەڵیاندا رادەبوێرێ نەزانێت؟

فرەژنی لە فرە دەنكی ئەخلاقیترو ئینسانیترە، ئەخلاقیترە، لەبەر ئەوەی رێگە نادات بە پیاو لەگەڵ هەر ژنێكدا لە هەر كاتێكدا بیەوێت پەیوەندیی بكات، چونكە بۆی نییە پەیوەندیی لەگەڵ زیاتر لە چوار ژندا هەبێت، بۆی نییە ژێراو ژێر پەیوەندیی بە ژنو كچی خەڵكییەوە هەبێت.

مرۆڤانەترە، چونكە زیاد لە یەك ژن دەپارێزێت لەوەی كە سەرگەردانو دەربەدەر بن.

مرۆڤانەترە لەوەی كە خۆی لە ئەركی لە خۆگرتنو بەخێوكردنی ئەو منداڵانەی لێی دەبێت بدزێتەوە.

ئەخلاقیترەو ئینسانیترە، لەبەر ئەوەی كە پیاو هەوەسەكەی دانامركێنێتو بڕوات، بەڵكو هەرچی دەرئەنجامێكی بەسەردا كەڵەكە دەبێت دەیخاتە سەرشانی خۆیودەچێتە ژێر باری هەموو مەسئولییەتەكانەوە.

لەبەرامبەر فرەژنیشدا فەردەنكی كارێكی نائەخلاقیو نامرۆڤانەیە، فرەژنی لە رۆژئاوا دەكرێت بە ناوی فرەدەنكییەوە، بەڵام جیاوازییەكەی ئەوەیە كە فرەژنی كارێكی ئەخلاقیو ئینسانیە، فرەدەنكیش نائەخلاقیو نائینسانییە.

ئەمیان بە ناوی فرەژنییەوە، ئەویان بە ناوی فرەدەنكیی، ئەمیان تەنها چوارە ئەویان بێشومارە.

ئەمیان بە ئاشكراو بە ئاگاداری كەسوكارو خەڵكو یاساوەیە، ئەویان ژێراوژێرو بێئاگاداری ژنو كەسوكارو دەوڵەت.

ئەمیان هەڵگرتنی مەسئولیەتی تێدایە، ئەویان هیچ مەسئولییەتێكی تێدا هەڵناگیرێت.

ئەمیان چارەسەرە بۆ چەندین كێشەی كۆمەڵایەتی، ئەویان چەندین كێشەی كۆمەڵایەتی لێدەبێتەوە.

ئەگەر فرەژنی لەبەرامبەر تاكە ژنیدا بێت ئەوا گومانی تێدا نییە كە تاكەژنی باشترە، بەڵام ئەگەر لەبەرامبەر فەردەنكیدا دابنرێت ئەوا ئاشكرایە كە فرەژنی لە فرەدەنكی باشترە.

لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە كە ئەوانەی باوەڕیان بە فرەژنی هەیە حەز دەكەن كۆمەڵگە بە ئەخلاقو پارێزكار بێتو خێزان تۆكمە بێت، لەبەرامبەریشدا ئەوانەی باوەڕیان بە فرەدەنكی هەیە حەز دەكەن كۆمەڵگە بێ ئەخلاق بێتو پەیوەندیی خێزانی هەڵوەشاوە بێت، چونكە نانەكەیان لەوەدایەو حەزو ویستیان لەوێدا بەدەست دەهێنرێت.

## کێ سودمەندە لە فرەژنی و کێ لێی زەرەرمەندە؟

جێی خۆیەتی ئەم پرسیارە بکەین: کێ سودمەندە و کێ زەرەرمەندە لە فرەژنی؟

بەبێ هیچ گومانێك دەتوانین بڵێین زەرەرمەند لە نەهێشتنی فرەژنیدا ئەو ڕێژە زیادەیەیە کە لە ئافرەتاندا هەیە کە وەکو لە سەرەتاشەوە وتمان لە دێر زەمانەوە هەر وابووە و هەرواش دەمێنێتەوە.

ئەو ئافرەتانەی کە شوو دەکەن و مێردەکانیان لەگەڵیاندا دەمێننەوە و تەمەنیان درێژ دەبێت سودمەندن لە نەمانی فرەژنی، بەڵام کچە زیادەکان و ئەو ژنانەی مێردەکانیان لە دەست دەدەن لە گەنجیدا کە بە زۆری بە هۆی شەڕەوە یان کارەساتی ڕێگاوبان کە زیاتر پیاوان تیا دەچن یا دەبێ تا ماون بێبەش بن لە مێرد و لە ژیانی ژن و مێردایەتی وەیا ڕێگەی ناشەرعی بگرنە بەر بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانیان، ئەویش وەکو وتمان تەنها لایەنە جەستەییەکەیان تێر دەکەن، بەڵام لایەنی ڕۆحی و دەروونییەکەیان بە بۆشی و بێ وەڵامدانەوە دەمێنێتەوە و زیاتر بێئارام دەبن.

زەرەرمەندی تر لە نەمانی فرەژنی ئەو پیاوانەن کە ژنەکانیان نەزۆکن یان نەخۆشن یان لەبەر تەمەن ئارەزووی سێکسییان زۆر کەم بۆتەوە، ئەو پیاوانەی کە بە سروشت ئارەزوو و توانی جنسییان زۆرە.

ئەگەر لەو ئافرەتانە بپرسی کە هەلی شووکردنیان لە دەست داوە لە تەمەنی گەنجیدا یان خەریکە لە دەستی دەدەن و ئەو ئافرەتە گەنجانەی کە مێردیان مردووە چیتان پێ باشترە: بە شێوەیەکی ناشەرعی ئەو ئارەزووانە تێر بکەن، یان شوو بکەن بە پیاوێکی ژندار، یان دان بە خۆتاندا بگرن و ئەو ئارەزووە کەبت بکەن؟ لەو باوەڕەدام ڕێژەی هەرە زۆریان ئەوە هەڵدەبژێرن کە شوو بە پیاوێکی ژندار بکەن لەوەی کە بەبێ مێرد بمێننەوە یان لە ڕێگەی ناشەرعییەوە هەوەسەکانیان دامرکێننەوە، ئەمەش نەك تەنها بە نیسبەت ئافرەتی لای خۆمانەوە، بەڵکو تەنانەت ئافرەتی ڕۆژئاواش ئەوە هەڵدەبژێرن، نموونەش ئەو ئافرەتە پەرلەمانتارە کوردە بوو کە مێردی کرد بە پیاوێکی عەرەبی خاوەنی دوو ژن.

زەرەرمەندی تر لە نەمانی فرەژنی کۆمەڵگەیە، چونکە نەمانی فرەژنی وەکو لەمەوبەر وتمان یا دەبێتە هۆی مانەوەی ئافرەتێکی زۆر لە کۆمەڵگەدا بەبێ شووکردن کە ئەمەش لە دوو ڕووەوە کێشەی کۆمەڵایەتی لێدەبێتەوە، ئەگەر دان بە خۆیاندا بگرن و پەنا نەبەنە بەر ڕێگای ناشەرعی بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووەکانیان ئەوا هەندێکیان تووشی ناڕەحەتیی دەروونیی دەبن، کاریگەریی ئەم حاڵەتانەش لەسەر کۆمەڵگە شاراوە نییە لای شارەزایان.

ئەگەر پەناش ببنە بەر ڕێگەی ناشەرعی ئەوا لە چەند ڕوویەکەوە زەرەر بە کۆمەڵگە دەگەیەنن، یەکەم بەوەی کە زیناو فاحیشە لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاو دەبێتەوە و ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە سێکسییەکان و تلیاك خۆری و تاوان و جەریمەو دەیان کێشەی تر.

دووەم: منداڵی ناشەرعی و بێ دایك و باوك زیاد دەکات، ئەوانەش زۆربەیان کەسانی ناتەواو دەبن لە رووی دەروونیی و کەسایەتییەوە لەبەر بێبەشبوونیان لە سۆزی دایك و باوك و ئاسودەیی خێزان و هەست بە کەمی کردن لەبەردەم برادەرەکانیاندا کێشەی دەروونی زۆریان بۆ دروست دەبێت، کاریگەریی نێگەتیڤی ئەم حاڵەتانەش لەسەر زیادبوونی ڕێژەی نەخۆشی دەروونی و کێشەی کۆمەڵایەتی لە ڕۆژئاوادا بە ئامارەوە سەلمێنراوە گەر کەسێك بیەوێت بە ئاسانی دەستی دەکەوێت.

سێهەم: پشت هەڵکردنی کوڕان لە ژنهێنان لە ئەنجامی بوونی ڕێگا ناشەرعییەکانی دامرکاندنەوەی هەوەسە سێکسییەکان لە لایەن گەنجانەوە، ئاشکرایە کە مرۆڤ ئەگەر ڕێگرێکی دینی و ئەخلاقی نەبێت لەبەردەمیدا لە جیاتی ئەوەی بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووە سێکسییەکانی بچێت خۆی بخاتە ژێر باری مەسئولیەتی ژنهێنان و خێزانەوە دەچێت ئەو ئارەزووە هەر ڕۆژەی لەگەڵ ئافرەتێکدا خاڵیی دەکاتەوە، ئەم حاڵەتەش خۆی واتە پشت هەڵکردنی کوڕان لە ژنهێنان دەبێتەوە هۆی زیادبوونی ڕێژەی کچانی شوو نەکردوو، ئەمیش یا دەبێتە هۆی زیادبوونی ڕێژەی زیناو فەساد یان زۆری ڕێژەی کچی قەیرە کە باسی سلبیاتەکانیمان کرد.

له هەموو زەرەرەکانیش گەورەتر ئەوەیە کە خەڵکانێکی زۆر لە ئەنجامی ئەم حاڵەتەوە لە ڕێگەی بەهەشت دوور دەکەونەوەو ژیانی پڕ بەختەوەریی ئەو دونیا لە دەست دەدەنو بەر خەشمو تووڕەیی پەروەردگار دەکەون. لە ڕاستیدا ئەمە گەورەترین زەرەرە لە مرۆڤەکان دەکەوێت کە لە چاویدا هەموو زەرەرو زیانێك بێ نرخو بێبایەخە، هەر ئەم خاڵەش بەردی بناغەی جیاوازیی نێوان بڕواداران‌و بێبڕواکانە، یان بە واتایەکی تر ئیسلام و ڕێبازەکانی تر.

ئیسلام بۆ ئەوەی خەڵکیی ژیانی هەتا هەتایی پڕ لە خۆشی بەهەشتیان لە دەست نەچێت‌و تووشی سزای دۆزەخ نەبن داوای لێ کردوون لەم دونیایەدا کەمێك فیداکاری بکەن‌و دەست لە هەندێك لەبەرژەوەندییەکانی خۆیان هەڵگرن بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی ڕۆژی دوایی مسۆگەر بکەن، واتە داوا لە ژنانی مێرددار دەکات ئەو ژنانەی زیادەن لە کۆمەڵگەداو بێ مێردن بەشداریان بکەنەوە لەگەڵ خۆیاندا بۆ ئەوەی ڕوو نەکەنە زیناو خۆشیان و کۆمەڵگەیان بەرەو ژیانی دۆزەخ نەبەن.

ئەم خاڵە گرنگترین شتە کە دەبێ وامان لێبکات پێ لە سەر مانەوەی فرەژنی داگرین وەکو چارەسەرێك بۆ ئەو هەموو حاڵەتانەی پاڵ بە نێرینە یان مێینەوە دەنێن ڕوو لە زیناو پەیوەندیی سێکسی ژێراو ژێرو ناشەرعی بکەن.

لێرەوەیە کە دەڵێم ئەوانەی دژی فرەژنی دەوەستن وەکو چارەسەر نەك وەکو حاڵەتێکی ڕەهاو بێسنوور کەسانێکن باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییەو زینا کە دەبێتە هۆی بێبەش بوون لە بەهەشت بە شتێکی ئاسایی تەماشا دەکەن و بە کێشەی نازانن.

وەکو ئاشکرایە کە هەموو شتێکی باش‌و بە کەڵك نرخی خۆی هەیە، تا ئەو شتە باشترو بە کەڵکترو جوانترو خۆشتر بێت نرخەکەی زیاترە، بەهەشتیش کە بەنرخترین شتە، ژیانەکەی خۆشترین ژیانە و ڕابواردنەکانی خۆشترین ڕابواردنەو ماوەکەی درێژترین ماوەیە بۆیە نرخەکەشی زۆرە وەکو پێغەمبەر (درودی خوای لە سەر بێت) دەفەرموویت: **"ألا إن سلعة الله غالية، ألا إن سلعة الله الجنة"**. واتە: شمەکەکەی خوا گرانبەهایە، شمەکەکەی خوا بەهەشتە.

نرخی بەهەشت پابەندبوونە بە کردن‌و نەکردنی ئەو شتانەی خوا حەڵاڵ‌و حەرامی کردون، بە تایبەت نەکردنی ئەو شتانەی حەرامکراون‌و نەفس حەزی لێیانە وەکو زینا.

ئەگەر مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی پلەوپایەیەکی دونیایی قوربانیی بە زۆرێك لە خۆشییەکانی خۆی دەدات‌و خۆی لە زۆر شت کە نەفسی حەزی لێیەتی بێبەش دەکات تا دەگاتە ئەو ئامانجەی دەیەوێت بۆ ئەوەی ئەو شتانەی کە بە شێوەیەکی کاتیی لە خۆی قەدەغە کردووە بە باشترین شێوە دەستی کەوێت ئایا ژیانێکی هەتا هەتایی پڕ لە خۆشی بەهەشت شایانی ئەوە نییە مرۆڤ قوربانی بە هەموو شتێکی دونیایی بدات لە پێناویدا؟

ئەمەیە جیاوازیی نێوان بڕوادارو بێبڕوا کە تا لێی تێنەگەین ناتوانین لە شتەکانی تر بگەین، ئەگەر بێبڕواکان لەبەر ئەوەی کە بڕوایان بەم شتانە نییەو گاڵتەی پێدەکەن یان گاڵتەمان پێدەکەن ئەوە ئارەزووی خۆیانەو وەڵامی ئێمەش بۆیان ئەم ئایەتەیە کە حەزرەتی نوح بە قەومەکەی دەوت: **".. قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ"**. (هود : 38).

واتە: ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە بە ئێمە بکەن، لە دواییدا ئێمە گاڵتە بە ئێوە دەکەین‌و دەردەکەوێت کێ ڕاست بوو.

بەم ئایەتەش کە هەموو پێغەمبەران وەڵامی گەلەکانیان پێداوەتەوە: **"قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّيَ وَآتَانِي رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِ فَعُمِّيَتْ عَلَيْكُمْ أَنُلْزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمْ لَهَا كَارِهُونَ"**. (هود: 28).

واتە: پێم بڵێن ئەگەر من بەڵگەم لەلایەن خوا هەبێ لەسەر پێغەمبەرایەتیم و خوا ئەو ئاوڕەی لە من دابێتەوە بەڵام لە ئێوە شاراوە بێت، ئایا دەتوانم زۆرتان لێ بکەم و بەزۆر باوەڕ بخەمە دڵتانەوە ئەگەر ئێوە خۆشتان لێنەیەت؟

## کێ ستەم لە کێ دەکات و کێ بەرپرسیارە لە فرەژنی؟

پێش ئەوەی باسی مەرجو بە بەرستەکانی فرەژنی بکەین پێویستە ئەوە بڵێین کە چەند پیاو لە فرەژنی بەرپرسیارە ئەوەندەش ژن لێی بەرپرسیارە، بە تایبەت لەو حاڵەتانەی کە ژن زۆری لەسەر نییەو بە مەیلی خۆی مێرد دەکات.

ئەگەر فرەژنی ستەم بێت لە ژن ئەوە نیوەی پیاو لێی بەرپرسیارەو نیوەکەی تری ئەو ژنەی کە رازییە شوو بە پیاوی ژندار بکات، لێرەدا پێویستە ئەم پرسیارە بوروژێنین:

کێ ستەم لە کێ دەکات، ئەو ژنەی شوو بە پیاوی ژندار دەکات ستەم لە ژنی یەکەم دەکات یان ئەو ژنەی رێگا لە کچێك یان بێوەژنێك دەگرێت شوو بە مێردەکەی بکات، یان ئەو پیاوەی ژنی دووەم و سێیەم و چوارەم دێنێت بە سەر ژنی یەکەمدا؟

ئەو پیاوەی ژنی دووەم دێنێت لەو کاتەی ستەمی لە ئافرەتێك کردووە دەستی ئافرەتێکی تری گرتووەو لە ژیانی تەنیاییو دەرئەنجامەکانی رزگاری کردووە، کەواتە باری پیاو لێرەدا هاوسەنگ دەبێتەوە، چاکەیەك بەرامبەر ستەمێك، بگرە هێشتا چاکەکە زیاترە، بەڵام دەمێنێتەوە ئەوەی ستەم دەکات یان ژنی یەکەمە کە ستەم لە ژنی دووەم دەکاتو هەلێکی شووکردنی لە دەست دەدات یا ژنی دووەمە کە دێت بەشداریی ژنی یەکەم دەکات لە پیاوەکەیدا، گومانی تێدا نییە کە لە رووی ئەخلاقیو ئینسانییەوە ستەمی ژنی یەکەم گەورەترە، چونکە ئەویان بە شوونەکردن زەرەری تەواو دەکات ئەویش بە ژن هاتنە سەر نیوە زەرەر دەکات، ئەم پیاوی تەواوی لە دەست دەچێت ئەو نیو پیاوی لە دەست دەچێت.

ئەگەر بڵێی پیاو ناتوانێت عەدالەت بەرپا بکاتو باوی ژنێکیان دەدات بەسەر ئەوی تریاندا ئەوەش دیسانەوە دەستی ئەو ژنەیانی تێدایە کە مێردەکەی هان دەدات ستەم لە وی تر بکاتو دەیەوێت مافەکانی زەوت بکات، لێرەدا کەسایەتی پیاوەکەش رۆڵی هەیە لەوەی کە دەکەوێت یان ناکەوێتە ژێر کاریگەریی یەکێك لە ژنەکانیەوە، ئەمەش دیسانەوە دەمانگێڕێتەوە بۆ پرسیارێکی هاوشێوەی ئەوەی پێشوو: کێ ستەم لە کێ دەکات؟ ئەو پیاوەی زیاد لە یەك ژنی هەیەو لە ژێر کاریگەریی یەکێکیاندا ستەم لەوانی تر دەکات، یان ئەو ژنەیان کە هانی مێردەکەی دەدات ستەم لەوانی تر بکات؟

## مەرجەکانی فرەژنی

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە باسی ئەوە بکەین کە ئایا ئەم مەسەلەیە (فرەژنی) لە ئیسلامدا هەروا بەبێ مەرجو بێ بەربەستو کۆنترۆڵ بەجێ هێڵراوە یان کۆمەڵێك مەرجو بنەمای بۆ دانراوە.

هەروەکو چۆن دەقێك نییە لە ئایەتو فەرموودە راستەوخۆ کۆیلایەتی قەدەغە بکات ـ بەڵکو زۆر رێگای ناڕاستەوخۆی گرتەبەر کە هەمووی دەڕژێتە ئەو دەرئەنجامەی کۆیلایەتی نەهێڵێت ـ بەهەمان شێوە قورئان هەندێك مەرجی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە دەیانەوێت زیاد لە یەك ژن بهێنن، ئەگەر بێتو رەچاو بکرێت فرەژنی لە بوارێکی زۆر تەسکدا دەمێنێتەوە، هەندێك جاریش چارەسەرەکە بەجێ دەهێڵرێت بۆ کۆمەڵگە کە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەریدا دێت زۆرێك لەو دابو نەریتانە گۆڕانکارییان بەسەردا دێت. بۆ نموونە لە کۆمەڵگەی کشتوکاڵیدا کە پیاو پێویستی بە منداڵی زۆر هەیە بۆ ئەوەی ئیشو کارەکەی بۆ بەرێوە ببەن، پێویستی دەکرد ئەو پیاوانەی کە دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارن زیاد لە یەك ژن بێنن، بەڵام لە کۆمەڵگەی شاریدا کە زۆری منداڵ ئەرکێکی ئابوری زیاتر دەخەنە سەر خێزان کەم کەس هەوڵ دەدات ژنی تر بێنێت مەگەر ئەو کەسانەی لەبەر یەکێك لەو هۆیانەی لەمەوبەر باسمان کرد بیانەوێت ژن بێنن.

ئەو ئایەتەی باسی فرەژنی دەکات لە قورئاندا ئەمەیە: **"وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ"**. (النساء :**3**). واتە ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو کە دادپەروەر نەبن لەگەڵ ئەو هەتیوانەی لەبەردەستانداندو بەخێوتان کردوون ئەگەر بیانخوازن ئەوا ژنی تر بخوازن، لە یەکەوە تا چوار، بەڵام ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو دادپەروەر نەبن لە نێوانیاندا ئەوا ئیکتیفا بکەن بە یەك ژن، یان بە کەنیزەك، ئەوە نزیکتر لەوەی کە منداڵتان زۆر نەبێتو هەژار نەکەون، هەندێك (ألا تعولوا) بەوە تەفسیر

دەکەن کە ستەم نەکەن، هەندێکی تر بەوە راڤەی دەکەن کە ئەوە نزیکترە لەوەی کە بە بۆنەی منداڵ زۆرییەوە هەژار نەکەون، ئەمەش رای ئیمامی شافیعیو بەیهەقی و زۆرێك لە موفەسیرەکانیش هەردوو تەفسیرەکەیان باسکردووە.

کەواتە لەم ئایەتەوە دوو مەرجمان دەست دەکەوێت بۆ کەسێك بیەوێت زیاد لە یەك ژن بێنێت، یەکەم مەرجی دادپەروەری، کە ئەمەیان شتێکە لە ئەنجامی مامەڵەوە دەردەکەوێت، بۆیە ئایەتەکە دەفەرموویت: ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو دادپەروەر نەبن، واتە هێشتا ئەو کەسە نازانێت کە ئایا دادپەروەر دەبێت یان نا، بەڵام تەنها ترسی هەیە کە ناتوانێت دادپەروەر بێت ئەوە ئەو کاتە با تەنها یەك ژن بێنێت.

### فرەژنی و داد پەروەری

هەندێك کەس دەڵێن بە رێکەوتو بە شێوەیەکی زۆر دەگمەن لە دونیادا هەڵدەکەوێت پیاوێك بتوانێ لە نێوان دوو ژندا دادپەروەر بێت، تەنانەت خودی پەیامبەریش ﷺ نەیتوانیوە ئەو دادپەروەرییە بهێنێتە دی! بەلگە بەو ئایەتە دەهێننەوە کە دەفەرموویت **(ولن تستطيعوا أن تعدلوا بين النساء ولو حرصتم)**.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی لە دڵەوە عائیشەی لەوانی تر زیاتر خۆش دەویست، بەڵام لە رووی مامەڵەوە هیچ جیاوازییەکی نەدەخستە نێوان ژنەکانیو لەو لایەنەوە ئەوپەڕی ئیداریو ئەوپەڕی دادوەر بووەو تا دونیا ماوە کەسێکی تر نایەت شان لە شانی پێغەمبەر بدات لە داناییو دادپەروەریدا.

قورئان خۆی دەفەرموویت دادپەروەریکردن کارێکی سەختەو مرۆڤ هەرچەند هەوڵ بدات ناتوانێ دادپەروەری رەها بەرپا بکات، بەڵام ئەمە رێگە ناگرێت لەوەی کە زیاد لە یەك ژن بێنن ئەگەر هەوڵی خۆتان خستەگەڕ بۆ بەرپاکردنی دادپەروەری وەکو ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو **(اللهم هذا قسمي فيما املك فلا تؤاخذني فيما تملك ولا أملك)**.

پاشان کەس نییە وتبێتی فرەژنی یەکپارچە خۆشیو رابواردنە، بەڵکو زۆر جار پڕە لە کێشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بەراورد لەگەڵ سلبیاتی مانەوەی ئافرەتی زۆر بەبێ مێرد هێشتا زیانی ئەم کەمترە، واتە شتەکە بەراوردە لە نێوان دوو حاڵەتدا، قورئان خۆی دەفەرموویت دادپەروەریکردن کارێکی سەختەو مرۆڤهەرچەند هەوڵ بدات ناتوانێ دادپەروەریی رەها بەرپا بکات، بەڵام ئەمە رێگە ناگرێت لەوەی کە زیاد لە یەك ژن بێنن ئەگەر هەوڵی خۆتان خستەگەڕ بۆ بەرپاکردنی دادپەروەری وەکو ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو **(اللهم هذا قسمي فيما املك فلا تؤاخذني فيما تملك ولا املك)**.

مەرجی دووەم ناراستەوخۆ لە ئایەتەکە وەردەگیرێت ئەویش توانای ماددییە، ئەم مەرجەیان هەر لە سەرەتاوە دەزانرێت و دادگا دەتوانێت بڕیار بدات کە ئەو کەسە دەتوانێت مەسرەفی دوو خێزان بکێشێت یان نا.

هێنانی کەنیزەکیش سوودی کەنیزەکەکانی تێدا بوو، چونکە تەنها بە هێنانی منداڵ ئیتر فرۆشتنیان حەرام دەبوو، دەبوا لە ئەستۆی ئەو پیاوە بمێنێتەوە و بە مردنی پیاوەکە یەکسەر ئازاد دەبوون. ئەمەش یەکێك بوو لە رێگاکانی ئازادکردنی کەنیزەکەکان.

پاشان کەس نییە وتبێتی فرەژنی یەکپارچە خۆشیو رابواردنە، بەڵکو زۆر جار پڕە لە کێشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بەراورد لەگەڵ سلبیاتی مانەوەی ئافرەتی زۆر بەبێ مێرد هێشتا زیانی ئەم کەمترە، واتە شتەکە بەراوردە لە نێوان دوو حاڵەتدا.

مەسەلەیەکی تر هەیە کە رێگا لە فرەژنی دەگرێتو ناهێڵێ هەروا بە رەهایی هەموو کەسێك هەڵسێتو فرەژنی بکات ئەویش بەرهەڵستی ژنی یەکەمە کە خوا وەکو غەریزەیەك لە ژناندا دایناوە حەز نەکەن ژنی تریان بێتە سەر، ئەم بەرهەڵستکارییە کاریگەرییەکی زۆری هەیە لە سەر کەمکردنەوەی فرەژنی و شتەکە تا رادەیەك لە حەزو ویستی پیاو

دەردەكاو لە سنووری زەرورەتدا دەیهێڵێتەوە، واتە ئەو بەرهەڵستكارییە كارێك دەكات كە تەنها ئەوانەی بیانوویەكی فیعلییان بەدەستەوەیە بۆ ژنهێنان و ئەوانەی كەسایەتییان بەهێزەو توانای ماددییان هەیە بتوانن ژنی تر بێنن.

لە كۆتاییدا دەڵێم ئیسلام ئایینێكی واقیعییەو چارەسەری واقیعی پێیە بۆ كێشەكان و هەوڵ بۆ دەستخستنی خۆشی هەردوو دونیای مرۆڤ دەدات.، ئەوەندە بەسە كە لە دانانی خوایەكی زانای دانای دادپەروەری بە بەزەییە و هەر كەموكورتییەك هەبێت لەبەرپاكردنیدا ئەوە لە كەموكورتی و نەزانی و هەوەسی مرۆڤەكانەوە سەرچاوەی گرتووە نەك لە ئیسلامەوە.

ئەگەر لە مێژوودا پیاوانێك هەبووبن كۆشكەكانیان پڕ كردبێت لە كەنیزەك ئەوە لادان بووە لە رۆحی ئیسلام و خراپ سوود وەرگرتن بووە لە روخسەتەكانی ئیسلام وەكو ئەوەی كە كوردێكی عەشایەر دەیكات، دەبینی لە هەموو ئیسلام تەنها ئەوە بەرپا دەكات كە زیاد لە یەك ژن بێنێت، چونكە خوا حەڵاڵی كردووە، لەولاشەوە هەرچی حەرام هەیە دەیكات لە ستەم و ماڵی حەرام خواردن و فرِوفێڵ و .. هتد، ئایا دەكرێت كردەوەكانی ئەو جۆرە كەسانە بەسەر ئیسلامدا ساغ بكرێتەوە؟

## هەوڵی ئەوروپا بۆ بەرپاكردنی فرەژنی و رێگریی حكومەتی كوردی لە فرەژنی

دوا وتەم لەم بەشەدا ئەوەیە كە زۆر جار لە ئەوروپا و لە وڵاتانی تر ویستویانە پەنا ببەنەبەر شەریعەتی ئیسلام بۆ چارەسەركردنی كێشەی زیادەی ئافرەت، بەڵام قەشە دەمارگیرەكان رێگەیان نەداوە، وەكو ئەوەی لە ئەڵمانیا دوای جەنگی جیهانی دووەم حكومەتی ئەڵمانی لیژنەیەكی نارد بۆ ئەزهەر بۆ ئەوەی هەندێك زانیارییان بدەنێ دەربارەی سیستمی فرەژنی لە شەریعەتی ئیسلامدا.

لە ساڵی 1949 خەڵكی (بۆن)ی پایتەختی ئەڵمانیا داوایان لە دەسەڵاتدارەكان كرد بەندێك بۆ دەستوور زیاد كەن كە رێگا بە فرەژنی بدات بۆ چارەسەری كێشەی ئەو زیادەیەی لە رێژەی ژناندا روویدابوو.

فەیلەسوف و دانیشمەندە رۆژئاواییەكانیش زۆرێكیان دانیان بەوەدا ناوە كە فرەژنی چاكترین تەشریعە بۆ چارەسەركردنی كێشەی زیادبوونی رێژەی ژنان و ئەوانەی ژنەكانیان توانایان نەماوە، وەكو فەیلەسوفی ئەڵمانی (شۆبنهاوەر) و (گۆستاف لۆبۆن) و (ئیهرینبل) و (وێستەر مارك) و چەندینی تر.

لە رۆژئاوای مەسیحیدا دەوڵەت دەیەوێت پەنا بباتە بەر فرەژنی بۆ چارەسەر كردنی كێشەی زیادەی رێژەی ئافرەتان، بەڵام دەزگای ئایینی دەمارگیر رێگری لێدەكات كەچی لە وڵاتی خۆماندا بە پێچەوانەوەیە: دەزگای ئایینی یارمەتیدەرو ئاسانكەرە، بەڵام دەوڵەت رێگری لێدەكات! لە هەردوو حاڵەتەكەشدا هەر ئەو ئافرەتانە زەرەرمەندن كە بێوەژن دەكەون یا تەمەنیان تێپەڕیوە یا خەریكە تێدەپەڕێ.

دەبوایە لای خۆمان حكومەت ئەو شتەی بە هەل بزانایەو سوودی لەو هەڵوێستەی ئایین وەرگرتایە بۆ چارەسەر كردنی ئەم كێشەیەو رۆڵی ئایینی كاریگەرتر بكردایە لەم بوارەدا، بەڵام بە داخەوە پێناچێت بەرپرسانی لای ئێمە مەبەستیان چارەسەركردنی كێشەی خەڵكی بێت. چارەسەرنەكردنی كێشەی كارەبا لە ماوەی حەڤدە ساڵدا و رۆژ دوای رۆژ خراپتربوونی كارەبا بەڵگەیەكی بەرجەستەیە لەسەر ئەوەی كە حكومەت بە تەنگ میللەتەوە نییەو مەبەستی خزمەت كردنی نییە بەڵكو لێپرسراوان هەموو هەم و غەمێكیان بە دەستهێنان و دابینكردنی بەرژەوەندیی خۆیانە ئەگینا شت هەیە بە 17 ساڵ چارەسەر نەكرێت بە تایبەت كارەبا كە یەكێكە لە پێداویستییە هەرە سەرەكییەكانی مرۆڤ لەم سەردەمەدا. ئەمە جگە لە دەیان كێشەی زیندووی تر كە بێ چارەسەر كردن هێڵراوەتەوە وەكو كێشەی ئاوو كرێچێتی و كۆچكردنی گەنجان بۆ هەندەران و...هتد.

حکومەت وەکو ڕێگە لە فرەژنی دەگرێت و یاسای بۆ دادەنێت بۆ سزادانی ئەوانەی ئەنجامی دەدەن هیچ هەنگاوێکیش ناگرێتە بەر بۆ ڕێگرتن لە کۆچکردنی گەنجان بۆ هەندەران کە لەبەرامبەر هەر گەنجێدا کە دەچێت بۆ هەندەران کچێك هەلی مێردکردنی لە دەست دەچێت و بێ هیوا دەبێت.

من زۆر دەترسم هەندێك لەبەرپرسان حەز بەم وەزعە بکەن (کۆچی گەنجان و زیادبوونی ڕێژەی کچان) بۆ ئەوەی هەلی رابواردن بۆ خۆیان زیاتر بێت و ئافرەتی زیاتریان لەبەردەستدا بێت! لەمەش زیاتر لەوە دەترسم حکومەت لەم سیاسەتەیدا ئەجندەی جیهەتگەلێکی دەرەکی جێبەجێ بکات، جیهەتگەلێك کە دەیانەوێت لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی فەسادەوە دوورکەوتنەوەی میللەت لە ئیسلام مسۆگەر بکەن، یان بەرنامەیەك لە ئارادابێت بۆ پاڵنان بە گەنجانەوە بۆ چوون بۆ هەندەران بۆ ئەوەی لەوێ مێشکیان بشۆنەوەو ئەگەر نەشکرێن بە مەسیحی هیچ نەبێت عەقڵییەت و ڕەوشت و کەسایەتییان بگۆڕن.

دەبوایە ئەو ئافرەتانەی لەسەر خەتەنە کرنی ئافرەت ئەو هەموو هەرایە دەکەن لەسەر کۆچی گەنجان بیانکردایەو حکومەتیان هان بدایە بە ئەرکی بەرپرسیارێتی خۆی هەڵسێت بەرامبەر ئەم کێشەیەی کە ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕۆژێك لە زیادبووندایە.

ئەوەی کە گومانی من زیاد دەکات لەوەی کە حکومەت لەوانەیە ئەجندەی جیهەتگەلێکی تر جێبەجێ بکات ئەوەیە کە لە جیاتی ئەوەی بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ڕێگری لە کۆچی گەنجان بکات کەچی دەچێت یاسایەك دەردەکات بۆ دەرچوانی زانکۆ کە تا ساڵی 2011 کەس دانامەزرێنرێت بۆ ئەوەی گەنجان ئەوەندەی تر بێ هیوا بن و زیاتر ڕوو لە هەندەران بکەن!

هەر کەسێك چاودێریی وەزعی کوردستان بکات لە مەسەلەی کۆچی گەنجان بۆ هەندەران بە ڕوونی بۆی دەردەکەوێت کە حکومەت هیچ هەنگاوێکی نەناوە بۆ ڕێگرتن لەو دیاردەیە وەکو ئەوەی شتەکە هیچ پەیوەندیی بەوەوە نەبێت و ئەو هیچ بەرپرسیارێتییەکی نەبێت بەرامبەر داهاتووی ڕۆڵەکانی ئەم میللەتە کە تەنها موڵکی خۆیان نین بەڵکو موڵکی ئەم میللەتەو هیوای دوارۆژین، بە شێوەیەکی تایبەتتر موڵکی ئەو کچانەن کە بە جێیان دەهێڵن.

بەرپرسانی ئێمە خۆیان بەهەر چییەك بزانن خۆیان بە بەرپرس نازانن بەرامبەر ئەم میللەتەو لە خەمی چارەسەرکردنی کێشەکانیدا نین.

لە کۆتاییی باسی فرەژنیدا دەڵێین: چەند شتێك گرنگە لێرەدا بیزانین:

1ـ ئیسلام داهێنەری ئەم نەریتە نەبووە، بەڵکو لە پێش ئیسلامدا لەناو هەموو گەلاندا هەبووەو بەرەهایی و بە بێسنوور و بە بێ هیچ ڕێنماییەکی بەرچاو لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ ژناندا.

2ـ ئیسلام سنوورداری کردووەو مەرجی بۆ داناوەو ڕێنماییگەلێکی زۆری داناوە بۆ چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ژناندا و تەشریعێکی تێروتەسەلی بۆ ئەم مەسەلەیە داناوە.

3ـ هەر مومارەسەیەك کرابێت لە لایەن پیاوەوە کە پێشێلکردنی ماف و کەرامەتی ئافرەتی تێدابێت ئەوە ئەو کەسانە خۆیان لێی بەرپرسیارن نەك ئیسلام.

## فرەمێردیو گەڕەلاوژێی سێکسی

تا ئێستا کێشەیەك نەبووە بە ناوی زیادی ڕێژەی پیاو تاوەکو بیر لەوە بکرێتەوە ئەگەر ڕێژەی پیاوان زیاد بوو پیاوەکان چی بکەنو لە داهاتووشدا شتی وا ڕوو نادات و هەموو توێژینەوە زانستییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە هەم ڕێژەی لەدایك بوونی کچ لە کوڕ زیاترەو هەم ڕێژەی مردنی پیاو لە ژن زیاترەو تەمەنی پیاو لە ژن کورتترە، دەرەنجامیش بە بەردەوامی زیادەی ڕێژەی ژنە بەسەر پیاودا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا نموونەیەکە لەسەر ناواقیعییەتی خاوەنی ئەم جۆرە بۆچوونانە.

دەڵێم: لەگەڵ ناواقیعییەتی بیرۆکەی فرەمێردی لەگەڵ ئەوەشدا هەر کەمێك گفتوگۆی لەسەر دەکەین، چونکە بانگەشەکەرانی ئەم بیرۆکەیە کوڵ نادەنو دەمو نادەمێك دەیدەن بە گوێی خەڵکیدا.

یەکەم: ئەوانەی بانگەشە بۆ ئەم بیرۆکەیە دەکەن نە لە سروشتی پیاوو نە لە هی ژنو تەنانەت لە فەسلەژەی کاری سێکسیو لە ڕۆڵی هەریەکە لە ژن و پیاو لە ئەنجامدانی کاری سێکسیدا تێنەگیشتوون. بۆ ئەوەی نزیکی بکەمەوە لە تێگەیشتنیان سەرنجیان رادەکێشم بۆ ئەو ململانێو زۆرانبازیو شەڕەی لە نێوان زۆربەی گیانلەبەراندا ڕوودەدات لە وەرزی جووتبووندا. ئەمەش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕۆڵی نێرینە لە ئەنجامدانی کاری سێکسیدا پۆزەتیڤ و ڕۆڵی مێینە نێگەتیڤە، واتە ئەنجامدانی کاری سێکسی زیاتر پیاو بڕیاری دەداتو ئەگەر ئامادەباشی تێدا نەبێت ئەوا هەرگیز ئەو کارە ئەنجام نادرێت.

ژن گەر دەسەڵاتی بەسەر یەك پیاودا نەبێت، دەسەڵاتی بەسەر زیاتر لە یەك پیاودا چۆن دەبێت؟ ئەگەر ئەو ژنە سکی پڕ بوو، چۆن بزانێت منداڵی کامیانە، گریمان ئەمڕۆ بە هۆی هەندێك ئازمایشەوە دەتوانرێت ئەوە بزانرێت، بەڵام خۆ دونیا تەنها ئەمڕۆ نییەو تەنها ئەو وڵاتانە نییە کە لە ڕووی زانستەوە پێشکەوتوون، ئەگەر ئەو ژنە کەوتە حەیزەوە یان کەوتە زەیستانییەوە ئەو چوار پیاوە چی بکەن؟ ئەگەر ئەو ژنە لە ئەنجامی سکپڕی لە یەکێك لە پیاوەکانەوە کەوتە زەستانییەوە پیاوەکانی تر تاوانیان چییە مانگەو نیوێك چاوەڕوان بن. ئاشکرایە کە توانا و ئارەزووی سێکسیی پیاو لە هی ژن زیاترە، ئەگەر پیاوێك چەند ژنی هەبێتو ئارەزووی زۆر بێت دەتوانێت بچێتە لای زیاتر لە یەك ژن، ئەی ئەگەر ژنێك زیاد لە یەك مێردی هەبوو، یەکێك، یان دوان لە مێردەکانی بەو شێوەیە بوون، چارەسەریان چی دەبێت؟

ئەگەر ئەو ژنە منداڵێکی کۆرپەی لە یەکێك لە پیاوەکان هەبوو، لە نۆرەی پیاوەکانی تردا چیی لێبکات، لەگەڵ خۆیدا بیگەڕێنێت یان لە لای باوکەکەی بەجێی بهێڵێت.

لەوانەیە بڵێی با دایەنی بۆ بگرێت، ئەی ئەگەر توانای نەبوو، یا هەر کەسێك نەبوو ئامادەبێت چەند شەوو ڕۆژ بەسەر یەکەوە دایەنی بکات.

لەوانەیە بڵێی: با پیاوەکە خۆی بە شیری دەستکرد بەخێوی بکات، ئەی ئەگەر لەو سەردەمانەی کە شیری دەستکرد نەبووە چی؟ ئەی ئەگەر دایکەکە بە شیری خۆی بەخێوی دەکرد، ئەوکاتە چی بکەن؟

ئایا پیاوەکانی تر ڕازی دەبن گریانو ئەرکی ساوای پیاوێکی تر هەڵگرنو ژنەکەیان لە سەرەی ئەواندا بە منداڵی پیاوێکی ترەوە خەریك بێت؟

ئاشکرایە کە لە کاری سێکسیدا پیاو بکەرە و بە سەد ژن ناتوانن پیاوێك دەلاقە بکەن یان وای لێبکەن کارێکی سیکسیی ئەنجام بدات گەر خۆی ئارەزووی نەبوو یان توانای نەبوو، بەڵام پیاوێك بە تەنها دەتوانێت چەند ژن لاقە بکات، ئەگەر وا ڕێك کەوت یەکێك لە پیاوەکان لە نۆرەکەی خۆیدا ئارەزووی نەبوو یا توانای نەبوو یان ماوەی نەبوو لەبەر هەر هۆیەك و ڕۆژی دووەمو سێیەم ئارەزووی جووڵا ئایا دەتوانێت ئەو ژنە لە مێردەکانیتری بسەنێتەوە بۆ ئەوەی کاری سەرجێیی لەگەڵدا بکات؟ ئاشکرایە کە ژنەکە خۆی دەسەڵاتی نییە، کەواتە دەبێت پیاوەکانی تر ڕازیی بن، ئەی ئەگەر ڕازی نەبوون چی؟

ئەگەر ئەو ژنە کەوتە تەمەنی بێ ئومێدیو چیتر توانای منداڵبوونی نەماو ئارەزووی سێکسیی کەم بوویەوە، ئایا چارەی ئەو پیاوانە چی بێت، بە تایبەت ئەوەیان کە هێشتا منداڵی لێ نەبووە.

پیاوێك ئەگەر چوار ژنیشی هەبێت دەتوانێت لە یەك ماڵدا دایانبنێتو کۆنترۆڵیشیان بکات، بەڵام ئایا ژنێك چوار مێردی هەبێت دەتوانێت لە یەك ماڵدا دایانبنێت؟ ئەو بەم حاڵەی ئێستای ناتوانێت بەسەر یەك پیاودا زاڵ بێتو کۆنترۆڵی بکات، ئەوکاتە چۆن دەتوانێت زیاد لە یەك پیاو کۆنترۆڵ بکات.

ئاشکرایە کە سروشتی پیاو جیاوازە لە هی ژن، پیاو زیاتر پەنا دەباتە بەر هێزو بازوو بۆ چارسەرکردنی کێشەکانی، واقیعیش ئەمە دەسەلمێنیٚو هەمووئەو شەڕو شۆڕەی لە دونیادا روودەدات راستیی ئەم بۆچوونە دەردەخات، ئەم سروشتەش لە پیاودا وادەکات رۆژانە سەدانو هەزاران پیاو بە سەر و قاچ شکاوی ببرێنە خەستەخانەو دادگاکان پڕ دەبن لە کێشەی شەڕی نێوان مێردەکان لەسەر کێشەی نۆرەو نۆرەبڕیو هتد.

ئەگەر پیاوی فرەژن ژنێکی لەوانی تر خۆشتر بووێت، ژنەکانی تر ناتوانن شتێکی ئەوتۆ بکەن یان لێپرسینەوە لەگەڵ پیاوەکەدا بکەن یان لەگەڵ ئەو ژنەدا و ناچاری بکەن دەست لەو کارە هەڵبگرێت، بەڵام ئەگەر ژنێك کە چەند مێردی هەیەو یەکێکیانی لەوانی تر زیاتر خۆش بووێت یان مەیل بە یەکێکیان زیاتر لەوانی تر بدات، هەڵوێستی پیاوەکانی تر چی دەبێت؟ حەتمەن ئەو وەزعە قبوڵ ناکەنو پەلاماری ئەو ژنو مێردە دەدەنو سەروگوێیان دەشکێنن.

ئەگەر یەکێك لەو پیاوانە لەوانی تر دەسەڵاتدارتر بێت، ئایا رازیی دەبێت ئەوانی تر وەکو ئەو یەکسان بن لە بەشەکەیاندا یان بیٚ بەشیان دەکاتو قسەش بکەن دەمو ددانیان دەشکێنێت. ئاشکراشە کە ژن لەبەر ئەوەی لە رووی لاشەوە لە پیاو لاوازترە لەو شتانەشدا ناتوانێت خاوەنی بڕیار بێتو بڕیار هەر بەدەست پیاو دەبێت.

بە کورتی ئەم بیرۆکەیە ئەوەندە بیٚ بایەخو بیٚ نرخە نازانی چۆنی گفتوگۆ لەسەر بکەیتو وەك وتم تەنها بۆ دژایەتیکردنی ئیسلامەو هیچی ترو بیٚ ئاوڕدانەوە لە واقیعییەتی ئەو ئەڵتەرناتیڤە. بۆیە بە پێویستی نازانم لەوە زیاتر لە سەری بڕۆمو ئەوەش کە دەیەوێت پێچەوانەی ئەمانەی ئێمە بسەلمێنێت وەك ئەوە وایە بیەوێت بە بێژنگ بەری خۆر بگرێت لە گەرمەی نیوەڕۆدا یان کەسێکە گومانی هەبێت لە روناکی رۆژو تاریکی شەو، ئەوکاتەش هیچ قسەیەك سوودی نابێت لەگەڵیاندا وەکو شاعیری عەرەب دەڵێت:

**وليس يستقيم في الاذهان شيئ        اذا احتاج النهار الى دليل**

واتە: هیچ راستییەك لە مێشکدا ناچەسپێت ئەگەر رۆژ پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە هەبێت لەسەر روناکییەکەی.

لە کۆتاییدا دەڵێم: ئەگەر بتەوێت فرەمێردی بەرپا بکەیت دەبێت پێش هەموو شتێك چەند شتێك بکەیت:

<u>یەکەم:</u> رۆڵی ئافرەت لە ئەنجامدانی کاری سێکسیدا بکە بە ئیجابیو رۆڵی پیاو بە سلبی، واتە ئەندامەکانیان بگۆڕیتەوە، چونکە ئاشکرایە کە ئەندامی پیاو لە هەموو کاتێکدا ئامادەی ئەنجامدانی کاری سێکسیی نییەو دەبێت گۆڕانکاری بەسەردا بێتو ئامادەبێت بۆ ئەو کارە، بەمەش دەوترێت رۆڵی ئیجابی لە کاتێکدا کە ئەندامی سێکسی ئافرەت هیچ ئامادەییەكو گۆڕانکارییەکی ناوێت، بەمەش دەوترێت رۆڵی سلبی.

<u>دووەم:</u> دەبێت هێزو بازوو و توانای بەدەنی ئافرەت زیاتر بکرێت لە هی پیاو بۆ ئەوەی بتوانێت زاڵ بێت بە سەر پیاوەکانیدا و بتوانێت لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکاتو دەسەڵاتی بەسەریاندا هەبێت بۆ ئەوەی بڕیار بە دەستی خۆی بێت نەك بە دەستی پیاوەکان.

<u>سێیەم:</u> مەسرەفی ماڵ بکێشێت لە دابینکردنی خانوو و بژێوی بۆ ماڵەکانی بۆ ئەوەی ئەو بەرپرس بێتو دەسەڵاتی هەبێت بەسەر پیاوەکاندا.

بە کورتی دەبێت ژن ببێت بە پیاوو پیاویش ببێت بە ژن، واتە هیچمان نەکردو گەڕاینەوە بۆ خاڵی سفر.

## مافی ژن لە مەسەلەی تەلاقدا

مافی ژن لە تەلاق وەرگرتن ئەوە شەرع پێی بەخشیوە، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ ژن هەبووە چووە بۆ لای پێغەمبەر و داوای جیاکردنەوەی کردووە لە مێردەکەی لەبەر ئەوەی کە توانای سێکسیی کەمە. نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو تەنانەت گەر جوانیی پیاوەکە یان رەوشتی بە دڵ نەبووایە بۆی هەبوو داوای جیابوونەوە بکات، ئەمەش بابەتێکە لە شەرعدا پێی دەوترێت (باب الخلع).

بەنیسبەت مافی ژنیشەوە بە بوونی زیاد لە یەك مێرد ئەوا لەمەوبەر وەڵامان دایەوە تەنها شتێك ماوە بیڵێین کە ئەویش ئەوەیە گەر ئەم نووسەرانە راست دەکەن با رێگە بە ژنەکانیان بدەن زیاد لە یەك مێردیان هەبێت، بزانە دەتوانن؟!

ئەوانەی دەڵێن با ژنێکیش زیاد لە پیاوێکی هەبێت ئایا مەبەستیان ئەوەیە کە تەنها ژنان لە یەك پیاو زیاتریان هەبێت یان پیاوان و ژنان هەریەك چەند هاوسەریان هەبێت؟ ئاشکرایە کە ئەگەری یەکەم نابێت، چونکە تاکو ئێستا رێك نەکەوتووە ژمارەی پیاوان لە ژنان زیاتر بێت و لە داهاتووشدا شتی وا رێك ناکەوێت. کەواتە دەبێت ئەگەری دووەم بێت، واتە پیاو و ژن هەریەکەو چەند هاوسەرێکی هەبێت، ئەوکاتە بیهێنە بەرچاوی خۆت دەبێتە چی گەرەلاوژێیەك، وای لێدێت سەگ خاوەنی خۆی نەناسێت و وەکو بە عەرەبی دەڵێن **(یختلط الحابل بالنابل)**.

## ئیسلام و مۆسیقا

هەندێك کەس رەخنەی ئەوە دەگرن لە ئیسلام کە رێ بە گوێگرتن لە مۆسیقا نادات، ئێمە لێرەدا بە کورتی لە سەری دەدوێین و هەر کەسێکیش بیەوێت زیاتر شارەزایی لەو بوارەدا پەیدا بکات دەتوانێت بگەرێتەوە بۆ هەندێك سەرچاوەی ئیسلامی.

سەرەتا فەتوای چەند زانایەکی برواپێکراو دێنین و دواتریش قسەی خۆمانی لەسەر دەکەین.

ئیمامی غەزالی دەفەرموویت: **"اللهو مروح للقلب، و مخفف عنه أعباء الفكر، و القلوب اذا أكرهت عميت، و ترويحها اعانة لها على الجد، فالمواظب على التفقه – مثلا – ينبغى ان يتعطل يوم الجمعة، لأن عطلة يوم تبعث النشاط في سائر الأيام، و المواظب على نوافل الصلوات في سائر الاوقات ينبغي ان يتعطل في بعض الأوقات، ولأجله كرهت الصلاة في بعض الأوقات. فالعطلة معونة عاى العمل، و اللهو معين على الجد، ولايصبر على الجد المحض والحق المر الاّ نفوس الأنبياء عليهم السلام – فاللهو دواء القلب من داء الأعياء والملل، فينبغى ان يكون مباحا، ولكن لاينبغى أن يستكثر منه، كما لايستكثر من الدواء. فالسماع من جملة المباحات، من حيث انه سماع صوت طيب موزون مفهوم، وإنما تحريمه لعارض خارج حقيقة ذاته.. و من لم يحركه الربيع و أزهاره، و العود وأوتاره، فهو فاسد المزاج، ليس له علاج.**

من هەموو پەرەگرافەکەت بۆ ناگۆرمە سەر کوردیی، چونکە پێشەکیە بۆ ئەو چەند دێرەی دوایی کە هێڵم هێناوە بە ژێریدا و راستەوخۆ باسی گۆرانیی و مۆسیقا دەکات.

دەفەرموویت: گۆرانیش یەکێکە لەو شتانەی کە رێگەی پێدراوە، لەو رووەی کە گوێ گرتنە لە دەنگی خۆشی کێشداری مانادار، حەرام کردنەکەشی لەبەر شتێکی کەیە لە دەرەوەی گۆرانیەکە (مەبەستی ئەوەیە کە لە مەجلیسی مەشروب خواردنەوە یا لە کاتی عیبادەتەکاندا بێت). هەر کەسێکیش بەهار و گوڵەکانی و عود و داوەکانی نەیجوڵێنن ئەوا میزاجی تێك چووە و چارەسەری نییە.

ئیبن تەیمیەش کە بە توندترین کەس دادەنرێت لەو بوارانەدا و سەلەفیەکان خۆیان بە شوێنکەوتووی ئەو دەزانن، وەکو هەموو زانایانی تر ئەو گۆرانییانەی وشەکانیان شتی ناشەرعی و وروژێنەری تێدا نییە بۆ غەریزەجنسییەکان بە شتێکی رێگەپێدراو دەزانێت و دەفەرموویت: **"السماع المباح، الذي رخص فيه رسول الله ﷺ للأمة، رفعا للحرج من حياتها،**

**فلقد رخص النبى ﷺ في أنواع من اللهو في العرس و نحوه، كما رخص للنساء ان يضربن بالدف في الأعراس و الإفراح، رفعا للحرج. و من هذا الباب، باب الرخصة في اللهو، حديث عائشة (رضي الله عنها) لما دخل عليها ابوها (رضي الله عنه) في أيام العيد، و عندها جاريتان من الانصار تغنيان بما تقاولت به الانصار يوم بعاث، فقال ابوبكر(رضي الله عنه): أبمزمار الشيطان في بيت رسول الله ﷺ؟** فقال صلى الله عليه و سلم" دعهما يا أبابكر، فإن لكل قوم عيدا، و **هذا** عيدنا أهل الإسلام". "فان السماع **الذى** يفعل كما تفعل سائر الأفعال التى **تلتذ** بها النفوس، و إن كان فيها نوع من اللهو و اللعب، كسماع الاعراس و غيرها، مما يفعله الناس لقصد **اللذة** و اللهو، لا لقصد العبادة و التقرب الى الله فهو من المباحات".

واته: گۆرانی ڕێگە پێدراو، ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پێداوە بۆ ئومەتەکەی، بۆ ئەوەی هەست بە گوناھ نەکەن، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بە هەندێك جۆر لە گۆرانی دابوو لە شاییدا هەروەکو چۆن ڕێگەی بە ژنان دابوو دەف لێدەن لە شایی و خۆشییەکاندا، لەم بوارەدا، بواری مۆڵەت دان بە کەیفخۆشی کردن، فەرمودەکەی عائیشە (خوا لێی رازی بێت) کاتێك باوکی چوو بۆ لای لە ڕۆژانی جەژندا دوو کچە ئەنصاریی گۆرانییان دەووت لەوانەی کە لە ڕۆژی بوعا**ثدا** دەیانگوت، ئەبوبکر فەرمووی:

ئایا زوڕنای شەیتان لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ لێدەدەن؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، ئەی ئەبوبکر لێیان گەڕێ، هەموو گەلێك جەژنی هەیە, ئەمەش جەژنی ئێمەی موسڵمانانە.

"جا گوێ گرتن لە گۆرانی وەکو هەموو ئەو کارانەیە کە دەروونی مرۆڤ چێژی لێوەردەگرێ با جۆرێك لە رابواردن و خۆخلەفاندنی تێدا بێت وەکو ئەوەی خەڵکیی لە جەژنەکاندا دەیکەن لە رووی کەیف و خۆشییە نەك بە مەبەستی عیبادەت و لە خوا نزیك بوونەوە، "مەبەستی ئەو دەروێشانە بووە کە بە دەف و سەما عیبادەتیان کردووە". ئەم جۆرە شتانە ڕێگە پێدراون.

(ابن حزم)یش رەخنە لە هەموو ئەو فەرمودانە دەگرێت کە لە سەر گۆرانی و مۆسیقا هاتووە و بەو کەسانەی کە لە روانگەی ئەو فەرمودانەوە گۆرانی حەرام دەکەن لە ئەنجامی تێنەگەیشتنیان لە زانستی فەرمودە دەزانێت و بە هەڵەیەکی گەورەی دادەنێت.

ئیمامی قورتوبیش کە یەکێکە لە گەورە فەقیھ و راڤەکەرانی قورئان ئەو گۆرانیانە بە حەرام دەزانێت کە غەریزەی جنسیی مرۆڤ دەجولێنن و بە ئافرەتدا هەڵدەدەن و هانی بەرەلایی دەدەن, ئەو جۆرە گۆرانییانەی کە شیعرەکانیان باسی جوانی ژنان و لەش و لاریان و ستایشی عەرەق و شتە حەرامەکان دەکات گومان نییە لە حەرامییاندا، چونکە کات بەسەربردنە لە شتی زەم کراودا، بەڵام ئەوەی کە ئەو جۆرە شتانەی تێدا نییە ئەوە حەڵاڵە بۆ کاتی خۆشیی وەکو شایی و جەژن و کاتی ئەنجامدانی ئیشی سەخت, سەبارەت بە تەپڵیش لە کاتی شەڕدا ئەوە هیچ حەرەجێکی تێدا نییە (واتە ئاساییە), چونکە سەربازان دەوروژێنێت و دوژمنان دەترسێنێ.

وتووشیانە (مەبەستی زاناکانە) تەپڵ (دەهۆڵ) لە شاییدا وەکو دەف وایە, بە هەمان شێوە ئامێرەکانی تر کە لە کاتی شاییدا بە کاردێت بەکارهێنانی ڕێگەپێدراوە بەو مەرجەی وشەکانی جوان بن و قسەی بێ شەرمی و ناڕەوای تێدا نەبێت.

دوا فەتواش لە سەر گۆرانی و مۆسیقا فەتوای یەکێکە لە زانا گەورەکانی ئەزهەر کە شێخی ئەزهەر بوو، سەرۆکی کۆڕی توێژینەوە ئیسلامییەکان و یەکێك لە دیارترین زانایانی سەردەمی خۆی ئەویش (شێخ مەحمود شەلتوت)ە کە بە فەتوایەکی تێرو تەسەل وەڵامی پرسیارێك دەداتەوە کە لێی دەکرێت دەربارەی گۆرانی و مۆسیقا و لە دواییدا رای زانا کۆنەکان دێنێتەوە لەسەر گۆرانی و مۆسیقاو دەڵێت:

"من وام دەبینی (قەناعەتم وا بوو) کە ئەوەندە بەس بێت بۆ زانینی حوکمی شەرع لە مۆسیقا و هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ حەزی لێدەکات بە سروشت ئەگەر کەسانێك نەبوایە ئیکتفا بەوەندە ناکەن, بەڵکو لەوانەشە باوەڕ بەم جۆرە ڕێنماییانە نەکەن بۆ زانینی حەڵاڵ و حەرام و بەوە قەناعەت دەکەن کە قسەی زانا کۆنەکانیان بۆ باس بکەین لەو رووەوە.

با ئەو کەسانە بزانن کە زانایان کۆکن لە سەر رێگەپێدانی گۆرانی لە رێگای حەجدا بەو شیعرانەی کە شەوقی حاجیان بۆ زیارەتی ماڵی خوا زیاد دەکات, بۆ هاندانی سەربازان لە شەڕدا, لە بۆنەکانی خۆشیدا وەکو جەژن و شایی و بۆ پێشوازی کردن لەوانەی لە دوورەوڵات دەگەڕێنەوە. لە غەیری ئەم شتانەشدا دوو بۆچوونیان هەیە: کۆمەڵێکیان رایان وایە حەرامە و پشت بە هەندێك فەرموودەو قسەی پێشینان دەبەستن, کۆمەڵێکی تریش بە حەڵاڵی دەزانن بە پشت بەستن بە فەرموودەو قسەی پێشینان (واتە صەحابە و تابعی)و بەڵگەشیان ئەوەیە کە دەڵێن: "نە لە قورئان و نە لە سوننەتی پێغەمبەردا ( فەرموودەو کردەوە)، نە لە پێوانی گونجاوو هەڵێنجانی زانایان (معقول القياس و الإستدلال) شتێك هەبێت دەلالەت بێت لە سەر حەرامی بیستنی دەنگی خۆشی کێش و سەروا دار لەگەڵ ئامێرێك لە ئامێرەکان، بە دوای هەموو ئەو بەڵگانەدا چوون کە دەڵێت حەرامە و بینیویانە هیچیان راست نین.

دوای ئەوە لە ژێر ناونیشانی" **الآصل في السماع الحل و الحرمة عارضة**"دا دەڵێت:

**و اذن فسماع الآلات, ذات النغمات أوالأصوات الجميلة, لا يمكن ان يحرم بإعتباره صوت آلة, أو صوت إنسان, أو صوت حيوان, وانما يحرم إذا استعين به على محرم, أو أتخذ وسيلة الى محرم, أو ألهى عن واجب.**

**وهكذا يجب أن يعلم الناس حكم الله في مثل هذه الشؤون و نرجو بعد ذلك ألاّ نسمع القول يلقى جزافا في التحليل و التحريم, فإن تحريم مالم يحرمه الله أو تحليل ما حرمه الله كلاهما افتراء وقول على الله بغير علم (قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِاللّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَاناً وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ) (الأعراف: 33).**

واتە: گۆرانی لە بناغەدا حەڵاڵە و حەرامییەکەی بە هۆی شتی ترەوەیە. کەواتە گوێ گرتن لە ئامێرە ئاوازدارەکان یا دەنگە خۆشەکان نابێ حەرام بکرێت لەبەر ئەوەی کە دەنگی ئامێرێکە, یان دەنگی مرۆڤێکە, یان دەنگی گیانلەبەرێکە بەڵکو لەبەر ئەوە حەرام دەبێت ئەگەر پەنای بۆ ببرێت بۆ ئەنجامدانی شتێکی حەرام یان ببێتە هۆیەك بۆ شتی حەرام یا ببێتە هۆی فەوتاندنی ئەرکێکی ئایینی (وەکو نوێژ).

بەو شێوەیە دەبێ خەڵکیی حوکمی خوا بزانن لەو جۆرە شتانەدا و بە هیوای ئەوەی دوای ئەوە قسەیەك نەبیستین کە هەروا بە بێ بنەمادەکرێت لە حەڵاڵ کردن و حەرام کردندا، چونکە حەرام کردنی شتێك کە خوا حەرامی نەکردووە یان حەڵاڵ کردنی شتێك کە خوا حەرامی کردووە هەردوو حاڵەتەکە قسە هەڵبەستن و بوختان کردنە بەدەم خواوە و قسە کردنە بە بێ زانیاری، خواش دەفەرموویت "بڵێ (ئەی موحەممەد) پەروەردگارم هەموو کارێکی ناشیرین و ناپەسەندی حەرام کردووە لە داوێن پیسی و بەدڕەوشتی و قسەی نابەجێ, ئەوەی بە ئاشکرا دەکرێت یا ئەوەی بە نهێنی و ژێراو ژێر دەکرێت، ستەم و زۆرداریی بە ناحەق و هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا بێ بەڵگەیەك لە لایەن خواوە، بە بێ زانیاری قسە و شت دانە پاڵ خوا". (واتە خوا ئەوانەی حەرام کردووە)

بە کورتی زانایانی ئیسلام بنەمایەکیان داناوە بۆ گۆرانی، ئەویش ئەوەیە کە گۆرانی وەکو قسە وایە, باشەکەی حەڵاڵ و خراپەکەی حەرامە, ئەگەر بۆ بێتاقەتی دەرکردن بێت و مرۆڤ لە یادی خوا غافڵ نەکات و کۆڕی بۆ نەبەسترێت بۆ مەشروب خواردن و کاری ناشەرعی کردن هیچی تێدا نییە و رێگەی پێدراوە.

لەوانەیە گۆرانییەك لە رادیۆو تەلەفزیۆنەوە گوێی لێبگری هیچی تێدا نەبێت، بەڵام ئەگەر لە ئاهەنگێکی تێکەڵ بە مەشروب خواردن و سەما کردن بێت حەرام بێت.

گرنگترین شتیش ئەوەیە کە وەکو شێخ مەحمود شلتوت دەڵێت: گۆرانی خۆی لە خۆیدا ئەگەر وشەکانی جوان و گونجاو بن حەرام نییە بەڵکو حەرامییەکەی لەبەر ئەو شتانە دەبێت کە لەگەڵیا دەکرێن, وەکو کۆڕی مەشروب خواردن و سەما کردنی ژن و پیاو پێکەوە یان لە کاتی عیبادەتدا بێت یان ئەرکێکی ئایینی گەورەت لە دەست بدات.

هەرشتێکی تریش, نەك تەنها گۆرانی و مۆسیقا, با حەلاڵیش بێت ئەگەر ببێتە هۆی فەوتانی ئەرکێکی ئایینی ئەوا حەرام دەبێت, بۆ نموونە گەر لە کاتی نوێژی فەرزدا هەر خەریکی نوێژی سوننەت بیت تا کاتی فەرزەکە نامێنێت ئەوا ئەو نوێژە سوننەتە حەرام دەبێت.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە کە ئەو سەردەمەی ئەو فەتوایانەی تێدا دراوە رادیۆ و تەلەفزیۆن نەبووە کە خەڵکیی لە ماڵی خۆیانەوە یان لە شوێنی خۆیانەوە گوێی لێبگرن یان تەماشای بکەن، بەڵکو دەبوایە بە تایبەت بۆی بچن و کاتی بۆ تەرخان بکەن و کاتەکەش جاری وا بووە زۆر بووە و هەندێك جاریش مەشروب خواردنی تێدا بووە, بە کورتی لە زۆرێك لەو ئاهەنگانەی ئەمڕۆ دەچوو کە بۆ هەندێك گۆرانیبێژ دەگێڕێت و چەند سەعات دەخایەنێت و کاری ناشەرعیی تێدا دەکرێت.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە کە ئامێرە مۆسیقییەکان لەبەر خودی خۆیان زەم نەکراون (ئەگەر لە گریمانێکدا ئەو فەرمودانە راست بن)، بەڵکو لەبەر ئەو شتە دەرەکیانە بوو کە باسمان کرد, ئەگینا دەبینی لە شەڕ و شایی و خۆشیدا کە هەریەك ئامێری تایبەتی خۆی هەیە رێگەیان پێدراوە.

ئەمە راماندەکێشێت بۆ لایەنێکی گرنگ لە مۆسیقا کە ئەویش مۆسیقای وێنەکێشی (دەربڕین) (الموسقی التصویریە)یە کە لە فیلمی سینەمایی و تەلەفزیۆنی و شانۆییدا بەکار دێت بۆ کێشانی وێنەی حاڵەتێك, بۆ نموونە مۆسیقای کاتی ترس یان کاتی دڵەڕاوکێ, یان دیمەنی خەفەت یا دیمەنی خۆشی یا دیمەنی شەڕ، هەروەها کە ئەمانە هەمووی بەشێکی گرنگن لەو فیلمانە و بە بێ ئەو مۆسیقا وێنەکێشییە تام و چێژ لەو فیلمە نابینرێت و تەماشاکەر باش لە دیمەنەکان تێناگات.

گومانیشی تێدا نییە کە سینەماو تەلەفزیۆن ئامێرێکن خۆیان لە خۆیاندا حەرام نین، بەڵام ئەگەر فیلمی بەدڕەوشتییان تێدا لێبدرێت یان فیلمی سوکایەتی کردن بە خواو بە ئایینی خوا ئەو کاتە تەماشاکردنیان حەرام دەبێت مەگەر بۆ کەسانێك بیانەوێت وەلامیان بدەنەوە (ئەڵبەتە هی جۆری دووەمیان نەك هی بەدڕەوشتییەکە).

هەروەها دەنگی خۆش و ئاوازی خۆشیش ئەگەر بۆ دەرکردنی بێتاقەتی بێت یان بۆ چالاك کردنەوەی مێشك و نەهێشتنی ماندووبوون بێت شتێکی ئاساییەو حەلاڵە، بەڵام لە کۆڕی مەشروب خواردننەوە و سەمای ژن و پیاو پێکەوە حەرامە.

## دەرئەنجامی باسەکە

ئەمە رای زانایان بوو لە کۆن و نوێدا، رادیۆو تەلەفزیۆنی لایەنە ئیسلامییەکان و کەناڵە ئاسمانییە ئیسلامیەکانیش هەموو مۆسیقا و گۆرانی لێدەدەن، ئیتر ئایا ئەوان راست دەکەن یان ئەم نووسەرە چەپانە کە بە نەزانی و بە ناحەزانە باسی ئیسلام دەکەن؟

بە کورتی گوێگرتن لە مۆسیقاو گۆرانی روخسەتێکە موسڵمان بۆی هەیە بیکات، ئەگەر بێتاقەتیەکەی بەوە دەردەچێت, یان لەبەر هێز و جوانی وشەکانی حەماسەتی دینی وعەشقی خوا و پێغەمبەری لە دڵدا زیاد دەکات یان لەبەر هەرهۆیەکی تر بە چەند مەرجێك, یەکەم زیادەڕەوی تێدا نەکات و شەو و رۆژ خەریکی نەبێت و بە ئەندازەیەکی مەعقول بێت. دووەم وشەکانی نەگونجاو نەبێت. سێهەم شتی ناشەرعیی لەگەڵدا نەبێت، بەڵام ئەگەر کەسێك بێتو دوای عەزیمە بکەوێت و کاتی خۆی هەمووی لە شتی جددیدا بە سەر ببات ئەوە مافی خۆیەتی، بەڵام بەو مەرجەی ئەو شتەی بۆ خۆی هەڵبژاردوە فەرز نەکات بە سەر سەرجەم خەڵکیدا.

## نهێنییەکانی دروشمە عیبادییەکانی ئیسلام

هیچ ئایینێك نییە وەکو ئیسلام هەموو شتێکی بەڵگە بێت لەسەر سەرچاوە خواییەکەی، هەر لە کتێبەکەی و شەریعەتەکەیەوە تا سیستمە ئەخلاقییەکەیو تەنانەت دروشمە پەرستشییەکانیشی.. ئەمەش زیاتر بۆ ئەو کەسانە دەردەکەوێت کە شارەزانو بەراورد دەکەن لە نێوان ئایینە جۆراوجۆرەکاندا و بە ئینصافن و عەودالّی راستین نەك ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشەو دڵو مێشکی خۆیان لە ئاستی راستییەکان دادەخەن، یان ئەوانەی نەشارەزانو توانای تێگەیشتنو بەراوردکردنیان نییە. شایەتیی ئەو هەموو زاناو پسپۆڕو گەورەپیاوە رۆژئاواییانەی موسڵمان دەبن لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لە ئیسلام گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەم راستییە، ئەوەیشی دەیەوێت لە نزیکەوە ئەم راستییە بزانێت با کتێبی **(رجال ونساء أسلموا)** بخوێنێتەوە کە لە چەند بەرگێکدا نووسراوە، یان سایتی ئیعجازی قورئان تەماشا بکات لە تۆڕی ئینتەرنێتدا.

بە نیسبەت ئایینەکانی تریشەوە لەبەر بێناوەرۆکی پەنا دەبەنە بەر مۆسیقاو شتی تر بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو کەموکورتیانەی پێ بکەنەوە، هەر ئایینێکی تر کتێبێکی وەکو قورئانی هەبوایە کە بەو هەموو ئاوازە جوانە دەخوێنرێتەوە و ئەو هەموو کێشو هاوسەنگییەی تێدایە پەنای نەدەبردە بەر شتێکی تر، پێغەمبەریش (سەلامی خوای لێ بێ) گرنگی دەنگخۆشیی زانیوە بۆیە فەرموویەتی: **(زينوا القرآن بأصواتكم)**. واتە: قورئان برازێننەوە بە دەنگەکانتان.

**وفي لفظ عند الدارمي "حسنوا القرآن بأصواتكم، فإن الصوت الحسن يزيد القرآن حسنا)**. واتە: قورئان جوان بکەن بە دەنگەکانتان، چونکە دەنگی خۆش لە جوانی قورئان زیاد دەکات.

ئەو ئارامییە رۆحیو دەرونییەی لە پەرستشە ئیسلامییەکاندا بەدەست دەهێنرێت لە پەرستشی هیچ ئایینێکدا بەدی ناکرێت، بپرسە لەوانەی دەچن بۆ حەج با باسی حاڵی خۆیانتان بۆ بکەن لە رووی دەروونیو رۆحییەوە یان ئەو چێژەی رۆژووەوان هەستی پێدەکات لە کاتی پارشێوو بەربانگدا، یان ئەوانەی گوێ لە قورئان دەگرنو لێی ورد دەبنەوەو ئەوانەی بە دڵو مێشکێکی ئامادەوە دەیخوێننەوە. ئەگەر کەسێك دەیەوێت زیاتر لە نهێنییەکانی پەرستشە ئیسلامییەکان تێبگات با یەکێك لەم کتێبانە بخوێنێتەوە:

یەکەم: (**أحياء علوم الدين**)ی ئیمامی غەزالی.

دووەم: (**حجة الله البالغة**)ی **ولي الله الدهلوي**.

سێهەم: (**الأركان الأربعة**)ی **ابوالحسن الندوي**.

چوارەم: (**العبادة في الإسلام**)ی **يوسف القرضاوي**.

شایانی باسە هەندێك لەوانەی موسڵمان بوون دیمەنی نوێژی جەماعەت سەرنجی راکێشاون و هەر لەوەوە بۆیان دەرکەوتووە ئەم دروشمەی کە بەم شێوە رێکوپێکە دەکرێت نابێ لە دانانی مرۆڤ بێت، هەروەها هەموو پەرستشەکانی تری ئیسلام لە رۆژووگرتنو حەجو زەکات هەمووی گەر لێی وردبیتەوەو لە نهێنییەکانی تێبگەیت دەگەیتە ئەو دەرئەنجامەی کە دانەری ئەم پەرستشانە کەسێکی زاناو دانایە کە ئەویش تەنها خوایە.

زانستی نوێش ئەمڕۆ زۆرێك لە نهێنییەکانی ئەو پەرستانەش دەرخستووە و سەلماندوویەتی کە هەریەك لەوانە حیکمەتی خۆی تێدایەو هیچێکی بێ سوود نییە، چ لە رووی لاشەیی، چ لە رووی دەروونی، چ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، شایەتییەکانی مەریەم نووریش کە ئافرەتێکی ئەرمەنییە بەڵگەیەکن لەسەر ئەم قسانەو ئەگەر کەسێکیش زانیاریی زیاتری دەوێت با بچێت لە تۆڕی ئینتەرنێت دا بگەڕێت بزانە چەند نهێنی سەیر و گەورە لەم دروشمە عیبادییانەدا هەیە هەر لە دەستنوێژگرتنو قورئان خوێندنو دوعاو پاڕانەوە تاکو نوێژو حەجو رۆژوو و زەکاتو هتد..

## زانست و ئازادیی لە  کۆمەڵگەی ئیسلامیدا

بایەخی ئیسلام بە زانست شتێك نییە کەس نەیزانێت مەگەر کەسانێکی ناحەزو بێ ئینصاف کە نەیانەوێت دانی پیدا بنێن، ئەگینا ئایینێك یەکەم شتی بە فەرماندان بە خوێندنو خوێندنەوە دەست پێبکات و بە هەڵگری پەیامەکە بڵێت (إقرأ) و پاشان سەرنجی رابکێشێت بۆ دروستکردنی مرۆڤو ئاماژە بدات بە زانستو پێنووس لە یەکەم سوورەتیدا چۆن تاوانبار دەکرێت بەوەی کە دژی زانستە. ئەم ئایەتانەم لەگەڵدا بخوێنەرەوەو بیری لێبکەرەوەو حوکمی خۆت بدە: **" اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ * الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ". (العلق:1ـ 4). " قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ..". (الزمر : 9 ). " إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء..". (فاطر : 28 )**. واتە بەندە زاناکان لە خوا دەترسن. پێغەمبەریش دەفەرمووێت: **"أطلب العلم ولو بالصين"**.، دەفەرمووێت: **"أطلب العلم من المهد الى اللحد"**.، دەفەرمووێت: **"أطلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة". "إن الملائكته تضع أجنحتها لطالب العلم"**.
ئەمانە برێکی زۆر کەمن لەو رێنماییانەی کە هانی زانستو فێربوون دەدەنو مێژووی ئیسلامیش بە درێژایی چەند سەدە شایەتن لەسەر پێشکەوتنیان بەسەر هەموو گەلانی دونیاداو شایەتی رۆژهەڵاتناسەکانیش لەسەر کاریگەریی ئیسلام لەسەر ئەورووپا گەورەترین بەڵگەن لەسەر بایەخدانی ئیسلام بە زانست. ئەم بابەتەش زۆر دوورو درێژەو لەم چەند لاپەڕەیەدا ناتوانین مافی خۆی بدەنێو هەر کەسێك زانیاریی زیاتری دەوێت با بچێت لە کتێبەکانی فەرموودەدا باسی گرنگی زانستو پلەو پایەی زانایان و گرنگی فێربوونو فێرکردن بخوێنێتەوە یان شایەتی ئەو رۆژهەڵاتناسانە بخوێنێتەوە کە باسی شارستانێتی ئیسلامی دەکەن بۆ ئەوەی دڵنیابێت لەم راستییە.

بەرچاوترین نموونەش میللەتی خۆمانە، بڕوانە چەند جیاوازیی هەیە لە نێوان ئەو بەشەی کورد کە موسڵمانن و ئەوانەی موسڵمان نینو بزانە هەرچی کەڵەپیاو لە ناو کورددا هەڵکەوتووە جگە لە مزگەوت لە هیچ شوێنێکی تردا پێگەیشتوون، بزانە ئەم بایەخەی مزگەوت داویەتی بە زانست لە هیچ پەرستگایەکی تری ئایینیدا بەدی دەکرێت.

بە نیسبەت ئازادییشەوە کە ئەم‌نووسەرانە زۆر پێی لە سەر دادەگرن دەڵێین: ئەوەندەی مرۆڤی موسڵمان یا بە شێوەیەکی گشتیی دانیشتووی جیهانی ئیسلامیی ئازاد بووە، لە جیهانی ئیسلامیدا بە درێژایی حوکمڕانی ئیسلام لە هیچ شوێنو سەردەمێکدا مرۆڤ ئەوندە ئازاد نەبووە.

بە درێژایی و پانایی جیهانی ئیسلامیی هەرکەسێك بیویستایە لە کوێ و چۆن بژی کەس رێی لێنەگرتووە.

دەوڵەت نە دەزگای ئاسایشی هەبووە، نە هەواڵگری (مخابرات) هەبووە، نە دەزگای داپڵۆسێنەری هەبووە، کە چاودێریی خەڵکیی بکەنو هەناسەیان لەسەر بژمێرنو دایانپڵۆسێنن، نە دەخالەتی لە ژیانی رۆژانەی خەڵکیدا کردووە.

داداگاو قازییەکان هەمیشە ئازاد بوونو حکومەت هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نەبووەو دەخالەتی لە ئیشیاندا نەکردووە مەگەر ئەو والیە یان حاکمە خۆی ستەمکار بووبێت. جگە لە دەوڵەتی سەفەوی کە ئەوانیش شیعە بوون، هیچ حکومەتێکی تری ئیسلامی زۆریان لە خەڵکیی نەکردووە مەزهەبیان یان ئایینیان بگۆڕن. بوونی ئەم هەموو مەزهەبو ئایینو تایەفەیە لە وڵاتانی ئیسلامیدا بەڵگەن لەسەر چاوپۆشی ئیسلام.

ئەو ئایەتەی کە لە قورئاندا هاتووە دەربارەی ئازادیی عەقیدە لە هیچ ئایینێکی تردا نییەو گەر هەبوایە گوێی دونیایان کەڕ دەکرد ئەویش ئەوەیە کە دەفەرمووێت: **(لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ..)** شایانی باسیشە ئەم ئایەتە لە کۆتاییەکانی عەهدی مەدینەدا دابەزیوە، نەك لە مەککەدا. دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە ئەمڕۆ وەکو داهێنانێکی ئەم سەردەمە لە پێکهاتەکانی سیستمی عەولەمە دادەنرێت بە باشترین شێوە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەبووە، زۆرێك لە دەزگاکان ناحکومی بوون و هیچ کات حکومەت وەکو هی ئەمڕۆ دەستی نەخستۆتە کاروباری خەڵکییەوەو بەو شێوەیە چاودێریی نەکردوون.

تاقە رەفتارێك کە رێگەی پێنەدراوە ئەوانەن کە یارمەتی بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی و داوێن پیسی و هەڵوەشانەوە کۆمەڵ دەدەن.

شایانی باسە ئیسلام تەنها رێگای لەو شتانە گرتووە کە زیانی هەیە بۆ مرۆڤو کەس ناتوانێ نکوڵی لێبکات، مەگەر کەسانی دەمارگیر.

لە ئیسلامدا نە ئازادیی، نە فەلسەفە، نە رۆشنبیری، نە هونەر پشتگوێ نەخراوە، ئەو قسەیەی کە دەڵێت ئەم شتانە لە لایەن موسڵمانانەوە پشت گوێ خراوە درۆیەکە و هیچ پاڵپشتێکی نییە نە لە ناو بنەماکانی ئیسلامدا، نە لە مێژووی ئیسلامو نە لە واقیعی خۆماندا.

کێشەی مرۆڤایەتی لەوەدایە کە بەو شێوەیە دەرك بە زیانی شتە ماددییەکان دەکات دەرك بە شتە کۆمەڵایەتییو مەعنەوییەکان ناکات.

بۆ نموونە پابەندنەبوون بە یاساکانی هاتوچۆوە هەموو کەسێك دەزانێت چ زیانێکی لێدەکات و کاریگەریی چییە لەسەر هاتوچۆی خەڵکییو دەرئەنجامەکەی یەکسەر دەردەکەوێت، بەڵام بەرتیلخۆریو مەشروب خۆریو بڵاوبوونەوەی زینا زۆر کەس دەرك بە زیانەکانی ناکاتو دەرئەنجامە خراپەکانی یەکسەر نابینن.

هەروەها رێزنەگرتن لە دایكو باوكو لاوازبوونی پەیوەندیی خزمایەتیو رێزنەگرتن لە مامۆستاو هتد.. کۆمەڵێك دەرئەنجامی مەعنەوی و کۆمەڵایەتی خراپی لێدەبێتەوە، بەڵام، چونکە شتانی بەرجەستە نین ناتوانی هەموو کەسێکی قەناعەت پێ بکەیت.

لەم روانگەیەوە دەڵێین هەموو ئەو شتانەی ئیسلام رێگەی لێ گرتووە شتانی زیانبەخشن بۆ مرۆڤو بۆ کۆمەڵگە، بەڵام زیانەکان زۆرجار شتی کتوپڕی نینو لە لایەن هەموو کەسێکەوە هەستی پێناکرێتو بەرجەستە ناکرێت، بەڵکو زۆرجار پێویست بە کەسانی پسپۆڕو شارەزا دەکات بۆ ئەوەی دەرئەنجامە خراپەکانیان دەربخەن..

هەموو کەسێك دەزانێت ئەگەر ماددەیەکی ژەهراوی بچێتە گەدەی کەسێك یان خوێنییەوە چ ئاکامێکی خراپی لێدەبێتەوە، بەڵام کەم کەس کاریگەریی بیروبۆچوونی ژەهراوی لەسەر مرۆڤو کۆمەڵگە دەرك پێدەکات.

یاسا سزای ئەو کەسانە دەدات کە دزیی دەکەن، یان خەڵکی دەکوژن، چونکە لەناوبردنی سامانو ژیانی خەڵکییە، بەڵام کەس هیچ حیسابێك بۆ ئەو کەسانە ناکات کە لە رێگەی هزرو بۆچوونی گەندەڵەوە ئاسودەیی کۆمەڵگە دەشێوێنن یان رەوشتو بیروباوەڕی خەڵکیی تێك دەدەن.

هەرگیز مرۆڤی ئێستا لە مرۆڤی سەردەمی خیلافەتە ئیسلامییەکان ـ بە کەموکورتیشیانەوە ـ ئازادتر نییە، ئەو دەمە هەر کەسێك لە هەر کوێیەك بیویستایە نیشتەجێ دەبوو، هەر ئیشێکی بویستایە دەیکرد (جگە لە وانەی لە رووی شەرعەوە قەدەغەن)، بە هەر زمانێك بیویستایە قسەی دەکرد، لە هەر شوێنێك بیویستایە دەیخوێند، هەر جلێکی بویستایە لەبەری دەکرد (بەو مەرجەی عەورەتی داپۆشیبێو لەگەڵ عورفی کۆمەڵگەدا گونجاو بێت)، نە دەزگای ئاسایش هەبوو، نە هەواڵدەری ئاسایش هەبوو، نە رێکخراوی حزبی هەبوو چاودێریی بکەنو هەناسەکانی لەسەر بژمێرن، نە زیندانی سیاسیی هەبوو، نە کامێرای چاودێری هەبوو، نە مانگی دەستکرد هەبوو، هیچ لەمانە نەبوون کە لە ئازادی مرۆڤەکان کەم بکەنەوە، تەنها چەند شتێك قەدەغە بوون، ئەوانەی کە زیانیان بۆ کۆمەڵگە هەبوو، لەوانە خۆرووتکردنەوەی ئافرەت، مەشروب خواردنەوە بە ئاشکراو هەر رەفتارێك کە پێچەوانەی عورفی کۆمەڵگە بووبێت.

بە نیسبەت رۆشنبیریی و فەلسەفەشەوە کتێبخانەی ئیسلامیی شاهیدە لەسەر بایەخی موسڵمانان بەم بوارانە، کێ فەلسەفەی ئەرستۆی ناساند بە رۆژئاوا، رۆژئاواییەکان خۆیان یان موسڵمانان؟ ئەگەر نازانی بپرسە لە پسپۆڕانی ئەو بوارە با وەڵامت بدەنەوە.

بڕوانە کتێبخانەی ئیسلامیی پێش سەرهەڵدانی چاپخانەکان بزانە کتێبخانە هەیە لە جیهاندا شان لە شانی بدات. بە هەموو میللەتانی دونیاوە ئەوەندەی موسڵمانان کتێبیان نەنووسیوەو نەخوێندۆتەوە.

بڕوانە میللەتی کوردی خۆمان بزانە سەرچاوەی ڕۆشنبیرییەکەی چی بووە و کێ بووە، مەگەر جگە لە ئیسلام هیچی تر بووە.؟

ئەگەر کەسێکیش وا بزانێت ئەم شارستانییەتە ڕۆژئاواییە هەروا لە پڕێکدا پەیدا بوو ئەوا بەهەڵەدا چووەو بۆ شارەزا بوون لە کاریگەریی شارستانێتی ئیسلامیی لەسەر ڕۆژئاوا و شارستانییەتەکەی با کتێبی (**تأثير الإسلام على أوروبا**) لە نوسینی (مونتیگمری وات) یان هەر کتێبێکی تر کە شایەتیی ڕۆژئاواییەکانی تێدایە بخوێنیتەوە.

## ئایا ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسبازە؟!

هەندێك كەس لەم سەردەمی ئیباحییەتەدا ئیسلام تاوانبار دەکەن بەوەی کە ئایینی پیاوی هەوەسبازە، ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین:

ئایا ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسبازە یان ئەو ڕێبازانەی کە بانگەشە بۆ ئازادیی سێکسی ڕەها دەکەن؟

ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسبازە کە فرەژنی لە چوار ژندا کورت دەکاتەوە لە کاتێکدا کە لە کاتی هاتنیدا فرەژنی سنووری نەبوو؟ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو چوار ژنییەشی بە ڕەهایی نەهێشتۆتەوە بەڵکو گرێیدا بە مەرجی توانایی‌و دادپەروەرییەوە. ئەگەر ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسباز بووایە نە سنووری بۆ فرەژنی دادەناو نە مەرجیشی بۆ دادەنا، بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین کە کاتێك ئیسلام ئەو دەسپێشخەرییەی کرد بارودۆخی ژن لە هەموو دونیادا زۆر خراپ بوو و یەك کەس نەبوو لە سەریان هەڵبدات‌و داوای مافیان بکات.

لە کاتێکدا کە ئیسلام کێشەی ئافرەتی وروژاندو باسی مافەکانی دەکرد هیچ ئایین‌و ڕێبازێك نەبوو کەمترین ئاوڕی لە ئافرەت دابێتەوەو کێشەیەك نەبووە بەناوی کێشەی ئافرەت یان مافی ئافرەت یان کێشەی فرەژنی.

ئەگەر بێتو ڕێنماییەکانی ئیسلام دەربارەی ئافرەت بخوێنیتەوەو تەماشایەکی بارودۆخی ئافرەت بکەین لەو سەردەمەدا لە سەرتاسەری دونیادا بە نیمچەدورگەی عەرەب‌و فارس‌و هیندو میسرو عێراقەوە ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێت کە ئیسلام چ گۆڕانکارییەکی کردووەو چ پەیامێکی هێناوەتە کایەوە.

شایانی باسیشە ئەو ڕێنماییانەی ئیسلام دەربارەی ئافرەت زۆربەی کۆمەڵگە ئیسلامییەکانیش لەبەر زاڵی ڕەگەزی پیاوو لەبەر پیاوسالاری تا ئەم سەردەمەش بەرپا نەکراوە.

کەسانێك بە ئیسلام بڵێن ئایینی پیاوی هەوەسباز کە خۆیان مومارەسەی سێکس نەکەن یان لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا بیکەن، یان کەسانێك بن سێکس بە گشتی‌و نێربازی بە تایبەتی بە لایانەوە قێزەون بێت‌و نەفرەت لەم شارستانییەتەی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا بکەن کە گرنگترین دیاردەکانی بریتییە لەبەرەڵایی سێکسی بە هەموو شێوازەکانیەوە، نەك کەسانێك کە ئەم بەرەڵاییەی بە لاوە دیاردەیەکی ئاسایی بێت.

### ئەگەر ئیسلام ئایینی هەوەسباز بووایە

جا ئەگەر ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسباز بوایە:

1- حیجابی بەسەر ئافرەتدا فەرز نەدەکرد کە جوانییەکەی داپۆشێت بەڵکو هانی ڕووتکردنەوەی دەدا وەکو ڕێبازەکانی ئەمڕۆ.

2- تێکەڵی ژن‌و پیاوی قەدەغە نەدەکردو سنووری بۆ دانەدەنا، بەڵکو هانی دەداو ئاسانکاریی بۆ دەکرد.

3- نەزەرو تەماشاکردنی پیاو و ژنی نامەحرەمی بۆ یەکتر قەدەغە نەدەکرد، بەڵکو هانی پیاوانی دەدا باشتر ورد ببنەوە لە جوانی ئافرەت بە بیانووی ئەوەی کە ئەو جوانییە دەسەڵات‌و جوانیی ئیشی خوا دەردەخات وەکو ئەوەی کە هەندێك کەسی نا پابەند بە ئایینەوە دەیکەن.

4- خەڵوەتی پیاوانی بە ژنان حەرام نەدەکرد، تەنانەت ئەگەر بشیەوێت قورئانی فێر بکات.

5- هانی ژنانی نەدەدا بۆ ئەوەی لە ماڵەوە بمێننەوە، بەڵکو هانی دەدان بچنە دەرەوە بۆ ئەوەی پیاوان تەماشایان بکەن و لە جوانییەکانیان ورد ببنەوە.

6- زینا و نێربازیی حەرام نەدەکرد و بە فاحیشەو خراپترین رێگا ناوزەدی نەدەکرد.

7- ژنهێنانی سنوردار نەدەکرد، لە کاتێکدا ئەگەر بە رەهایی و بێ سنوور بیهێشتایەتەوە کەسێك لەو کاتەدا رەخنەی لێ نەدەگرت بەڵکو لەوانەیە خەڵکانێك کە ژنی زۆریان هەبوو زووتر بهاتنایە بە دەم بانگەوازەکەیەوە.

8- رێگای ئازادکردنی کەنیزەکەکانی واڵا نەدەکرد و رێگاکانی بە کۆیلەکردنی قۆرخ نەدەکردەوە لە دیلی شەڕدا، لە کاتێکدا کە کۆیلایەتی لە سەرتاپای دونیادا شتێکی باو و کارپێکراو بوو و هیچ دەنگێك لە هیچ شوێنێکی دونیادا بەرز نەبووبویەوە بۆ نەهێشتنی یان چاککردنی بارودۆخی ژیانیان و هیچ گلەییەك نەدەهاتە سەر پێغەمبەر ﷺ ئەگەر وەکو جاران بیهێشتایەتەوەو هیچ هەوڵێکی نەدایە بۆ نەیهێشتنی کۆیلایەتی یان بۆ چاککردنی باری ژیانی کۆیلەکان.

9- بە ئافرەتانی نەدەوت دەنگتان ناسك مەکەنەوە، نەوەکو سەرنجی پیاوانی دەروون نزم راکێشن بۆ لای خۆتان.

10- ریزی ئافرەتانی لە نوێژدا نەدەخستە دواوە و نەیدەفەرموو باشترین ریزی پیاوان ئەوانەن کە لە پێشی پێشەوەن، هی ئافرەتانیش ئەوانەن کە لە دواوەن، دیارە تا پیاو لە پێشەوەتر بێت کەمتر ماوەی تێکەڵاوی لەگەڵ ژناندا دەبێت و ئافرەتیش تا لە ریزی دواوە بێت کەمتر بواری تێکەڵی پیاو یا بینینی لە لایەن پیاوەوە دەبێت.

11- بۆن و عەتر لە خۆدانی حەرام نەدەکرد لە سەر ئافرەتان لە کاتی چوونە دەرەوەدا، چونکە ئاشکرایە کە بۆنی خۆش سەرنجی خەڵکیی رادەکێشێت.

12- سەرزەنشتی ئەو کۆڕ و مەجلیسانەی نەدەکرد کە پیاوان و ژنان تێیدا گۆرانی دەڵێن و مەشروب دەخۆنەوە و سەما دەکەن.

13- تەوقەکردنی لە نێوان ژن و پیاوی نامەحرەمدا حەرام نەدەکرد، ئاشکراشە کە پیاو دەتوانێت لە رێگای تەوقەکردنەوە چ نامەیەك بنێرێت بۆ ئافرەت.

وەك دەبینی ئەم سیازدە خاڵەی لە سەرەوە باسمانکرد هەمووی لە سەربەستی پیاو کەم دەکاتەوەو زۆر هەلی لە دەست دەدات لەوەی کە بە ئارەزووی خۆی تەماشای ژنان بکات و یان لەگەڵیاندا رابوێرێت.

ئایا ئایینێك ئەمە بنەماکانی بێت لە مامەڵەی نێوان ژن و پیاودا و ئەم هەموو سنوورەی دانابێت لەبەردەم پیاودا بەوە تاوانبار دەکرێت کە ئایینی پیاوی هەوەسبازە؟ ئەم قسەیەی نووسەر نە عەقڵ و نە لۆژیك و نە مێژوو و نە واقیع و نە بنەماکانی ئیسلام پشتگیریی لێ ناکەن و هەموویان پێچەوانەن لەگەڵیدا.

ئایا ئایینێك ئەم هەموو تەشریعەی دانابێت بۆ رێگەگرتن لە زینا و داوێن پیسی پێی دەوترێت ئایینی پیاوی هەوەسباز؟

ئەگەر ئەمە ئایینی پیاوی هەوەسباز بێت ئەی بەو رێبازانەی ئەمڕۆ چی دەڵێن کە بانگەشە بۆ بەرەڵڵایی سێکسی دەکەن و ئافرەت رووت دەکەنەوەو جوانی لاشەی بەکار دەهێنن بۆ پڕوپاگەندەی بازرگانی و لە ژێر لافیتەی جۆراوجۆردا هەڵیان دەخەڵەتێنن؟ ئەگەر ئیسلام ئایینی پیاوی هەوەسباز بووایە ئەڵبەتە ئەویش ئەو شتانەی دائەهێنا کە لە رێگەیەوە پیاو بتوانێت زۆرترین ژمارە لە ئافرەتی پێ لە خشتە ببات وەکو بایەخدان بە مۆدیلی جل و نمایشکردنی لە لایەن ئافرەتانەوە و داهێنانی خەڵات بۆ جوانترین ئافرەتانی دونیاو هاندانی ئەو جۆرە هونەرانەی لەم سەردەمەدا ئەنجام دەدرێن!

وەکو لەمەوبەریش باسمکرد سەیر لەوەدایە کە کەسانێکی سێکسی، بانگەشەکەر بۆ بەرەڵڵایی سێکسی لە سەردەمێکدا کە ئازادیی سێکسی و بەرەڵڵایی سێکسی گەورەترین دیاردەیەتی، ئیسلام تاوانبار بکەن بەوەی کە ئایینێکی سێکسییە!! ئەمەش رێك وەك ئەوە وایە کە کەسێك لە کوورە هاتبێتە دەرەوە و سەرتاپای لەشی لە رەشیدا ون بووبێت گاڵتە

به كەسێك بكات كە پەڵەیەكی رەشی بچووك بە جلەكەیەوە بێت، هەرچەند ئەم نموونەیەش لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێت، چونكە ئایینی خوای بێگەردو زاناو داناو بالادەستەو وەكو خۆی بێگەردە.

## شیعەو یارانی پێغەمبەر

گەورەترین هەڵەی شیعە لەوەدایە كە دونیا لە روانگەی عەلی كوڕی ئەبو تالیبەوە دەبینن ـ رەزای خوای لێبێت ـ و عەلی بە لایانەوە تەوەری ئیسلام (محور الإسلام)ە و كێ لەگەڵێدا بێت ئەوە ئیسلامەو ئەهلی بەهەشتەو كێش لەگەڵێدا نەبێت (لە روانگەی شیعەوە) ئەوا سەر لێشێواو و ئەهلی دۆزەخە. لەسەر ئەم بنەمایە ئەبوبەكرو عومەرو عوسمانو عەبدوڕڕەحمانو معاویەو عائیشەو هەرچی لەگەڵیاندا بووبێتو خۆشی بوێن ئەوا لە دینی خوا بەریيەو دوو چاوی بە بەهەشت ناكەوێت.

بەوەشەوە نەوەستاون هەرچی بوختانیش هەیە بۆیان هەڵبەستوونو هەرچی هۆ هەیە گرتوویانەتە بەر بۆ ناشیرینكردنیان، لەوانە عومەرو ئەبوبەكر پشكی گەورەیان بەركەوتووە لەبەر ئەوەی لە روانگەی ئەوانەوە خیلافەتیان لە عەلی زەوت كردووە، ئینجا لە پیاواندا عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف دێت، چونكە ئەو بەڕێوەبەری راپرسی نێوان عەلیو عوسمان بوو بۆ وەرگرتنی خیلافەتو لە ئەنجامدا دای بە عوسمان، بۆیە ئەوەی نەشیاوە پێیان كردووە، لەبەر ئەوە بە لامانەوە سەیر نییە گەر بوختانێكی وای بۆ هەڵبەستن كە گوایە ئیشوكاری نەبووە ئەوە نەبێ كە چوار چوار ژنی خواستووەو تەلاقی داونو دوایی چواری تری خواستووەو بەو شێوەیە هەتا گەیاندوویانەتە (36) ژن لە ماوەی (7) ساڵدا. درۆش گەر شاخی هەبووایە ئەمیان شاخی دەردەكرد.

دیارە ئەو ژنانەش ئیشیان نەبووە ئەوە نەبێ دانیشن كەی سەرەیان دێت عەبدوڕڕەحمان بیانخوازێت!! ئاخر درۆیەك بكەن كەمێ رێی تێ بچێت.

## ئایا سێكس ئەمڕۆ كێشەیە یان جاران؟

هەندێك وادەزانن سێكس ئەمڕۆ لە رۆژئاوادا كێشە نییە، چونكە بە ئازادی و بێبەربەستی ئایینی و كۆمەڵایەتی ئەنجام دەدرێت، لە وەڵامی ئەم بۆچوونە هەڵەیەدا دەڵێین:

جاران ژنهێنان زۆر ئاسانو بێ ئەركو بێ تەكلیف بوو، بە تایبەت لە كۆمەڵگەی پێغەمبەرو تا ماوەیەكیش لەمەوبەر كە كۆمەڵگە ئیسلامییەكان تا رادەیەكی باش پابەندی بوون بە ئیسلامەوەو ئەم بەرەڵڵاییە رووی نەكردبووە دونیای ئیسلامیو ئافرەت بەو شێوەیە خۆی رووت نەدەكردەوەو لە ماڵ نەدەچووە دەرەوە.

كوڕو كچ تەمەنیان دەگەیشتە (15-16) ساڵ هاوسەریان دەگرت، ئیتر كێشەیەكیان بۆ نەدەما بە ناوی سێكسەوە، بە دەگمەن دەتبینی كچێك گەشتبێتە بیست ساڵو مێردی نەكردبێت، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵكیی هەمیشە خەریكی ئیشوكار بوونو دەستیان بەتاڵ نەبووو هۆیەكانی وروژاندنی سێكسیی لە ئارادا نەبوون لە سەتەلایتو ئینتەرنێتو سینەماو تێكەڵاویو هتد تاوەكو بیانوروژێنێتو تووشی كێشەیان بكات، ئەگەر لێرەو لە وێش حاڵەتێكی زینا یان نێربازییەك رووی بدایە ئەوا شتێكی دەگمەن بوو و لە ناو كۆمەڵگەدا قێزەون بوو.

بەڵام ئەمڕۆ كە هەموو هۆیەكانی وروژاندن لە ئارادان، كچو كوڕ لە هەموو شوێنێكدا تێكەڵنو ئەركی ژنهێنان زۆر قورس بووە، سێكس بووەتە كێشەیەكی حەقیقیو لەگەڵ هەبوونی دەرمانی رێگربی لە سكپڕی رێژەی منداڵی زۆڵ لە زۆربووندایەو كێشەی تەلاق روو لە زیادبوونەو ئەوەتا مرۆڤە مۆدێرنەكان بەوەشەوە ناوەستنو ئیكتیفا بەوەش ناكەن داوای بە رەسمی كردنی نێربازیی دەكەنو بانگەشە بۆ زەواجی هاوشێوە دەكەن (نێر لە نێرو مێ لە مێ).

ئایا ئەگەر سێكس كێشەیەك نەبێت ئەم مەسەلانە سەرهەڵدەدەنو كۆنگرەی نێودەوڵەتییان بۆ دەبەسترێت؟

ئەگەر سێکس کێشە نییە بە لای کوڕە گەنجەکانەوەو لەو غەریزەیە وا تێدەگەن کە تەنها بۆ ئارامکردنەوەی خۆیانە لە ڕێگای مومارەسەی سێکسییەوە بە نیسبەت ئافرەتانەوە شتەکە وا نییەو کێشەیەکی گەورەیە بۆیان، نەك تەنها لە کۆمەڵگەی خۆماندا بەڵکو تەنانەت لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکانیشدا. ئەگەر بەڵگەشت دەوێت بڕۆ چاوێك بخشێنەوە بەو لێکۆڵینەوانەی لە ڕۆژئاوادا کراوە دەربارەی ئافرەتان، بزانە بە چ ڕێژەیەك داوای گەڕانەوە بۆ ماڵەوەو بۆ ژیانی پڕ ئاسوودەیی دەکەن لە چوارچێوەی خێزاندا.

ئایا ئەمە کێشە نییە بۆ ئافرەتان کە ڕێژەیەکی زۆریان تەمەنیان لە (30) ساڵ تێپەڕی کردووەو کەس لە دەرگای نەداون بە تایبەت چینی خوێندەوار، یان هەیانە هەلی بۆ ڕەخساوە، بەڵام لە سەرەتاوە دەستی بە بەختی خۆیەوە ناوەو ئێستا نازانێ چی بکات.

## خوێندنەوەیەکی هەڵە بۆ کۆچی موسڵمانان و هەڵوێستی ئەنسارەکان

ئەو شتانەی کە زۆر ڕوونو ئاشکرا نین جێی خۆیەتی هەندێك کەس نەتوانن بە باشی بیخوێننەوەو لێی تێبگەن، بەڵام ڕووداوێکی وەك کۆچی موسڵمانان بۆ مەدینەو بەجێهێشتنی سەروەتو سامانو هەموو شتێکیانو پێشوازیکردنی گەرمو گوڕی خەڵکی مەدینە لێیانو لێبوردەییو دڵفراوانیو بەخشندەیی ئەهلی مەدینە لەگەڵیاندا شتێکە بواری بۆ کەس نەهێشتۆتەوە پیایدا هەڵنەداتو پێی سەرسام نەبێت هەندێك نووسەری لای خۆمان نەبێت کە ئەوەندە دڵیان ڕەش بۆتەوەو ئەوەندە بەرچاویان ڕەش بووە ناتوانن هیچ شتێك وەکو خۆی ببینن‌و هیچ ڕاستییەك قەبووڵ بکەن.

هەروەکو چۆن ئەو کەسەی نەخۆش بێت تامی هەموو شتێك لە دەمیدا دەگۆڕێت بە هەمان شێوە ئەو کەسەی دەروونی نەخۆش بێت یان مێشکی ژەهراوی بووبێت بە ئەفکاری بۆگەن هیچ ڕاستییەك وەکو خۆی نابینێتو هەموو شتێك بە هەڵەو پێچەوانەوە ڕاڤە دەکاتو دەیخوێنێتەوە.

هیچ کەسێك تاکو ئێستا ڕەخنەی لەو ڕەفتارەی خەڵکی مەدینە نەگرتووە کە لەگەڵ خەڵکی مەککەدا کردویانە ئەم کۆڵکە نووسەرانەی لای خۆمان نەبێت.

من نازانم ئەم هەموو ڕقو ئەم هەموو دوژمنایەتییە بەرامبەر بە ئیسلام لە چ سەنتەرێكو لە چ پەیمانگایەك وەریان گرتووە. ئەمە خەوە من دەیبینم یان ڕاستی، کەسێك هەبێت لە کۆمەڵگەیەکی موسڵماندا گەورە بووبێتو لە خێزانێکی بەناو موسڵمان پێگەیشتبێت ئەم هەموو ڕقەی لە ئیسلام بێتەوە.

ئایا مارکسییەکانو چەپەکان لە کوردستاندا تا ئەو ڕاددەیە ڕقیان لە ئیسلام دەبێتەوە کە نەتوانن دان بە هیچ لایەنێکی ئیجابییدا بنێن! دیارە ئەوان ئەم هەموو ساڵە تەنها پیشەیان ناشیرینکردنی ئیسلام بووە لەبەرچاوی شوێنکەوتووانیاندا. لێکدانەوەی سێکسییم بۆ زۆر ڕووداو خوێندۆتەوە، بەڵام تاکو ئێستا لێکدانەوەیەکی بەم شێوەیەم نەبینیوەو کەسم نەبینیوە هەڵهاتنی کۆمەڵێك لە دەستی ستەمکارانو بەجێ هێشتنی هەموو شتێکیان تەنها لە پێناوی ئەوەی بە ئاینو عەقیدە تازەکەیانەوەو دەرباز بینو توانەوەیان لەو عەقیدە تازەیەدا هەمووی بە ڕاکردن بە دوای تێرکردنی هەوەسە سێکسییەکان لێکبداتەوە!!

گەڕامەوە بۆ کتێبی (**حیاة محمد**) لە نووسینی (ئەمیل دیرمەنگام)و وەرگێڕانی عادل زعیتر، وتم لەوانەیە ئەو ڕۆژئاواییانە شتی وایان وتبێت، بەڵام بینیم نەخێر ئەوان زۆر لەم نووسەرانەی لای خۆمان بە ویژدانترنو کەسیان ئەو هەڵوێستەی (سەعدی کوڕی ڕەبیع)یان بەرانبەر بە (عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف) بەوە لێکنەداوەتەوە کە ئافرەت وەکو کەلوپەل تەماشا بکەن بەڵکو بەوپەڕی بەخشندەییو جوامێری لە قەڵەمیان داوە.

شایانی باسە ئەو مەسەلەیەی کە هەندێ کەس گەورەی دەکەن و دەیانەوێت خوێنەر وا تێبگەیەنن کە گوایە هەرچی ئەنساری هەیە شتەکانی خۆیانیان بە ژنەکانیشیانەوە لەگەڵ موهاجیرەکاندا دابەشکردووە، لە کاتێکدا کە ئەمە تەنها حاڵەتێك بوو کە (سەعدی کوڕی رەبیع) بە (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف)ی وت ئەوە ماڵەکەمە لەگەڵتدا برابەش دابەشی دەکەم ئەوەش چوار ژنم هەیە حەزت لێیە دەست لە هەر کامیان هەڵگرم، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی خوا بەرەکەت بخاتە ماڵو منداڵتەوە، تەنها رێگەی بازاڕم نیشان بدە..

ئەگەر وا بووایە عەبدوڕڕەحمان پێشنیارەکەی سەعدی رەت نەدەکردەوەو یەکسەر قەبووڵی دەکرد، بەڵام ئەو ئەمەی نەکرد بەڵکو داوایکرد رێی بازاڕی نیشان بدات، ئەوەبوو بە ماوەیەکی کەم سامانێکی زۆری کۆکردەوەو دواییش ژنی هێنا.

هەموو موسڵمانانی مەدینە ئەوپەڕی بەخشندەییو فیداکارییان نیشاندا بەرانبەر بە موهاجیرەکان بە رادەیەك کە قورئان باسیان بکاتو ستایشیان بکات (**والذين تبوءوا الدار والأيمان من قبلهم يحبون من هاجر اليهم ولا يجدون في صدورهم حاجة مما أوتوا ويؤثرون على أنفسهم ولو كان بهم خصاصة، ومن يوق شح نفسه فأولئك هم** المفلحون) (الحشر: 9). واتە: ئەوانەی لە پێش موهاجیرەکانەوە نیشتەجێ بوون لە مەدینەو ئیمان لە دڵیاندا نیشتەجێ بوو بوو ئەو کەسانەیان خۆش دەویست کە کۆچیان دەکرد بۆ لایانو هیچ ناڕەحەتییەك رووی تێنەکردن گەر لە دەستکەوتەکان تەنها بەشی موهاجیرەکان بدرایەو ئەوان بێبەش بکرانایەو باوی ئەوانیان دەدا بەسەر خۆیاندا (ئەوانیان لە خۆیان بە پێشتر دەزانی) هەرچەند نەدارو هەژاریش بوونو پێویستیی زۆریان بە یارمەتی هەبوو، هەر کەسێکیش بپارێزرێت لە چاوبرسێتیو تەماعو چنگقوچراوی ئەوا سەرفرازو سەرکەوتوون.

مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژووی خۆی رووداوێکی بەو شێوەیەی بە خۆیەوە نەدیوە کە ئاوها خەڵکی شارێك بە کۆمەڵ بچن بە پیری خەڵکانێکی ترەوەو نەك هەر تەنها پارووە نانەکانیان لەگەڵدا لەت بکەن بەڵکو لە خۆیان بە پێشتریان بزانن لە هەموو شتێك کە هەیانەو زیاد لە برابەش بەشیان بدەن.

کوردی عێراق لە کۆڕەوەکەدا کە رووی کردە ئێران، ئێرانییەکان یەك لەسەر سەدی ئەوەی مەدینەییەکانیان لەگەڵدا نەکردین، لەگەڵ ئەوەشدا تا ماوین پێی دەزانینو سوپاسگوزاریانینو خاڵێکی سپییە بەنێو چاوانی برا کوردەکانی ئێرانەوە. ئەی ئەگەر بهاتایە وەکو ئەوانیان لەگەڵدا بکردینایەو هەریەك لەوان یەکێك لە ئێمەی ببردایەتە ماڵی خۆیو ماڵەکەی لەگەڵدا برابەش بکردایە چیمان پێ دەوتنو چەند سوپاسگوزاریان دەبووینو چۆنمان ستایش دەکردن؟ هەندێك بەهاو ئاکار هەیە هەموو کەسێك خۆشی دەوێو حەزی لێیە با ئەو کەسە لە خۆشیدا نەبێت، بۆ نموونە کەس نییە مرۆڤی راستگۆو بە وەفای خۆشنەوێت، تەنانەت درۆزنترینو بێ وەفاترین کەسیش.، کەس نییە بەخشندەییو لێبوردەییو سەخاوەتی خۆش نەوێت تەنانەت خۆپەرستترینو رەزیلترین کەسیش، لەبەر ئەوەیە هەرچی نووسەرو مێژوونووسو بیرمەند هەیە بە رێزو سەرسامییەوە باسی ئەو هەڵوێستەی خەڵکی مەدینە دەکەن بەرانبەر برا موهاجیرەکانیان تەنها ئەم نووسەرانە نەبێت کە کەس نازانێ چ دەعباو جانەوەرێکن کە هیچ شتێك وەکو خۆی نابینن و هەموو شتێکی چاك بە خراپو هەموو شتێکی خراپ بە چاك دەزانن.

ئەم نووسەرانە زیاتر یەك شت بەر دڵی گرتوون، ئەویش ئەوەیە کە (سەعد) بە (عەبدوڕڕەحمان)ی وتووە ئەوەش ژنەکانمە هەرکامیانت دەوێت دەستی لێ هەڵدەگرم تۆ بیخوازی، کە گوایە ئەمە وەکو هەر شتێك لەو شتانەی کە هەیەتی تەماشای دەکات، لە کاتێکدا کە ئەمە وانییەو ئەوپەڕی فیداکاریی (سەعد) دەردەخات. ئەگەر سەعد بیوتایە ئەوە ژنەکانمە هەرکامیانت دەوێ با بتدەمێ یان با لات بێت قەیناکا. ئەو وتی هەرکامیانت بوێت من تەڵاقی دەدەم، دوایی دەمێنێتەوە سەر ئەو ئافرەتە خۆی ئایا مێردی پێدەکات یان نا. ئەم تەنها ئەوەندەی لەسەرە لەلایەن خۆیەوە لێی جیابێتەوە ئیتر ئەویتر دەکەوێتە سەر پیاوو ژنەکە یەکیان دەوێت یان نا.

دەوڵەمەندەکانی تری مەککە عوسمانی لێدەرچێت هەموو زۆربەی سەروەت و سامان و هەندێکیشیان ژن و منداڵیشیان لە مەککە جێهێشتبوو، ئەبوبەکر تەنها پێنج هەزار درهەمی لەگەڵ خۆیدا بردبوو، سوهەیبی رۆمی دەستی لە هەرچی سەروەت و سامانی هەبوو هەڵگرت کە باری دوو حوشتر پارەو خشڵ و زێر بوو بۆ ئەوەی رێگەی بدەن کۆچ بکات.

## ئایا پێغەمبەر ﷺ کەوتە ژێر کاریگەریی دابونەریتی کۆمەڵگەکەیەوە؟

ئەوانەی دەڵێن پێغەمبەر کەوتبوە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگەی عەرەبییەوە پێدەچێ هیچ کتێبێکیان دەربارەی قەوارەی ئەو گۆڕانکارییە نەخوێندبێتەوە کە ئیسلام ئەنجامیدا بە درێژایی (23) ساڵی ژیانی پێغەمبەر ﷺ.

ناکرێت لێرەدا بە دوورو درێژیی باسی ئەم مەسەلەیە بکەین، چونکە گۆڕانکارییەکە لە یەك بواردا نییە، بەڵکو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بوو هەر لە عەقیدەو بیرو بۆچوون و تێڕوانین بۆ مەسەلە جیاجیاکانی ژیانەوە هەتا ئەخلاق و دابونەریت و شەریعە و سیاسەت و هتد. ئەوەندە بەسە بۆ زانینی قەوارەی ئەو گۆڕانکارییە کە لە ماوەی چارەکە سەدەیەکدا نەك تەنها دوو ئیمپڕاتۆریەتی گەورەیان بەچۆکدا هێنا لە رووی سەربازییەوە بەڵکو تەنانەت لە رووی فیکری و عەقیدەییشەوە ئەو دوو ئیمپڕاتۆرییە خاوەن تەمەن زیاد لە هەزار ساڵەیان گۆڕی، ئایا ئەم گۆڕانکارییە بە کلتوری عەرەبی نیمچەدورگەی عەرەب دەکرا، نەك هەر ئەوەش بەڵکو ئیسلام لە کاتی لاوازی و ژێردەستەییشدا توانیویەتی عەقیدەو بیروبۆچوونی سوپای داگیرکەریش بگۆڕێت وەکو ئەوەی کە لەگەڵ مەغۆلەکاندا روویدا و ئەو میللەتە جەنگاوەرە دڕندەیەی گۆڕی بە میللەتێکی پابەند بە یاسا و شەریعەتەوە.

عەرەب بتیان لە دارو بەرد و خورما دەتاشی و دەیانپەرست و زینایان دەکرد و کچیان زیندەبەچاڵ دەکرد و قوماریان دەکرد و مەشروباتیان دەخواردەوە و ماملەیان بە سوو دەکرد و بەبێ ئەژمار ژنیان دەخواست و ستەمیان لە کۆیلە دەکرد و باوەڕیان بە رۆژی دوایی نەبوو، باوەڕیان بە پێغەمبەران نەبوو، وایاندەزانی فریشتەکان کچی خوان، خوایان نەدەناسی، بۆ بەدەستهێنانی بژێوی ژیانیان هەڵیاندەکوتییە سەر یەك و خاوەنی پەیامێك نەبوون لە ژیانداو لە عێراق و شام و یەمەندا لە ژێر دەستی فارسەکان و رۆمەکان و حەبەشییەکاندا بوون، گۆڕدران بە میللەتێکی خواناس و خواپەرستی دەست پاکی داوێن پاکی خاوەن پەیام و هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامە لە دونیادا و خەوو ئیسراحەتیان لە خۆیان هەڵگرت تا لە ماوەیەکی کەمدا ئەم پەیامەیان گەیاندە مرۆڤایەتی، ئەوەش هەمووی لە سایەی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامەوە، ئایا ئەمە کەم گۆڕانکارییەك بوو لەو میللەتەدا کرا. خۆ شایەتییەکەی ئێچ جی وێڵس کە لەمەوبەر ئاماژەمان پێدا بەسە بۆ زانینی قەوارەی ئەو گۆڕانکارییە.

## خوێندنەوەیەکی هەڵە بۆ کۆمەڵگەی پێغەمبەر

نووسەری سێکس و شەرع لە لاپەڕە (113)ی کتێبەکەیدا دەڵێت: "وەك لە باسەکەماندا نووسیومانە ئەو کۆمەڵگایە بە چوار کاری سەرەکییەوە خەریك بوون: شەڕ و شۆڕ، بازرگانی، کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، زەواج و سێکس".

ئێمەش لەمەوبەر گفتوگۆمان لەسەر ئەم قسەیە کرد و کرچ و کاڵییەکەیمان دەرخست، دەمێنێتەوە لێرەدا چەند شتێکی تری لەسەر بنووسین: ئەگەر داوا لە نووسەر بکەین باسێکی کۆمەڵگای کوردەواریی ئەمڕۆ یان کۆمەڵگای رۆژئاواو ئەمریکامان بۆ بکات چۆنی باس دەکات و دەڵێ خەریکی چین؟ ئایا شتەکان ئاوها بە سادەیی و بە سەر یەکەوە باس دەکرێن؟ ئەی بۆ باسی لایەنەکانی تری چالاکیی کۆمەڵگەی نەکردووە لە خواردن و خەوتن و جلوبەرگ و هتد..ئەی بۆچی باسی لایەنی عیبادی ئەو کۆمەڵگەیەی نەکردووە؟ ئایا کۆمەڵگەی پێغەمبەر خەریکی نوێژو عیبادەت و خواپەرستی نەبوون؟ ئایا نووسەر دەزانێت کە پێغەمبەرو یارانی زیاد لە نیوەی شەویان بە شەونوێژ دەبردە سەرو زۆربەی رۆژەکانیان بە رۆژوو دەبوون بە رادەیەك کە هەندێك لە یارانی لەبەر زۆری شەونوێژو رۆژووگرتن ژنەکانیان لێیان بکەونە سکاڵا کردن، هەندێکیان لای پێغەمبەر و هەندێکیشیان لای رەفیقی مێردەکانیان وەکو ئەوەی خێزانی ئەبو دەرداو عەبدوڵڵای کوڕی

عەمر کە یەکەمیان سکاڵای لای سەلمان کرد و دووەمیان لای پێغەمبەر! ئایا نووسەر دەزانێت کە تەنها ئەهلی سوففە کە نزیکەی حەفتا کەس بوون زۆربەی کاتیان لە مزگەوت بوون و خەریکی نوێژو قورئان خوێندن و دەرس خوێندن بوون و ژنیشیان نەبوو؟

کۆمەڵگەی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگەیەکی ئەوەندە رۆحی بوو خەریك دەبوو زۆر کەس بە تەواوی دەست لە دونیا هەڵگرن و پشت هەڵکەن لە ژن هێنان و تەنانەت لە ئیش کردنیش ئەگەر بهاتبایە پێغەمبەر ﷺ رێی لێ نەگرتنایە.

ئایا دەزانی کە زۆر کەس هەبووە ویستوویەتی خۆی بخەسێنێت بۆ ئەوەی ژن نەهێنێت و خەریکی خواپەرستی بێت؟

ئایا دەزانی کە یەکێك لە یارانی پێغەمبەر ﷺ پارەی کۆ کردبوویەوە بۆ ژن خواستن، لەو کاتەدا زەنگی جیهاد لێدرا چوو بەو پارەیە ئەسپ و چەکی کڕی و چوو بۆ غەزاو لەوێ شەهید کرا؟ ئایا ئەمانە رەفتاری کەسانی سێکسین؟

ئەگەر نووسەر بە ئاوها کۆمەڵگەیەك بڵێت خەریکی زەواج و سێکس بوون ئەی بە کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆ چی دەڵێت؟

ئایا سەردەم هەبووە ئەوەندەی ئەم سەردەمە مرۆڤ بە دوای سێکسدا گەڕابێت و سێکس تێیدا ئەوەندە بایەخی هەبووبێت کە یەکێك لە هەرە گرنگترین تیۆرییەکانی دەروونناسی هەموو رەفتارێکی مرۆڤی بە سێکسەوە گرێ دابێت؟

دەتوانی بە کۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی ئەمڕۆی رۆژئاوا یا تەنانەت رۆژهەڵاتیش بڵێی کۆمەڵگەیەکی سێکسییە یا کۆمەڵگەیەکە سێکس رووبەرێکی زۆری لە ژیان و فکری داگیر کردووە، چونکە تەنها باوەڕی بە ژیانی ئەم دونیایە هەیەو رابواردن‌و خۆشگوزەرانی ئەم دونیایە بە لایەوە هەموو شتێکە، بەڵگەش ئەو گەنجانەی لای خۆمانن کە بیر لە چوونەدەرەوە دەکەن، گەر لێیان بپرسی لەبەر چی؟ دەبینی یەکێك لە هۆکارەکان ئەو ئازادییە سێکسییەیە کە لەوێ هەیە، بەڵام ناکرێت کۆمەڵگەیەك کە باوەڕ بە دوارۆژ رووبەرێکی گەورە لە فکرو ژیانی داگیر بکات بڵێین کۆمەڵگەیەکی سێکسییە.

لەمەودواش لە باسی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ بۆت دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ سەرەڕای ئەو هەموو ژنەی کە هەیبووە ئینجا سێکس رووبەرێکی زۆر کەمی لە ژیان‌و بیرکردنەوەی داگیر کردبوو، ئەمەش بە تەواویی رەنگی دابوویەوە بەسەر دەوروبەرەکەیداو بەڵگەش ئەو نموونەیە بوو کە هێنامانەوە لە هەوڵدانی هەندێك کەس بۆ خۆخەساندن.

گەورەترین دیاردەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دینداری‌و خواپەرستی‌و رۆحانییەت و بایەخ دان بە ژیانی رۆژی دوایی بوو، زۆر گەورەتر لە بازرگانی‌و کشتوکاڵ‌و ئاژەڵداری چ جای سێکس‌و رابواردن.

بۆ ئەوەی رۆڵی ئایین‌و دینداری بزانی لە کۆمەڵگەی پێغەمبەردا تەنها یەك دوو نموونەت بۆ دێنمەوە.

یەکەم: جارێکیان پێغەمبەر فەرمووی (عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف)م بینی بە گاگۆڵکێ دەچووە بەهەشتەوە، ئەم هەواڵە گەیشتە عەبدوڕڕەحمان، ئەویش فەرمووی سوێند بەخوا دەبێ بە پێوە بچمە بەهەشت، ئەوەبوو لەو کاتەدا قافڵەیەکی زۆر گەورەی لە بازرگانی هاتەوە، ئەویش بێ ئەوەی سەیری بکات‌و دایبگرێت، فەرمووی هەموو ئەو حوشترانە بە خۆیان‌و بارەکانیانەوە ببەخشنەوە بەسەر هەژاراندا.

دووەم: عوسمانی کوڕی عەفان لە ساڵێکی نەهاتیدا قافڵەیەکی زۆر گەورەی بۆ هاتەوە، هەمووی دانەوێڵەو خواردنی تێدابوو، بازرگانەکانی مەدینە خۆیان گەیاندێ بۆ ئەوەی لێی بکڕنەوەو قازانجی لێبکەن، هەرچی نرخێکیان دەدایە دەیگوت زیاتریان داومەتێ، بازرگانەکان وتیان ئەوە ئێمە هەموو بازرگانەکانی مەدینەین‌و کەسی تر شکنابەین بتوانێ لە ئێمە زیاترت بداتێ، ئەویش فەرمووی نەخێر هەیە، وتیان کێیە؟ فەرمووی خوا لە ئێوە زیاتری داومەتێ.

دینداری‌و بایەخدان بە دین‌و رۆژی دوایی گەورەترین سیمای کۆمەڵگەی پێغەمبەر بوو کە لە پێناویدا دەست لە هەموو شتێك هەڵدەگیراو قوربانی بە هەموو شتێك دەدرا، کەواتە چۆن دەبێ لە باسکردنی ئەو کۆمەڵگەیەدا ئاماژە بەم لایەنە نەدرێت؟ ئایا ئەمە لادان نییە لە راستی‌و شاردنەوەی راستییەکان نییە؟

ئەگەر لە مزگەوتەکاندا پەیکەری ئافرەتی رووت هەبوایە وەکو پەرستگای شوێنکەوتووانی ئایین‌و رێبازەکانی تر دەمانگوت لەوانەیە قسەکەی راست بێت، بەڵام ئایینێك ئەوەندە پێداگرێت لەسەر پۆشتەیی ئافرەت‌و زینا بە تاوانێکی ئەوەندە گەورە تەماشا بکات چۆن بەو کۆمەڵگەیەی پابەندە پێوەی دەوترێت کۆمەڵگەیەکی سێکسییە؟

کاتێك ئەو قسەیەی نووسەر ڕاست دەبوو ئەگەر ئیسلام بوارەکانی ئەنجامدانی سێکسی زیاتر بکردایەو ئەو هەموو شێوازەی لە ناو عەرەبدا هەبوو قەدەغە نەکردایە بەڵکو چەند شێوازێکی تریشی بخستایەتە سەر بە ڕاددەیەك کە مومارەسەی سێکسی لە سەردەمی ئیسلامدا زیاتر بووایە لە سەردەمی پێش خۆی، ئەوکاتە جێی خۆی بوو کەسێك بیگوتایە یەکێك لە مەبەستەکانی ئیسلام تێرکردنی هەوەسەکانی پیاوبوو وەکو ئەوەی کە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا دەیکات بە ناوی ئازادکردنی ئافرەتەوە دەست دەخاتە ناو وڵاتەکانو دەیەوێت ئەو دابو نەریتو کلتورانە نەهێڵێت کە ڕێگە لە ئازادیی سێکسی دەگرنو سنوور بۆ مومارەسەی سێکسی دادەنێن، ئەو قسەیە دەبێ بە ڕۆژئاواییەکان و شارستانێتی ڕۆژئاوا بگوترێت نەك بە ئیسلام کە بوارەکانی مومارەسەی جنسێکسی زۆر تەسك کردۆتەوەو سزای سەختی بۆ ئەوانە داناوە کە لە دەرەوەی بازنەی ئەو ڕێگا حەڵاڵانەوە سێکس دەکەن.

ئەوە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە کۆمەڵگە تا زیاتر دینی هەبێت لایەنە دونیاییەکان بایەخیان کەمتر دەبێتەوە، بە پێچەوانەشەوە تا دین لاوازتر بێت، بایەخ بە شتی دونیایی زیاتر دەبێت.

هەر ئێستاش بڕوانە دەوروبەری خۆت ئەگەر خوێندکاری زانکۆی یا فەرمانبەری یا کاسبکاری، بزانە کوڕ و کچی دیندار زیاتر بە دوای سێکسدا دەگەڕێن یان کەسانی بێدین، بزانە ڕێژەی زیناو فاحیشە لە نێوان دیندارانیدا زۆرە یا لە نێوان بێدینەکان... ئیتر خۆت لەوەوە بڕیار بدە، ئەمە ئەگەر کاریگەربی ئایین بێت لەسەر شوێنکەوتووانی ئیسلام دوای هەزارو چوار سەد ساڵو لە سەردەمی ئیباحییەتی سێکسیو سەتەلایتو ئینتەرنێتداو لەگەڵ ئەو هەموو فشارەی لەسەر دینداران هەیە، ئەی دەبێ لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە لەناویاندا بووە چۆن بووبێت؟

## دەسەڵاتی پێغەمبەر بەسەر کۆمەڵگەکەیدا

ڕۆژ دوای ڕۆژ دەسەڵاتی پێغەمبەر بەسەر کۆمەڵگەدا زیاتر دەبوو، پابەندیی موسڵمانان بە فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەوە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندا بوو، بۆ ئەوەی رادەی پابەندیی موسڵمانت بە فەرمانەکانی پێغەمبەرەوە بۆ دەرکەوێت تەنها ئاماژە بە دوو نموونە دەدەم.

**یەکەم:** کاتێك ئەو ئایەتە دابەزی دەربارەی عەرەق کە دەفەرموویت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ * إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ) (المائدة :90،91)**. ئیبن کەسیر چەند فەرموودەیەك لە یارانی پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی هەڵوێستی یاران لە دابەزینی ئەم ئایەتە، کورتەکەیان ئەوەیە دەفەرموویت (فهل أنتم منتهون) ئایا ئێوە بە یەکجاری دەست هەڵدەگرن لەو کارانە (واتە مەشروب خواردنەوەو قومارکردنو قاوە گرتنەوەو هتد)؟ هەموو بە یەك دەنگ وتیان: انتهينا ربنا. واتە پەروەردگارمان ئێمە وازمان هێنا، ئەوەی بە دەستییەوە بوو ڕشتی، ئەوەی تازە خواردبوویەوە خۆی ڕشاندەوە، ئەوەی لە گۆزەو دەفردا هەڵیگرتبوو هەمووی ڕشت بە ڕاددەیەك کە ئەو ڕۆژە بۆنی عەرەق هەموو مەدینەی گرتبوویەوە، بڕوانە تەفسیری ئەم ئایەتە لە ئیبن کەسیرو تەبەریدا.

ئاوها یەکسەر بێ سێو دوو و بێ بیرکردنەوە لەو زەرەرەی کە دەیکەنو بێ ئەوەی بڵێن پارەی زۆرمان پێداوەو دەیبەین دەیفرۆشینەوە.

**دووەم:** بەسەرهاتی ئەو سێ کەسەی کە بە بێ بیانوو لە شەری (تەبوك) کە لە ساڵی 9ی کۆچیدا ڕوویدا دواکەوتن دەریدەخات کە موسڵمانان چەند پابەند بوون بە فەرمانەکانی پێغەمبەرەوە.. درێژەی بەسەرهاتەکەش لە تەفسیری ئایەتی (118)ی سورەتی تەوبە دەبینییەوە لە تەفسیرەکانی ئیبن کەسیرو تەبەریو لە (**صحيح البخاري**)و (**رياض الصالحين**)و چەندین کتێبی تەفسیرو فەرموودەی تردا.

کورتەکەشی ئەوەیە کە سێ کەس لە یارانی پێغەمبەر بە ناوی (کعب بن مالك) کە پیاوێکی گەنج بوو، (هلال بن امیه)و (مراره بن الربیع) لە غەزای تەبوك دواکەوتن، لەگەڵ کۆمەڵێك لە مونافیقەکان، کاتێك پێغەمبەر ﷺلەو غەزایە گەڕایەوە (لە گەرمەی هاویندا بوو) مونافیقەکان چوون بۆ لای پێغەمبەرو هەریەکە و بیانوویەکیان هێنایەوە و پێغەمبەریش هەرچەند دەیزانی درۆ دەکەن، بەڵام هەر لێی قبوڵ کردن، ئەم سێ نەفەرە نەبێت، درۆیان نەکردو وتیان ئێمە هیچ بیانوویەکمان نەبووە، نە نەخۆش بوون و نە لە سەفەر بووین، پێغەمبەریش فەرمووی بڕۆن چاوەڕوانی حوکمی خوا بن، ئەوە بوو پەنجا رۆژ ئایەت دەربارەیان دانەبەزی و پێغەمبەریش فەرمانی بە موسڵمانان دا نە سەلامیان لێبکەن، نەشتیان پێ بفرۆشن و نە قسەیان لەگەڵدا بکەن، دواتریش فەرمانیدا بە ژنەکانیان رێگەیان نەدەن بچنە لایان، ئەم سێ نەفەرە ماوەی ئەم پەنجا رۆژە نە کەس قسەی لەگەڵ دەکردن، نە سەلامیان لێدەکرن و نە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن، تەنانەت ژنەکانیشیان لە ماڵەوە قسەیان لەگەڵدا نەدەکردن، خۆشیان هیچ رەخنەیان لەو فەرمانانەی پێغەمبەر نەدەگرت و هیچ کەسێکیان نەیگوت پێغەمبەر کاری چییە بەسەر ماڵ و منداڵمانەوە بەڵکو (کەعبی کوڕی مالك) کە گەنج بوو، بە ژنەکەی وت بڕۆرەوە ماڵی باوکت تا حوکمی خوا دادەبەزێ بۆمان، (هیلالی کوڕی ئومەیە)ش پیاوێکی پیر بوو، ژنەکەی چوو بۆ لای پێغەمبەرو پێی وت ئەی پێغەمبەری خوا من مێردەکەم پیرە و کەس نییە خزمەتی بکات ئایا بەجێی بێڵم؟ فەرمووی نەخێر، بەڵام نە قسەی لەگەڵدا بکەو نە بهێڵە سەرجێیت لەگەڵدا بکات. بەو شێوەیە تا پەنجا رۆژەکە تەواو بوو ئایەتی (117،118)ی سورەتی (التوبە) دابەزی کە دەفەرموویت: **(لَقَد تَّابَ الله عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ * وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّواْ أَن لاَّ مَلْجَأَ مِنَ اللّهِ إِلاَّ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)**، لە ئایەتی (119)شدا ستایشیان دەکات لەبەر ئەوەی کە راستیانکرد لەگەڵ پێغەمبەرداو هانی موسڵمانان دەدات کە وەکو ئەوان بن و دوای ئەوان بکەون **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ)**.

ئەگەر دەتەوێت زیاتر پابەندیی موسڵمانان بە فەرمانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺبزانیت تەماشایەکی سورەتی (الحجرات) بکە لە **(في ظلال القرآن)**دا یان تەماشای کتێبی **(حياة الصحابة)**ی **(محمد يوسف الكاندهلوي)** بکە.

## شێوەو رووخساری پەیامبەری ﷺئیسلام

زۆرێك لەوانەی پێغەمبەریان بینیوە باسی شێوەو رووخساریان کردووەو هەریەکەو لە چەند روویەکەوەو هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە هیچ کەسێکیان نەبینیوە وەکو پێغەمبەر ﷺجوان و بە هەیبەت و نورانی بووبێت، بەڵام نووسەر تەنها ریوایەتێکی بە قرتاوی لە تەبەرانییەوە گێڕاوەتەوە کە لەسەر زمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب ـ رەزای خوای لێ بێت ـ هاتووە، بەڵام نووسەر کۆتاییەکەی قرتاندووە کە دەڵێت: **(ليس بالقصير ولا بالطويل، ولا العاجز ولا اللئيم، كأن العرق في وجهه اللؤلؤ، وَلريح عرقه اطيب من المسك، لم أر قبله ولا بعده مثله)**. واتە باڵای نە کورت بوو نە درێژ، نە بێدەسەڵات بوو نە فێڵباز و نارەسەن، ئارەقی دەم و چاوی وەکو مرواری وابوو (دەدرەوشایەوە)، بۆنی ئارەقی جەستەی لە بۆنی میسك خۆشتر بوو، نە لەوەبەر و نە لەوەدوا کەسم نەبینی وەکو ئەو (لە جوانی و هەڵکەوتووییدا).

ئاشکراشە کە نووسەر بۆچی ئەم چەند دێڕەی قرتاندووە لە باسی پێغەمبەردا ﷺ!!

بۆ زیاتر ئاشنابوون بە شێوە و روخساری پێغەمبەر ﷺفەرموو لەگەڵ شایەتی ئەم چەند کەسەی پێغەمبەریان بینیوە:

**اخرج الشيخان عن البراء قال: كان رسول الله ﷺ أحسن الناس وجهاً و أحسنهم خلقاً ليس بالطويل الذاهب ولا بالقصير**. واتە: بوخاری و موسلیم لەبەرائەوە دەیگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەم و چاوی لە هەموو کەسێ جوانتر بوو، جەستەی لە هەموو کەسێ جوانتر و رێکتر بوو، نە زۆر درێژ بوو، نە کورت.

**و أخرج مسلم عن ابي الطفيل انه قيل له صف لنا رسول الله قال: <u>كان أبيض مليح الوجه</u>.** واتە: بە ئەبی توفەیلیان وت باسی پێغەمبەرمان بۆ بکە، وتی: پێغەمبەر □سپی و دەم و چاو جوان بوو.

**وأخرجه الدارمي عن ابن عمر قال: ما رأيت أشجع ولا أجود ولا أضوء من رسول الله.** واته: ئیبن عومەر دەڵێت: لە پێغەمبەر ﷺ ئازاتر و سەخیتر و رووگەشترم نەبینیوە.

**أخرج الترمذي عن عبدالله بن سلام قال: لما قدم النبي المدينة جئته لأنظر اليه فلما استبينت وجهه عرفت أن وجهه ليس بوجه كذاب.** واته: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (یەکێك بوو لە زانایانی جولەکە موسڵمان بوو بوو) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە چووم تەماشای بکەم، کاتێك دەمو چاویم بینی زانیم ئەوە دەمو چاوی کەسێکی درۆزن نییە.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش دەڵێت:

**لو لم تكن فيه آيات مبينة　　　　لكان منظره يُنبيك بالخبر**

واتە: ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرای نەبووایە (لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی)، دیمەنی (ڕوخساری) هەواڵی دەدایتێ (کە ڕاستگۆیە و پێغەمبەرە ﷺ).

**أخرجه الترمذي والبيهقي عن أبي هريرة قال: ما رأيت شيئاً أحسن من رسول الله كأن الشمس تجري في وجهه، ما رأيت أحداً أسرع في مشيه منه كأن الأرض تطوى له، إنا لنجهد وأنه غير مكترث.** واته: ئەبوهورەیرە دەڵێت: هیچ شتێکم نەبینیوە لە پێغەمبەر ﷺ جوانتر وەکو بڵێی خۆر لە نێو چاوانیدا بوو، کەسم نەبینی لەو خێراتر بێت لە ڕۆیشتنیدا، دەتگوت زەوی بۆ دەپێچرێتەوە، ئێمە خۆمان ماندوو دەکرد لە ڕۆیشتندا ئەو خۆی تێن نەدەدا.

**ومن وصف هند ابن أبي هالة له: كان رسول الله ﷺ فخماً مفخماً يتلألأ وجهه تلألؤ القمر ليلة البدر، عظيم الهامة رجل الشعر، أزهر اللون واسع الجبين، أزج الحواجب سوابغ في غير قرن. بينهما عرق يدره االغضب، أقنى العرنين، له نور يعلوه يحسبه من لم يتأمله اشم، كث اللحية أدعج، سهل الخدين ضليع الفم أشنب مفلج الإسنان، دقيق المسربة كأن عنقه جيد دمية في صفاء، معتدل الخلق بادن متماسك، سواء البطن والصدر، بعيد ما بين المنكبين.. أنور المتجرد. طويل الزندين رحب الراحة.. شثن الكفين والقدمين سابل الاطراف خمصان الاخمصين.. ذريع المشية اذا مشى كأنما ينحط من صبب و اذا التفت التفت جميعاً خافض الطرف نظره الى الأرض اكثر من نظره الى السماء.**

هندی کوڕی ئەبی هالە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی چوارشانە بوو، دەموچاوی دەدرەوشایەوە هەروەکو مانگ لەشەوی چواردەدا، سەری گەورە بوو، قژی شەپۆلاوی بوو (نە لوول و نە ساف)، ڕەنگی گەشاوە بوو، برۆکانی درێژو کەوانەیی و تۆکاوی بوون بەبێ تێکەڵ بوون (نەگەیشتبوونە یەك) لە نێوانیاندا دەمارێك (دەماری خوێن) هەبوو لە کاتی توورەییدا پڕ دەبوو، لوتی درێژو سەری لوتی باریك و لە ناوەڕاستیدا بەرز بوو، ڕووناکیەکی بەسەرەوە بوو ئەوەی لێی ورد نەبوایەتەوە وایدەزانی لوتی درێژە، ریشی پڕو چاوی گەش بوو، گۆناکانی ساف و دەمی بەرین و دانەکانی پرشنگدارو شاش بوو، لەسەر ناوکییەوە موویەکی کەمی باریکی هەبوو تا سەر سنگی، گەردنی دەتوت ملی بووکە شوشەیە لە سافیدا، لەشی ڕێك و پڕو پتەو بوو، سك و سنگی لە یەئسدا بوون (ورگن نەبوو)، سنگی پان و ناوشانی بەرین بوو، نورانی بوو، باڵەکانی درێژو ناولەپی پان بوو، دەست و پێکانی گەورە بوون (ئێسقانی ئەستوور بوو) پەنجەکانی درێژ بوو، گورج و گۆڵ بوو لە ڕۆیشتندا، کە دەڕۆیشت واتدەزانی لەبەرزاییی دێتە خوارەوە و ئاوڕی بدایەتەوە بە هەموو لەشی ئاوڕی دەدایەوە، چاوی هەمیشە دادەخست و ڕوانینی بۆ زەوی زیاتر بوو تا ڕوانینی بۆ ئاسمان. (واتە بێ فیز بوو).

پێغەمبەر ﷺ تاکو مرد لەشی تێکنەچووبوو، دەمو چاوی چرچی تێنەکەوتبوو، چەند موویەك نەبێت لە سەرو ریشی مووی سپی نەکردبوو، تا ئەو کاتەی کۆچی دوایی کرد جوانترین کەس بوو.

ئەمانە باسی شێوەو ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ بوو، بە شایەتیی هەموو ئەوانەی کە بینیویانە هیچ کەمو کوڕییەك لە لاشەیدا نەبووە و ئەوەندە جوان و ڕێك بووە وەکو دەڵێن دەڵێی بە ویستی خۆی دروستکراوە: وەکو حەسانی شاعیر دەڵێت:

**و أجمل منك قط لم تر عيني**

**و أحسن منك لم تلد النساء**

خلقت مبرءاً من كل عيبٍ

كأنك خلقت كما تشاء

واتە: بە شێوەیەك بەدیهێنراوی كە هیچ كەمو كورییەكت تێدا نەبێت، وەكو ئەوەی كە بە ویستی خۆت بەدیهێنرابی.

لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە كە روخساری لە یەكەم تەماشاكردنەوە گوزارشی لە كەسێكی راستگۆی بە هەیبەتی خاوەن كەسایەتییەكی زۆر بەهێز دەداو یەكسەر كاری دەكردە سەر بەرامبەركەی و رایدەكێشا بەرەو لای خۆی. وەكو لەسەر زمانی عەلی كوڕی ئەبی تالیبەوە هاتووە لە سیرەی (ئیبن هیشام)دا: **من رآه بديهة هابه ومن خالطه أحبه**. واتە: ئەوەی یەكەمجار بیبینیایە سامی لێدەكرد و ئەوەشی تێكەڵی بكردایە خۆشی دەویست.

ئەمە دەربارەی شێوەو رووخساری پەیامبەر ﷺ كە نووسەر بە كەمو كورتی هێنابووی و لە خۆیەوە لە راڤەكەیدا ئەمەی بۆ زیاد كردبوو: (لەبەر ئەستووری شان و گەردنی كاتێك لای كردبوویەوە هەموو لەشی بادراوە)!!.

لەمە گرنگر كە نووسەر دەبوایە باسی بكردایە كەسایەتی و رەوشتو ئاكاری پەیامبەر ﷺ بوو، كە پەیوەندییەكی زیاتری بە باسەكەوە هەیە، بەڵام نووسەر بۆ ئەوەی وێنەیەكی راستەقینە دەربارەی پەیامبەر ﷺ دروست نەكات ئەم لایەنەی بە تەواوی فەرامۆش كردووەو پشت گوێی خستووە، ئێمە وا ناكەین بەڵكو بە كورتی تیشك دەخەینە سەر لایەنەكانی كەسایەتی پەیامبەر □ و رەوشتو ئاكارەكانی بۆ ئەوەی لەسەر رۆشنایی ئەو زانیارییانە كەسایەتی پەیامبەر ﷺ هەڵسەنگێنین و درۆ و دەلەسە و بوختان و بێ ئەدەبییەكانی نووسەر بۆ خوێنەر دەرخەین.

## رەوشتو ئاكاری پێغەمبەر ﷺ

هەروەكو چۆن پەیامبەر ﷺ لە رووی جەستەوە رێكوپێكترین كەس بووە، هیچ كەمو كورییەك لە جەستەیدا نەبوو، ئاشكراشە كە ئەمانە چەند كاریگەرییان هەیە لەسەر دروستكردنی كەسایەتی مرۆڤو باوەڕ بەخۆبوونی، بەهەمان شێوە لە رووی كەسایەتی و رەوشتو ئاكارییەوە كامڵترین كەس بوو، هیچ رەوشتێكو خوویەكی نەبوو جێی رەخنە بێت.

1- ویقارو هەیبەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە ویقارو هەیبەت بوو كەس نەیدەتوانی چاو ببڕێتە ناوچەوانی و بەرەو روو تەماشای بكات، وەكو ئیمامی عەلی دەفەرمووێت: لە یەكەم تەماشا سامت لێدەكرد و بە تێكەڵیی خۆشت دەویست.

ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی كە پیاوێكی زۆردار بوو، بەڵكو بە بەزەییترین كەس و بێ نەفسترین كەس بوو، هەركەسێك لەبەردەمیدا ترس دایبگرتایە هێمنی دەكردەوەو دەیفەرموو: (**على رسلك فإن أمي كانت تأكل القديد**) واتە: ئارام بەرەوە من پاشا نیمو كوڕی ژنێكم خورمای وشكی دەخوارد، (قەسپ) واتە هەژار بوو، یان دەیفەرموو: من كەسێك بووم شوانیم بۆ خەڵكی مەككە دەكرد.

2- ئەدەبو حەیاو شەرمی: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە حەیا بوو وەكو یارانی دەڵێن لە كچێكی تازە گوێزراوە بەشەرمتر بوو (**كان اشد حياءً من العذراء في خدرها**)،

هیچ كەسێك رۆژێك لە رۆژان وشەیەكی بەدەر لە ئەدەبی لێ نەبیستووە، یان رەفتارێكی دژ بە ئەدەبی لێ نەبینیوە.

3- راستگۆیی و زمان پاكی بە رادەیەك بوو كە پێش پێغەمبەرایەتی بە راستگۆ ناوبانگی دەركردبوو، هەر ئەمەش بوو كە قورەیشی خستبووە گێژاوەوە هەڵوێستی لاواز كردبوون، چونكە هەر كەسێك لێی بپرسینایە ئایا كەسێكی درۆزن بووە؟ دەیاگوت نەخێر، هەرگیز لەوەوبەر درۆمان لێ نەبینیوە، هەر ئەمەش بووە وای كردووە لەوانەی دەیانناسی یان پرسیاری رەوشتیان دەكرد باوەڕی پێ بێنن، چونكە دەیانگوت ئەمە شتێكی نالۆژیكییە كە كەسێك تا چل ساڵ هیچ درۆیەكی لێ نەبینرابێت دوای چل ساڵ بێتو درۆ بە دەمی خواوە بكات.

هەروەها ئەوەندە زمان پاكو زمان پاراو بوو هیچ كەسێك جنێوێك یان گاڵتەپێكردنێك یا سووكایەتیكردنێكی بە كەسێك لێ نەبیستووە، پەیامبەر ﷺ لە سوعبەتكردنیشدا درۆی نەكردووە، راستگۆیی پێغەمبەر ﷺ بە رادەیەك بووە كە سەرسەختترین دوژمنانی نەیانتوانیوە نكوڵی لێبكەن، ئەوەتا ئەبو سوفیان لەبەردەم هیرقلی رۆمو سوهەیلی كوڕی عەمر لەبەردەم نەجاشیدا دانی پێدا دەنێن كە بە راستگۆی دەستپاك ناسراو بوو لە ناویاندا.

4- دەستپاكیو ئەمانەتی پێغەمبەر (سپاردەپارێزی): دەستپاكییەكەشی بە هەمان شێوە یەكێك بوو لەو سیفەتانەی كە لە پێش پێغەمبەرایەتیدا ناوبانگی پێ دەركردبوو، پێی دەوترا (**الصادق الأمین**) واتە راستگۆی دەستپاكی جێی متمانە. جێی متمانە لە هەموو شتێكدا، لە پاراستنی ماڵو سەروەتو ئەمانەتی خەڵكیدا و لە پاراستنی نهێنیو هەموو شتێك كە دەدرا بە دەستی بۆ پارێزگاریكردنی، هەر ئەو سیفەتەش بوو هانی خەدیجەیدا داخوازیی بكات.

ئەمانەتی پێغەمبەر ﷺ تەنها لە پاراستنی سەروەتو سامانو نهێنیو تایبەتمەندییەكانی خەڵكیدا نەبوو كە پێی دەسپێردرا بەڵكو گرنگترین رواڵەتی ئەمانەتی پەیامبەر ﷺ گەیاندنی ئەو نیگایە بوو كە خوا بۆی ناردبوو، پارێزگاریكردنی بوو لە عەقیدەی یەكتاپەرستیو رێگەگرتن لە زیادەڕەوی بەرامبەر خۆیشی.

پەیامبەر ﷺ بوار زۆر بوو لەبەردەمیدا بۆ ئەوەی خۆی زۆر لەوە گەورەتر نیشان بدات كە هەبووە، خەڵكیش باوەڕیان پێدەكرد و ئەگەر بیویستایە دەیانبردە ئاستی خواو دەیانپەرست، بەڵام ئەو هەرگیز رێگەی ئەوەی نەدەدا كە شتێكی لەو بارەیە بكرێت، جارێكیان دوو كچ لە مزگەوتدا لە بۆنەیەكدا گۆرانییان دەوت، لەناو قسەكانیاندا دێڕێكیان دەوت كە دەڵێت:

**وفينا نبي يعلم ما في غد**

واتە: پەیامبەرێكمان هەیە دەزانێت سبەی چی روو دەدات، فەرمووی ئەمە مەڵێن، داهاتوو تەنها خوا دەیزانێ، شتەكانی تر بڵێن.

كاتێك ئیبراهیمی كوڕی مرد خۆر گیرا، خەڵكیی وتیان ئەوە لەبەر خاتری پەیامبەر ﷺ خۆر گیراوە، ئەویش كە ئەمەی بیستەوە یەكسەر خەڵكی كۆكردەوەو چووە سەر مینبەر و فەرمووی: رۆژو مانگ دوو دروستكراوو بەڵگەن لە بەڵگەكانی خوا، نە بە ژیانی كەسو نە بە مردنی كەس ناگیرێن، ئەم هەڵوێستەی پەیامبەر ﷺ وایكرد لە زانایەكی رۆژئاوایی موسڵمان بێت، چونكە وتی ئەم رەفتارە هی كەسێكی فێڵباز نییە.

هەر لەبەر ئەو ئەمانەتەیە كە زیادەڕەویكردن لە پەیامبەردا زۆر كەمترە لە زیادەڕەوی لە عەلیو پیاوچاكاندا.

5- بێ فیزیو رێزگرتنی لە خەڵكی: دەیان، بگرە سەدان نموونە هەیە لەسەر بێ فیزی پەیامبەر ﷺ و رێزگرتنی لە خەڵكی، پەیامبەر ﷺ هەركەسێك تەوقەی لەگەڵدا بكردایە دەستی بەر نەدەدا هەتا ئەو كەسە خۆی دەستی پەیامبەری ﷺ بەرنەدایە، هەزار ئیشی هەبووایە ئەگەر پیرەژنێك رایگرتایە بەجێی نەدەهێشت تا ئەو پیرەژنە، یان پیرەپیاوە قسەكەی تەواو دەكرد یان ئیشەكەی بۆ جێبەجێ دەكرد.

هەرگیز لە سەرووی مەجلیسدا دانەنیشتووەو كەسی لە جێی خۆی هەڵنەساندووە بۆ ئەوەی لە جێگاكەیدا دانیشێت، زۆر جار كەسێكی غەریب بهاتایەتە ژوورەوە لە یارانی جیای نەدەكردەوەو دەیپرسی (**أيكم محمد**؟) واتە: كامتان موحەممەدن؟ لە خواردنو هەڵسوكەوتدا خۆی لە دەوروبەرەكەی جیا نەكردۆتەوە، وەكو ئەوان ئیشی كردووە، بێ فیزییەكەی بەو رادەیە بوو كە زوربەی كات بۆ زەوی دەڕوانی نەك لووت بەرز كاتەوەو بۆ ئاسمان بڕوانێت، نەك هەر لە كاتی ئاساییدا بەڵكو لە كاتی بەدەستهێنانی گەورەترین سەركەوتنیشدا وەكو لە رۆژی فەتحی مەككەدا.

6- حیلمو حەوسەڵەو دانبەخۆداگرتنو دڵفراوانی: پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بە حیلمو حەوسەڵە بوو هەرگیز بۆ مافێكی خۆی تووڕە نەدەبوو، تەنها كاتێك تووڕە دەبوو كە سەرپێچی فەرمانێكی خوا بكرایە (**ما كان يغضب لنفسه قط وكان شديد الغضب إذا انتهكت حرمة من حرمات الله**). نەزانی وا هەبووە كراسەكەی پێغەمبەری راكێشاوە تا شوێنی یەخەكەی لە

گەردنی موبارەکیدا دەرکەوتووە، یاران ویستوویانە تەمێی بکەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیهێشتووەو هێمنی کردۆتەوەو کارەکەی بۆ جێبەجێ کردووەو رازیی کردووە.

ئەمما دان بەخۆداگرتنی پەیامبەر ﷺ لە رێگای گەیاندنی بانگەوازەکەیدا ئەوە شتێك نییە کەس نەیزانێت. ئەوهەموو فشارەی لەسەر ئەو بوو، لە گاڵتەپێکردنو منداڵ بەدوونانو شوێنکەوتنی بۆ ئەو شوێنانەی قسەی تێدا دەکرد بۆ خەڵکی بۆ بەدرۆخستنەوەیو ناوسكو ریخۆڵەی ئاژەڵ کردن بەسەریدا لە کاتی نوێژدا و تۆمەتبارکردنی بە سیحربازو شێتو جادوگەرو ئابڵوقەدانیو دەیان شتی تر لەو بابەتە، گەر بەسەر کێوێکدا دابباریایە دەیتواندەوە، بەڵام پەیامبەر ﷺ بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە لەبەردەمیدا وەستاو دەستی لە بانگەوازەکەی هەڵنەگرت، دەیانترساند، گاڵتەیان پێدەکرد، تەماعیان دەخستەبەر، مامیان لێ هاندەدا، منداڵە وردکەیان دەخستە دووی (وەکو ئەوەی لە تائیف روویدا)، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر بانگەوازەکەی، ئەو قسەیەی کە بەرامبەر مامەی دەیکات گەورەترین بەڵگەیە لەسەر رادەی خۆڕاگریی و سووریی پەیامبەر ﷺ لە گەیاندنی پەیامەکەی خوادا: سوێند بەخوا مامە، ئەگەر خۆر بخەنە دەستی راستمو مانگ بە دەستی چەپم لەبەرامبەر ئەوەی دەست لەم بانگەوازە هەڵگرم، دەستی لێهەڵناگرم تا دەیگەیەنمە مەبەست، یا لە پێناویدا تیادەچم.

7- ئازایەتیو نەبەردیو چاونەترسی: ئازایەتی پەیامبەر ﷺ شتێك نییە پێویست بە سەلماندن بکات، تەنها ئەوەندە بەسە بە شایەتیی لەسەر ئازایەتییەکەی کە بە تەنها توانی رووبەڕووی قوڕەیشو هەموو عەرەب بێتەوەو بانگەوازەکەی بگەیەنێتو لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەو گوڕەشەیەدا دەستی لێهەڵنەگرێتو پاشگەز نەبێتەوە.

ئەو رووداوەی کە لە مەککەدا روویدا پێش پەیامبەرێتییەکەی بەڵگەیە لەسەر ئازایەتییەکەی، ئەویش ئەوە بوو شەوێکیان دەنگێکی زۆر بەرز لە لایەکی مەککەوە بیسترا، بە رادەیەك کە هەموو خەڵکی مەککە خەبەریان بوویەوەو شڵەژان، لەو کاتەی کە خۆیان ئامادە دەکرد بچن بەدەم ئەو دەنگەوە، بینییان وا موحەممەد لەوێوە دێتەوە، پێی فەرموون ئارام بن هیچ شتێك نەبوو.

هەڵوێستی لە شەڕەکاندا بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئازایەتییەکەی، وەکو ئیمامی عەلی دەڵێت: کاتێك شەڕ گەرمبووایە ئێمە خۆمان دەدایە پەنای پەیامبەر ﷺ (**كنا اذا حمي الوطيس نحتمي برسول الله** ﷺ)، شەڕی حونەینیش کە هەموو یاران هەڵهاتن تەنها پەیامبەر ﷺ و چەند کەسێك نەبێت، گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەم راستییە، ئەوەبوو بانگی لێکردن: **إليّ إليّ، أنا النبي لأكذب أنا ابن عبدالمطلب**، واتە بۆ لای من، بۆ لای من، من پەیامبەرم بەبێ درۆ، من کوڕی عەبدولموتتەلیبم.

8- سەخاوەتو دەستو دڵ فراوانییەکەی: سەخاوەتی پەیامبەر ﷺ شتێك نییە بەڵگە هێنانەوەی بووێت، یارانی دەڵێن: (**كان أجود من الريح، وكان أجود ما يكون في رمضان**) واتە لە با بەفەڕتر بوو، واتە لە با خێراتر بوو بۆ چاکەکردن، لە رەمەزانیشدا لە هەموو کاتێك زیاتر.

پەیامبەر ﷺ داوای هەرچییەکی لێکرابێت نەیوتووە نەخێر، تەنانەت ئەگەر جلەکەی بەریشیان داوا کردبێت، هەرگیز دەستی کەسی نەگێڕاوەتەوەو کەسی بێبەش نەکردووە.

9- سۆزو بەزەییو نەرمو نیانیو لێبوردەیی: پەیامبەر ﷺ هەموو گیانی سۆزو بەزەیی بوو، تەنها لە مەیدانی جەنگدا نەبێت کە بەزەیی ناخوات، تەنانەت دوای شەڕیش تا بۆی بکرایە نەرمیی دەنواند، نموونەش دیلەکانی بەدر بوو کە پرسی بە سەحابییەکان کرد چییان لێبکەن، لەو هەموو راو بۆچوونە جیاجیایانە ئەوەیانی هەڵبژارد کە ئازادیان بکەن بەرامبەر بەوەی هەر یەکەیان کە خوێندەوارە دە نەفەر لە موسڵمانانی مەدینە فێری خوێندەواریی بکات.

پەیامبەر ﷺ هەرگیز تۆڵەی بۆ خۆی نەسەندۆتەوەو تا بۆی کرابێت نەرمو نیان بووە، تەنها لە چەند حاڵەتێکدا نەبێت. یەکەم: وەکو وتمان لە شەڕدا، دووەم: لە ئەنجامدانی حوکمی شەرعدا بەرامبەر کەسێك سەرپێچی بکردایە.

خوای گەورەش لە چەند شوێنێکدا بە غەفورو رەئوف و رەحیم ناوی بردووە (**لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ**) (التوبة : **128**).

سۆزو بەزەیی پەیامبەر ﷺ تەنها بەرامبەر بە ئادەمی نەبوو، بەڵکو بەرامبەر گیانلەبەرانیش بووە، لەم رووەشەوە زۆر فەرمودەی هەیە، لەوانە:

فەرموویەتی: (**الراحمون يرحمهم الرحمن**) (**ارحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء**)، بەزەییتان بەوانەی سەر زەویدا بێتەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لە ئاسماندایە (واتە خوا) بەزەیی پێتاندا بێتەوە، پیاوێك پەیامبەری بینی کچەزاکانی ماچ دەکات، وتی من چەند منداڵم هەیە کەسیانم ماچ نەکردووە، فەرمووی: من چیت لێبکەم گەر بەزەیی لە دڵت دەرهێنرابێت (یا داڕنرابێت)، (**ماذا أفعل بك ان كانت الرحمة قد انتزعت من صدرك**). پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ژنێك بە بۆنەی پشیلەیەکەوە چووە دۆزەخ، لەبەر ئەوەی بەستبوویەوەو نانو ئاوی نەدەدایە، دەفەرموێت: نە نانو ئاوی دەدایەو نە بەرەڵڵای دەکرد خۆی نانو ئاو بخوا. هەروەها دەفەرموێت: ئافرەتێکی داوێن پیس بە بۆنەی سەگێکەوە چووە بەهەشت.

10- داوێن پاکی: داوێن پاکی پەیامبەر ﷺ لە لای کەس جێی گومان نەبووەو بە رادەیەك بووە هەر لە گەنجییەوە سەرنجی دەوروبەری بە لای خۆیدا راکێشابوو، تاکو (25) ساڵی کە ژنی هێناوە، هیچ پەیوەندییەکی ناشەرعیی لەگەڵ کەسدا نەبووە، تەنانەت کەس نەیبینیوە وەکو گەنجانی تر بچێتە سەر رێی کچانو خەریکی چاوبڕکێ و ئەو شتانە بێت، دوای ژنهێنانیشی و تا دابەزینی نیگا زیاتر سیفاتی جوامێریو پیاوەتی تیایدا دەردەکەوت.

11- وەفاداری: یەکێك لە سیفەتە دیارەکانی پەیامبەر ﷺ وەفاداریی بوو، وەفای بۆ رەفیقەکانی دایکیو خەدیجەی خێزانیو هەموو کەسێك کە رۆژێك لە رۆژان چاکەی لەگەڵدا کردبێت، چاکەی هیچ کەسێکی فەرامۆش نەکردووەو لەبیر نەچووە.

12- رووخۆشیو خۆش مەعشەری: پێغەمبەر ﷺ یەکێك بوو لەوانەی کە بە هەمیشەیی رووی خۆش بوو، کەسێك تا زیاتر تێکەڵی بکردایە زیاتر خۆشی دەویست، قسەی خۆش بوو، میناشکێنی کەسی نەدەکردو کەسی لە مەجلیسدا تەریق نەدەکردەوە، رێزی لە منداڵو هەژارو پیرو ژنو پیاو دەگرت، لەگەڵ ماڵو منداڵیدا زۆر بەرێزو بەزەییو هێمنی قسەی دەکرد، هەرگیز لەسەر ئەوەی کە خواردنیان دروست نەکردبێت یان کارێکی ئەویان جێبەجێ نەکردبێ تووڕە نەبووە، ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: دە ساڵ خزمەتی پەیامبەرم کرد ﷺ، رۆژێك لە رۆژان شتێکم کردبێت، پێی نەوتووم بۆچی کردووتە یان نەمکردبێت پێی نەوتووم بۆچی نەتکردووە.

رۆژێ لە رۆژان لە ژنێکی خۆی نەداوە مەگەر لە رووی سوعبەتەوە، لە هیچ خزمەتکارێکی نەداوە.

زۆرجار لە نوێژی بەیانی گەڕاوەتەوە (چێشتەنگاو) پرسیویەتی لە خێزانەکانی چیمان هەیە، ئەگەر شتێك هەبووبێت خواردوویەتی، نەبووبێت دەنگی نەکردووەو فەرموویەتی: کەواتە بە رۆژووم. بە دەستی خۆی جلی بۆ خۆی شۆردووەو پینەی لێداوەو پێڵاوی بۆ خۆی چاککردووە.

13- هەژارانی خۆشویستووەو فەرموویەتی لە ریزی هەژارندا حەشرم بکە، بەڵام کەسانی تەمەڵو ئیشنەکەری خۆشنەویستووە، هەرکەسێك هاتبێت بۆ داوای شتێك هانیداوە بچێت ئیش بکاتو فەرموویەتی: (**اليد العليا خير من اليد السفلى**)، فەرموویەتی: (**المؤمن القوي خير وأحب الى الله من المؤمن الضعيف وفي كل خير**)، فەرموویەتی: (**ان الله يحب العبد المحترف**). پیاوێکی بینی لە مزگەوتدا خەریکی خواپەرستی بوو، پرسی ئەوە کێ مەسرەفی دەکێشێ؟ وتیان برایەکی، فەرمووی براکەی لە خۆی باشترە لای خوا.

14- زوهدو قەناعەتی پەیامبەر ﷺ لە رادەبەدەر بووە، جێگاکەی دۆشەکێکی تەنك بووە، زۆرجار کە لەسەری راکشاوە شوێنی حەسیرەکە لەسەر جەستەی موبارەکی دەرکەوتووە، ژوورەکانی زۆر سادە بوون، خواردنی زۆر سادە بووە،

له خواردندا حەزی لە گۆشت بوو، بە تایبەتی ناوشانی حەیوان، نەشبووایە گوێی لێنەبوو، جاری وا بووە بە دوو مانگ ئاگر لە ماڵی پەیامبەر دا نەکراوەتەوە.

15- ژیری و دانایی: پەیامبەر ﷺ هەر لە منداڵییەوە نیشانەی ژیری و دانایی پێوە دیار بوو، کەسایەتییەکەی هەر لە منداڵییەوە ئەوەندە بەهێز بوو باپیری لەو هەموو کوڕو کوڕەزایەی تەنها ڕێگەی بەو دەدا لە مەجلیسدا بە تەنیشتییەوەو لەسەر جێگاکەی دانیشێت.

دانایی پەیامبەر ﷺ لە چارەسەرکردنی کێشە قورس و گەورەکاندا بە زەقی دەردەکەوت، وەکو چارەسەرکردنی کێشەی (**حجر الأسود**) لە کاتی نوێکردنەوەی کەعبەدا کە خەریك بوو خێڵەکانی قورەیش بچن بەگژ یەکداو گۆماوی خوێن لە نێوانیاندا بڕژێت، بەڵام پەیامبەر ﷺ بە چاوتروکانێك چارەسەری کرد، هەروەها چارەسەرکردنی کێشەی مونافیقەکانو ڕووداوی ئیفك و دەیان کێشەی گەورەتری لەو بابەتە کە وای لە یەکێکی وەکو بەرناردشۆ کرد بڵێت: ئەگەر موحەممەد لە ژیاندا بووایە لە ماوەی قاوە خواردنەوەیەکدا کێشەکانی دونیای چارەسەر دەکرد.

16- پەیامبەر ﷺ گرنگی بە پاك و خاوێنی زۆر دەدا، جلەکانی لەگەڵ سادەییاندا هەمیشە پاك بوون، ددانەکانی وەکو مرواری دەدرەوشانەوە لە پاکی و سپێتیدا، بەردەوام سیواکی بەکاردەهێنا، حەزی لە بۆنی خۆش بوو، بە بەردەوامی بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا و دەیفەرموو: هەر کەسێك سیر، یان پیاز یا توور دەخوات با نەیەتە ناو کۆڕ و مەجلیسەوە بۆ ئەوەی ئازاری دەوروبەری نەدات.

17- پەیامبەر ﷺ گرنگی بە زانست زۆر دەدا و هانی موسڵمانانی دەدا منداڵەکانیان فێری خوێندەواری بکەنو دەفەرمووێت: بە دوای زانستدا برۆ ئەگەر لە وڵاتی چینیش بێت، دەیفەرموو: داوای زانست بکەن هەر لە ناو بێشکەوە تا ناو گۆڕ.

18- پەیامبەر ﷺ کەسێکی جددیی بوو، حەزی لە پیاوی تەمەڵ نەبوو، حەزی لەو کەسانە نەبوو کە کاتی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن، فەرمانی بە هەر شتێك بکردایە خۆی پێش هەموو کەسێك ئەنجامی دەدا.

19- پەیامبەر ﷺ لە هونەری پەروەردەو ئیدارەو سیاسەتدا کەسی نەدەگەیشتێ، ئەوەندە سەرکەوتوو بوو لە پەروەردەو بەڕێوەبردندا کە هاوەڵانی لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشەویستییان بۆی ئەوپەڕی گوێڕایەڵییان بۆی هەبوو، سوهەیلی کوڕی عەمر دەڵێت: زۆر پاشا و سەرۆك هۆز و سەرکردەم بینیوە، بەڵام کەسم نەبینیوە شوێنکەوتووانی وەکو شوێنکەوتووانی ئەو سەرۆکی خۆیان خۆش بووێت و ڕێزی لێبگرنو گوێڕایەڵی بکەن.

20- ویست و ئیرادەی پەیامبەر ﷺ: پەیامبەر ﷺ یەکێك بوو لەو کەسانەی خاوەنی ئیرادەیەکی پۆڵایین بوو، زۆریش زاڵ بوو بەسەر نەفسی خۆیدا، توانای کۆنترۆڵکردنی نەفس و ئارەزووەکانی بێ سنوور بوو، ئەمەش یەکێك بوو لە لایەنە بەهێزەکانی کەسایەتی پەیامبەر ﷺ کە وایکردبوو بتوانێت ئەو گۆڕانکارییە گەورەیە لەو کۆمەڵگەیەدا بکات کە بتپەرستی و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی تێکەڵی خوێنیان بوو بوو، ڕەگی داکوتابوو.

21- ڕێزگرتنی لە خەڵکیی بە گشتی و یارانی بە تایبەتی و پرس و ڕاوێژپێکردنیان: پەیامبەری ئیسلام ﷺ سەرەڕای ئەوەی کە پەیامبەر ﷺ بوو و لەلایەن خواوە نیگای بۆ دەهات، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێکی نەدەکرد بەبێ پرسی یارانی بە تایبەت لەو شتانەی کە پەیوەندی بە ژیانو بەرژەوەندی و بەشداری و ڕۆڵی ئەوانەوە هەبووبێت، وەکو بڕیاردانی شەڕو بەستنی قەراردادی ئاشتی و... هتد.

پەیامبەر ﷺ هەرگیز خەڵکی پەشیمان نەدەکردەوەو میناشکێنی نەدەکردن، کەسێك شتێکی بکردایە لەناو کۆڕو کۆمەڵدا پێی نەدەوت، ئەگەر بیشیوتایە بە شێوەیەك دەیوت کەس نەزانێت مەبەستی کێیە، بۆ نموونە دیفەرموو: (**ما بال اقوام يفعلون كذا وكذا**) واتە: هەندێك خەڵکی بۆچی ئەمە دەکەن و ئەوە دەکەن یان چییانە ئەمە دەکەنو ئەوە دەکەن.

پەیامبەر ﷺ لە زۆر شتدا پرس و ڕای بە خێزانەکانی خۆی دەکرد و شتی لێوەردەگرتن.

22- پەیامبەر ﷺ فێڵ و تەڵەکەو خیانەتی نەدەزانی، هەرگیز لە ژێرەوە بە چاو یا بە هەر شێوازێکی تر کە هەندێك لەوانەی لە دەوروبەریدان بیبینن و هەندێکیان نەیبینن ئاماژەی نەدەکرد، بۆ نموونە لە فەتحی مەککەدا یەکێك لەوانەی پەیامبەر  بڕیاری دابوو بکوژرێت (**عبدالله ابن أبي سرح**) بوو کە نووسەری وەحی بوو هەڵگەڕابووەوە لە ئیسلام، عوسمانی کوڕی عەففان هات لەگەڵیدا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لێی خۆش بێت، پەیامبەر  تا ماوەیەك دەستی نەدایێ بۆ بەیعەت لێوەرگرتنی، دوایی کە دەستی دایە و چووە دەرەوە فەرمووی: بۆچی کەسێکتان هەڵنەسان بیکوژن کە بینیتان دەستی نادەمێ، وتیان: ئەی پەیامبەری خوا  تۆ لە ژێرەوە بەچاو ئاماژەیەکت بۆ بکردینایە، فەرمووی: (**ما كان ينبغي لنبيٍ ان تكون له خائنة أعين**) واتە: بۆ پەیامبەر ﷺ نییە ژێراوژێر بە چاو ئاماژە بدات، بە هەمان شێوە لە هەموو مامەڵەیەکیدا لە کڕین و فرۆشتن، لە پەیمان بەستن و پەیمانداندا هەرگیز فێڵی نەکردووە و خیانەتی نەکردووە و پەیمانشکێنیی نەکردووە.

لەگەڵ ئەو هەموو سیفاتانەدا کە هەمووی سیفەتی کەسایەتی بەهێزن و هەرکەسێك کۆمەڵێك لە وانەی تێدابێت بە رێژەیەکی کەمیش، بە کەسێکی خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز و کاریگەر لە قەڵەم دەدرێت، چ جای ئەو هەموو سیفاتانە بە بەرزترین پلەیاندا لە کەسێکدا کۆببووبێتنەوە.

لەگەڵ ئەو هەموو سیفەتانەشدا کە بەسن بۆ هەر کەسێك بیەوێت گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگەیەکدا ئەنجام بدات یان پێشەوایەتی کۆمەڵێك یان کۆمەڵگەیەك بکات، لەلایەن خوایشەوە پشیوانی لێدەکرا.

یەکەم لە رێگەی نیگاوە (**وحي**) کە خۆی لە خۆیدا گەورەترین موعجیزەی پەیامبەرە ﷺ، دووەم لە رێگەی ئەو موعجیزانەی کە رۆژانە لەسەر دەستی دەردەکەوتن، وەکو تەسبیحات کردنی بەردەکان لەناو لەپیدا و هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەکانیەوە و شکات کردنی حوشتر لای لە دەستی خاوەنەکەی و بەرەکەت کەوتنە هەر خواردن و خواردنەوەیەك کە دوعای بەسەردا دەخوێندو قڵیشانی مانگ بە ئاماژەکردنی و دەیان شتی تر کە هەمووی راستگۆیی پەیامبەری دەردەخست و کەسایەتییەکەی لە ناو خەڵکییدا بەهێزتر دەکرد.

ئەمانە هەندێك بوون لە سیفاتەکانی پەیامبەر  کە هیچ کەسێك ناتوانێت نکۆڵی لێ بکات، هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەم سیفەتانە بداتە پاڵی ئەوە وەکو کەسێك وایە نکوڵی لە رووناکی رۆژ بکات یا بیەوێت بە بێژنگ بەری ئەو رووناکییە بگرێت.

کەسێك نییە بتوانێت بیسەلمێنێت کە پەیامبەر ﷺ کەسێکی درۆزن یا بێوەفا یا فیزل یا دەست پیس یا داوێن پیس بووە، یا بتوانێت بڵێت کەسێکی نەزان یا دڵڕەق یا بێ سیاسەت بووە، مەگەر کەسانێك نرخ بۆ قسەی خۆیان دانەنێن و تەنها مەبەستیان چەواشەکردنی خەڵکیی بێت یان ئاڕاستەکردنی تۆمەت بێت بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن کە ئەو تۆمەتە راستە یا درۆ یا گوێ بەوە بدەن بە درۆ دەخرێنەوە یان نا..

**ئەو رەخنە جددییانەی لە پێغەمبەری ئیسلام گیراوە و پێویست بەوە دەکات وەڵام بدرێتەوە، دوو شتە:**

1- فرەژنی

2- پەنابردنە بەر چەك یان شەڕ، بە تایبەت کوشتنی پیاوانی بەنی قورەیزەو بە غەنیمە بردنی ژن و ماڵیان.

ناحەزانی ئیسلام دەڵێن موحەممەد تا لە مەککە بوو تەنها یەك ژنی هەبوو، پەنای نەبردە بەر چەك و کەسێکی ئاشتیخواز بوو، بەڵام هەر کە چووە مەدینە دەستی دایە ژنهێنان و بەسێ و چوار نەوەستا بەڵکو تا سێزدە رۆیشت جگە لە کەنیزەك، هەروەها پەنای بردە بەر چەك و دەستی کردە شەڕکردن لەگەڵ عەرەب و جوولەکەدا.

لە چوارچێوەی ئەو رەخنانەشدا وتوویانە پەیامبەر ﷺ کەسێکی شەهوانی بووەو دڵی چووە لە ژنی زەیدی کوڕی **حاریثە** کە کردبوویە کوڕی خۆی، عائیشەی بە منداڵی خواست کە لەگەڵ تەمەنیدا نەدەگونجا و چەندین شتی تر کە کتێبەکەی مەریوان هەندێکی لەخۆ گرتووە (لەگەڵ بێ شەرمی و بێ ئەدەبیدا).

ئێمەش لێرەدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتانە بە پێویستی دەزانین تیشکێکی زیاتر بخەینە سەر ژیانی پێغەمبەر ﷺو چەند لایەنێکی تر لە ژیانی باس بکەین بۆ ئەوەی وێنەکە روونتر بێتەوە لەبەرچاوماندا:

**1ـ ژیانی پەیامبەری خوا ﷺ لە رووی عیبادەتەوە**

پێغەمبەری خوا ﷺهەر لەو رۆژەی نیگای بۆ هاتە خوارەوەو فەرمانی پێدرا دەست بکاتە بانگەواز ئیسراحەتی لە خۆی بری و رۆژی دەدا بە دەم شەوەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئایینە، رۆژی تەرخان کردبوو بۆ بانگەواز کردنی خەڵك و شەویش بۆ شەونوێژو موناجات و پارانەوە لە پەروەردگار بۆ سەرخستنی و ئاسانکردنی کارەکەی.

پەیامبەر ﷺهەر لە سەرەتای پێغەمبەرایەتییەوە بە دوو ئایەت ئاخاوتنی لەگەڵدا کرا کە چیتر نەتوانێ دوای ئەوە بیر لە پشودان بکاتەوە:

یەکەمیان دەفەرموویت: **"يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ * قُمْ فَأَنذِرْ" (المدثر 1 ـ2)** واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت داپۆشیوە بە جلەکانت هەستە خەڵکیی ئاگادار بکەرەوە.

دووەمیشیان دەفەرموویت: "**يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ * قُمِ اللَّيْلَ إِلاَّ قَلِيلاً**" (المزمل 1ـ 2). واتە: ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە بەجلەکانت شەو هەستە بۆ نوێژ، بەشێکی کەم نەبێت ئەوی تر هەمووی بە شەونوێژ ببەسەر.

پێغەمبەر ﷺدوای ئەو دوو سورەتە هەستا خۆی گورج کردەوەو خوا حافیزی لە خەوو ئیسراحەت کردو بە خەدیجەی فەرموو: "**مضى عهد النوم يا خديجة**". واتە: ئەی خەدیجە کاتی خەو بەسەرچوو.

دیارە ئەو هەموو شەونوێژو عیبادەتەی فەرز کرابوو لە سەری بۆ ئەوە بوو وزەی رۆحیی پێویست وەربگیرێت بۆ هەڵگرتنی ئەو بارە قورسە و هەستان بە پێداویستییەکانی ئەو بانگەوازە نوێیە وچوونە ژێر ئەو بەرپرسیارێتییە گەورەیەوە: **"قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً * نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً * أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً * إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلاً ثَقِيلاً * إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئاً وَأَقْوَمُ قِيلاً". (المزّمِّل: 2ـ 6)**. دوای فەرمان پێدانی بە شەونوێژو قورئان خوێندن پێی دەفەرموویت: ئێمە و تارێکی قورس وگران دەدەین بەسەرتا، بە راستی هەستانی شەو دوای خەو بۆ خوا پەرستی قورستر و گرانترە لە رووی کردارەوەو دروستترە لە رووی وتنەوە.

پەیامبەر ﷺو یارانی بۆ ماوەی ساڵێك ئەوەندە شەونوێژیان کرد تا بنی پێیان ئاوسا، دوای ئەوە ئەو ئایەتە دابەزی کە دەفەرموویت:

**"إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَى مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ وَطَائِفَةٌ مِّنَ الَّذِينَ مَعَكَ وَاللَّهُ يُقَدِّرُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَى وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ اللَّهِ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً وَمَا تُقَدِّمُوا لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ اللَّهِ هُوَ خَيْراً وَأَعْظَمَ أَجْراً وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ". (المزّمِّل: 20)**.

واتە: پەروەردگارت دەزانێت کە تۆ نزیکەی دوو لەسەر سێ و نیوەی شەوو سێیەکی هەڵدەستی بۆ شەونوێژ لەگەڵ هەندێك لەوانەی لەگەڵتان، خوا دەزانێت ئێوە ناتوانن بیژمێرن یا بیخەملێنن کە چەند نوێژتان کردووە (یان بەرگەی ناگرن) بۆیە خوا لێتان خۆشبوو، دەتوانن ئەوەندەی پێتان دەکرێت قورئان بخوێننەوە. دەزانێ کە لەمەودوا هەتانە نەخۆشە دەکەوێت و هەندێکتان خەریکی ئیش و کار دەبێت بۆ پەیداکردنی بژێوی و هەندێکتان دەچن بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا بۆیە بەو رادەیەی پێتان دەکرێت و دەتوانن قورئان بخوێننەوەو نوێژ بکەن و زەکات بدەن.. هتد.

واتە: دوای ساڵێك شەونوێژکەم کرایەوە لەسەر موسڵمان، بۆ موسڵمانان بوو بە سوننەت و لەسەر پەیامبەر ﷺبە فەرزیی مایەوە.

ئەمە لە مەککەدا، بەلام پاش کۆچی بۆ مەدینە کە سەردەمی فرەژنی و سەردەمی دەولەت و دەسەلاتی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئایا پێغەمبەر ﷺ وەکو سەرکردەکانی تری دونیا کە سەرکەوتن بەدەست دێنن و دەبنە خاوەن دەسەلات رووی وەرگێڕا بەرەو دونیاو دەستی دایە رابواردن یا هەروەکو سەردەمی مەککە خەریکی خواپەرستی و عیبادەت کردن بوو؟

بە پێچەوانەی هەمموو دەسەلاتدارە دنیاخوازەکانەوە پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی کە هیجرەتی کرد بۆ مەدینە و دەولەتی دامەرزاند و بوو بە خاوەنی دەسەلات زیاتر رووی کردە عیبادەت و شەونوێژو ئەوەندە خەریکی نوێژو پاڕانەوە بوو کەوا لە عائیشەی خێزانی بکات سەری سووڕبمێنێت و بپرسێت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت مەگەر خوا پەیمانی نەداویتێ کە لە هەمموو گوناهە رابردووەکان و داهاتووەکانت خۆش بێت پێغەمبەریش لە وەلامدا فەرمووی: "أفلا أكون عبداً شكورا". واتە: ئەی عائیشە نابێ بەندەیەکی سوپاسگوزارو شوکرانە بژێر بم؟

پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا نەك هەر شەونوێژی زۆری دەکرد، بەڵکو زۆرجار وا رێك دەکەوت چەند رۆژو چەند شەو بەسەریەکەوە بە رۆژوو دەبوو، نە بە رۆژو نە بە شەو هیچی نەدەخوارد کە ئەویش عیبادەتێکی تایبەت بوو بە پێغەمبەرەوەو پێی دەوترێت (وصل الصوم).

جا با لێرەدا بپرسین: ئایا مرۆڤێك لەو تەمەنەدا (54 -63ساڵ) بە رۆژ یا بە چەند رۆژ بەدەم یەکەوە بەڕۆژوو بێت وەزیاد لە نیوەی شەویش خەریکی نوێژ کردن بێت چی هێزو تواناو کاتێکی دەمێنێت بۆ رابواردن لەگەڵ ژندا بە تایبەت گەر بزانین پارشێوو بەربانگی پێغەمبەر ﷺ وەکو هی خەڵکیی ئەم سەردەمە رازاوە نەبوو، بەڵکو ئەوپەڕەکەی نان و خورما و ئاوێك بووە، نانیش چ نانێك؟ وانەزانی نانی گەنم بووە و وەکو هی ئێستا گەنمەکەی بە وردی هاڕرابێت و ئەو نانە جوانەی لێدروست کرابێت، بەڵکو نانی جۆ بووەو بە دەستاڕیش دەهاڕراو شتێکی وای لە بڕوێش زیاتر نەبوو.

ئێمە لەو کەسانەی کە دەپرسن بۆچی مۆڵەت دراوە بە پەیامبەر ﷺ ئەو هەمموو ژنە بێنێت دەپرسین ئەی بۆچی ناپرسن بۆچی ئەو هەمموو شەونوێژو رۆژو و عیبادەتە زیادەی لەسەر فەرز کرا بوو؟

ئەمانە هەمووی لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە دەبێ ئەوە بزانین کە پەیامبەری خوا ﷺ بە بەردەوامی چاوەڕوانی دابەزینی وەحی بوو لەلایەن خواوە، بۆیە هەوڵی داوە هەمیشە لەشی پاك بێت و دەستی بە دەستنوێژ بێت هەروەکو چۆن کەسێك چاوەڕوانی لێپرسراوێکی گەورە بێت و هەمیشە خۆی بەستبێت و لە ئامادەبیشدا بێت بۆ پێشوازی کردنی بە هەمان شێوە پەیامبەر ﷺ بە بەردەوامی چاوەڕوانی هاتنی جوبرەئیل و دابەزینی وەحی بوو کە بە نیسبەت ئەوەوە لە هەمموو رابواردنەکانی دونیا خۆشتر بوو.

زۆرجار پەیامبەر ﷺ لەکاتێکدا کە خەڵکی لە شیرینی خەو و لەناو جێگەی گەرمدا بوون ئەو هەڵدەستاو دەستنوێژی دەشۆردو دەچووە سەر بەرماڵ و دەستی دەکردە نوێژ کردن و پاڕانەوە و موناجات لەگەڵ خوای خۆیدا. جاری وا بووە ئەوەندە لە سوجدەدا ماوەتەوە عائیشە دەستی بردووە بۆ ژێر پێی و ختوکەی داوە بۆ ئەوەی بزانێت ماوە یان مردووە، یان لە نیوەی شەودا کە خەڵکی هەمموو خەوتوون ئەو هەڵساوە و چووەتە دەرەوە، عائیشە وای زانیوە دەیەوێت بچێت بۆ لای ژنەکانی تری، بەڵام دوایی بینیویەتی دەچێ بۆ گۆڕستانی بەقیع و سەلام لەو یارانەی دەکات کە شەهید بوون و دوایی دەگەڕێتەوە بۆ سەر نوێژەکانی.

بەکورتی ئەگەر ژیانی پەیامبەر ﷺ بخوێنیتەوە لە بواری عیبادەتدا دەڵێی ئەم زاتە جگە لە عیبادەت هیچی تری نەکردووەو نەپەرژاوەتە سەر هیچی تر، شایانی باسە ئەمە تەنها لایەنێکە لە ژیانی پەیامبەر ﷺ کە ئەوەندەی لە کاتی گرتووە، ئەگەر بێتو لایەنەکانی تر تەماشا بکەین لە بانگەوازو پەروەردەو جیهاد و بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمان و چارەسەرکردنی ئیشەکانیان لەگەڵ لێکدانەوەی کەسایەتی پەیامبەر ﷺ لە رووی هیمەت و بایەخەکانیەوە **(إهتماماتە)** ئەو کاتە دەپرسی ئاخۆ دەبێ پەیامبەر ﷺ چی بۆ خێزانەکانی خۆی هێشتبێتەوە.

**2- ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە بواری بانگەوازو پەروەردەدا**

ئەگەر بەراوردێك بكەین لە نێوان سەردەمی نەفامی و ئەو كاتەی كە پەیامبەر ﷺ دونیای بەجێهێشت قەوارەی ئەو گۆڕانە گەورەیەمان بۆ دەردەكەوێت كە لەو كۆمەڵگەیەدا بەو ماوە كورتە ئەنجام درا بوو و ئەو كاتەش دەتوانین بیخەملێنین كە پەیامبەر ﷺ چەند كات و ئەركی بۆ ئەو كارە تەرخان كردووەو چەند پێوەی ماندوو بووە.

ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیدا لە روخاندنی ئەو هەموو بیرو باوەڕە چەوت و هەڵەیەی كە لە مێشكی ئەو خەڵكەدا رەگی داكوتابوو، تێكەڵی هۆش و هەست و خوێنیان بوو بوو، روخاندنی ئەو هەموو دابونەریت و رەوشتانەی خوویان پێوەگرتبوو، وەدامەزراندنی بیروباوەڕێكی راست و بەرفراوان دەربارەی خواو پەیامبەران و گێتی و بوونەوەرو ژیانی دونیاو دوارۆژ پاشان دروست كردنی كۆمەڵگەیەك لەسەر بناغەی رەوشتی بەرزو پاك و هەڵوەشاندنەوەی ئەو هەموو دابونەریتەو گۆڕینیان بەدابو نەریتێكی نوێی هەڵقوڵاو لە عەقیدەو بیروباوەری ئیسلامییەوە.. هتد. ئەم كارانە گەر بە جیددی بیریان لێبكرێتەوە و بە وردی هەڵسەنگێنرێت دەبێ بڵێین پەیامبەر ﷺ جگە لە بانگەوازو پەروەردە كردنی خەڵكیی هیچ كارێكی تری نەكردووەو نەیپەرژاوەتە سەر هیچ شتێكی تر و دەبێ بڵێین هەموو ژیانی لە ناو خەڵكیدا بردۆتە سەر.

لەوانەیە بڵێین پەیامبەر ﷺ دوای ئەوەی هاتە مەدینە كۆڵی (13) ساڵی هەوڵدان و ماندوو بوون و ئەشكەنجەو ئازارو ناڕەحەتی داخست و پشووی داو قۆناغێكی تازەی دەست پێكردو ئاوڕی دایەوە لە ژیان و رابواردن و ئارەزووەكانی خۆی.

لە راستیدا پەیامبەر ﷺ دوای كۆچكردنی بۆ مەدینە، نەك هەر ئەركی سەرشانی سووك نەبوو، بەڵكو چەند بار قورستر بوویەوەو ئیشەكانی زۆر زیاتر بوون و ئەو كارەی چاوەڕوانی پێغەمبەری دەكرد زۆر زیاتر و سەختتر بوو لە كاری مەككەی.

لە مەككەدا پەیامبەر ﷺ خەریكی بانگەوازو پەروەردەو خواپەرستی بوو، بەڵام لە مەدینەدا دەبوایە لە پاڵ ئەوانەدا كاروباری خەڵكی مەدینە بەڕێوە ببات و كێشەكانیان چارەسەر بكات و رووبەڕووی هێرشەكان و پیلانەكانی عەرەبی بتپەرست و جولەكەو دووڕووەكان بێتەوەو دەوڵەت بەرێوە ببات و چەندین شتی تر، جا ئیتر بیهێنە بەرچاوی خۆت كەسێك بیەوێت ئەو هەموو كارە بكات و ئەو هەموو ئەركانەی لەسەر شان بێت، ئەبێ چەند ماندو بێت و چەند لە كاتی خۆی بۆ تەرخان بكات، بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین كە پەیامبەر ﷺ پیرەژنێكیش لە رێگەو باندا رایگرتایە بەدەمیەوە دەوەستاو گوێی لێدەگرت و وەڵامی دەدایەوەو بەجێی نەدەهێشت تا خۆی نەڕۆشتایە، پەیامبەر ﷺ دەبوایە ئەو كۆمەڵگە نەفام و دوور لە شارستانییەت و گیرۆدەی دەستی دەمارگیریی بۆ هەموو دابونەریت و بیروباوەڕێكی بەجێماو لە باو و باپیرانەوە بگۆڕێ بە كۆمەڵێكی خواپەرستی رەوشت بەرزو بیانكاتە پێشەواو مامۆستای مرۆڤایەتی، جا ئایا كەسێك بۆ ئاوەها مەبەستێك هاتبێت و ئاوەها گرنگییەكی لە ئەستۆدا بێت دەتوانێ لێببڕێ بۆ رابواردن و خۆشگوزەرانی خۆی؟ لێرەدا بۆ زانینی قەوارەی ئەو گۆڕانكارییەی كە پەیامبەر ﷺ ئەنجامیدا لە كۆمەڵگەی ئەو سەردەمەدا بە پێویستی دەزانین جارێكی تر ئاماژە بەو قسەیە بدەین كە دەڵێت: ئەگەر بهاتایە كەسێك پێش هاتنی پەیامبەر ﷺ پێشبینی ئەوەی بكردایە كە دوای چارەكە سەدەیەك ئەو هەموو گۆڕانكارییە بەسەر خەڵكی نیوەدورگەی عەرەبیدا دێت لەوانەیە بەشێت لەقەڵەم بدرایە!

دەبێ ئەوەش بزانین كە گۆڕینی كۆمەڵگە لە كۆمەڵگەیەكی ناپابەند بە هیچ شەریعەت و یاسایەكەوە بۆ كۆمەڵگەیەكی خواپەرستی پابەند بە شەرعەوەو خاوەنی كۆمەڵە بەهاو نەریتێكی نوێ ئەركێك و كارێكی زۆری دەوێت بە پێچەوانەشەوە گۆڕینی كۆمەڵگەیەكی پارێزكار بۆ كۆمەڵگەیەكی بەرەڵڵای شوێن ئارەزووكەوتوو كارێكی زۆر ئاسانە، چونكە نەفسی مرۆڤ حەزی لێیە، یەكەمیان وەكو سەركەوتن بە شاخێكی سەختدا وایە و دووەمیان وەكو گلۆركردنەوەی شتێكە لەبەرزییەكەوە بۆ خوارەوە، یەكەمیان وەكو دروست كردنی كۆشكێك لەسەر شوێنەوارێكی زۆر شەخەڵ و دووەمیان وەكو روخاندنی كۆشكەكە وایە.

ئایا كەسێك ئەو هەموو مەشغەڵەتەی هەبێت و ئەو هەموو ئەركەی لەسەر شان بێت و ئەو هەموو كێشەیە رۆژانە رووی تێبكەن تا چ رادەیەك دەتوانێت خەریكی سێكس و رابواردن بێت كە مێشكێكی ئاسودەی دەوێت؟

**3ـ ژیانی پەیامبەر ﷺ لە رووی خواردن و خەوتن و پۆشاك و كەرەسەی ماڵەوە**

ئەوەی لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ زۆر سەرنجڕاکێشە ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی لە مەدینەدا پارەو زێڕو هەرچی پێداویستی هەیە لەبەردەستیدا بوو، کەچی هیچ گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ لە ژیانیدا رووی نەدا، لەوەوبەر چۆن دەژیا لە مەدینەشدا بەهەمان شێوە ژیانی دەبردە سەر لە رووی خواردن و پۆشاك و جلوبەرگ و پێداویستیەکانی ماڵەوە، جاری وادەبوو بە دوو مانگ لە ماڵی پەیامبەردا ﷺ ئاگر نەکرایەوە، وەکو عائیشە دەیگێڕێتەوە، ئەو بە هیچ شێوەیەك بە تەنگ خواردنی خۆش و رابواردنی خۆشەوە نەبوو، زۆرجار پاش رۆژهەڵاتن لە مزگەوت دەگەڕایەوە لە خێزانەکانی دەپرسی چیمان هەیە؟ ئەگەر شتێك هەبوایە دەیخوارد، ئەگەر هیچیشیان نەبوایە دەیفەرموو کەواتە بەڕۆژووم بێ ئەوەی هیچ ئاژاوەیەك بنێتەوە یان هیچ ناڕەحەتییەك بنوێنێت یان هیچ بۆڵەیەك بەسەر ژنەکانیدا بکات یا تەنانەت ژنەکانیشی هیچ بۆڵەیەکی بەسەردا بکەن.

پەیامبەر ﷺ وا نەیدەڕوانی بۆ ژیان کە بۆ خواردنی خۆش یا رابواردن بێت، بەڵکو خۆی بە خاوەنی پەیامێك دەزانی کە لە خواوە بۆی هاتبوو، دەبوایە بیگەیەنێت بە مرۆڤایەتی، جگە لەو پەیام و ئەرکەش هیچ شتێکی تر ئەو نرخ و بایەخەی نەبوو بە لایەوە وەکو مەحوی دەڵێ:

فەلەك جاهێ سەری خەرمانی تا عەرش ئەڵبەتە نابێ

تەنەزول کا علووی هیمەتی بۆ دەنکە زیزانە

بەڵێ، هەموو دونیا بە لای پەیامبەرەوە ﷺ وەکو دەنکە زیزانەیەك وابوو کە لە خەرمانێکی زۆر گەورە بەجێ مابێ ئیتر چۆن کێشە و ئاژاوەی لەسەر دروست دەکات.

جارێکیان عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ) چوو بۆ ماڵی پەیامبەر ﷺ بینی لەسەر زەوی دانیشتووە، دەستی کرد بە گریان وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەوە پاشای رۆم و فارسە لەگەڵ ئەوەی کە کافرو بێ باوەڕن کەچی لەوپەڕی خۆشیدا دەژین تۆش پەیامبەری خوای لەسەر ئەو زەوییە رەق و تەقە دادەنیشی و دەخەوی؟

پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عومەر ئەوان رابواردنی دونیایان بۆ پێش خراوەو ئێمەش بەهەشتمان بۆ دانراوە. ئەگەر دونیا لای خوا ئەوەندەی باڵە مێشوولەیەك ئەرزشی هەبوایە یەك قوم ئاوی بە بێبڕواکان نەدەدا.

ئاشکرایە گەر کەسێك بیەوێت لە لایەن جنسەوە زۆر رابوێرێت، دەبێ هەمیشە خواردنی زۆر و باش بخوات، بەڵام پەیامبەر ﷺ نەك هەر خواردنی زۆر و خۆشی نەدەخوارد، بەڵکو زۆربەی کات بەڕۆژوو بووە جاری واش رێك دەکەوت بە چەند رۆژو چەندشەو رۆژووی نەدەشکاند، زۆر جاریش لە برسانا بەردی لەسەر سکی خۆی دەبەست وەکو لەچەندین شوێندا یارانی باسیان کردووە، زۆر جاریش خواردنی پەیامبەر ﷺ نان و ئاو یان نان و خورما بووە.

جا ئەوانەی وا ژنیان هەیە با تاقی بکەنەوە و خۆیان بۆ ماوەیەك برسی بکەن بزانن ئایا دەتوانن چالاکی جنسی ئەنجام بدەن؟ شتێکی تر کە گرنگە بۆ هەر کەسێك بۆ رابواردن ژنی زۆر بهێنێت ئەوەیە کە دەبێ ئەو کەسە جێگە و رێگەی باشی بۆ ئامادە بکات و زۆر بە پەرۆشی چاککردنی شوێنی خەوتنیەوە بێت، بەڵام ئەگەر سەیری ژیانی پەیامبەر ﷺ بکەین دەبینین سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی کاتی لە شەواندا خەریکی شەونوێژ بووە ئەو کاتانەشی کە تێیدا دەخەوت یا لە سەر زەوییەکی رووت دەخەوت، یا لە سەر حەسیرێك کە شوێنی ریشاڵەکانی لەسەر پشتی پیرۆزی دەردەکەوت و ئەو چێژەی لە خەو نەدەبینی کە ئەو کەسانەی لەسەر جێگەی نەرم دەخەون دەیبینن، مەبەستیشی لەوە ئەوە بوو خەوی قوڵ نەیباتەوە و شەونوێژەکانی لە دەست نەچێت.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە کە هەموو کەسێك لە روانگەی خۆیەوە دەڕوانێت بۆ خەڵکانی تر، بۆ نموونە لاوێك کە هەموو فکرو هۆشی لای جنس و رابواردنی جنسی بێت بە لایەوە سێکس لە هەموو شتێك گرنگترە و لەوانەیە بڕوا نەکات کەسێك هەبێت بتوانێت جڵەوی نەفسی خۆی بگرێت یان بەلایەوە سەیر بێت پیاوێك شەو لەناو جێگە هەڵسێت و دەست بکاتە شەونوێژ کردن، هەروەها خەڵکانی نەوسن و زۆرخۆر لەوانەیە بە لایانەوە سەیر بێت کەسانێك هەبن خواردنی زۆر خۆشیان لەبەردەمدا بێت و بتوانن نەیخۆن یان کەسێك رۆژی نا رۆژێك بێ ئەوەی فەرز بێت لەسەریان بەڕۆژوبن.

لێرەوە دەڵێین گەورەیی کەسایەتی پەیامبەر ﷺ تەنها کەسانێك لێی تێدەگەن و پەی پێدەبەن کە خۆیان گەورە بن و خاوەنی مەبەست و پەیامی گەورە بن لە ژیاندا، ئەگینا ئەوانەی کە بۆ مەبەستی بچووك و تێرکردنی ئارەزووەکانی نەفس هەوڵ دەدەن هەرگیز ناتوانن لە کەسایەتی پەیامبەری خوا تێبگەن.

4- ژیانی پەیامبەر ﷺ لە رووی سێکسەوە: ئاشکرایە کە ئەگەر کەسێك مەیلی بە لای شەهوەتی جنسیدا زۆر بێت ئەوا هەر لە زەمانی هەرزەکاری و گەنجییەوە پێوەی دەردەکەوێت و هەندێك شتی لێ دەبینرێت کە بەڵگە بێت لەسەر ئەو شتە، بەڵام ئەوەی بە شێوەیەکی حاشاهەڵنەگر لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ زانراوە ئەوەیە کە بە درێژایی تەمەنی لاوی و جوانی هیچ شتێکی لێ ناگێڕنەوە لەوانەی کە لاوێك یا هەرزەکارێکی ئاسایی دەیکات چ جای کەسێکی شەهوانی، لە دڵداری و چاوبڕکێ و دوای کچ کەوتن و خۆ قۆزکردن و وەستان لە رێی کچاندا و نزیك بوونەوە لە کانی ژنان و باسکردنی کچە جوانەکانی گەڕەك و شار لەگەڵ رەفیق و دۆستانیدا، پەیامبەری خوا ﷺ نەك هەر هیچ شتێك لەوانەی لێناگێڕنەوە، بەڵکو هەر لە تەمەنی منداڵی و گەنجیدا هەموو سیفەتێکی پیاوانەو نەجابەت و رەشیدی و جوامێری پێوە دەرکەوتبوو بە رادەیەك کە سەرنجی هەموو دەوروبەرەکەی بە لای خۆیدا راکێشابوو، ئەوەندە کەسایەتییەکەی بەهێز بوو لە منداڵییەوە جێگاکەی باپیری کە لە پاڵ کەعبەدا بۆیان رادەخست و هیچ کوڕێکی لەسەری دانەدەنیشت باپیری ئەمی لەسەری دادەناو لە تەنیشتی خۆیەوە دایدەنیشاند، ئەمە حاڵی پەیامبەر ﷺ بوو تا (25)ساڵیی کە ژنی هێنا، نە دڵداری، نە چاوبڕکێ، نە وەستان لەڕێی کچان، نە هاتوچۆی ئەو شوێنانەی کە زینای تێدا دەکرێت، نە هیچ رەفتارێك کە بچووکترین بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە کەسێکی هەوەسباز بێت، لە دوای (25) ساڵییش ژنێکی هێنا (15) ساڵ لە خۆی گەورەترو تا پەنجا ساڵی و بۆ ماوەی (25) ساڵی رەبەق لەگەڵیدا مایەوە بێ ئەوەی بیر لە هێنانی ژنی تر بکاتەوە یان هیچ شتێکی لێ ببینرێت یا ببیسرێت بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی کە نارازییە لەو ژیانەی یان حەزی لە ژنی ترە، بەڵام لەترسی خەدیجە ناوێرێت یان لە ژێرەوە پەیوەندیی لەگەڵ ئافرەتی تردا هەبێت وەکو ئەوەی هەندێك لەو پیاوانەی لە ژیانی ماڵەوەیان نارازین یا جوانی ژنەکانیان بە دڵیان نییە دەیکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوەی لێ دەگێڕنەوە ئەو پەڕی ئاسودەیی و خۆشەویستی و رێزگرتن لە یەکتر بووە لە نێوانیاندا، ئەو خۆشەویستی و رێز لەیەکترنان و لەیەکتر گەیشتنە بە رادەیەك بوو کە پەیامبەر ﷺ دوای مردنی خەدیجەش هەمیشە باسی دەکرد. لەوانەیە هەندێك کەس بڵێن بە تەماعی پارەکەی خواستبێتی، ئەگەر وابوایە ئەو کاتە وەکو هەموو ئەوانەی کە ئافرەتی دەوڵەمەند بە تەماعی سامانەکەیان دەخوازن بە بیانوویەك ئەوی لە کۆڵی خۆی دەکردەوەو ژنێکی تری دەهێنا، بەڵام پەیامبەر ﷺ تا ئەو رۆژەی کە خەدیجە کۆچی دوایی کردووە هیچ ژنێکی تری نەهێناوەو سامانی خەدیجەشی بەکار نەهێناوە بۆ خۆشگوزەرانیی خۆی، چونکە ژیانێکی زۆر سادەو زاهیدانەی بردۆتە سەر، نەك هەر ئەوە بەڵکو مێژوونوسانیش بۆمان باس ناکەن کە پەیامبەر ﷺ دوای خواستنی خەدیجە خەریکی بازرگانی بووبێت بە سامانەکەی خەدیجەوە یان لە رووی سەروەت وسامانەوە رەوشتی گۆڕابێت و بووبێت بەکەسێکی دەوڵەمەندی ناو مەککە، یان رۆژێك لە رۆژان لەگەڵ خەدیجەدا کێشەیەکی هەبووبێت لەسەر سامانەکەی و بازرگانییەکەی، پەیامبەر ﷺ لە بێ دەسەڵاتیشی نەبووە کە ژنی تری نەهێناوە، چونکە وەکو باسمان کرد ئەو کەسایەتییەکی وا لاواز نەبوو ژنێك بتوانێت قسەی خۆی بەسەریدا زاڵ بکات و ببێتە بەربەست لەبەردەم ویست و ئارەزووەکانیدا، پەیامبەر ﷺ گەر ئارەزووی لێ بوایە جوانترین و دەوڵەمەندترین و ناودارترین ژنانی نەك هەر مەککە بەڵکو هی عەرەبیشی دەهێنا، بە تایبەت پاش ئەوەی کە دەستی دایە بانگەوازەکەی بۆ ئیسلام یەکێك لەو شتانەی سەرانی قوڕەیش پێشنیاریان کرد بۆی ئەوەبوو ئەگەر دەیەوێت جوانترین کچی عەرەبی بۆ بێنن، هەر کچێك کە ئەو دەستی بخستایەتە سەر یا بیکەن بە دەوڵەمەندترین کەسی ناو عەرەب، یا گەر لەو پایەی دەوێت بیکەن بە سەرگەورەی خۆیان، بەڵام ئەوە بوو پەیامبەر ﷺ بە هیچکام لەو شتانە رازی نەبوو، بەو کەسانەی کە ئەو پێشنیارەیان بۆ کرد چەند ئایەتێکی لە قورئان خوێندەوە کە پێیان بڵێت: ئێوە زۆر بەهەڵەدا چوون و من لە شیوێك و ئێوە لە شیوێکن، من پەروەردگار ناردومی پێتان راگەیەنم کە دەست لە بتپەرستی هەڵگرن و تەنها ئەو

خوایە بپەرستن کە بەدیهێناون، ئێوەش وادەزانن من مەبەستم دەسکەوتی شەخسییە، پەیامبەر ﷺسەرەتای سورەتی (فصلت)ی بۆ خوێندنەوە کە دەفەرموویت: "**حم * تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ * كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ * بَشِيراً وَنَذِيراً فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ * وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ * قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ * الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ**". تاگەیشتە ئایەتی: "**فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ**". (**فصلت: 1ـ 13**). واتە: ئەگەر پشتیان تێ هەلکردی ئەوا هەڕەشەی سزایەکی وەکو سزای گەلی عاد و **سەمو**دیان لێبکە. ئەوە بوو ئەو دوو سێ کەسەی چووبوون ئەو قسانەی لەگەڵدا بکەن دەستیان خستە سەر دەمی پەیامبەر ﷺو تکایان لێکرد تەواوی نەکات.

پەیامبەر ﷺئەوەندە لە ژیانی خۆی لەگەڵ خەدیجەدا رازی بوو بە رادەیەك کە دوای مردنیشی هەمیشە باسی دەکردو پرسیاری رەفیقەکانی دەکرد و ریزی تایبەتی لێدەنان و ئەوەندەی باس دەکرد کە ئیرەیی خێزانەکانی تری بەرامبەر بجولێنێت و وا لە یەکێکی وەکو عائیشە کە خۆشەویسترین ژنی پەیامبەر ﷺبوو بپرسێت ئەوە چییە ئەوەندە باسی ئەو پیرەژنە دەکەیت دەلێی خوا ژنی تری نەداویتێ ئەو نەبێت؟ ئەویش لە وەلامدا دەیفەرموو: نا سوێند بە خوا کەسی تری وەکو ئەوم نەدراوەتێ، ئەو لە کاتێکدا کە خەلکی بە درۆیان خستمەوە باوەڕی پێ هێنام، کاتێك خەلکی پشتیان تێکردم ئەو پشتی گرتم، خوا تەنها لەو منداڵی پێ بەخشیم، بڕوانە بیرکردنەوەی پێغەمبەر ☐کە بە زۆریی پەیوەستە بە بانگەوازەکەیەوە.

کوا شوێنەواری شەهوەت لە ژیانی کەسێکدا تا (25) ساڵی هیچ شتێکی لێ نەبینرابێت لەوەی کە گەنج و هەرزەکار دەیکات و لە (25) ساڵییەوە تا (50) ساڵیی لەگەڵ ئافرەتێکدا کە (15) ساڵ لە خۆی گەورەترە ژیانی بردبێتە سەر بێئەوەی شتێکی لێ ببینرێت کە بەلگە بێت لەسەر رازی نەبوونی بەو ژنە یا رازی نەبوونی بەو ژیانەی کە لەگەڵیدا بردویەتە سەر.. نەك هەر ئەوەندە بەلکو پاش خەدیجە ژنێکی تری هێنا کە هەموو مێژوونوسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە جوان نەبووەو ژنێکی کەتە بووە، لەگەڵ ئەویشدا نزیکەی چوار ساڵ بە تەنها ماوەتەوە، ئەویش سەودەی کچی زەمعە بوو.

پەیامبەر ﷺنەك هەر لە مەککە، بەلکو لە مەدینەشدا هەلی بۆ رەخسا جوانترین کچی عەرەب بخوازێت یان بیکات بە کەنیزەك، بەلام نەیکرد.

لەشەڕی (بەدر)دا کچێکی زۆر جوانیان بە دیل گرت، دایکی بە دژایەتی کردنی پەیامبەر ☐ناوبانگی دەرکردبوو پێشیان دەوت (**شیطانة** العرب)، ئەو کچە بەر یەکێك لە یارانی پەیامبەر ﷺکەوتبوو، پەیامبەر ﷺدوجار داوای لێکرد کە ئەو کچەی بداتێ، دوای جاری دووەم هێنای بۆ پەیامبەر ﷺ، ئەویش دەیتوانی بیکات بە کەنیزەکی خۆی یان بیخوازێت، بەلام هیچیانی نەکرد بەلکو ناردییەوە بۆ مەککە و لەگەڵ چەند دیلێکی موسلماناندا گۆڕییەوە.

5ـ پێغەمبەر ﷺلە نێوان حەز و ویست و نیگادا : ئەوەی لە ژیانی پەیامبەر ﷺبکۆلێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر زۆر زالبووە بەسەر نەفس و ئارەزووەکانیدا، بە تایبەت شەهوەتی خەوتن و خواردن و سێکس کردن، وەحییش رۆلێکی گەورەی بینیوە لە ژیانیدا.

ئێمە نالێین پەیامبەر ﷺمەیلی بۆ خواردن و سێکس کردن نەبووە، بەلام دەلێین ئەو وەکو هەموو مرۆڤێکی تر ئارەزووی خواردن و سێکسی لە سنورێکی سروشتیدا بووە، بەلام ئیرادەیەکی زۆر بەهێزو پۆلایینی هەبووە، بە رادەیەك کە دەیتوانی هەموو شتێك کە نەفسی ئارەزووی دەکات لەسەر خۆی قەدەغە بکات و بە شێوەیەکی وا زاڵ بێت بەسەر ئارەزووەکانیدا کە هەندێك جار واپێویست بکات خوا لەرێگای نیگاوە فەرمانی پێ بدات کە ئەو شتانەی خوا بۆی حەلاڵ کردووە لەسەر خۆی حەرام نەکات. "**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ..**".

پەیامبەری خوا ﷺلە رووی توانای زاڵ بوون بەسەر نەفس و هێزی ئیرادەیەوە لە هەموو کەسێك بە تواناتر بووە، هەر وەکو چۆن توانیویەتی چەند رۆژ و چەند شەو بەسەریەکەوە بەرۆژوو بێت و بەربانگ و پارشێو نەکات لە نێوانیاندا، بەهەمان

شێوە توانیویەتی بۆ ماوەیەکی زۆر نزیکی خێزانەکانی نەکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە لەگەڵیدا دەژیان و لە ماڵەوە پێکەوە بوون و لە یەك ژووردا دەنوستن.

حەزرەتی عائیشە لەم رووەوە بە صەحابەکان دەفەرموویت: (**انه ليس فيكم من يملك اربه مثل رسول الله**)

واتە: هیچ کەسێك لە ئێوە ناتوانێت وەکو پەیامبەری خوا ﷺ نەفسی خۆی کۆنترۆڵ بکات.

لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە کە پەیامبەر ﷺ چ لە بەکارهێنانی شەهوەت و ئارەزوەکانیدا، چ لە بەکارهێانی ویست و ئیرادەیدا پابەند بووە بە نیگاوە و هیچ شتێکی لەخۆیەوە ئەنجام نەداوە و هیچ هەنگاوێکی سەربەخۆ نەناوە.

## ئەگەر پەیامبەر ﷺ کەسێکی شەهوانی و هەوەسباز بوایە!

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ کەسێکی هەوەسباز بوایە دەبوایە یەکێك یا زیاتر لەمانەی بکردایە یا تێدا بوایە:

1ـ لەماوەی هەرزەکاری و گەنجی و پێش ژن هێنانیدا شتێکی وای لێدەگێڕرایەوە کە بەڵگە بێت لەسەر شەهوانی بوونی، لە وەستان لە رێی کچان یا چاوبڕکێ کردن لەگەڵ کچاندا یا چوونە سەر کانی ژنان و هتد.

2- لەو سەردەمەی کە کوڕان پێش پازدەساڵی ژنیان دەهێنا ئەو تا بیست و پێنج (25) ساڵی نەدەوەستا و ژنهێنانی بەو شێوەیە دوا نەدەخست، وەنەبێ ئەوەشی لەبەر بێدەسەلاتی یا بێتوانایی بووبێت یا کەس ئامادە نەبووبێ ژنی بداتێ، بەڵکو ئەو کەسایەتییەك بوو هەموو کەسێك حەزی دەکرد ژنی بداتێو هەموو کچێك ئاواتی دەخواست شووی پێبکات، بەڵام ئەو خۆی لە خولیای ژنهێناندا نەبووەو زۆر مەتڵەبی نەبووە، چونکە ئەگەر وا نەبوایە دەچووە خوازبێنی هەندێك کەس، بەڵام ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە تا خەدیجە خوازبێنی نەکرد ئەو نەچووبووە خوازبێنی هیچ کچێكو باسی ژنهێنانی لای هیچکام لە مامەکانی یا تەنانەت رەفیقەکانیشی نەکردبوو.

3ـ ژنێکی (15) ساڵ لەخۆی گەورەتری نەدەهێنا یان ئەگەر لەبەر سەروەت و سامانەکەی و پلەو پایەکەی بیهێنابایە لە ژێرەوە پەیوەندیی لەگەڵ ژنی تردا دەکرد و بۆ ماوەی (25) ساڵ ئیکتفای بەو تەنها ژنە نەدەکرد.

4- دەیتوانی سوود لە پارەکەی خەدیجە وەرگرێت و خۆی پێ پێبگەیەنێو لەو جیابێتەوەو ژنی تر بە دڵی خۆی بێنێ.

5-کاتێك قوڕەیشییەکان پێشنیاری جوانترین ژن و بەرزترین دەسەڵات و زۆرترین سامانیان بۆ کرد قبوڵی دەکرد.

6- لە پاش مردنی خەدیجە ژنێکی جوانی دەهێنا نەك بچێت سەودەیەکی بێوەژنی بەتەمەنی بێدەمەن بهێنێت و چوار ساڵی رەبەق بە تەنها لەگەڵ ئەویشدا بباتە سەر.

7- ئەو هەموو بێوەژنەی لە خۆی کۆ نەدەکردەوە و لە جێی ئەوان کچی جوانی دەخواست بە تایبەت لە مەدینەدا کە دەسەڵاتی پەیدا کردبوو، لە رووی توانای لاشەییەوە هێشتا بەتوانا بوو، لە رووی دیمەنیشەوە هەر گەنج دیار بوو، نیشانەی پیریی لێدەرنەکەوتبوو و پیاوێکی جوان و هەڵکەوتوو بوو، هەموو کەسێکیش ئامادە بوو ژنی بداتێ و هەموو کچێکیش ئامادە بوو شووی پێ بکات.

8- تەڵاقدانی ئەو ژنانەی کە هەیبوو، گۆڕینەوەیانی بە ژنی تر لەسەر خۆی حەرام نەدەکرد، بەڵکو دەرگای لەسەر خۆی دەخستە سەرپشت و بە ئارەزووی خۆی تەڵاقی دەدان و ژنی جوانتری دەهێنا.

9-هەموو ئەوانەی خۆیانیان پێشکەش کرد قبوڵی دەکردن و دەیخواستن.

10-جوانترین کچی عەرەب کە کچی ژنێك بوو بە ناوی (**شيطانة العرب**) کە بەدیل گیرابوو نەدەگۆڕییەوە بە چەند دیلێکی موسڵمان، بەڵکو بۆ خۆی دەیهێشتەوە.

11- ئەو ژیانە سادەو هەژارییە و کەم خواردنەی بۆ خۆی هەڵنەدەبژارد، بەڵکو جوانترین کۆشکی بۆ خۆی دروست دەکرد و خۆشترین خواردنی دەخوارد.

12ـ شەوان ئەو هەموو شەونوێژو عیبادەتەی نەدەکرد و خەوی لە خۆی حەرام نەدەکردو لە سەر حەسیر نەدەخەوت، بەڵکو جێگەی نەرم و خۆشی رادەخست و شەوانی لە جیاتی عیبادەت بە رابواردن دەبردە سەر.

13 ئەو هەموو رۆژووەی نەدەگرت و لە رۆژوودا (**ویصالي**) نەدەکرد، چونکە وەکو ئاشکرایە ئەنجامدانی کاری سێکسی لەسەر رۆژووان حەرامە با پەیامبەریش بێت، نەك وەکو ئەوەی هەندێك نەفام لێی تێگەیشتووە کە گوایە پەیامبەر ﷺ لە کاتی رۆژوودا کاری سێکیسی ئەنجام داوە.

14ـ ئەگەر پەیامبەر ﷺ کەسێکی شەهوەتباز بوایە، دەبوایە ئەو شتە لەناو خەڵکیدا دەنگی بدایەتەوە و نەیارانی بیانکردایەتە رەخنەیەك لەسەری و قاویان لێبکردایەو تانەو تەشەرەیان لێ بگرتایە، بەڵام ئەوەی کە بۆ هەموو کەسێك ئاشکرایە ئەوەیە کە هیچ کەسێك لە هاوسەردەمانی خۆی ئاوها تۆمەتێکیان ئاراستە نەکردووە.

15ـ هەندێك لەو ژنانەی کە خواستنی لەسەر قسەیەك یان فێڵێك کە لە خۆیان یا کەسوکاریانەوە دەردەکەوت دەست پێوە نەدەنا.

16ـ داواکاری ژنەکانی بۆ چاککردنی بژێوی رەت نەدەکردەوە و لەبەر ئاوەها داواکارییەك سەرپشکی نەدەکردن لە نێوان جیابوونەوە یا قبوڵ کردنی نەبوونی و سادەیی و هەژاری، بەڵکو هیچ نەبوایە هەندێك لە داخوازییەکانی بۆ جێبەجێ دەکردن بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین کە خێزانەکانی دەیانزانی لە توانایدا هەیە ژیانیان لە رووی گوزەران و خواردن و پۆشاك و خانووەوە باشتر بکات و هەموو شتێکیان بۆ دەستەبەر بکات و داوای شتێکی مەحاڵیان لێ نەکردبوو.

17ـ فەرمانی نەدەدا بە ئافرەتان خۆیان داپۆشن، بەڵکو بە ناوی فێرکردن و تەمێ کردنەوە مافی بەخۆی دەدا تەماشای ئافرەتان بکات.

18ـ کاتی بەیعەت وەرگرتن لە ئافرەتان تەوقەی لەگەڵ دەکردن، یان گەر کەسێکیش بیویستایە دەستی بدات بەدەستیەوە دەستی خۆی دانەدەپۆشی.

19ـ هەموو کەسێك کوڕی رۆژی خۆیەتی، ئەگەر پەیامبەر ﷺ کەسێکی هەوەسباز بووایە هەڵی دەسەڵاتی خۆی و ئەو خۆشەویستییەی هەیبوو لە دڵی خەڵکیداو بێ سنووری فرەژنی دەقواستەوەو دەیان ئەوەندەی تر ژنی جوانی دەهێنا و سنووری بۆ فرەژنی دانەدەنا و تەڵاق دانی ئەو ژنانەی لە سەرخۆی حەرام نەدەکردو سەدان کەنیزەکی لە دەوری خۆی کۆدەکردەوە و کەمترین رەخنەشی ئاراستە نەدەکرا و لە رەخنەی دوارۆژیش نەدەترسا، چونکە هیچ کەسێك نەبوو پێشبینی ئەوە بکات کە رۆژێك دێت فرەژنی دەبێتە عەیبە و رەخنەی لێ دەگیرێ.

## هۆیەکانی فرەژنی پەیامبەر ﷺ

ئێستاش دوای ئەوەی کە وتمان پەیامبەر ﷺ کەسێکی هەوەسباز نەبووە و ژیانی هەمووی لە خواپەرستی و عیبادەت و بانگەواز و پەروەردە و چارەسەرکردنی کێشەی خەڵکیی و بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو دەوڵەتە ساوایەی پێکی هێنا بوو و رووبەڕوو بوونەوەی بەردەوامی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی قورەیش و عەرەبەکان و پیلانی جولەکەکاندا دەبردە سەر و ئەوەندە کاتی نەدەما بەدەستەوە کە خەریکی رابواردن بێت، پرسیارێك خۆی دەسەپێنێ ئەویش ئەوەیە کە: بۆچی ئەو هەموو ژنەی هێنا؟

زانایان و بیرمەندانی ئیسلامی چەندین هۆیان بۆ فرەژنی پەیامبەر ﷺ باس کردووە، لەوانە:

1ـ پێویستییەکی سروشتی پەیامبەر ﷺ وەکو مرۆڤێك بۆ ژن.

2ـ بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بانگەواز.

3ـ مەبەستی مرۆڤایەتی و کۆمەلایەتی.

4ـ مەبەستی سیاسیی.

5ـ مەبەستی پەروەردەیی و تەشریعی.

ناحەزانی ئیسلام و نەیارانی پەیامبەر ﷺ جگە لە هۆی یەکەم دان بە هیچ هۆیەکی تردا نانێن و دەڵێن پەیامبەر ﷺ تەنها بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووە سێکسییەکانی خۆی ئەو هەموو ژنەی هێناوە، ئێمە لێرەدا و پێش ئەوەی بە درێژیی بچینە سەر باسی یەکە یەکەی ژنەکانی پەیامبەر ﷺ و هۆو بۆنە و هەلومەرجەکانی خواستنیان باس بکەین تەنها ئاماژە بە یەکێك لەو ژنهێنانانەی پەیامبەر ﷺ دەدەین بزانین، ئایا هیچ کاریگەرییەکی شەهوەت و رابواردنی تێدا بەدیی دەکرێت؟ جا ئەگەر سەلماندمان (بە بێ زۆر لە خۆکردن و بادانی ملی دەقەکان و شێواندنی رووداوەکان) کە پەیامبەر ﷺ هیچ نیازێکی شەخسی لەو ژنهێنانە نەبووە و شەهوەت هیچ رۆڵێکی نەبووە لەو ژنهێنانەدا ئیتر تاوانە دوای ئەوە کەس باوەڕ بە قسەی ناحەزانی ئیسلام و پەیامبەر ﷺ بکات.

ئەو ژنەش (**ام حبیبة**)ی کچی (أبوسفیان)ی سەرۆکی قورەیش بوو، ئەم ژنە یەکێك بوو لەو موسڵمانانەی کۆچیان کرد بۆ حەبەشە لەگەڵ مێردەکەیدا کە ناوی (عبدالله بن جحش) بوو، مێردەکەی لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و چووە سەر ئایینی مەسیحی و داوای لەویش کرد شوێنی بکەوێت، بەڵام رازیی نەبوو، عەبدوڵلا دەستی دایە مەشروب خواردنەو و دەستی لە ئوم حەبیبە هەڵگرت و هەر لەوێش مرد، پەیامبەر ﷺ کە ئەمەی بیست خەبەری نارد بۆ نەجاشی کە خوازبێنی أم حبیبەی بۆ بکات، ئەوەبوو نەجاشی خۆی خوازبێنی کرد بۆ پەیامبەر ﷺ و چوار سەد دیناری کردە مارەبییەکەی و هەر لەوێشدا ئاهەنگ گێڕا، أم حەبیبە بوو بە خێزانی پەیامبەر ﷺ، بەڵام ئایا یەکسەر گوێزرایەوە بۆ پەیامبەر ﷺ ؟ نەخێر، بەڵکو دوای حەوت ساڵ لە کۆچی موسڵمانان بۆ مەدینە و لە دوای فەتحی قەڵای خەیبەر گەڕایەوە بۆ مەدینە، واتە دوای زیاد لە (10) ساڵ لە مارەبڕینی!!

کوا شوێنەواری شەهوەت لەم ژن هێنانەدا؟

لەم ژن هێنانەدا هەموو مەبەستەکان دێنە پێشەوە، یەك مەبەست نەبێت کە ئەویش مەسەلەی شەهوەت و ئارەزووی سێکسی و جوانی ئافرەتەکەیە.

ئەگەر پەیامبەر ﷺ بۆ شەهوەت (**أم حبیبة**)ی بهێنایە دەبوایە هیچ نەبێت یەکسەر دوای کۆچ کردنی بۆ مەدینە بیگەڕاندایەتەوە لە حەبەشە، بەڵام وەکو وتمان لە ساڵی حەوتی کۆچیدا (**أم حبیبة**) گەڕایەوە بۆ مەدینە.

هێنانی (ئوم حەبیبە) یەکەم شت لەبەر هۆیەکی مرۆڤایەتی بوو، بۆ سارێژکردنی برینی دڵی ئەو ئافرەتەی کە کچی سەرگەورەی مەککەیەو لە پێناوی ئایینەکەیدا وڵات و کەسوکارو پلەو پایەی دونیای بەجێ هێشتووەو لەگەڵ مێردەکەی و کۆمەڵێك موسڵمانی تردا رووی کردۆتە وڵاتێکی دووری وەکو حەبەشە، لەوێ مێردەکەی تووشی نسکۆیەکی گەورەی دەکات بەوەی کە دەستی لێ هەڵدەگرێ و دوای ژنێکی تر دەکەوێت، پەیامبەریش ﷺ بۆ سارێژکردنەوەی ئەو برینە گەورەیەو وەکو دڵنەواییەك بۆی و پاداشتێك لەسەر خۆڕاگرتنەکەی خوازبێنی دەکات و دەیکاتە خێزانی خۆی و ئەو شەرەفەی پێدەبەخشێ کە دەیکاتە خێزانی سەرگەورەی موسڵمانان.

ئەمە ئەوپەڕی هەست کردنە بە بەرپرسیارێتی لەلایەن پەیامبەرەوە ﷺ کە هیچ کەسێك لە شوێنکەوتوان و ژێر دەستەکانی خۆی فەرامۆش نەکات.

پەیامبەر ﷺ بەو خوازبێنییە (**أم حبیبة**)ی پاراست لە گاڵتە پێکردنی کەسوکارە بێبڕواکەی و شاکامی پێ بردنیان و ئەو برینە قوڵەی لە دڵیدا پەیدا بوو بە بۆنەی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە گەورەیەوە تیمار کردو سارێژی کرد.

ئەمە جگە لە چەندین مەبەستی تر کە پەیامبەر ﷺبەو ژنهێنانە پێکای، لەوانە: لاوازکردنی پێگەی ئەبوسوفیان لەناو قورەیش و کەمکردنەوەی دژایەتی ئەو بۆ پەیامبەر ﷺو ئیسلام و..هتد.

کەواتە تەنها ئەم نموونەیە بەسە بۆ دەمکوتکردنی ناحەزانی ئیسلام و قەناعەت پێکردنی راستیخوازان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لەسەر باسەکە دەڕۆین و باسی مەبەستەکانی پەیامبەر ﷺلە هێنانی هەریەك لەو ژنانە دەکەین، بەڵام پێش ئەوە پێویستە چەند راستییەك بڵێین، ئەویش ئەوەیە کە:

یەکەم: پەیامبەر ﷺچونکە هەڵبژێردراوی خوا بوو بۆ گە یاندنی دوا پەیامی بۆ مرۆڤایەتی، هەروەکو چۆن هەڵبژاردنی لە نێوان عەرەب و لەشاری مەککەو لە هۆزی بەنی هاشم لەلایەن خواوە بوو، بەهەمان شێوە ئەو ژنانەی بوون بە هاوسەری هەموویان بە حیکمەتێك لەلایەن خواوە بۆی دانرابوون، ئەگەر راستەوخۆش نەبوو بێت وەکو زەینەبی کچی جەحش، ناراستەوخۆ بووە، چونکە بە ئاشکرا دەبینی هەریەك لەو ژنانە بەکارێك هەڵساوە و ئەرکێکی تایبەتی ئەنجام داوە، خەدیجە پشتیوانی پەیامبەر ﷺبووەو لە سەرەتای پەیامبەرێتیدا پاڵپشتێکی گەورەی رۆحی و ماددیی بووە بۆی، عائیشە زانا بوەو زۆربەی هەرە زۆری ئەو فەرموودانەی پەیوەندییان بە نیوەی کۆمەڵگەوە هەیە لەوەوە ریوایەت کراوە، ئوم سەلەمە ژنێکی دانا بووە، پەیامبەر ﷺلە زۆر کێشەدا پرسی پێی کردووەو بە قسەی کردووە، بۆ نموونە لە (**صلح حديبية**)دا... هتد.

دووەم: ئەو ژنانەی کە پەیامبەر ﷺهێنانی راستی ئەو بنەما ئیسلامییە دەسەلمێنی کە ئیسلام فرەژنی بە پلەی یەکەم وەکو چارەسەرێك تەماشا کرووە نەك بۆ تێرکردنی هەوەسی پیاو و بیانووی ئەو کەسانەی بڕیوە کە دەڵێن ئەگەر راستە ئیسلام وەکو چارەسەرێك رێگەی بە فرەژنی داوە بۆچی پیاوان تەنها بە دوای خواستنی کچانی جوانو گەنجدا دەگەڕێن نەك بێوەژنو کچی قەیرەو کەم دیمەن، ئەگەر ئەمڕۆ پیاوان وا ناکەن ئەوە لادانە لە بنەماکەو ئەوان هەڵەن نەك ئیسلام، ئەگینا پێغەمبەر ﷺخۆی وای کردووە.

ئێستاش با بێینە سەر باسی یەکە یەکەی ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ:

**خەدیجەی کچی خوەیلد (رەزای خوای لێ بێت)**

هەموو مێژوونووسانو نووسەرانی ژیاننامەی پەیامبەر ﷺکۆکن لەسەر ئەوەی کە خەدیجە ئافرەتێکی جوانی دەوڵەمەندی خاوەن پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز بووە، زۆرێك لە گەورەپیاوانی قورەیش داخوازییان کردبوو، بەڵام مێردی پێ نەکردن، بەڵام بە نیسبەت پەیامبەرەوە ﷺخەدیجە خۆی لە ئەنجامی ئاشنا بوونی بە کەسایەتیو رەوشتی، خوازبێنی کرد، پەیامبەریش ﷺبەڵێ هەژار بوو، بەڵام کوڕەزای عەبدولموتەلیبی سەرۆکی پێشووی قورەیش و برازای ئەبوتالیبی سەرۆکی ئەوکاتەی قورەیش بوو، واتە سەرباری کەسایەتییە بەهێزەکەیو رەوشتە بەرزەکەی خاوەنی پلە و پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز بووە و داوای هەر کەسێکی بکردایە دەستی نەدەنا بە روویەوە، بەڵام ئەو عەودالی جوانی نەبوو، کەسێکی ئارەزووباز نەبوو، بۆیە تا ئەو کاتە داوای هیچ کچێکی نەکردبوو، ئەو مەسەلەیەی لای کەس نەوروژاندبوو، بەڵام چونکە خەدیجە ئافرەتێکی ناودارو خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بوو خوازبێنییەکەی رەت نەکردەوەو لێی چووە پێشەوە، واتە رێی کەوت لە کەسی گونجاو شیاو بۆیە سێو دووی لێنەکرد.

رەتکردنەوەی ئەو هەموو خوازبێنیکەرە دەوڵەمەندو خاوەن دەسەڵاتو کەسایەتیانەی مەککە لە لایەن خەدیجەوە و هەڵبژاردنی موحەممەد ﷺدوو شت دەسەلمێنێت:

یەکەم: کەسایەتی بەهێزی پێغەمبەر ﷺکە سەرنجی خەدیجەی راکێشابوو.

دووەم: کە لە هەمووی گرنگترە ئەوەیە کە ئەم زەواجە تەقدیرێکی خوایی بوو بۆ ئەوەی ئەو ژنە لە قۆناغی سەختی پەیامبەر ﷺ و بانگەوازو رووبەڕووبوونەوەی قوڕەیشدا پشتیوانو یارمەتیدەرو دڵنەواییکەری بێت.

ئەوەی مێژووی ئیسلام بخوێنێتەوە لە سەرەتای سەرهەڵدانیدا ئەو رۆڵە گەورەیەی بۆ دەردەکەوێت کە خەدیجە بینیویەتی لە پشتگیریکردنی پەیامبەرداو دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە خەدیجە ژنی ئەو قۆناغە بوو، هەر کەسێکی تر بوایە ئەو رۆڵەی پێ نەدەبینرا، کەواتە خەدیجە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، بێ ئەوەی پەیامبەریش ﷺ بزانێت دانرابوو بۆ ئەوەی ئەو رۆڵە سەرەکییە ببینێت لە ژیانی پەیامبەر ﷺ و مێژووی ئیسلامدا.

مانەوەی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ خەدیجەدا بۆ ماوەی (25) ساڵ بێ ئەوەی ژنی تر بهێنێتو یادکردنەوەی دوای مردنیو رێزگرتن لە رەفیقەکانی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پەیوەندیی نێوان پەیامبەر ﷺ و خەدیجە پەیوەندییەکی زۆر گەورەتر بووە لە سێکسو شەهوەتو رابواردن، پەیوەندیی نێوان دوو کەسی خاوەن کەسایەتی بەهێزی پڕ لە رێزو متمانەو خۆشەویستی، دوو کەسی هاوکار لە هەڵگرتنو گەیاندنی پەیامێکی گەورەی وەکو ئیسلام.

ڕازیبوونی خەدیجە بە پەیامبەر ﷺ ئەوە دەگەیەنێت کە پەیامبەر ﷺ لە هیچ کەسێك کەمتر نەبووەو توانیویەتی داوای هەموو ئافرەتێك بکاتو هەزاری بەربەستێك نەبووە لەبەردەم ئەوو هیچ کەسێکی تردا، بۆیە ئەگەر داوای هیچ ئافرەتێکی نەکردووە، لەبەر ئەوە نەبووە کە بە خۆی رانەبینیوە، بەڵکو پێدەچێ ئەوەی ئەو مەبەستی بووە ـ یان باشتر بڵێین ئەوەی قەدەر بۆی دیاری کردووە ـ نەکەوتبووە بەرچاوی.

لەبەرامبەر ئەوەشدا رازیبوونی پەیامبەر ﷺ بە خەدیجە لەگەڵ ئەوەی کە (15) ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە هەموو لێکدانەوەیەك هەڵگرێت ئەوە هەڵناگرێت کە پەیامبەر ﷺ لەبەر جوانییەکەی یان بۆ شەهوەت هێناویەتی، چونکە ئافرەتێك هەر چەندە جوان بێت ئەگەر تەمەنی بگاتە (40) ساڵ و دوی مێردی کردبێتو لە هەردووکیان منداڵی بوویێت ئەو جوانیو شۆخو شەنگییەی نامێنێت کە سەرنجی گەنجێکی پێکەوتوو راکێشێت.

ناحەزانی پەیامبەر ﷺ ئەگەر بڵێن پەیامبەر ﷺ خەدیجەی لەبەر سامانەکەی هێناوە ئەوا ئەو کاتە خۆیان ئەو تۆمەتە هەڵدەوەشێننەوە کە دەیدنە پاڵ پەیامبەر ﷺ کە گوایە کەسێکی هەوەسباز بووە.

(15) ساڵ بۆ جیاوازیی نێوان تەمەنی ژنو پیاو شتێکی ئاسایی نییە، بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین کە ژن تا ئەوپەڕی تەمەنی پەنجا ساڵی توانای منداڵبوونی هەیەو دوای ئەوە بە کاریگەریی هۆرمۆنەکانی گۆڕانێکی زۆر بەسەر جەستەو دەرونیدا دێت، ئەو مەیلو ئارەزووەی نامێنێت کە بتوانێت وەڵامی پێویستییەکانی پیاوێکی (35) ساڵ یان چڵ ساڵە بداتەوە، کاتێك پەیامبەر ﷺ (40) ساڵ بووە خەدیجە (55) ساڵ بووە واتە پیرەژن بووە، ئەگەر پەیامبەر ﷺ کەسێکی هەوەسباز بوایە چۆن دەیتوانی ئەو هەموو ساڵە لەگەڵ ئافرەتێکی پیردا بژی.

لەوەتی دونیا هەیە بە زۆری پیاو لە ژن گەورەتر بووەو ئەوانەشی وا ژنی لە خۆیان گەورەتریان هێناوە یا ئەوەیە ژنی تریان هێناوە، یا ژیانیان پڕ بووە لە کێشە، یا کە تەمەنیان گەورە بووە، دەستیان لێهەڵگرتوون، پەیامبەر ﷺ نەبێت کە تا ئەو رۆژەی خەدیجە کۆچی دوایی کرد، قسەیەکی لە رووی نەداوە یان بۆڵەیەکی نەکردووەو شتێکی نەداوە بە گوێیدا بۆنی ناڕەزایی لێ بێت.کەسێك رۆژێك لە رۆژان گلەییەکی لە دەمی خەدیجە نەبیستووە و هیچ رۆژێك لە رۆژان کێشەیەك لە نێوانیاندا رووی نەداوە، ئەگەر رووی بدایە باس دەکرا، چونکە شت نەبووە لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ بە شاراوەیی هێڵرابێتەوە.

خۆشەویستیی نێوان پەیامبەر ﷺ و خەدیجە تەنها لە ژیانیاندا نەبووە، بەڵکو وەکو لەمەوبەر وتمان درێژەی کێشا تا دوای مردنی خەدیجەش و تا ئەو رۆژەی پەیامبەر ﷺ دونیای بەجێهێشت.

پەیامبەر ﷺ خۆی هۆی ئەو خۆشەویستییەی باس کردووە، ئەوەی ئاماژەی پێ نەداوە جوانی خەدیجە، یان لایەنی سێکسیی بووە، بەڵکو لە وەڵامی پرسیارێکی عائیشەدا دەڵێت: ئەو کاتێك خەڵکیی بە درۆیان دەخستمەوە باوەڕی پێ هێنام، کاتێك خەڵکیی پشتیان تێ کردم ئەو پشتی گرتم و یارمەتی دام، خوا لەو منداڵی پێبەخشیم.

کەواتە تا تەمەنی (50) ساڵی هیچ شوێنەوارێکی هەوەسبازی لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ بەدی ناکرێت.

## سەودەی کچی زومعە

سەودەی کچی زومعەی کوڕی قەیس، کوڕی عەبدولشەمس کوڕی عەبدولوەدی قوڕەیشی عامری، پێش پەیامبەر ﷺ مێردی کردبوو بە (سەکرانی کوڕی عەمر)ی برای سوهەیلی کوڕی عەمری عامری، ئەو لە بڕوادارە پێشینەکان بوو لەگەڵ مێردەکەیداو لەوانە بوون کە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، دوای ئەوەی لە حەبەشە گەڕانەوە مێردەکەی مردو بێوەژن کەوت، دوای مردنی خەدیجە، خەولەی کچی حەکیم هات بۆ لای پەیامبەر ﷺ و پێی وت ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ژن ناهێنی؟ پەیامبەر ﷺ پرسیی کێ؟ وتی گەر بتەوێت کچ، گەر بتەوێت بێوەژن، پرسیی کچەکە کێیەو بێوەژنەکە کێیە؟ وتی: کچەکە کچی خۆشەویسترین کەس بۆ تۆ عائیشەی کچی ئەبوبەکر، بێوەژنەکەش سەودەی کچی زومعەی ژنی سەکرانی کوڕی عامر.

هەموو مێژوونووسان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سەودە ئافرەتێکی بە تەمەنی بە هەیکەلی بێ دیمەن بووە، پەیامبەر ﷺ ماوەی (4) ساڵ لەگەڵ سەودەدا مایەوە بێ ئەوەی ژنی تر بێنێت، واتە لە دوای کۆچی دوایی خەدیجەوە تا ساڵێك لە دوای کۆچ بۆ مەدینە.

ئاشکرایە کە خواستنی سەودە پاڵنەرێکی سێکسیی لە دواوە نەبوو بەڵکو ماڵی پەیامبەر ﷺ لەو کاتەدا پێویستی بە ئافرەتێکی دونیا دیدە بوو بۆ ئەوەی سەرپەرشتیی بکات، چونکە پەیامبەر ﷺ کوڕی نەبوو، خۆیشی زۆر جار دەچوو بەم لاو بەو لاداو پێویستی دەکرد کچەکانی کەسێکیان لا بێت سەرپەرشتییان بکاتو ئاگای لێیان بێت، باشترین کەسیش کەسێکی وەکو سەودە بوو کە نیمچەپیاوێك بوو بۆ خۆی.

کەواتە تاکو ئێستا زەواجی پەیامبەر ﷺ لە خەدیجەو ئوم حەبیبەو سەودە لەبەر هۆکارێکی سێکسی و بۆ مەبەستێکی سێکسی نەبووەو لەبەر هەندێك ئیعتباراتی تر بووە کە لەوەبەر باسمان کرد، ئەوەندەش بەسە وەکو بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە پەیامبەر ﷺ کەسێکی هەوەسباز نەبووەو بۆ مەبەستی سێکسی رووت ژنی نەهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بەردەوام دەبین لە شیکردنەوەی زەواجەکانی تری پەیامبەر ﷺ بۆ ئەوەی زیاتر هەڵەو چەواشەکانی ناحەزانی ئیسلام دەربکەوێت.

## عائیشەی کچی ئەبوبەکری صدیق

یەکێك لەو هەڵە گەورانەی لە مێژوودا رووی داوە و زۆربەی مێژوونووسان دووبارەیان کردۆتەوە تەمەنی عائیشەیە کاتی شووکردنی، کە گوایە پەیامبەر ﷺ لە شەش حەوت ساڵیدا مارەی کردووە و لە (9) ساڵیدا گواستویەتییەوە.

تەمەنی عائیشە لەوانەیە جارێك لە دەمی خۆی دەرچووبێت و ئیتر بووبێتە ماڵ بە سەریەوە، ئیتر ئایا هەر بە راستیی نەیزانیوە تەمەنی چەند بووەو ئەو ژمارەیەی وتووە، یان وەکو هەر ژنێکی تر ویستویەتی تەمەنی خۆی بچووك بکاتەوە (کە ئەمەشیان دوورە لە رەوشتی دایکی موسڵمانانەوە)، یا هەر نەیوتووەو خەڵکانی تر لەسەر زاری ئەو ئەو شتەیان گێڕاوەتەوە، گرنگ ئەوەیە هەموو بەڵگەکان دژی ئەوەن کە عائیشە لە کاتی مارەبڕینیدا شەش حەوت ساڵ و لە کاتی گواستنەوەیدا نۆ دە ساڵ بووبێت، ئەمەش هەندێك لەو بەڵگانە:

1ـ عائیشە پێش ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ داوای بکات، درابوو بە پیاوێکی تر بە ناوی (جوبەیری کوڕی **موطعیم**)، کاتێك پەیامبەر ﷺ داوای کرد ئەبوبەکر فەرمووی کچەکەم داوە بە جوبەیری کوڕی **مطعم**، لێم گەڕێن بچم یەکلایی بکەمەوە بزانم دەیەوێت یان نا، ئەوە بوو چوو بۆ ماڵی باوکی جوبەیر و مەسەلەکەی لەگەڵدا باس کردن، دایك و باوکی

جوبەیر وتیان دەترسین کوڕەکەمان لە ئایینەکەی هەڵگەڕێنێتەوە (واتە بیکات بە موسڵمان)، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عائیشە لەو کاتەدا دەبێ تەمەنێکی وای هەبووبێت کە بۆ ئەوە بشێت مێرد بکات بە تایبەت گەر ئەوەش بزانین کە کچ بەشوودان لەناو بێشکەدا لەناو عەرەبدا باو نەبووە هەتا وەکو بڵێین عائیشە هەر لە منداڵیەوە درابوو بە جوبەیر، ترسی دایكو باوکی جوبەیر لەوەی کە کوڕەکەیان لە ئایینەکەی وەرگێڕێتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عائیشە لە تەمەنێکدا بووە کە فامیوەو تواناى ئەوەی هەبووە کار بکاتە سەر مێرد.

2ـ ئەوەی کە پێشنیاری خواستنی عائیشەی کردو ناوی هەڵدا بۆ پەیامبەر ﷺ خەولەی کچی حەکیم بووەو کاتی پێشنیارکردنەکەو چۆنێتی پێشنیارکردنەکە ئەوە دەگەیەنێت کە عائیشە لەو کاتەدا لە ڕێکی مێردکردندا بووە، چونکە خەولە بە ماوەیەکی کەم لە دوای کۆچی دوایی خەدیجە کاتێك بینی پەیامبەر ﷺ لەو بارودۆخە سەختەدا بە تەنها ماوەتەوە پێشنیاری ژنهێنانی بۆ کردو ناوی سەودەو عائیشەی بۆهەڵدا، واتە ژن هێنانی پەیامبەر ﷺ بۆ ئەو کاتە پێویست بوو، دواخستنی هەڵنەدەگرت، ئەگەر پەیامبەر ﷺ بیگوتایە عائیشەم دەوێت چی وەڵام دەدایەوە؟ دەیوت ئەی پەیامبەری خوا ﷺ هێشتا منداڵە! ئەی ئەو کاتە پەیامبەر ﷺ نەیدەپرسی ئەی مادەم وایە بۆچی ناوی هەڵدەدەیتو پێشنیاری دەکەیت؟

پەیامبەر ﷺ کە عائیشەی نەهێناوەو سەودەی هێناوە، لەبەر ئەوەیە کە عائیشە بۆ ئەو قۆناغە نەدەشیا بەڵکو کەسێکی وەکو سەودە شیاوتربوو کە وەکو دایك وابوو بۆیان و لە تەمەندا گەورە بوو، نەك عائیشەیەك کە هێشتا لە سەرەتای تەمەنیدا بوو، چونکە عائیشە بە حوکمی تەمەنی نەیدەتوانی لەو قۆناغەدا ڕۆڵێکی ئیجابی ببینێتو پەیامبەر ﷺ سەبارەت بە ماڵەوەو کچەکانی ئاسودەو دڵنیا بکات، بەڵام لە مەدینەدا پەیامبەر ﷺ کاتێك عائیشەی هێنا کچەکانی بە فاتیمەشەوە هەموو مێردیان کردبوو، جگە لە سەودە کەس لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ نەبوو.

3ـ ئەوەی کە گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) کاتێك خەولە هات بۆ ماڵیان و خوازبێنیی عائیشەی لێ کرد نەیوت عائیشە هێشتا منداڵە بەڵکو وتی منو پەیامبەر ﷺ وەکو برا واینو منداڵەکانیشم برازای ئەون، کاتێك پەیامبەر ﷺ قسەکەی ئەبوبەکریان بۆ گێڕایەوە فەرمووی بەڵێ منو ئەبوبەکر براین، بەڵام کچەکەی بۆ من دەشێت، ئەبوبەکر فەرمووی قسەیەك لە نێوان ئێمەو ماڵی جوبەیر بن مگعم دا هەیەو کاتی خۆی پەیمانێکمان پێداون با بچم بزانم چی دەڵێن، ئەوەبوو ئەوان لەبەر موسڵمانبوونی خێزانی ئەبوبەکر شتەکەیان هەڵوەشاندەوە.

4ـ ژیریو کەسایەتیو شارەزایی و لێهاتوویيو ڕۆڵی عائیشەو بەشداریی کردنی لە زۆر بوارداو ئەو هەموو چالاکییەی لێی دەگێڕنەوە هیچیان لە هی کەسێك ناچن کە بەو شێوەیە منداڵ بووبێت و لەو تەمەنەدا بێت، بەڵکو دەبێت تەمەنی زۆر لەوە گەورەتر بووبێت.

وەنەبێ من یەکەم کەس بم ئەم قسەیەم کردبێت، بەڵکو دوو زانای گەورەی هیند: شبلی النعمانی و سلیمان الندوی، کە ژیاننامەی پێغەمبەریان نووسیوە لە نۆ (9) بەرگدا بەبەڵگەوە سەلماندوویانە کە تەمەنی عائیشە کاتی شووکردنیدا پازدە(15) ساڵ کەمتر نەبووە، هەرچەند بە داخەوە من کتێبەکەم لەبەر دەستدا نییە بۆ ئەوەی بەڵگەکانیان باس بکەم، بەڵام ئەوەی مەبەستی بێت دەتوانێت دەستی بخات.

بەڵێ پێغەمبەر ﷺ لە مەککەدا مارەی بڕیوە بۆ پتەوتر کردنی پەیوەندیی نێوان خۆیو ئەبوبەکرو بۆ ئەوەی ببن بە یەك ماڵ، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی لە سەرەوە باسمان کرد گواستنەوەکەی دواخستوە بۆ مەدینە، بۆ دوای بەشوودانی کچەکانی.

5ـ هەڵوێستی کۆمەڵگە بە گشتی و ناحەزانی پەیامبەر ﷺ بەتایبەتی ئەوە دەسەلمێنێت کە پەیامبەر ﷺ عائیشەی لە تەمەنێکی گونجاودا هێناوە ئەگینا ئەگەر ڕاست بوایە پەیامبەر ﷺ لەو تەمەنەدا (9 ساڵی) عائیشەی بهێنایە ئەڵبەتە دەبووە دەنگو باسێك و خەڵکی باسیان دەکردو ناحەزانی پەیامبەر ﷺ دەیانوروژاند و مەسەلەکە وا بە سەلامەتی تێنەدەپەڕیو هەروەکو چۆن لە مەسەلەی زەینەبدا کرا بە دەنگو باسێكو کرایە ڕەخنەیەك لەپەیامبەر ﷺ و دووڕووەکانو ناحەزانی پەیامبەر ﷺ و بێبڕواکان ورووژاندیان، لێرەشدا هەمان شتیان دەکرد، بەڵام ڕوونەدانی هیچ شتێك

لەو جۆرە رەخنانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خواستنی عائیشە لە تەمەنێکدا نەبووە کە نەگونجاو بێت بۆ شووکردنو نەگونجاو بێت لەگەڵ تەمەنی پەیامبەردا ﷺ.

ئەمە دەربارەی تەمەنی عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە کاتی مارە بڕینو گواستنەوەدا کە من بۆ خۆم هیچ گومانم نییە لەوەی کە ئەو شەش ساڵ و نۆ ساڵەی کە لە مێژوودا هاتووە یەکێکە لە هەڵە باوەکانی مێژوو، وەنەك ئەو مێژونووسانە، بەڵکو سەد ئەوەندە کەسی تر باسی بکەن جێی باوەڕ نییە، چونکە لەگەڵ عەقڵو لۆژیكو واقیعو زانستدا ناکۆکەو هەرچی پاساویش هێنراوەتەوە لەو بارەیەوە هەمووهەڵەو لاوازن، چونکە ئەگەر راست بوایە کچ لە نیوە دورگەی عەرەبدا لەبەر گەرمی ئاوو هەوا زووتر لە کچانی شوێنە ساردەکان بالّغ دەبن دەبوایە جگە لە عائیشە کچانێکی تریش هەر لەو تەمەنەدا شوویان بکردایە، بەڵام روونەدانی ئاوها شتێك لەناو خەڵکیدا بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە ئەم پاساوە لاوازەو راست نییە، ئەمە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە دەبێ ئەوە بزانین کە کچ لە دوای (10) ساڵ (12- 15) نیشانە دەرەکییەکانی سێکسی تێدا دەردەکەوێت، لە گەورەبوونی سنگی و ناسك بوونەوەی دەنگو رووانی مووی بن باڵ و دامێن و دواشتیش کەوتنە بێنوێژی، بە دەگمەن کچ هەیە لە پێش (10) ساڵیدا ئەو نیشانانەی تێدا دەرکەوێت.

خاڵێکی تریش ئەوەیە کە باڵای کچ لە (12) ساڵییەوە هەڵدەدات، واتە پێش (12) ساڵ کچ وەکو منداڵ وایەو دوابی لە پڕێکدا باڵای بەرز دەبێتو سنگی گەورە دەبێت، کچ پێش (10) ساڵ لە باڵادا هەر زۆر بچووك دەبێت، ئەوانەشی کە باسی عائیشە دەکەن لە کاتی گواستنەوەیدا کەسیان نەیانوتووە باڵای بچووك بووە یان سنگی نەکردووە، بەڵکو هەموو کۆکن لەسەر ئەوەی کە لە ڕووی جەستەو باڵاوە تەواو بووە و تەنها ئەوە نەبێت کە کاتێك گواستوویانەتەوە لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا یاریی کردووە، ئەمەش هیچی تێدا نییە، چونکە ئاساییە کچ لە پازدەو شازدە ساڵیشدا بگرە گەورەتریش ماڵباجێنە بکاتو بووکی هەبێتو لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا یاری بکات.

**هۆکانی خواستنی عائیشە:**

ئەمە دەربارەی تەمەنی عائیشە لە کاتی شووکردنیدا بە نیسبەت هۆکانی خواستنیشیەوە دەڵێین:

1- ئەوەی کەسایەتی ئەبوبەکری صدیق بناسێتو رۆڵی ئەو لە پشتیوانی کردنی پەیامبەر ﷺ و پاشان لە جێگیرکردنی دەوڵەتی ئیسلامی و بڵاوکردنەوەی ئیسلامو فراوانکردنی دەسەڵاتی ئیسلام بزانێت گومانی لەوەدا نامێنێت کە پەیامبەر ﷺ خواستنی عائیشەی پێش هەموو شتێك بە مەبەستی نزیك کردنەوەی ئەبوبەکر بوو لە خۆی نەك خودی عائیشە، ئەگەر عائیشە بێوەژنیش بوایە یان ناشیرینیش بووایە پەیامبەر ﷺ هەر دەیخواست بە دەلیلی ئەوەی کە حەفصەی کچی عومەری خواست کە بێوەژنیش و ناشیرینیش بوو.

ئەگەر سەرنجێکی ئەوانە بدەین کە بوون بە خەلیفە لە دوای پەیامبەر ﷺ بۆت دەردەکەوێت کە هێنانی عائیشەو حەفصە لەبەر لایەنی سێکس نەبووە، بەڵکو بۆ مەبەستی زۆر لەوە گەورەتر بووە، دەتوانی بڵێیت تەقدیرێکی خوایی بووە نەك نەخشەیەکی مرۆڤی.

لەو چوار خەلیفەیە ئەبوبەکر خەزوری یەکەمو عومەر خەزوری دووەمو عوسمان زاوای یەکەمو عەلی زاوای دووەمی بووە، واتە ئەوانەی بوون بە خەلیفە دوای پەیامبەر ﷺ نزیکترین چوار کەس بوون لە پەیامبەرەوە ﷺ، بوونیان بە خەلیفەش لەسەر بنەمای نزیکییان نەبوو لە پەیامبەرەوە ﷺ بەڵکو لەسەر هەمان ئەو بنەمایە بوو کە پەیامبەر ﷺ نزیکی کردبوونەوە لەخۆی ئەویش دڵسۆزییان بۆ ئیسلامو کەسایەتی بەهێزو کاریگەرییان لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا بوو.

2- لە لایەکی ترەوە ئەگەر تەماشای کەسایەتی عائیشە بکەیتو ئەو هەموو فەرموودەیەی گێڕاویەتەوە لە پەیامبەر ﷺ (دووەم کەسە دوای ئەبوهورەیرە لە رووی زۆری ئەو فەرموودانەی لە پەیامبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە)، وەهەروەها ئەو هەموو زانیارییەی هەیبوو (یەکێك بوو لە زانایانی صەحابەو قوتابی زۆری هەبوو، لە هەموو مەسەلەیەکی شەرعیو کۆمەڵایەتیو تەنانەت سیاسیشدا قسەی هەبووەو رۆڵی هەبووەو پرسیان پێ کردوە) بۆی دەردەکەوێت کە هێنانی عائیشە مەبەستێکی گەورەتر لە سێکسی تێدابوو، ئەویش گەیاندنی زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە موسڵمانان بە

تایبەت ئەو لایەنانەی تایبەت بوون بە ژنانەوە، ئەگەر سەردەمی مەککە پێویستی بە ئافرەتێکی وەکو خەدیجە بوو بێت لە رووی تەمەنیو کەسایەتیەوە بۆ پشتیبوانی کردن لە پەیامبەر ﷺ و دڵنەواییکردنی، دواتریش بە کەسێکی وەکو سەودە بۆ سەرپەرشتی کردنی منداڵەکانی، سەردەمی مەدینە پێویستی بە کەسێکی وەکو عائیشە بوو لە رووی زیرەکیو ئامادەگییەوە بۆ ئەوەی فەرمودەکانی پەیامبەر ﷺلەبەر بکاتو بیانگەیەنێتە موسڵمانان، ئەمانە هەموو تەقدیری خوایی بوون بۆ گەیاندنی ئایینەکەی بە مرۆڤایەتی. ئەوەی باوەڕی بەوەهەبێت کە ئەم ئایینە ئایینی خوایە و موحەممەد دوا نێرراوی خوایە بۆ مرۆڤایەتی بە لایەوە ئاسانە باوەڕ بێنێت بەوەی کە ئەوانەی هەڵبژاردن بۆ هاوسەرێتی بە پلەی یەکەم بۆ مەبەستی ئایینی و بانگەواز بووەو بگرە وەکو وتم هەر تەقدیرێکی خوایی و هەڵبژاردنێکی خوایی بووە بۆی.

بەڵگەش لە سەر ئەوەی ئەم زەواجانەی پێغەمبەر ﷺلە لایەن خواوە بووە ئەم ریوایەتەیە کە بوخاری موسلیم دەیگێڕنەوە لە عایشە کە پێغەمبەر ﷺفەرمووی **(أُريتك في المنام ثلاث ليال، جاء بك الملك في خرقة من حرير فيقول: هذه إمرأتك فأكشف عن وجهك فإذا أنت فيه، فأقول: إن يك هذا من عند الله يـمضيه)**. واتە: پەیامبەر ﷺفەرمووی: لە خەودا سێ شەو تۆیان نیشان دام، مەلائیکەیەك تۆی لە ناوی پارچەیەکی ئاوریشمدا هێناو پێی وتم ئەوە خێزانی تۆیە، پەچەکەم لەسەر رووت لادەدا دەمبینی تۆی، دەموت: ئەگەر ئەمە لەلایەن خواوە بێت ئەوا جێبەجێی دەکات.

ئاشکرایە کە ئەمە لە مەککەدا بووە، ئەمەش دوو دەلالەتی هەیە، یەکەم: دەبێ حەتمەن ئەو دەمە عائیشە گەورە بووبێت، دووەم: هێنانی عائیشە بە فەرمانێکی خوایی بووە.

**ئایا عائیشە نەگونجاو بوو بۆ پێغەمبەر ﷺ**

ئەوانەی کە رەخنە لەم زەواجە دەگرن دەڵێن پەیامبەر ﷺزۆر لە عائیشە گەورەتر بوو لە تەمەندا، ئەو تەمەنی (54) ساڵ بوو، عائیشە (9) ساڵ بوو، ئێمە لەمەوبەر بە دەلیلی عەقڵیو لۆژیکی و مێژوویی سەلماندمان کە تەمەنی عائیشە زۆر لەوە زیاتر بووە کە لە مێژوودا هاتووەو هەڵەیەکی مێژوونووسانە، ئەم جۆرە هەڵانەش لە مێژوودا زۆر روو دەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە عائیشە کچ بووەو سەرەتای تەمەنی بووەو پەیامبەر ﷺ(54) ساڵی بووە هێشتا جیاوازیی تەمەنیان زۆرە، بەڵام ئایا نەگونجاوە بووە بۆ پەیامبەر ﷺ؟

<u>ئەوانەی ئەم رەخنەیە دەگرن چەند شتێکیان لەبیر دەچێتەوە</u>

یەکەم: ئافرەت لە شووکردندا زۆر جار تەماشای پلەوپایەی پیاو دەکات نەك تەمەنی، ئەمە لە کۆنو تازە هەروا بووەو ئێستاش زۆربەی کچانی دونیا ئەگەر هەلی مێردکردنیان بە لێپرسراوی گەورە یا سەرمایەداری گەورە بۆ برەخسێت لە دەستی نادەن و بەڵکو بگرە خەونیشی پێوە دەبینن، هی واشیان هەیە نەك بە مێردکردن بەڵکو بە پەیوەندی ناشەرعیش رازین، بەڵگەش ئەو هەموو کچانەیە کە لە خزمەتی مەسئولەکاندان!.

پەیامبەریش ﷺلە رووی پلەو پایەوە کەسی نەدەگەیشتێ، هەموو کەسێك بە فەخرو شانازی دەزانی خزمایەتی بکات و کچی بداتێ، هەموو کچ و ژنێکیش ئاواتی دەخواست شووی پێ بکات، ئەوانەی خۆیان پێشکەش بە پەیامبەر ﷺ دەکرد گەورەترین بەڵگەن لەسەر ئەم راستییە.

دووەم: پێغەمبەر ﷺلە رووی لاشەو تواناوە تا بڵێی جوانو دامەزراو و بە توانا بووە، ئەو کاتەی عائیشەی خواست یەك تاڵی سپی لەسەرو ریشیدا نەبوو، سەری نەڕووتابوویەوە، دانی نەکەوتبوو، دەمو چاوی چرچ نەبوو بوو، لە هەموو کەسێك جوانترو قۆزتر و رێکوپێکتر بوو، ئافرەتیش لەمانە زیاتر چی دەوێت لە پیاو بۆ ئەوەی مێردی پێ بکات.

خۆشەویستی عائیشەش بۆ پەیامبەر ﷺلە ژیانو لە دوای مردنیشیدا و شانازی کردنی بەو زەواجە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عائیشە زیاتر سوودمەند بووە لەو زەواجە، ئەو شوکردنە تاجێك بووە خراوەتە سەری خۆیوبنەماڵەی و هەموو ئافرەتێك خۆزگەی پێ خواستووە، ئەو کەسانەشی کە تەنها لە رووی سێکسییەوە شتەکان لێك دەدەنەوە ئەوا دەروونزمیی خۆیان دەردەخەنو لە خۆیانەوە بۆ شتەکان دەڕوانن و وادەزانن کەسانی گەورەش وەکو خۆیان بیر دەکەنەوە!.

ئەگەر عائیشە خۆی بەو زەواجە رازیی بووبێت و دڵی پێی خۆش بووبێتو شانازیی پێوە کردبێت، هەروەها باوكو دایکیشی رازیی بووبن و شانازییان پێوە کردبێت و خۆیان بە بەختەوەر زانیبێت کە کچی خۆیان داوە بە پەیامبەر ﷺو کۆمەڵگەش شتەکەی بە لاوە ئاسایی بوو بێت، ئیتر ناحەزان رەخنەی چی دەگرنو ئەو شین و رۆرۆیە بۆ کێ دەکەن؟ بۆ عائیشە، عائیشە خۆی پێی خۆش بووەو شانازیی پێوە کردووە، بۆ دایكو باوکی، ئەوانیش بە هەمان شێوە پێیان خۆش بووەو شانازییان پێوە کردووە، ئیتر کام بێ ویژدانیی کە ئەم نەزانانە باسی لێوە دەکەن؟ ئەگەر بڵێین عائیشە کاتی شووکردنی منداڵ بووە و هەستی نەدەکرد و دەرکی بە شتەکان نەدەکردو ناڕەزایی خۆی دەرنەدەبڕی، خۆ لە دواییدا پێگەیشتبوو، دەبوایە گلەیی بکردایە و ناڕەزایی خۆی دەرببڕیایە، بەڵام کە هیچێك لەو شتانە رووی نەداوە ئیتر ئەم شینە چییە دەیکەن؟

## هەڵەو چەواشەکارییەکانی نووسەری سێکس و شەرع

نووسەری کتێبی سێکسو شەرعو ژن لە باسی عائیشەدا دەکەوێتە چەندین هەڵە و نەزانیو راوو بۆچوونی دژبە یەك (جگە لە بێئەدەبییەکانی بەرامبەر پێغەمبەر ﷺکە لە ژماردن نایەن و کەڵکی باسکردنیان نییە):

1ـ لەو قسەیەی **طبری** کە دەڵێت: "فکانت یوم تزوجها صغیره لا تصلح للجماع".

بە هەڵە تێدەگات. **طبری** مەبەستی ئەو کاتەیە کە لە مەککە مارەی براوە بەکەڵکی جیماع نەهاتووە، بەڵام ئەم وای راڤە دەکات کە گوایە کاتی گواستنەوەی بە کەڵکی جیماع نەهاتووە، لەو باوەڕشدام کە نووسەر وەکو عادەتی خۆی لە ئەنقەست دەقەکەی بە قرتاوی باسکردووە، چونکە دەقەکە بە راشکاوی ئاماژە بۆ کاتی خوازبێنییەکە دەکات ئەمەش دەقەکەی (**طبري**)یە، **قال أبو جعفر: ولم يتزوج رسول الله ﷺفی حياتها على خديجة حتى مضت لسبيلها فلما توفيت خديجة تزوج رسول الله ﷺبعدها: فأختلف فيمن بدأ بنكاحها منهن بعد خديجة، فقال بعضهم: كانت التي بدأ بنكاحها بعد خديجة قبل غيرها عائشة بنت أبي بكر الصديق. وقال بعضهم: بل كانت سودة بنت زمعة بن قيس بن عبد شمس بن عبدود بن نصر. فأما عائشة فكانت يوم تزوجها صغيرة لا تصلح للجماع، وأما سودة فإنها كانت امرأة ثيبا، قد كان لها قبل النبي زوج، وكان زوجها قبل النبي السكران بن عمرو بن عبدشمس، وكان السكران من مهاجرة الحبشة، فتنصر و مات بها، فخلف عليها رسول الله ﷺوهو بمكة.**

واتە: أبو جعفر دەڵێت: پەیامبەر ﷺلە ژیانی خەدیجەدا ژنی بەسەردا نەهێنا تا کۆچی دوایی کرد، کاتێك خەدیجە مرد پەیامبەر ﷺژنی هێنا، جیاوازییش هەیە دەربارەی ئەو کەسەی کە پەیامبەر ﷺراستەوخۆ دوای خەدیجە خواستی، هەندێکیان دەڵێن: ئەوەی کە پەیامبەر ﷺدەستی کرد بە خواستنی دوای خەدیجە عائیشەی کچی أبوبکر بوو، هەندێکیش دەڵێن: بەڵکو سەودەی کچی زەمعە بوو، بە نیسبەت عائیشەوە ئەو کاتە منداڵ بوو نەدەشیا بۆ جووت بوون، بەڵام سەودە بێوەژن بوو، ژنی (السکران بن عمرو) بوو کە یەکێك بوو لە کۆچکەران بۆ حەبەشە، سەکران لەوێ چووە سەر ئایینی مەسیحی و هەر لەوێ مرد، دوای ئەو پەیامبەر ﷺکە هەر لە مەککەدا بوو خواستی.

دەبینی دەقەکە بە روونی باسی سەردەمی مەککە دەکات، جگە لەوەی کە تەبەری هەڵەیەکی گەورە دەکات لێرەدا ئەویش ئەوەیە کە سەکران مێردی سەودە چووەتە سەر ئایینی مەسیحی و لە حەبەشە مردووە، لێرەدا تەبەری لە نێوان سەکرانی کوڕی عەمرو (عبدالله بن حجش)ی مێردی ئوم حەبیبەدا لێی تێك چووەو تێکەڵی کردووە.

2 ـ ئەو قسەیەی عائیشە کە دەڵێت (... **وکنت جارية حديثة السن**) بەوە لێك دەداتەوە کە گوایە بچووك و سووك بووە و گۆشتن نەبووە، کەواتە بە کەڵکی شووکردن نەهاتووە.

ئەم قسەیەی عائیشە باسی سەرەتای سەردەمی مەدینە دەکات کە هێشتا کچێکی کەم تەمەن بووە و ژنان ئەو کاتە لەبەر نەبوونی خواردنی باش لاواز بوون و گۆشتیان نەگرتبوو.

ئەم دەقەی کە نووسەر بەتەواوی نایگێڕێتەوە باسی پێشبڕکێی نێوان عائیشە و پەیامبەر ﷺدەکات لە سەرەتای سەردەمی مەدینەداو چەند ساڵێك دوای ئەوە، لە یەکەمیاندا عائیشە دەڵێت هێشتا لاواز بووم و گۆشتم نەگرتبوو، بۆیە پێشی پەیامبەرم ﷺدایەوە، بەڵام لە جاری دووەمدا قەڵەو ببووبووم و توانای راکردنم وەکو جاران نەمابوو، بۆیە پەیامبەر ﷺپێشی دامەوە، ئیتر ئەمە چ پەیوەندییەکی بەو دەرئەنجامەوە هەیە کە نووسەر لێ دەرهێناوە کە گوایە عائیشە ئەو کاتە بۆجووتبوون نەشیاوە؟ بە پێچەوانەوە هەر ئەم دەقە ئەوە دەگەیەنێت کە عائیشە ئەوەندە منداڵ نەبووە کە باس دەکرێت، بەڵام کە دەڵێت (**کنت جارية حديثة السن**). واتە: کچێك یان ئافرەتێکی کەم تەمەن بووم. (**جارية حديثة السن**) بە مانای منداڵ نایەت.

3ـ نووسەر هەموو قسەکانی خۆی و بۆچوونەکانی خۆی دەخاتە درۆوە کاتێك دەڵێت: عائیشە یەکێك دەبێت لە چاوکراوەترین ژنانی پەیامبەر ﷺ.

ئەم قسەیە و ئەوانەشی لە دوای ئەمە دەیکات لە لاپەڕەی (155 تا 161) کە هەمووی باسی زیرەکی و لێهاتوویی و داکۆکی کردنی عائیشە لە مافی خۆی و پیلانگێڕانی دژی ژنەکانی تری پەیامبەر ﷺ پێچەوانەی ئەو قسەیەتی کە دەڵێت: بەڵام ئەوەی لەم گریمانەیەدا بەدی دەکرێ ئەوەیە کە یەکەم: بەتەنها پێکهاتەی بایۆلۆژی، بە مانایەکی تر هەبوونی باڵا، یا خود پانی و کەتەیی ژن نابێتە دەرئەنجامی ئەوەی لە توانایدا هەبێت کۆمەڵێك ئەرك بەڕێوە ببات، بەڕێوەبردن هەرکارێك بێت، بەسێکسیشیەوە، پێویستی بە پێگەیشتنی ئەقڵی و هۆشیاری هەیە و پێکهاتەی عائیشەش لەبەر ئەوەی منداڵ بووە و تەمەنی نۆ ساڵان بووە ئەم ئامادەییەی تێدا نەبووە[1].

4ـ دەڵێت: ئەگەر شەنوکەوی ئایەت و ئەم ریوایەتە بکەین، تێدەگەین کە ئەگەرچی عائیشە موسڵمان بووە و بڕوای بە پەیامبەر ﷺ هەبووە، بەڵام لەبەردەم مافە سەرەتاییەکانی خۆیدا لە پەیامبەر ﷺ دەکەوێتە گومانەوە و پێی وایە خواکەی لایەنگیری ئەو زیاتر دەکات تاموسڵمانانی دیکە و رەخنەدەگرێ لەوەی کە خوا لە بەجێهێنانی ئارەزووەکانی پەیامبەردا ﷺ هەمموو دەم ئامادەیە دەسەڵاتی خۆی بداتێ و ئەویش ئامادەیە بە ناوی خواوە ئایەتێك بڵێ، هەڵەی نووسەر لێرەدا و تێنەگەیشتنی لە واتای قسەکانی عائیشە روونو ئاشکرایەو ئەم قسەیەی ئەم دەیکات بە تەواوی پێچەوانەی مەبەستەکەی عائیشەیە.

عائیشە کە بە پەیامبەر ﷺ دەڵێت: **"ما أرى ربك إلاّ يسارع في هواك"**. واتە: دەبینم پەروەردگارت پشتوانیت لێدەکات یان بە دڵی تۆ دەکات یان لەگەڵ مەیلی تۆدایە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پەیامبەر ﷺ هیچی لە خۆیەوە نەکردووەو دووەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ شتی نابەجێ و نەشیاوی نەکردووە.

ئەوەشی کە عائیشە دەڵێت دەبینم پەروەردگارت بەپەلە ئارەزووەکانی دڵت بەجێ دێنێ یان شتەکان بە دڵی تۆ دەکات متمانەی لای عائیشەو خەڵکانی تر بە پەیامبەر ﷺ زیاتر دەکات کە هیچ شتێك لە خۆیەوە ناکاتو و وەکو خوا دەربارەی دەفەرموویت: **"وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى * إِنْ هُوَ إِلاّ وَحْيٌ يُوحَى"**. (النجم: 3ـ 4). یان دەفەرموویت : **"وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ"**.

4ـ دەڵێت جگە لە عائیشە حەفصەی ژنیشی کە کچی خەلیفە عومەرە هەمان رەفتاری هەبووە و پێکەوە بە بەردەوامی بەرگرییان لە خۆیان کردووەو ئەم بەرگرییەش لەناو کۆمەڵگایەکی وەکو نیوەدوورگەدا دەگمەنەو کەم ژن هەبووە توانای ئەم ئاکارەیان هەبوو بێت.

ئەمە نەزانی ئەو بە کۆمەڵگەی موسڵمانان و رۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا دەردەخات، ئەگینا گەر بگەڕێینەوە بۆ کتێبەکانی سیرەو مێژوو سەدان نموونەی لەو جۆرە دەبینی کە ژنان داکۆکییان لە مافی خۆیان کردووەو هاتوونەتە لای پەیامبەر ﷺ سکاڵای خۆیانیان کردووە، سوورەی **(المجادلة)** نموونەیەکە لەسەر ئەم راستییەیە.

یەکێك لە یارانی پەیامبەر ﷺ لە کاتی خیلافەتی عومەردا دەچێت بۆ لای عومەر شکاتی ژنەکەی خۆی لێبکات لەبەر ئەوەی دەنگی بەرز دەکاتەوە بەسەریدا، کە گەیشتەماڵی عومەر گوێی لە دەنگی ژنەکەی عومەر بوو دەنگی بەسەر عومەردا بەرز دەکردەوە، وتی من هاتووم سکاڵای حاڵی خۆم بکەم کەچی ئەویش بە هەمان شێوە ژنەکەی دەنگی بەسەردا بەرز دەکاتەوە، ویستی بگەڕێتەوە عومەر چاوی پێ کەوت بانگی کرد و لێی پرسی کە بۆچی هاتووەو بۆچی گەڕایەوە ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە، عومەر لە وەڵامدا وتی: ژنەکانمان خزمەتمان دەکەنو جلمان بۆ دەشۆنو نانمان بۆ دەکەنو منداڵمان بۆ بەخێو دەکەن، ئایا دانیان لەسەر نەگرین گەر کەمێك دەنگیان بەرز کردەوە بەسەرماندا یا کەمێك بۆڵەیان کرد؟ ئەمە توندوتیژترین کەس کە عومەر بوو دەبێ خەڵکانی تر ژنەکانیان چۆن بووبن بەرامبەریان؟

[1] ل 153.

7ـ دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموویت: "**يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ**". (**التحريم: 1**). دەڵێت: تەبەری لە راڤەکەی خۆیدا باسی یەکێك لەو نارەزاییەمان بۆدەکات کە عائیشەو حەصفە دژی پەیامبەر ﷺ نیشانیان دابوو، ئەم چیرۆکە ئەگەر چی سەرسورهێنەرە، بەڵام بەداخەوە کەم کەس ئاماژەی بۆ کردووە.

159/ منیش دەڵێم: سەیر ئەوەیە کە هەرچی کتێبی (اسباب النزول) و تەفسیرە گەورەکان و زۆرێك لە کتێبەکانی فەرمودە ئاماژەیان بەم روداوە داوە لەتەفسیری ئایەتەکەدا کەچی نووسەر دەڵێت: بە داخەوە کەم کەس ئاماژەی بۆ کردووە: ئەوە هەر خۆی لە تەفسیری تەبەری و پێشترین لە (**صحیح البخاري**)یەوە نەقڵی کردووە کەچی هێشتا ئەو قسەیەش هەر دەکات! ئەمە ناوی دەنێی چی؟

8ـ دەڵێت: عائیشە بەردەوام لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ لەشەڕدا بووە. ئەمە درۆ و بوختانێکی روونە و هەموو راستییەکان و بەڵگەکان بە درۆی دەخەنەوە و هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستترین خێزانی پەیامبەر ﷺ بووە، تەنانەت کورت فیشلەری ئەڵمانی کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (عائیشە ژنە خۆشەویستەکەی موحەممەد) کە زەبیحوڵڵای مەنسوری کردویەتی بە فارسی بە ناوی (عائیشە بعد از فوت محمد)، حەمەی حەمەسەعید کردویەتی بەکوردی بە ناوی (گەڕانەوەیەك بۆ سەرەتاکانی ئیسلام)، دان بەوەدا دەنێت کە عایشە خۆشەویسترین خێزانی پەیامبەر ﷺ بووە و ئەو رووداوەی کە دەیگێرێتەوە و دەیداتە پاڵ کەسانێ کە گوایە پەیامبەر ﷺ بە عائیشەی وتووە (**قد جاءك شيطانك**). واتە شەیتانەکەت هات بۆ لات و ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت (**أما لك شيطان**) ئەی تۆ شەیتانت نییە، لە هەڵبەستنی شیعەیەو هیچ حەقیقەتێکی نییە.

**روى البخارى ومسلم في صحيحيهما إن عمرو بن العاص (رضي الله عنه) سأل النبي (ص): أي الناس أحب اليك يا رسول الله؟ قال: عائيشة. قال فمن الرجال: قال: أبوها. قال ثم من؟ قال: ثم عمر.**[1]

واتە: عەمری کوڕی عاص دەڵێت: لە پەیامبەرم ﷺ پرسی کێ خۆشەویسترین کەسە بە لاتەوە؟ فەرمووی: عائیشە. پرسیم ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: باوکی وتم ئیتر کێ؟ وتی دوای ئەو عومەر.

[1] البخاري باب فضائك اصحاب النبي مسلم: باب فضائل الصحابة.

## ڕووداوی بوختان ( حادثة الأفك )

روداوی هەڵبەستنی بوختان کە لە قورئان و ژیاننامەی پەیامبەردا ﷺ بە (**حادثة الأفك**) ناسراوە یەکێك بوو لەو ڕووداوانەی کە کۆمەڵگەی مەدینەی هەژاندو موسڵمانانی خستە گێژاوێکەوە نەیاندەزانی چی بکەن: باوەڕی پێ بکەن، واتە تانەدان لە شەرەفی پەیامبەر ﷺ و تۆمەتبار کردنی خێزانی پەیامبەر ﷺ کە سەرۆکی موسڵمانانە و بانگەشە بۆ داوێنپاکی دەکات و لە هەمان کاتدا کچی نزیکترین کەسە لێوەی کە ئەبوبەکری وەزیری دەستە راستێتی. ئایا ئەگەر راست بێت پەیوەندیی نێوان ئەم دوو پیاوە چی لێ دێت و هەڵوێستی پەیامبەر ﷺ چۆن دەبێت؟

باوەڕیشی پێ ناکەن، ڕووداوەکە بە شێوەیەك باس دەکرێت کە بەدرۆخستنەوەی ئاسان نەبێت و دەنگ و باسەکەشی جۆرێك بڵاوکراوەتەوە کە گومان لە دڵی هەمموو کەسێکدا دروست بکات: ژن و پیاوێکی گەنج بەجێ ماون لە لەشکر، ئەگەر بۆ ئەوە نەبێت بۆ چییە ؟ ئاشکرایە کە خەڵکی نەیاندەزانی بۆچی عائیشە لە لەشکرەکە بەجێماوە، بەو شێوەیە خەڵکیی بوون بە دوو چینەوە، هەندێکیان دەیانوت شتی وا هەرگیز مومکین نییە لە خێزانی پەیامبەر ﷺ و یەکێك لە یارەکانی بوەشێتەوە، ئەوانەش وا حەزیان دەکرد باوەڕ بکەن بە لایانەوە ئاسایی بوو شتی وا روو بدات...

بەو شێوەیە ماوەی مانگێك قسەو باس لە مەدینەداو لە هەمموو ماڵێك و کۆڕو مەجلیسێکدا تەنها باسی ئەو ڕووداوە بوو، تا کاریگەرییەکەی لەسەر پەیامبەر ﷺ گەیشتە ئاستێك ئەوانەی لە خۆی و عائیشەوە نزیکن کۆبکاتەوە و راپرسییان پێ بکات و دوای شایەتی هەموویان لە سەر پاکی ئەو پیاو و ژنە بچێتە مزگەوتو خەڵکی کۆ بکاتەوە و گلەیی و سکاڵای خۆی لە دەستی ئەوانەی ئەو پڕوپاگەندەیەیان بڵاوکردۆتەوە دەربڕێت و بڵێت: (**یا معشر المسلمین: من یعذرنی من رجل قد بلغ اذاه فی أهل بیتی؟ والله ما علمت علی أهلي الاّ خیرا، ولقد ذکروا رجلا ماعلمت علیه الاّ خیرا**). واتە: ئەی موسڵمانان کێ بەرگریم لێ دەکات لەپیاوێك (مەبەستی عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو) کە ئازاری پێ گەیاندوم لەخێزانمدا، سوێند بەخوا جگە لە چاکە و باشی هیچی ترم لە خێزانی خۆم نەدیوە و باسی پیاوێکیش دەکەن (مەبەستی **صفوان بن المعطل** ) بوو جگە لە چاکە هیچی ترم لێ نەبینیوە و نەمزانیەوە..

بەڵێ ئەم ڕووداوە خەریك بوو کۆمەڵگەی مەدینە سەروژێر بکاتو گەورەترین ئاژاوە لەناو موسڵماناندا بنێتەوەو پێگەی پەیامبەر ﷺ لە دڵی موسڵماناندا بهەژێنێ، لە هەمووشی سەختتر ئەوە بوو کە ماوەیەکی زۆری خایاندو هیچ ئایەتێك لەو بارەیەوە دانەبەزی، ئەمەش ئەوەندەی تر مەسەلەکی ئاڵۆز کردبوو.

بەڕاستی ئەم بوختانە گەورەترین ئازار بوو بە پەیامبەر ﷺ گەیشتبوو لەو رۆژەی دەستی بە بانگەواز کردبوو تا ئەو کاتەو بگرە لەو رۆژەی فامی کردبوو تاکو ئەو رۆژەی دونیای بەجێهێشت.

### کورتەی ڕووداوەکەش بەم شێوەیە

پەیامبەر ﷺ لە هەمموو سەفەرێکیدا یەکێك لە ژنەکانی خۆی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، هەڵبژاردنەکەش بە تیروپشك بوو، ناوی هەر کەسێکیان دەرچووایە ئەوەیانی دەبرد، لە غەزای (**بني المصطلق**)دا پەیامبەر ﷺ عائیشەی لەگەڵ خۆیدا برد، لەوێ کێشەیەك لە نێوان یەکێك لە کۆچکەران (مهاجرین)و یەکێك لە پشتیوانان (أنصار) روو دەداتو سەرگەورەی مونافیقەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول دەیقۆزێتەوەو کێشەکە گەورە دەکاتو دەست دەکاتە هەڕەشە کردن کە ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە ئەوەمان کە بە هێزە بێهێزەکەمان دەردەکات، کاتێك ئەم هەواڵە دەگاتە پەیامبەر ﷺ فەرمان دەدات بە لەشکرەکە بکەونە رێ بەرەو مەدینە، شەوو رۆژێك بەبێ وەستان رۆیشتن تا کاتی چێشتەنگاو لەوێ لەبەر ماندوویی خەڵکەکە هەمووی کفت لێی کەوتن، دوایی کە شەو داهات پەیامبەر ﷺ دیسانەوە فەرمانی دا بە لەشکرەکە بکەونە رێ، عائیشە دەڵێت: کە پەیامبەر ﷺ فەرمانی دا لەشکرەکە بکەوێتە رێ، من چووم دەست بگەیەنمە ئاو، کە گەڕامەوە دەستم برد بۆ سنگم دەبینم ملوانکەکەم نەماوە، گەڕامەوە بە دوایدا (گومانی بردووە کە لەو شوێنەی دەستی بە ئاو گەیاندووە لێی کەوتبێت) کاتێك گەڕامەوە دەبینم لەشکرەکە کەوتۆتە رێ، چووم لەو شوێنەی خۆم دانیشتم، گومانم برد

که پێم دەزانن و دەگەڕێنەوە بە دوامدا، ئەوکاتەش لاواز بووم و هێشتا گۆشتم نەگرتبوو، ئەوانەی کەژاوەکەیان خستبووە سەر حوشترەکە هەستیان بەوە نەکردبوو منی تێدا نییە لەبەر کێش سوکیم، هەر لەوێ خەو بردمییەوە، خەبەرم بویەوە دەنگی زەلامێك دەیوت (**لاحول ولا قوة إلا بالله**)، **بینیم (صفوان بن المعطل)**ە کە لە دوای لەشکرەکەوە بوو، ناسیمیەوە، چونکە لەوەبەر پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب منی بینیبوو، دەمو چاوی خۆمم داپۆشی بە باڵاپۆشەکەم، سوێند بە خوا یەك قسەمان بە یەکەوە نەکردو جگە لەوەی کە دەیوت (**لاحول ولاقوة الا بالله**) هیچی ترم لێ نەبیست، حوشترەکەی یەخدا تا سواری بووم و کەوتینە رێ و دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە لەشکرەکە، ئەوەبوو هەندێك تێکەوتن و ئەو بوختانەیان بۆ هەڵبەستم، ئەوەشی پشکی گەورەی لەو مەسەلەیەدا هەبوو عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.

عائیشە بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

کاتێك گەڕاینەوە بۆ مەدینە بۆ ماوەی مانگێك نەخۆش کەوتم، تومەز باسی ئەو بوختانە لەناو خەڵکیدا گەرمەو من پێی نازانم و هەستم بە هیچ شتێك نەدەکرد تەنها ئەوە نەبێت کە پەیامبەر ﷺ ئەو لوتفەی جارانی نەمابوو و وەك جارانی پێشوو لێی نەدەپرسیمەوە کە نەخۆش دەکەوتم،ئەوە نەبێ کە سەلامی دەکردو دەیفەرموو ئەوە چۆنە؟ کاتێك روو لە چاك بونەوە بووم شەوێکیان لەگەڵ دایکی (مـوستیح)[1] چووینە دەرەوە بۆ دەست بە ئاو گەیاندن، ئەوکاتە هێشتا شوێنی دەست بەئاو گەیاندمان لە ماڵەوە جیا نەکردبوویەوە، کاتێك گەڕاینەوە دایکی مـوستیح پێی هەڵکەوت، وتی بەدبەخت بێت مـوستیح، وتم قسەیەکی زۆر خراپت کرد: جنێو بە پیاوێك دەدەیت لە شەڕی بەدراد بەشداریی کردووە؟ وتی: ئەی مەگەر نەتبیستووە چی وتووە؟ لەوێدا بۆی گێڕامەوە کە بوختانم بۆ کراوە، ئیتر ئەوەندەی تر نەخۆش کەوتم، ئەو شەوە تا بەیانی گریام و خەو نەچووە چاوم و فرمێسکم وشك نەبوویەوە، پەیامبەر ﷺ دەستی کرد بە راپرسی لە نێوان یارانیدا دەربارەی بوختانەکەو جیابونەوە لە من، هی وایان هەبوو دەیووت ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەوە خێزانی تۆیەو لە چاکە زیاتر هیچ دەربارەی نازانین، هی واشیان هەبوو دەیگوت ئەی پەیامبەری خوا ﷺ، خوا رێی لێ تەسك نەکردویتەوە (واتە: ئەتوانی تەڵاقی بدەیت و ژنی تر بهێنیت)، ژنی تر زۆرن[2] لەو کچە، ـ مەبەستی بورەیرە بووە ـ بپرسە راستییەکەت پێ دەڵێت، پەیامبەر ﷺ بانگی بورەیرەی کردو لێی پرسی: ئایا هیچتی لە عائیشە بینیوە کە جێی گومان بێت بە لاتەوە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: لە چاکی زیاتر هیچم لێنەبینیوە، تەنها ئەوەندە هەیە کە هێشتا منداڵەوکاتێك هەویر دەشێلێ خەوی پیا دەکەوێت و مریشك (لە هەندێك گێڕانەوەدا بزن) دێن هەویرەکەی دەخۆن. ئینجا پەیامبەر ﷺ چوو بۆ مزگەوت و خەڵکی کۆکردەوەو پێی وتن: ئەی موسڵمانان کێ بەرگریم لێ دەکات لە کەسانێك کە ئازارم دەدەن لە خێزانەکانمداو قسەی ناڕەوا دەکەن دەربارەیان، سوێند بەخوا لە چاکە زیاتر هیچم لێ نەبینیون، باسی پیاوێکیش دەکەن لە چاکە زیاتر هیچم لێ نەبینیوەو لە گەڵ خۆمدا نەبێت نەهاتوونەتە ماڵم. لە ئەنجامدا دەمەقاڵەیەك لە نێوان ئەوسییەکان و خەزرەجییەکان روو دەدات، دواتر پەیامبەر ﷺ ئارامیان دەکاتەوە.

عائیشە دەڵێت: دوای ئەوە ئیزنم لە پەیامبەر ﷺ خواست رێگەم بدات بچم بۆ ماڵی باوکم لەوێ چارەسەر بکرێم. رێگەی دام و فەرموی قەیناکا بڕۆ.

رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ هات بۆ ماڵی باوکم، دایك و باوکم لەوێ بوون، ژنێکی ئەنساریش لام بوو من دەگریام ئەویش دەگریا، دانیشت و سایشی خوای کردو فەرمووی : ئەی عائیشە ئاگاداری خەڵکی چی دەڵێن دەربارەت، لە خوا بترسەو ئەگەر شتێکت کردووە لەوەی کە خەڵکی دەیلێن پەشیمان بەرەوەو تۆبە بکە لای خوا، خوا تەوبە لە بەندەکانی قبوڵ دەکات و لێیان خۆش دەبێت، هەر لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ئەو قسانەی کرد فرمێسکەکانم وشك بوونەوەو چاوەڕوان بووم دایك و باوکم

---

[1] مسطح بن أثاثة خزمی عائیشە بوو، أبوبكر یارمەتی دەداو یەکێك بوو لەوانەی بوختانەکەیان کردبوو.

[2] لێرەدا مەبەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیبە، بەڵام ناوی نابات.

له جیاتی من وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە، سوێند بە خوا من خۆمم زۆر لەوە بەکەمتر دەزانی کە خوا قورئانێك دەربارەی من دابەزێنێت خەڵکی بیخوێننەوەو نوێژی پێ بکرێت، بەڵکو بە هیوای ئەوە بووم کە خوا لە خەودا شتێك نیشانی پێغەمبەر ﷺ بدات بوختانچییەکان بە درۆ بخاتەوە، چونکە دەزانێ کە پاکم، یان هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ بدات دەربارەی پاکی من.

کاتێك بینیم دایك و باوکم قسە ناکەن، پێم وتن: وەڵامی پێغەمبەر ﷺ نادەنەوە؟ وتیان: سوێند بە خوا نازانین چی وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەینەوە.. سوێند بە خوا ئەوەی بەسەر ماڵ و خێزانی ئەبوبەکردا هاتووە لەو رۆژانەدا بەسەر هیچ خێزانێکدا نەهاتووە.

کاتێك بینیم دایك وباوکم قسە ناکەن دەستم کرد بە گریان و وتم: سوێند بە خوا هەرگیز تۆبە ناکەم لەو شتەی کە وتت!

دەشزانم ئەگەر نکۆڵی لەو شتە بکەم باوەڕم پێ ناکەن و ئەگەریش دانی پێدا بنێم ئەوا دان بە شتێکدا دەنێم کە رووی نەداوە، بەڵام ئەو قسەیە دەکەم کە باوکی یوسف کردی (هەرچەندم کرد لەو کاتەدا ناوی یەعقوبم بە بیردا نەهاتەوە): "فصبر جميل والله مستعان على ما تصفون". سوێند بە خوا هێشتا پێغەمبەر ﷺ لە جێی خۆی هەڵنەستابوو ئەو حاڵەتەی بۆ پێش هات کە کاتی دابەزینی نیگا بۆی دەهات، بە کراسەکەی پێچایانەوەو سەرینێکیان خستە ژێر سەری، سوێند بە خوا من کە ئەو حاڵەتەم بینی نەترسام و خۆمم تێك نەدا، چونکە دەمزانی بێتاوانم و خوا ستەمم لێناکات، بەڵام دایك و باوکم سوێند بەو کەسەی گیانی عائیشەی بەدەستە خەریك بوو گیانیان دەردەچوو لە ترسی ئەوەی خوا ئەو بوختانەی بۆم هەڵبەستراوە بسەلمێنێ.

دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتەوە سەر خۆی دانیشت، بە لێزەمە ئارەقی لێدەچۆڕا، ئارەقەکەی ناوچەوانی سڕی و فەرمووی موژدە بێت ئەی عائیشە خوا پاکێتی تۆی دابەزاند. وتم سوپاس بۆ خوا!

دایکم وتی کچم هەڵسە سوپاسی پێغەمبەر ﷺ بکە. وتم سوێند بەخوا جگە لە خوا سوپاسی کەس ناکەم، چونکە ئەو پاکێتی منی راگەیاند.

دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ ناو خەڵکی و ئایەتەکانی بەسەردا خوێندنەوە و پاشان فەرمانی جەڵدە لێدانی حەسسانی کوڕی سابت و موستیحی کوڕی **أثاثه** و حیمنەی کچی جەحشی دەرکرد. هەڵبەستنی بوختان بۆ عائیشە کە بۆ ماوەی مانگێك مەدینەی هەژاندو گەورەترین ئازاری بە دڵی پەیامبەر ﷺ گەیاندو خەریك بوو هەموو ئیشەکانی پەیامبەر ﷺ هەڵوەشێنێتەوە تا ئەو چەند ئایەتە دابەزین و کێشەکە بە شەرلاق لێدانی ئەو سێ کەسەی راستەوخۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بوختانەیان گرتبووە ئەستۆ یەکەمیان حەسانی کوڕی سابیتی شاعیری پەیامبەر ﷺ و حیمنەی کچی جەحشی ژن خوشکی پەیامبەر ﷺ و موستیحی کوڕی ئەساسەی خزمی عائیشە تەواو بوو، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول رزگاری بوو لە شەرلاق لێدان، چونکە شتەکەی دەوروژاند بێ ئەوەی خۆی بیلێکێنێ.

خوا دەفەرموویت: **"لا تَحْسَبُوهُ شَرّاً لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ.."**. ئێوە وا مەزانن ئەوە خراپ بوو بۆتان بەڵکو ئەوە سوودی هەبوو بۆتان.

ئەڵبەتە پەیامبەر ﷺ خۆیشی نەیدەزانی حیکمەتی دواکەوتنی دابەزینی قورئان چی بوو، ئەوەش زیاتر ئازاری دڵی دەدا تاکو ئەو ئایەتانە دابەزین کە پڕ بوون لە گلەیی لە موسڵمانانو کۆمەڵێك وانەی بە نرخی تێدابوو کە هەندێکیان لە دواییدا دەرکەوتن و لە سەرووی هەموویانەوە ئەوەیە کە:

1ـ ئەگەر ئەم قورئانە لە هەڵبەستنی پەیامبەر ﷺ خۆی بوایە هەرگیز لێنەدەگەڕا ئەو شتە وا درێژە بخایەنێت و یەکسەر ئایەتی پاکێتی عائیشەی دادەبەزاندو سەختترین حوکمی بەسەر ئەوانەی ئەو تۆمەتەیان هەڵبەست دادەبەزاند و هیچ خۆی تێك نەدەدا، بە نسیبەت عائیشەوە لەوە دوا بە بیانوویەکی تر لە کۆڵی خۆی دەکردەوە، چونکە ئەگەر راگەیاندنی بێتاوانی عائیشە لەلایەن پەیامبەر ﷺ خۆیەوە بوایە بۆ پاراستنی ناوی خۆیو دەمکوتکردنی خەڵکی ئەو کاتە دڵی لێ پاك

نەدەبوویەوەو تۆڵەی لە هەردووکیان دەسەندەوە، بەڵام دەبینی بە پێچەوانەوە خۆشەویستی بۆ عائیشە زیاتر بوو، ڕێزی صەفوانیش زیاتر بوو.

ئەگەر کەسێك ئینصافی هەبێتو مەبەستی زانینی ڕاستیو گەیشتن بە ڕاستی بێت، هەڵوێستی پەیامبەر ﷺ لەم بوختانەی بۆی هەڵبەسترا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو تەنها پەیامبەرێك بووەو قورئان لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوەو ئەو هیچ دەستێکی نییە لە دەست نیشان کردنی کاتو شوێنی دابەزینی قورئانو ئەو وەکو خوا پێی دەفەرموویت لە پەیامبەرێك بەو لاوە هیچی تر نییە **"قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إَلاَّ بَشَراً رَّسُولاً"**. بڵێ: پاکی بۆ خوا مەگەر من جگە لە مرۆڤێکی نێرراو شتێکی ترم.

دەتوانی ڕووداوەکە بێنیتە پێش چاوی خۆتو خۆت ببەیتە ئەو سەردەمەو ئەو کۆمەڵگەیە، ئینجا بزانی کاریگەری ئەو ڕووداوە لەسەر پەیامبەر ﷺ چەند بووە و چۆن پەیامبەر ﷺ بە هەموو ڕۆحو ویژدانییەوە ئازاری پێگەیشتبوو، چۆن دووڕووەکانو بێبڕواکان زمان درێژییان دەکردو موسڵمانان سەرسامو بێ تاقەت بوو بوون، ئینجا تا مانگێك هیچ ئایەتێك دانەبەزێت یان تەنانەت پەیامبەر ﷺ خۆی هیچ شتێك نەڵێت جگە لەوەی کە بڵێت: ئەم خیزانەمە لە باشی بەو لاوە هیچی ترم لێ نەبینیوەو بەو صەحابەیەش کە بوختانەکەیان داوەتە پاڵی هەمان شت بڵێت، ئەگەر هەر کەسێکی تر بوایە لەوانەی کە بە ناوی ئایینەوە لافی ئەوە لێدەدەن کە لە غەیب دەزانن دەیان شتی دادەهێنا بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو بوختانچیانە، بەڵام پەیامبەر هیچ ناڵێت تەنانەت باسی خەویش ناکاتو لەوێدا بەشەریەتی خۆی بە تەواوەتی بۆ خەڵکی دەردەخات.

2ـ پەیامبەر ﷺ پابەند بوو بە فەرمانەکانی خواوە و ئەو یاسایەی بۆی هاتبوو چۆن بەسەر خەڵکیدا بەرپای دەکرد ئاوها خۆیشی پابەندی دەبوو. ئەمەش لە مامەڵەی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی و ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەستبوو بە ڕوونی دەردەکەوێت.

پەیامبەر ﷺ دەیتوانی تاوانی ئەو کەسانە زۆر گەورەتر بکاتەوەو تۆمەتی خیانەتی گەورەیان بداتە پاڵ و تاوانەکەیان وا باس بکات کە ئەوان تەنها بوختانیان بۆ ژنی پەیامبەر ﷺ هەڵنەبەستووە، بەڵکو مەبەستیان لێدانی ئیسلام بووە لە ڕێگای لەکەدارکردنی پەیامبەر ﷺو زڕاندنی ناویەوە، بەوەش تاوانەکەیان چەند بەرامبەر دەبێتەوە و گەورەترین سزایان بەسەردا بسەپێنێت و خوێنیان و ماڵ و منداڵیان و خزمی پلە یەك و دوویان لە هەموو شتێك بێبەش بکات، بەڵام کاتێك دەڕوانی بۆ هەڵوێستی پەیامبەر ﷺ بەرامبەر ئەوانەی ئەو بوختانەیان بۆ خێزانی هەڵبەست دەبینیت بەقەد باڵە مێشوولەیەك لە سنوری ئەو سزایانە لاینەدا کە قورئان دیاریی کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە بوختان هەڵدەبەستن بۆ خەڵکی.

لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەوانەی سزادران دوای ئەوە گەڕانەوە ناو کۆمەڵگەو شوێن و پلەوپایەی جارانیان، بێئەوەی کەمترین زیانیان پێ بگەیەنرێ یان مامەڵەیان لەگەڵدا بگۆڕدرێت. ئەوە حەسانی کوڕی سابتە کە شاعیری پەیامبەر ﷺ بوو بێئەوەی کەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو کارەی بداتەوە بەناوچاودا یان پەیامبەر ﷺ دووری بخاتەوە لەخۆی.

تۆ خۆت دادوەر بە: ئەوە هەر کەسێکی تر بوایە لە جیاتی پەیامبەر ﷺ هەڵوێستی چۆن دەبوو لەکەسێك بوختانی بۆ ژنەکەی هەڵبەستبێ. هەروەها ئەو ژنخوشکەی پەیامبەر ﷺ کە ئەو بوختانەی هەڵبەست بۆ عائیشە، ئەوە کەسێکی تر بوایە یەکسەر خوشکەکەی تەڵاق نەدەدا و پەیوەندیی لەگەڵدا نەدەبچڕان؟ بەڵام هیچێك لەمانە لە پەیامبەرەوە ﷺ ڕووی نەدا.

نەك هەر پەیامبەر ﷺ، بەڵکو ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێ بێت) کە یارمەتیەکی بەردەوامی بڕیبوویەوە بۆ موستیحی خزمی، دوای ئەوەی موستیح بەشداریی کرد لە هەڵبەستنی ئەو بوختانەدا لە تۆڵەی ئەوەدا بڕیاری دا ئەو یارمەتییەی لێ ببڕێت، ئەویش مافی خۆی بوو، بەڵام دوای دابەزینی ئەم ئایەتە لە کۆتایی ئەو چەند ئایەتەی لە پاکێتی عائیشە دەدوێت: **(وَلا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)** (النور: 22).

واتە: با ئەوانەی کە خاوەنی پلەو پایە و سەروەت و سامانن سوێند نەخۆن کە چیتر یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچکەرانی ڕێگای خوا نەدەن، با چاوپۆشییان لێ بکەن و لێیان خۆش بن، ئایا ئێوە حەز ناکەن خوا لێتان خۆش بێت، خودا لێبوردە و بەبەزەییە.

ئەبوبەکر فەرموی: بەڵێ من دەمەوێت خوا لێم خۆش بێت، دوای ئەوە گەڕایەوە سەر یارمەتییەکانی خۆی بۆ موستیح.

ئەمە دوو دەلالەتی گەورەیە کە لە ڕووداوی ئیفکدا بەدی دەکرێت بۆ هەر کەسێك کەمێك تێگەیشتن و ئینصافی هەبێت و دەمارگیرانە شت نەخوێنێتەوە، جگە لەو دوو دەلالەتەش دەیان وانەی پەروەردەیی تێدایە کە هەمووی گەورەیی ئیسلام و شەریعەتەکەی و پەیامبەرەکەی دەردەخات.

نووسەری کتێبی سێکس و شەرع و ژن لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەدا ویستوویەتی ئەوە بسەلمێنێت کە ئەو بوختانەی هەڵبەستراوە بۆ عائیشە بوختان نەبووە، بەڵکو بە فیعلی ئەو دووە زینایان کردووە، بەڵام نەیتوانیوە بیسەلمێنێت، چونکە مەحاڵە, هەرچەند بۆ ئەو مەبەستە پەنای بردۆتە بەر خیانەت و زیاد کردنی هەندێك شت و قرتاندنی هەندێکی تر.

## چەواشەکاری و شێواندنەکانی نووسەر

1ـ وشەی (ادلج) کە بە مانای رێکردن لەسەرەتای شەودا دێت بە خەوڕەو راڤە کردووە، جیاوازی نێوان ئەم دووەش زۆر زۆرە: یەکەمیان مرۆڤ بە ویستی خۆیەتی و ئاگای لە خۆیە چی دەکات، دووەمیان لە خەودایە و ئەو کەسە ئاگای لە خۆی نییە.[1]

2ـ **صفوان بن المعطل** بە ویستی خۆی لە لەشکرەکە جیٚ نەمابوو، بەڵکو بە فەرمانی پەیامبەر ﷺ بۆ ئەوەی هەرچییەك لە لەشکرەکە بەجێماوە کۆی بکاتەوە، خەوڕەویشی نەکردبوو.

3ـ دەڵیٚ لە لای جێگەکەی مندا خەوی لێکەوتبووە و رۆژمان لیٚ بووەوە. ئەمەش زیادەیەکە لە خۆیەوە خستویەتە سەری بۆ ئەوەی وا بە خوێنەر بگەیەنێت کە زینایان کردووە، لە کاتێکدا کە ئەمە لە هیچکام لە ریوایەتەکاندا نییە و عائیشە دەفەرموویێت هاتە سەرم لە دەنگی ئەو خەبەرم بوویەوە کە دەیوت (لاحول ولا قوە إلا باللە). (استرجاع: واتە **وتنی لاحول ولاقوة الا بالله**).

4ـ پێدەچیٚ نووسەر مانای وشەی استرجاع نەزانێت بۆیە فەرامۆشی کردووە و دەڵێت: هیچم لیٚ نەبیست لەکاتێکدا کەدەقەکەی کە خۆی دەیگێڕێتەوە دەڵێت: **واللة ما تكلمنا بكلمة ولاسمعت منه سوى استرجاعه.**

تێبینی: لە چاپی دووەمدا کە لەبەردەستمدایە وشەی سوی کە بەمانای. (جگە لە) دێت قرتاوە ئیتر ئایا بەئەنقەست یان هەڵەی چاپە نازانم، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە نووسەر وشەی (استرجاع)ی راڤە نەکردووە، کە وتنی (**لاحول ولا قوة الا بالله**)یەو ئەگەر قرتاندنی وشەی (سوى) هەڵەی چاپ نەبووبیٚ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە مانای (سوى استرجاعه) نەزانیوە بۆیە وای لێکردووە.

5ـ دەستەواژەی (تولّى كبره) واتە: ئەوەی پشکی گەورەی هەبوو لە مەسەلەکەدا، یان رۆڵی سەرەکی هەبوو، بەڵام ئەو بەم شێوەیە راڤەی کردووە: ئەو کەسەش کە بوختانەکەی گەورە کرد.

دەڵێت: ئێمەش قەرزاری مێژوونووسانی ئیسلامین کە بە هۆی ئەوانەوە ئەم چیرۆکەمان زانی[2]. دەڵێم: بەس نییە ئەو مێژوونووسانە وەکو تۆ خیانەتکار نەبوون و شتەکانیان وەکو خۆیان گێڕاوەتەوە، ئەمەش گەورەیی ئەم ئایینە دەردەخات کە ئەو مێژوونووسە راستگۆیانەی تێدا هەڵکەتووە، خیانەتەکانی تۆش پوچەڵی ئەو رێچکەیە دەسەلمێنێت کە شوێنی کەوتووی.

7ـ هەڵەیەکی زەقی تر دەکات ئەویش ئەوەیە کە دەڵێت: ئەمەش وای کرد موسڵمانان هەموو ساڵێك لەبەرائەتی عائیشەدا یادی ئەو کارەساتە لە شەوی بەراتدا بکەنەوە و شیرینی بەسەر منداڵەکاندا بیەخشنەوە!!.

هەموو کەسێك دەزانێت شەوی بەرات هیچ پەیوەندییەکی بە پاکیزەیی عائیشەوە نییە نە لە نزیکەوە، نە لە دوورەوە، ئەو شەوەش کەدڵنیام نووسەر نازانێت دەکەوێتە کەیەوە شەوی بەراتی پێدەڵێن دەکەوێتە (15)ی شەعبانەوە و ئاهەنگ گێڕان تێیدا شتێکی تازەیە و کۆن نەبووەو لە سەر بناغەی فەرمودەیەکی لاواز کە گوایە لەو شەوەدا رۆزیی دابەش دەکرێت، لەوەش سەیرتر ئەو لێکدانەوەیە کە نووسەر بنیاتی دەنێت لەسەر ئەم رووداوەی کە بە هەڵە لێی تێگەیشتووە، ئەویش ئەوەیە کە گوایە ئەم بۆنەیە بۆیە زیندوو دەکرێتەوە بۆ ئەوەی لەو رێگەیەوە پاکیزەیی عائیشە بسەلمێنن، چونکە منداڵ لە تەمەنی پەروەردەکردندایەو ئاستی هۆشیاریی کەمەو نازانیٚ راست و دروست کامەیەو پرسیار دەربارەی ئەو شتانە ناکات کە لۆژێکی نین و باوەر بە پاساوەکانیان دەکات!

بنەمایەکی لۆژێکی هەیە دەڵێت: ئەوەی لەسەر هەڵە و ناڕەوا بنیات بنرێت هەڵە و ناڕەوایە (**مابني على الباطل فهو باطل**). ئەمەش کە ئەم دەیکات کەڵەکەکردنی هەڵە لە سەر هەڵەیە.

---

[1] ادلج: سارمی أول الليل، ادلج: سار في آخر الليل. بڕوانە مختار الصحاح وشەی دلج.

[2] ل168

لەکۆتاییدا دەڵێین: وای بۆ حاڵی میللەتێك ئەمە دەم راستی بێت یان ئەمە تەرجومانی بێت.

پێویستە هەموو کەسێك ئەم پرسیارە بکات: ئەگەر کەسێك ئەمە ئاستی رۆشنبیریی بێت کە نەزانێت شەوی بەرات کە هەموو ساڵێك منداڵان دەیگێڕن بۆچی دەکرێت یان ئەوەندە چەواشەکار بێت کە بۆنەیەکی ئاوها بەو شێوەیە تەفسیر بکات شایانی ئەوەیە باوەڕ بە هیچ شتێکی تری بکرێت؟

خۆشبەختانە نووسەر زۆر جار دەقە عەرەبییەکان دێنێتەوە یان هەڵەی وا گەورە دەکات بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی بەرجەستە لە سەر نەزانی و خیانەت و نائەمانەتی!

**بەڵگەکانی پاکێتی عائیشە لە خودی رووداوەکەوە**

ئێستاش بابزانین ئەو بەسەرهاتەی مێژوونووسان گێڕاویانەتەوە بەڵگەیە لەسەر پاکی عائیشە یان لەسەر زینای عائیشە وەکو ئەوەی کە ناحەزانی ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ دەیڵێن:

1ـ هەر کەسێك کەمێك شارەزایی لە دەروونناسی هەبێت تەنها لە خوێندنەوەی رووداوەکەوە و بێ ئاوڕدانەوە لە ئایەتەکان بۆی دەردەکەوێت کە هیچ شتێکی ناشەرعی لە نێوان عائیشە و صەفواندا رووی نەداوە، ئەویش بەوەی کە کەسی تاوانبار هەڵسوکەوتی دەگۆڕێت و سروشتییانە رەفتار ناکات وەکو کورد دەڵێت: تریشکە لەخۆی بەشکە، یان دەڵێت: دار هەڵگرە سەگی دز دیارە، واتە گەر کەسێك لە خۆی بە گومان بوو قسەو رەفتاری دەگۆڕێت.

2ـ ئەوانەی کە دەیانەوێت لە دوای شایەتی قورئان لەسەر پاکێتی عائیشە باوەڕ بەو بوختانە بکەن بە هۆی باگکراوندە دوژمنایەتیو دەمارگیرییانەوە، ئەوەیان لەبیر دەچێتەوە کە ئاوەها کارێك هەرگیز مومکین نییە روو بدات چ لەلایەن عائیشەوە، چ لەلایەن صەفوانەوە، یا هەر هاوەڵێکی ترەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە عائیشە خێزانی پەیامبەری سەرگەورەی موسڵمانانەو کچی ئەبوبەکری وەزیری دەستە راستی پەیامبەر ﷺو پیاوی ناوبانگی قورەیشە، ئەم پلەوپایەیەش رێگرێکی گەورەیە لەبەردەم ئافرەتدا بۆ ئەنجامدانی کارێك کە تیاچوونی خۆی و ریسوابوونی خێزانی و لە دەست دانی پلەوپایە و سوکبوونی مێردەکەی و رێبازەکەی تێدایە، بە تایبەت کەدەشزانێ سزای ئافرەتی مێرددار بەردباران کردنە تاکو مردن، لەو لایشەوە بەنسبەت هەر پیاوێکەوە کە پلەوپایەی پەیامبەر ﷺبزانێت و سزای زینا بزانێت هەرگیز جورئەت ناکات هەنگاو بۆ کارێکی وا بنێت، ئەمە لەڕووی مەبدەئەوە **(من حيث المبدأ)**.

3ـ ئێمە دەپرسین لەوانەی باوەڕ بەو بوختانە دەکەن: ئایا ئەوە زینا بوو بە رەزامەندی هەردوولا یان ئیغتصاب؟ ئەگەر زینا بێت ئەوا هەرگیز ئەو کارە لە نێوان ژن و پیاوێکدا بە یەکجار بەیەك گەیشتن روو نادات بەڵکو دەبێ سەرەتای هەبێت و لەوەوبەر چەندین شت روویدابێت لە نێوانیاندا تا رێك کەون لە کاتێکدا ئەو کارە بکەن، ئاشکراشە کە لەوەبەر لە نێوان عائیشەو صەفواندا هیچ پەیوەندییەك نەبووە، چونکە ئەگەر کەمترین گومان لە سەر عائیشە هەبوایە ناحەزانی بڵاویان دەکردەوە بە تایبەت کەسێکی وەکو عائیشە کە چەندین هەوێی هەبوو، لە هەموویان گەنجتر و جوانتر و لەپێشتر بووە و پێغەمبەر ﷺزیاد لەسنوور خۆشی ویستووە، ئەگەر ئیغتصاب بوایە، ئەوا ئەو پیاوە هەرگیز جورئەتی نەدەکرد بگەڕێتەوە بۆ ناو موسڵمانان لە ترسی ئەوەی کە شتەکەی دەرنەکەوێت نەك بە خۆی عائیشە بێنێتەوە.

4ـ بە تەنها شێوازی گەڕانەوەی عائیشە و صەفوان بۆ ناو لەشکری موسڵمانان بەسە وەکو بەڵگەیەك لەسەر پاکێتیان، چونکە ئەگەر تاوانبار بوونایە ئەو کاتە عائیشە لە رێگایەکەوە و صەفوانیش لە رێگایەکی ترەوە دەهاتنەوە، یان هیچ نەبوایە نزیکی دەکردەوە لە لەشکرەکە و دوایی خۆی دەهاتەوە، یان لەوێ بەجێی دەهێڵا و کە دەگەڕایەوە بۆ ناو موسڵمانان بەشێوازێك لە شێوازەکان تێی دەگەیاندن کە عائیشە بەجێ ماوە، نەك عائیشە بەسەر حوشترێکەوە و صەفوان لەپێشەوە جڵەوەکەی راکێشێت و دووبەدوو بەبێ ترسی هیچ شتێك بگەڕێتەوە بۆ ناو لەشکری موسڵمانان، کوردیش دەڵێت: پاکم بۆیە بێباکم، کەسی تاوانبار هەرگیز بەو شێوەیە رەفتار ناکات، بەڵکو هەموو ئیحتیاتێك بۆ خۆی دەکات و حیساب بۆ هەموو ئەگەرەکان دەکات.

بەهەرحاڵ دەیان ڕێگە هەبوو بۆ چەواشەکردنی خەڵکی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەوەی بە خەیاڵی ئەوو صەفواندا نەهاتبوو ئەوە بووە کە ئاوها گومانێکیان بۆ ببڕێت بەو شێوەیە گەڕانەوە.

5ـ لە چۆنێتی ڕووبەڕووبوونەوەی عائیشە لەگەڵ پەیامبەر ﷺو دایكو باوكو دەورووپشتیدا پاکی عائیشە دەخوێنرێتەوە، چونکە کەسی تاوانبار هەرگیز ناتوانێت بەو شێوەیە ڕووبەڕووی کەسوکار ببێتەوە بە تایبەت ئەو کاتەی کە ئایەتەکان دابەزین و دایکی عائیشە پێی وت هەستە سوپاسی پەیامبەر ﷺبکە، وتی سوێند بەخوا جگە لە خوا سوپاسی کەس ناکەم، چونکە تەنها ئەو پاکیی منی ڕاگەیاند.

6ـ ئەوەی کە گومانی تێدا نییە و هەموو خەڵکی لە سەری کۆکن ئەوەیە کە عائیشە کەسێکی بڕوادار بووە و باوەڕی بەوە هەبووە کە مێردەکەی پەیامبەرە ﷺ، ئەمەش وای لێدەکرد کە نەوێرێت نکۆڵی لەو شتە بکات چەنکە دڵنیا بوو کە خوا بۆ پەیامبەری ئاشکرا دەکات ئەگەر بە ئایەتیش نەبێت وەکو خۆی دەڵێت بە خەو، بە تایبەت لەو کاتەی کە پەیامبەر ﷺپێی وت: ئەی عائیشە ئەگەر بێتاوان بی ئەوە خوا دەریدەخات، ئەگەر گوناهێکت کردووە ئەوا تۆبە بکە و بگەڕێرەوە بۆ لای خوا، خوا بەخشندە و لێبوردەیە, ئەو قسەیەی پەیامبەر ﷺبەس بوو بۆ ئەوەی ورەی عائیشە بڕوخێنێت و هەرەسی پێ بێنێت و وای لێبکات بداتە پڵمەی گریان و دان بە تاوانەکەیدا بنێت.

7- ئەو حاڵەتەی عائیشەی تێدا بوو هەرگیز ناشێت بۆ ئەنجامدانی زینا, ئەو لە لەشکرەکە بەجێمابوو، نەشیدەزانی کەسی تر هەبێت دوا کەوتبێت لەو لەشکرە جگە لە خۆی, بەتەنها لەو چۆڵەوانیەدا چاوەڕوان بوو لەشکرەکە لە هەر کاتێدا بێ پێی بزانن و بگەڕێنەوە بەدوای دا.

واتە: هەر کەسێك لەو وەزعەی عائیشەدا بێت بە دوو هۆکار بیر لە زینا ناکاتەوە:

یەکەم: ئەو ترس و نائارامییەی ڕووی تێدەکات لە ئەنجامی بەجێمانی لە لەشکرەکە و بەتەنها مانەوەی.

دووەم: چاوەڕوان بوونی ئەوەی لە هەر لەحزەیەکدا بێنەوە بەدوایدا.

عائیشە لەگەڵ لەشکرێکدا هاتبوو کە لە مەدینە دوور کەوتبوویەوەو هاتبوو بۆ تەمێ کردنی تیرەی بەنوموستەلەق, لەو شوێنی شەڕەداو دوور لە مەدینە بە تەنها بەجێماوە, مەترسی ئەوە لەئارادا بوو کە بکەوێتە دەستی دوژمنان، چۆن دەتوانێ بیر لە کارێکی وا بکاتەوە؟ ئەمە چ لۆژیکێکە؟

ئەوانەی بە تەنها لەبەر ئەوەی عائیشە و صەفوانیان بینی پێکەوە دەگەڕێنەوە تۆمەتیان بۆ هەڵبەستن، بێئەوەی بە چاوی خۆیان هیچ شتێك ببینن و دوای قسەی دووڕووەکان بکەون، ئەگەر ئەوان ئەوکاتە توانای لێکدانەوەیان نەبوو خۆ ئەمڕۆ دەتوانین ئەو جۆرە ڕووداوانە لە هەموو ڕوویەکەوە تاووتوێ بکەین و لێکی بدەینەوە و لە ئەنجامی ئەمەشدا دەردەکەوێت کە ڕووداوەکە لە هەر لایەکەوە بیگری و لێکی بدەیتەوە ئەگەری ڕوودانی ئاوها کارێك (زینا) دوور دەخاتەوەو دەیکاتە شتێکی مەحاڵ.

## هەندێکی تر لەوانەکانی ڕوداوی ئیفك

1-یەکێك لەو شتانەی ئایەتەکانی سورەتی (نور) باسی دەکەن ئەوەیەکە بڕواداران نابێت باوەڕ بە هەموو قسەیەك بکەن بەڵکو دەبێ عەقڵ و ژیریی خۆیان بەکاربهێنن بۆ وەرگرتن یان ڕەتکردنەوەی هەواڵ و پڕوپاگەندە, ئەو وانەیەی نووسەر فێری نەبووە قورئان لەو سەردەمەدا لە ڕوانگەی ئەم ڕووداوەوە بە موسڵمانانی فێر کرد و فێریکردن کە بەرپرسیارێتی قسە چۆن دەبێت, ئەو بەرپرسیارێتییەی کە نەنووسەر دەیزانێت، نە بەداخەوە زۆرێك لەموسڵمانانی ئەمڕۆ دەیزانن بە تایبەت ئەوانەی بە قسەو هەڵوێستەکانیان ئیسلام دەبێزرێنن لەبەرچاوی خەڵکی.

2ـ یەکێك لەو ڕێگا کاریگەرانەی خوا دەیگرتە بەر بۆ پەروەردەکردنی موسڵمانان ڕووداو بوو، خوا وەکو فەیلەسوفەکان ئیکتفای نەکردووە بە باسکردنی باشی و خراپی شتەکان لە ڕوویەکی تیۆری ڕووتەوە بەڵکو ڕووداوەکانی دەقۆستەوە بۆ

باسكردنی بنەماكانی خێر و شەڕ، یان ئامۆژگارییە ئەخلاقییەكان، یا تەشریعاتەكان، چونكە ئەمیان كاریگەرتر بوو، پەیامبەریش ﷺ هەمان شتی دەكرد و لە سەر هەمان بەرنامە دەڕۆیشت.

ئەوەی هۆیەكانی دابەزینی ئایەتەكانی قورئان یا بۆنەكانی هاتنی فەرمودەكانی پەیامبەر ﷺ بخوێنێتەوە بە روونی ئەم راستییەی بۆ دەردەكەوێت.

ئەم رووداوەش (واتە هەڵبەستنی بوختان) دوای دابەزینی ئەو ئایەتانە روویدا كە باسی سزای ئەو كەسانە دەكەن كە زینا دەكەن و ئەو كەسانەی كە بوختان هەڵدەبەستن بۆ ژن و پیاوی بێتاوان و بە خۆیانەوە چوار شایەت ناهێنن، ئایەتەكان دەفەرموون:

**(الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ وَلا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ)** (النور: 2).

واتە ئەو ژن و پیاوەی زینا دەكەن سەر و سەد جەڵدەی لێدەن و بەزەیی هاتنەوەتان نەبێت پێیان لە جێبەجێ كردنی فەرمانی خوادا و با كۆمەڵێك لەموسڵمانان سزاكەیان ببینن و حازری كاتی سزادانەكەیان بن.

پاشان باسی مەرجی سەپاندنی تۆمەتی زینا بەسەر خەڵكیدا دەكات ئەویش بەوەی دەڵێت چوار كەس شایەتی بدەن لە سەر بینینی ئەو دوو كەسە لە كاتی ئەنجامدانی زیناكەدا، بەڵام ئەگەر كەسێك تۆمەتی زینای دایە پاڵ ژن و پیاوێك و سێ شایەتی تری لەگەڵ خۆیدا نەهێنا ئەوا هەشتا جەڵدەی لێدەدرێت بە تاوانی ئەوەی كە بوختانی بۆ خەڵكیی هەڵبەستووە.[1]

مەبەستیش لەم هەموو شایەتە ئەوەیە كە هەر كەسێك هەڵنەسێت و لەخۆیەوە تۆمەتی زینا بداتە پاڵ خەڵكی تر و تووشی سزایان بكات و ناویان بزڕێنێت:

**(وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)**. (النور: 4).

واتە: ئەو كەسانەی بوختان بۆ ئافرەتە بڕوادارە داوێن پاكەكان هەڵدەبەستن و چوار شایەت ناهێنن (بە خۆیانەوە) هەشتا جەڵدەیان لێبدەن و چیتر شایەتییان لێ قبوڵ مەكەن، مەگەر ئەوانەی كە تۆبەیەكی راستەقینە دەكەن و خۆیان چاك دەكەن، خوا بەخشندەو لێبوردەیە.

دوای دابەزینی ئەم ئایەتە موسڵمانان وتیان جا چۆن دەكرێت بۆ سەلماندنی هەموو زینایەك چوار كەس شایەتیی بدات؟ بەو شێوەیە بێت كەس تۆمەتی زینای بەسەردا ناسەپێ.

دوای ئەم ئایەتانە رووداوی ئیفك روویدا، ئەوە بوو ئەوانەی شایەتییان دا لە سێ كەس تێنەپەڕین، كاتێك قورئان پاكێتی عائیشەی ئاشكرا كرد موسڵمانان لە حیكمەتی ئەو ئایەتە گەیشتن كە باسی چوار شایەت دەكات.

لێرەشدا هەر وەكو چۆن بۆ نەهێشتنی یاسای بە منداڵی خۆكردن (تبنّي) فەرمان بە پەیامبەر ﷺ درا ژنی زەیدی بە كوڕكراوی خۆی بهێنێت، بەهەمان شێوە پەیامبەر ﷺ و خێزانی پەیامبەر ﷺ كرانە سەرمەشق بۆ ئەم مەسەلەیە و بۆ دەرخستنی گرنگیی چوار شایەت بۆ سەلماندنی زینا لە سەر كەسێك.

3ـ هەڵوێستی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ عائیشەداو دابەزینی ئەو ئایەتانەی باسی حوكمی كەسێك دەكەن كە خۆی شایەتی لە سەر ژنەكەی بدات كە زینای كردووە دەری دەخات كە لە ئیسلامدا كەس بۆی نییە ژنی خۆی بكوژێت یاپیاوێكیشی بە سەرەوە بگرێت، بەڵكو دەبێ بیداتە دادگا و لەوێ لەبەردەم قازیدا یان شایەت بێنێت یان سوێند بخوات، كوشتنی ئافرەت بۆ سڕینەوەی ئەو شورەییەی تووشی ئەو خێزانە بووە تەشریعێكی ئیسلامی نییە، بەڵكو نەریتێكی كۆمەڵایەتییە لە ئەنجامی پیاوسالارییەوە سەری هەڵداوە نەك شەرعسالاری، ئەوەی كە مامەڵەی پەیامبەر ﷺ تەماشا بكات لەگەڵ

[1] هەڵبەستنی بوختان بۆ پیاویش هەمان سزای هەیە، بەڵام باسكردنی ئافرەت بەتایبەت چەندین مەبەستی تێدایە ئێستا كاتی باسكردنیان نییە، گرنگترینیان پاراستنی ئافرەتە لەوەی ئەم و ئەو، لەبەر ئەوەی ئافرەت زیاتر زیانی پێدەگات لەو جۆرە تۆمەتانە.

عائیشەدا بە درێژایی ئەو ماوە زۆرەی (نزیکەی مانگێك) کە دەنگوباسەکە بڵاو بووبویەوە و بوختانەکەی تێدا کرا بوو سەرسام دەبێت: پەیامبەر ﷺ بە درێژایی ئەو ماوەیە نە دای بە رووی عائیشەداو نە پێی وت، نە قسەیەکی ناشیرینی پێ وت، نە تانەو تەشەرەیەکی تێگرت، لەوەش زیاتر کە دەهاتە ماڵەوە پرسیاریشی دەکردو هەواڵی تەندروستیی دەپرسی.

ئایا دوای ئەمە ئیسلام تۆمەتبار دەکرێت بە پێشێلکردنی مافی ئافرەت.

ئەگەر خەڵکی پابەند نین بەم بنەمایانەوە لەبەر زاڵی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی ئەوە تاوانی خەڵکییە نەك ئیسلام.

ئیسلام دەیویست دەوڵەتی یاسا دامەزرێنرێت و وا لە خەڵکی بکات لە تایبەترین کێشەدا کە مرۆڤ بە زەحمەت خۆی پێ دەگیرێ بگەڕێتەوە بۆ یاسا و خۆی هیچ بڕیارێك نەدات.

4ـ لەم رووداوەوە خوا لە رێی قورئانەوە موسڵمانان فێری دوو شتی گرنگ دەکات:

أـ بە ئاسانی باوەڕ بە هەموو شتێك نەکەن و عەقڵ و ژیریی خۆیان بەکار بهێنن بۆ هەڵسەنگاندنی هەر هەواڵێك کە پێیان دەگات، یان هەر بوختانێك بە هەر کەسێك دەکرێت. (**لَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْراً وَقَالُوا هَذَا إِفْكٌ مُّبِينٌ**). (النور: 12). واتە: دەبوایەکاتێك بروا داران قسەیەکی وایان بیست گومانی چاکیان بە خۆیان ببردایەو بیانگوتایە ئەمە بوختانێکی ئاشکرایە، واتە لە خۆیانەوە بیانزانیبایە کە ئایا ئەوان شتی وا دەکەن؟ پیاوەکان کەسیان چاو دەبڕێتە خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ و ژنەکان کەسیان خیانەت لە مێردەکانیان دەکەن، چ جای ئەگەر خێزانی پەیامبەر ﷺ بێت، لە شوێنێکی تردا قورئان هانی برواداران دەدات کە کوێرانە باوەڕ بەهیچ کەسێك نەکەن، بەڵکو هەرکەسێك هەواڵێکیان بۆ بێنێت لێی وردبینەوە و بچنەوە بنج و بنەوانیەوەو بزانن راستە یان نا بۆ ئەوەی بە نەزانی و بەبێ بەڵگە خەڵکیی تۆمەتبار نەکەن: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ) (الحجرات: 6)**.

هەر لەم چەند ئایەتەشدا قورئان داوا لە برواداران دەکات باوەڕ بە هەواڵێك نەکەن ئەگەر خاوەنەکەی بەڵگەی بە دەستەوە نەبوو، یان شایەتی نەبوو: (**لَوْلَا جَاؤُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاء فَأُوْلَئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ**). (**النور: 13**).

ب- هەرشتێك دەبیستن بڵاوی نەکەنەوە و هەست بە بەرپرسیارێتی ئەو قسانە بکەن کە لە زاریان دێتە دەر بە تایبەت لەو مەسەلانەی کە گرنگن و پەیوەندییان بە ناو و شوهرەتی خەڵکییەوە هەیە، یا پەیوەندییان بە ئەمنییەت و ئاسایشی کۆمەڵگەوە هەیە. (**إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمٌ * وَلَوْلَا إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَا أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَذَا سُبْحَانَكَ هَذَا بُهْتَانٌ عَظِيمٌ**). (**النور**: 15ـ 16).

(**وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً). (النساء**: 83). لە ئایەتێکی تریشدا بە راشکاوی باس لەبەرپرسیارێتی گوێ و زمان و عەقڵ دەکات و دەفەرموویت: (**وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً). (الإسراء**: 36).

ئەمانە هەندێك بوون لە دەلالەت و وانەکانی رووداوی ئیفك کە خەڵکانی دەمارگیر چاویان بەرایی نادات بیانبینن و بە شێواندن و قرتاندن و خستنەسەرو هەر شێوەیەکی تر بێت دەیانەوێت پێچەوانەکەی لێ هەڵبێنجێنن، بەڵام هەرگیز بۆیان ناچێتە سەر، چونکە شتەکە لە رۆژی نیوەڕۆ ئاشکراترە و بە بێژنگی نەزانی و دەمارگیری بەری ناگیرێت.

ئەمە بەنسبەت ئەو بوختانەی بە عائیشە کرا، بەنسبەت تەمەنی عائیشەشەوە کاتی شووکردنی دواقسەمان ئەوەیە کە ئەگەر تەنانەت راستیش بێت تەمەنی لەو کاتەدا نۆ ساڵ بوو بێت ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە عائیشە کەسێکی تایبەت بووەو خوا بە شێوەیەکی تایبەت بۆ پەیامبەری پێگەیاندو بۆ ئەوەی ئەو رۆڵە گرنگە ببینێت و ئەو هەموو فەرمودانەی تایبەتن بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە لەبەر بکات و بیگەیەنێت بە موسڵمانان، هەر کەسێکیش ژمارەی ئەو فەرمودانەی

عائیشە گێڕاونیەتەوە و ئەو راوبۆچوونە فیقهییانەی عائیشە بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە چ کەسێکی زیرەك و لێهاتوو و ژیرو زاناو داناو تێگەیشتوو بووە.

یەکێك لە گرنگترین بوارەکانی تێگەیشتن و شارەزایی عائیشە بریتی بووە لەو لەو مەنهەجەی هەیبووە لە وەرگرتن و رەتکردنەوەی ئەو فەرمودانەی دەدرانە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، دەتوانی بڵێی عائیشە دامەزرێنەری مەنهەجی عەقڵی بووە بۆ هەڵسەنگاندنی فەرمودەکان و ئەو قسانەی دەدرانە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، ئەو لەسەر دوو بنەما فەرمودەکانی وەر دەگرت:

1- پێچەوانەی قورئان نەبوونایە.

2- لەگەڵ ژیریدا بگونجانایە و نالۆژیکی نەبوونایە.

لەبەر ئەوەشە دەبینی راوبۆچوونی خۆی هەبوو دەربارەی زۆرێك لەو فەرمودانەی لە پەیامبەرەوە ﷺ بۆیان دەگێرایەوە و ئەو کەسانەی کە فەرمودەکەی گێراوەتەوە تاوانبار دەکرد بە تێنەگەیشتن لە پەیامبەر ﷺ، بۆ نموونە ئەو فەرمودەیەی کە باسی دیتنی خوادەکات لە شەوی میعراجدا لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ، ئەو فەرمودەیەی کە دەڵێت ژن و کەرو سەگی رەش بە بەردەمی نوێژخوێندا تێپەڕن نوێژەکەی بە تاڵ دەبێتەوە، ئەوەش شتێکی نامۆو سەیر نییە ئەگەر خوای گەورە بۆ ئەم مەبەستە گەورەیە عائیشەی بەو شێوەیە ئامادە کردبێت، ئەوەتا عیسای لە مریەم بەبێ باوك هێنایە بوون و کۆشکی بەلقیسی بۆ سولەیمان بە چاوتروکانێك گوێزایەوە و ئیسحاقی لە (80) ساڵیدا دا بە سارا، دەیان شتی تری لەو بابەتە گەر باسیان بکەین درێژە دەکێشێت و خوای گەورەش لە وەڵامی ئەوانەی کە سەیریان هاتووە لەو جۆرە موعجیزانە فەرموویەتی ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن، یان فەرموویەتی من دەسەڵاتم بە سەر هەموو شتێکدا هەیە و هیچ شتێك بۆ من ئەستەم و مەحاڵ نییە[1].

بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە ئەو فەرمودەیەیە کە عائیشە دەیگێڕێتەوە کە پەیامبەر ﷺ پێی فەرموو فریشتەکان دووجار لە خەودا تۆیان نیشان دام.

رۆڵی حەزرەتی عائیشە لە رووی زانستیەوە زۆر بەرچاوە، بە رادەیەك کە بە یەکێك لەزانایانی سەحابە دەژمێرێت، لە رووی کۆمەڵایەتیشەوە بە هەمان شێوە رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە یارمەتی دانی هەژاران و لێقەوماوان, بە رادەیەك کە جاری وا هەبووە لەو ماڵەی بۆی هاتووە هەمووی بە رۆژێك بەخشیوەتەوە و هیچی نەهێشتووەتەوە.

کەمترین رۆڵێك عائیشە هەیبووبێ رۆڵی سیاسیی بوو، ئەویش تەنها بەشداریکردنی بوو لە شەڕی (الجمل)، ئەویش لەبەر ئەوەی هەستی دەکرد خەلیفە عوسمان بەناڕەوا کوژراوە و ستەمی لێکراوە و داوای سزادانی بکوژانی دەکرد، ئەگینا پێش ئەوەو پاش ئەوە هیچ رۆڵێکی ئەوتۆی نەبووە، هەر چیبەکیش لەو بارەیەوە دەوترێت هەمووی هەڵبەستراوەو لە هەڵبەستنی ناحەزانی ئیسلام و ناحەزانی عائیشە و یارانی پەیامبەرە ﷺ.

لە هەندێك مەسەلەدا ویستویەتی قسە بکات و قسەشی کردووە، بەڵام بەگوێی نەکراوە. بۆ نموونە کاتێك پەیامبەر ﷺ فەرمووی بڵێن بە ئەبوبەکر با پێشنوێژیی بکات بۆ موسڵمانان, عائیشە وتی ئەی پەیامبەری خوا ﷺ ئەبوبەکر کەسێکە لە نوێژا زۆر دەگری، فەرمان بدە با کەسێکی تر پێشنوێژی بکات, پەیامبەر ﷺ بەگوێی نەکرد، چونکە زانی لەبەر ئەوەی نییە کە باوکی لە نوێژدا زۆر دەگری، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە حەزی نەدەکرد تا پەیامبەر ﷺ لە ژیاندایە باوکی لە شوێنیدا ببینرێت، بەڵام ئەم قسەیەی عائیشە کە وەکو هەر ئافرەتێك لە حاڵەتی ئاوهادا دەیکات گەورە کراوەتەوە لە لایەن ناحەزانەوە و کراوەتە بەڵگەیەك لە سەر ئەوەی کە عائیشە هەمیشە خەریکی پیلانگێڕان و نەخشەکێشان بووە بۆ دیاری کردنی خەلیفەکان[2].

---

[1] بڕوانە سورەتی (البقرة) و(آل عمران) و (مريم ) و (طه) و (نمل) باسی عیسا و زەکەریا و ابراهیم و عوزەیر و موسا و سولەیمان و.. هتد.

[2] بۆ نمونە بڕوانە کتێبی (گەڕانەوەیەك بۆ سەرەتاکانی ئیسلام) کە هەمووی یەکپارچە موبالەغە و زیادەڕەوییە.

عائیشە حەزی نەدەکرد با وکی پێش نوێژی بکات، لەبەر ئەوەی دەرکەوتنی ئەو لەو حاڵەتەدا وەکو ئەو کەسەی لێدەهات کە خەبەری ناخۆش بگەیەنێتە خەڵکی، ئەو ئیشەی کە زۆر کەس خۆی لیٚ لا دەدات و حەزناکات گەیەنەری هەواڵی ناخۆش بێت، بەڵکو هەموو کەسێك حەز دەکات گەیەنەری موژدەی خۆشیی بێت، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش زیاتر لەنا و ژناندا هەیە.

## گەڕانەوە بۆ تەمەنی عائیشە

دەپرسین: ئایا لە رووی زانستیەوە بۆی هەیە کچ لە نۆ ساڵیدا پێبگات و بە کەڵکی شوو کردن بێت و توانای زاووزێی هەبێت؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵیٚ حاڵەت هەیە پێی دەوترێت بلوغی پێش وادە Precaucious Puberty کە تێیدا کچ یان کوڕ بە ماوەیەکی زۆر پێش کاتی باڵق بوون باڵق دەبن و کچ دەکەوێتە سوڕی مانگانە و لە رووی لاشە شەوە وەکو کچێکی تەواو پێگەیشتووی لێدێت, لە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریشدا زۆر جاری وا رێککەوتووە کچ بە (12) ساڵی دراوە بە شوو منداڵیش بووە و توانیویەتی کاروباری ماڵ بەڕێوە ببات و سەرکەوتووش بێت لە ژیانی ژن و مێردایەتی و کۆمەڵایەتیشدا.

## حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب

چیرۆکی خواستنی حەفصەش یەکێکە لە بەڵگە بەرجەستەکان لەسەر ئەوەی کە ژنهێنانەکانی پەیامبەر ﷺ زۆرێکی مەبەستی تری لە دواوە بووە نەك مەبەستی جنسی، چونکە ئەوە حاشا هەڵنەگرە کە حەفصە بێوەژن بووە و جوانیش نەبووە، ئیمامی عومەر خۆی پێش ئەوەی پەیامبەر ﷺ داوای بکات داوای لە ئەبوبەکر و عوسمان کردووە بیخوازن، بەڵام نەیانخواستوە, عوسمان لەبەر ئەوەی کە نەیویستووە و ئەبوبەکریش لەبەر ئەوەی کە بیستویەتی پەیامبەر ﷺ باسی کردووە. لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین: بۆچی عومەر (رەزای خوای لێ بێت) ویستویەتی بیدات بە ئەبوبەکر یان عوسمان؟ تەنها یەك وەڵام هەیە بۆ ئەم پرسیارە ئەویش ئەوەیە کە خۆشی ویستوون و ویستیویەتی زیاتر لە یەك نزیك ببنەوە و زیاتر تێکەڵاوبن, جورئەتی ئەوەشی نەکردووە داوا لە پەیامبەر ﷺ بکات بیخوازێت ئیتر ئایا لەبەر ئەوەی حەفصە دیمەنی نەبووە و وا نەبووە کە سەرنجی پیاو راکێشێت یان شەرمی کردووە و رووی نە هاتووە شتێکی وا بدرکێنێت، یا هەر حەفصەی بە شیاوی پەیامبەر ﷺ نەزانیوە, بەهەرحاڵ کاتێك پەیامبەر ﷺ داوای دەکات عومەر لەخۆشیدا پێی زەوی ناگرێت و نازانێت چی بکات.

لەم زەواجەدا پەیامبەر ﷺ جگە لە رێزنان لە عومەر و دەرخستنی پلە و پایەی و نزیك کردنەوەی لە خۆی هیچ مەبەستێکی تری نەبووە، ئەمەش دانایی و گەورەیی پەیامبەر ﷺ دەردەخات، پتەوی پەیوەندیی نێوان عائیشە و حەفصەش لەوەدوا شتێکی ئاسایی بوو، چونکە رەنگدانەوەی پەیوەندیی نێوان ئەبوبەکر و عومەر بوو (رەزای خوایان لێ بێت).

ئەوانەی کە تێناگەن لە هۆیەکانی ژنهێنانی پەیامبەر ﷺ ئەوا نەزانیی خۆیان دەردەخەن لەمەڕ زۆرێك لەو دابونەریتانەی کە گەورەپیاوان لە کۆن و نوێدا رەچاویان کردووە و ئەو رێگایانەی گرتویانەتە بەر بۆ بەدەستهێنانی مەبەستەکانیان چ سیاسیی بووبێت یا ئایینی یا ئابوری، یا کۆمەڵایەتی و هتد..

## زەینەبی کچی جەحش

زەواجی پەیامبەر ﷺلە زەینەبی پورزای بەردەوام لە کۆن و نوێدا قسەی زۆری لەسەر کراوە و یەکێکە لەو بوارانەی دوژمنانی ئیسلام کردویانەتە رەخنە بە سەر پەیامبەری ئیسلامەوە ﷺ, بۆیە ئێمەش لێرەدا بە یارمەتی خوا بەتێروتەسەلی باسی دەکەین و دەیسەلمێنین کە ئەم زەواجش یەکێکە لە لایەنە گەورەو ئیجابیەکانی ئیسلام و پەیامبەری ئیسلام ﷺ، بە پێچەوانەی ئەوەی کە ناحەزان و دەمارگیران لێی تێگەیشتوون.

رەخنەگرانی زەمانی پەیامبەر ﷺرەخنەیان لەوەدا لێگرتووە کە ژنی کورەکەی خۆی هێناوە, چونکە بە لایانەوە نادروست بوو پیاو ژنی کوڕ بێنێت با لە راستیشدا کوڕی خۆی نەبێت و گرتبێتیە خۆی و ژنی کوڕ و بەکوڕکراو یەك حوکمیان هەبوو بە لایانەوە و، بەڵام هیچ کەسێك باسی لەوە نەکردووە کە حەزی لێکردووە و زەیدیش لەبەر ئەوە تەڵاقی داوە, چونکە ئەگەر شتێکی وا لەئارادا بوایە خەڵکی ئەو سەردەمە پێیان دەزانی و زیاتر قاویان لێدەدا بۆی, ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەو ریوایەتانە بەدرۆدەخاتەوە کە لەوە دوا خەڵکانێك گێڕاویانەتەوە کە گوایە پەیامبەر ﷺدڵی چووە بە زەینەبدا بۆیە زەید تەڵاقی داوە.

رەخنەگرانی نوێ (لە پێش هەموویانەوە رۆژهەڵاتناسەکان) لە روانگەی ئەو ریوایەتانەوە رەخنەی لێدەگرن کە دەڵێت پەیامبەر ﷺجارێکیان چووە بۆ ماڵی زەید و زەینەبی بینیوە و وتویەتی (سبحان مقلب القلوب) واتە پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە دڵەکان دەگۆڕێت, ئیتر بێ ئەوەی گوێ بدەنە راستی و هێزی فەرمودەکە, یان ئاوڕ بدەنەوە لە فەرمودەی تر کە پێچەوانەی ئەوە و دژە لەگەڵیدا، یا ئەو رووداوە هەڵسەنگێنن و بزانن شتی وا مومکینە یان نا، ئایا لە کەسایەتی پەیامبەر ﷺدەوەشێتەوە یان نا، ئەوان لەبەر ئەوەی مەبەستیان لەکەدارکردنی پەیامبەر ﷺبووە بە هەر نرخێك بووبێت، هەموو بنەمایەکی زانستیی و لۆژیکییان پشت گوێ خستووە و دەستیان بەهەرچی فەرمودە و گێڕاوەی لاواز هەیە گرتووە کە خزمەتی بە مەبەستەکەیانی کردبێت و پشتیان لە هەموو فەرمودەو گێڕاوەیەکی راست هەڵکردووە کە دژی مەبەستەکەیان بووبێت, ئەمەش نەزانێتیی و دەمارگیری و بێ ئینصافی ئەو لێکۆڵەرەوانە دەردەخات.

ئەوانەی لای خۆشمان کە قسەکانی ئەوان دەجونەوە لەوان بێ ئینصافتر و دەمارگیرتر و نەزانترن و بۆ مەبەستی زۆر نزم ئەو کارە دەکەن، بە هەرحاڵ ئەو ریوایەتەی کە ئەم جۆرە نووسەرانە پشتی پێ دەبەستن بە هەموو پێوەرێکی فەرمودە ناسی لاوازە و پشتی پێ نابەسترێ:

یەکەم: لە رووی زنجیرەی سەنەدەوە (ئەو کەسانەی کە گێڕاویانەتەوە) هەندێك لەوانە نەناسراون، هەندێکیان کەسی متمانەپێکراو نین و لاوازن, هەندێکیان درۆزنن و لە خۆیانەوە قسە هەڵدەبەستن و زانایانی فەرمودەش هەموویان کۆکن لە سەر لاوازی ئەم ریوایەتە[1]

دووەم : لەرووی (مەتن) واتە ناوەرۆکی فەرمودەکە: ئەو ریوایەتە لە رووی ناوەڕۆکەوە پێچەوانەی قورئان و عەقڵ و لۆژیك و مێژووە:

1ـ پێچەوانەی قورئانە، چونکە قورئان دەفەرموویت (**وتخفي في نفسك مالله مبديه**). واتە: شتێك دەشاریتەوە لە دڵی خۆتدا کە خوا دەریدەخات, ئاشکراشە کە خوا ئەوەی دەرخست کە پێی وترابوو زەینەب دەبێت بە خێزانی تۆ، بەڵام پەیامبەر ﷺدەیشاردەوەو دەری نەدەخست، لەبەر ئەوەی خوا حەزکردنی پەیامبەری ﷺلە زەینەب دەرنەخست کەواتە شتی وا رووی نەداوە.

2ـ دژە لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا لەوەی کە ئەو کەسەی ئەو بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە ناڵێ لە کێم بیستوە یان کێ لەگەڵ پەیامبەر ﷺبووە لەو کاتەی چووە بۆ ماڵی زەید.

[1] بروانە کتێبی نەزانی و بێ شەرمی, عومەر کەماڵ دەروێش ل 238 - 240 هەروەها تەفسیری بەغەوی و ابن کثیر و هتد

ئاشکرایە کە پەیامبەر ﷺ خۆی باسی نە کردووەو زەیدیش باسی ناکات، زەینەبیش باسی ناکات, قورئانیش باسی نەکردووە, ئیتر ئەوەی ئەو بەسەرهاتەی گێڕایەوە لە کوێوەی بیست, ریواتەکە دەڵێت پەیامبەر ﷺ لەبەر خۆیەوە وتی: (سبحان مقلب القلوب)، بەڵام ناڵێت کێی لەگەڵدا بوو، یا کێ ئەو قسەیەی لێ بیست.

پەیامبەر ﷺ بە شایەتیی هەموو خاوەن ئینصافەکان خاوەن کەسایەتییەکی زۆر دروستو دامەرزاو بوو، هیچ جۆرە حاڵەتێکی ناسروشتیی لێوە نەبینراوە. ئاشکراشە کە بە لای کەسی دروست و سروشتییەوە تەماع کردنە ژنی کوڕ هەرگیز روو نادات, لەوانەیە لە کەسانێکدا کە باری دەرونییان تەواو نەبێت یان کەسایەتییان ناسروشتی و نەشاز بێت, بەڵام بەنیسبەت کەسێکی وەکو پەیامبەرەوە ﷺ کە لە رادەبەدەر سروشتی و ئاسایی بووە هەرگیز شتی وا روو نادات با یاسای بە کوڕ گرتنیش سڕا بێتەوە.

ئێمە لە ژیانی رۆژانەدا دەبینین زۆر جار رێك دەکەوێت کوڕ و کچێك بە یەکەوە گەورە دەبن لە ئەنجامدا دڵیان بۆ یەك لێنادات، چونکە وەکو برا و خوشك تەماشای یەکتریان کردووە، ئەمەش (ماوەیەك وەکو بووك تەماشاکردنی زەینەب) یەکێك بووە لەو هۆیانەی کە وای کردووە لە پەیامبەر ﷺ ناڕەحەت بێت بەو زەواجە و باسی نەکات بە هیوای ئەوەی خوا لە سەری لاببات.

3ـ دژە لەگەڵ مێژوودا، چونکە وەکو لەمەوبەریش باسمان کرد گەر شتێکی وا رووی بدایە خەڵکی باسیان دەکرد و دووڕووەکان و غەرەزدارەکان گەورەیان دەکرد و قاویان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد, بەڵام دەبینی مێژوو تەنها ئەوەمان بۆ بلس دەکات کە خەڵکیی رەخنەی ئەوەیان لێگرتووە کە ژنی کوڕی خۆی خواستووە.

4ـ ئەگەر راست بێت زەید لەبەر ئەوەی زانیوەیەتی پەیامبەر ﷺ دڵی چووە لە زەینەب ئەوی تەڵاق داوە چۆن لە خزمەتی پەیامبەردا ﷺ دەمایەوە، یا چۆن گلەیی لێنەدەکردو دڵی لێی نەدەئێشا و پێوەی دەرنەدەکەوت؟ ئایا کەسێك لێپرسراوەکەی یان ئەو کەسەی کە تا دوێنێ وەکو باوکی خۆی تەماشای دەکرد دڵی بچێت لە ژنەکەی چ هەڵوێستێکی دەبێت؟ ئایا دەچێت ژنەکەی بۆ تەڵاق بدات؟ ئەگەر تەڵاقیشی دا لەوەودوا ئەو کەسە خواستی ئایا چاوی بەرایی دێنێ چیتر لە خزمەتی دا بمێنێتەوەو چاوی بە ژنەکەی خۆیدا هەڵبتەقێتەوەو ببینێ لای ئەو پیاوەیە کە تا دوێنێ باوکی بوو و دڵی چوو بە ژنەکەیداو لێی زەوت کرد.

5ـ ئەوەی کە هەموو مێژوونووسان لەسەری کۆکن ئەوەیە کە پەیامبەر ﷺ زەیدی نارد بۆ لای زەینەب بۆ ئەوەی خوازبێنی بۆ بکات, جا ئایا بەعەقڵەوە دەچێت پەیامبەر ﷺ لە ئەنجامی دڵچوونی لە زەینەب لەدەستی زەیدی بدات و دوایش هەر ئەو بنێرێت بۆئەوەی خوازبێنی بۆ بکات؟ پاشان ئەگەر وابێت زەید چۆن رازی دەبێت بچێت ئەو خوازبێنییەی بۆ بکات؟ ئەمە لەهیچ شوێنێکی دونیادا روویداوە تالای کەسێکی وەکو پەیامبەری ﷺ ناسراو بەژیری و دانایی و پیاوەتی و جوامێری رووبدات؟! مەگەر پیاو براوو پەیامبەر ﷺ بینێرێت بۆ خوازبێنی زەینەب زەیدی کۆنەمێردی نەبێت؟ ئەم ژنهێنانەی پەیامبەر ﷺ ئەگەر بەفەرمانی خوا نەبوایە نە ئەو تەکلیفی لە زەید دەکرد کە بڕوا بۆ ئەو خوازبێنییە، نە زەید قبوڵی دەکرد ئەو کارە بکات، چونکە ئەو کاتە تەنها یەك مانای هەڵدەگرت, ئەویش ئازاردانی دەروونی زەید و تەوهین پێ کردنی، بەڵام چونکە فەرمانی خوا بوو هیچ کەسێك بۆی نەبوو بێفەرمانی خوا بکات, نە پەیامبەر ﷺ خۆی، نە هیچ کەسێکی تر لە یارانی، هەر بۆ ئەوەی پەیامبەر ﷺ و زەیدیش ئەوە بسەلمێنن کە پابەندن بە فەرمانەکانی خواوە و لە ئاستی ویستەکانی خوادا هەست بە هیچ ناڕەحەتی و دڵەڕاوکێیەك ناکەن پەیامبەر ﷺ ئەو ئەرکەی خستە ئەستۆی زەید و ئەویش بەوپەڕی شانازی و رەزایەتەوە ئەو کارەی کرد.

6ـ ئاشکرایە کە رۆڵی عەقل و ژیریی بۆ ئەوەیە شتەکان هەڵسەنگێنێت و تاوتوێی بکات، ئینجا ئەوەیان کە لەگەڵ عەقڵ و لۆژیك و مێژوو و راستیدا دەگونجێت قبوڵ بکات و ئەوەیشی کە پێچەوانەی ئەوانەیە رەت بکاتەوە بە تایبەتی ئەگەر بێتو دوو شتی لەبەردەمدا بێت کە پێچەوانەی یەك بن, لێرەشدا دوو جۆر ریوایەتمان هەیە پێچەوانەی یەکن, یەکێکیان بە

هەموو پێوەرێك لەگەڵ عەقڵ و لۆژیك و مێژوو و قورئاندا ناگونجێت و دووەمیشان لەگەڵ هەموو ئەوانەدا كۆكە, ئیتر چۆن یەكەمیان وەردەگرین و دووەمیان رەت دەكەینەوە؟ بەداخەوە ئەوانەی ئەو ریوایەتەیان قبوڵ كردووە كە دەڵێت پەیامبەر ﷺ حەزی لە زەینەب كردووە ئەم هەڵە گەورەیەیان كردووە و عەقڵی خۆیان خستۆتە ئەو لاوە و تەنها دوای حەزی خۆیان كەوتوون و ئەو هەموو پێوەرەی سەرەوەیان پشت گوێ خستووە، ئەوان حەز دەكەن شتەكە وابێت بۆ ئەوەی پەیامبەر ﷺ لەكەدار بكەن بۆیە باوەڕ بەو ریوایەتانە دەكەن با پێچەوانەی ئەو هەموو پێوەرانەش بێت.[1]

7ـ زەینەب كچی پوری پەیامبەر ﷺ بوو، لەوەبەر بە بەردەوامی بینیویەتی، هەر خۆی داوای كروە بۆ زەید، لەوەش گرنگتر ئەوەیە كە زەینەب و كەسوكاری بەو زەواجە رازیی نەبوون، چونكە دەیانبینی زەید لە ئاستی زەینەبدا نییە, زەید كۆیلەیەكی ئازادكراوی بێكەسوكار, زەینەبیش كچی پوری پەیامبەر ﷺ و یەكێك لە ماڵە ناودارەكانی قورەیش, بۆیە ئەم زەواجەیان زۆر بە لاوە سەخت بوو، تەنها لەسەر فەرمانی خواو لەبەر دڵی پەیامبەر ﷺ ئەو كارەیان قبوڵ كرد،, ریوایەتەكانیش هەموو ئەوە دەسەلمێنن كە نێوانی زەینەب و زەید بەدرێژایی ماوەی ژن و مێردایەتییان باش نەبووە، زەید بەردەوام شكاتی زەینەبی كردووە لای پەیامبەر ﷺ, چونكە بەلای زەینەبەوە سەخت بوو زاڵ بێت بەسەر ئەو بەربەستە گەورەیەی لە نێوانیاندا هەبوو, زەیدیش وەكو هەموو پیاوێك كەژنەكەی خۆی لەو بە بەرزتر بزانێت ئەمەی پێ قبوڵ نەدەكراو پێی هەرس نەدەكرا بۆیە حەزی دەكرد لێی جیابێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی پەیامبەر ﷺ بۆی خواستبوو حەزی نەدەكرد لە خۆیەوە تەڵاقی بدات، چونكە ئەوە ئیحراج كردنی تێدا بوو بۆ پەیامبەر ﷺ بەرامبەر ئەو ماڵە و بەو كارە قسەی ئەوانی سوار دەكرد كە دەیانوت زەید لە ئاستی كچی ئێمەدا نییە، بۆیە دەیویست پەیامبەر ﷺ ئیزنی بدات بۆ تەڵاقدانی, پەیامبەریش ﷺ بەردەوام پێی دەوت لە خوابترسە و دەست بە ژنەكەتەوە بگرە، ئەم هۆیە زیاتر لەگەڵ واقیعدا دەگونجێت بۆ تەڵاقدانی زەینەب نەك ئەوەی كە دەڵێت زەید لەبەر دڵی پەیامبەر ﷺ زەینەبی تەڵاقدا، چونكە زانیویەتی پەیامبەر ﷺ دڵی چووە بە زەینەبدا.

8ـ ئەگەر بلێین پەیامبەر ﷺ دڵی چووە لە زەینەب ئەو كاتە دەبێ بلێین پەیامبەر ﷺ بۆیە بەزەیدی وتووە لە خوابترسە و دەست بە ژنەكەتەوە بگرە بۆ ئەوەی شوبهەی ئەوە لە دڵی زەید دوور بخاتەوە كە ئەو دڵی چووە بەژنەكەیدا، چونكە دڵچوون بە ژنی خەڵكیدا كارێكی نەشیاو و ناپەسەندە چ جای ژنی نزیكترین كەس، جا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە بە زەیدی وتووە لە خوا بترسە بۆ ئەوەی ئەو شوبهەیە لە خۆی دوورخاتەوە چۆن دەچێت دوای ئەوەی تەڵاقی دەدات دەیخوازێت؟ كەواتە تەنها ئەوەیان لەگەڵ سروشتی رووداوەكەو كەسایەتی پەیامبەردا ﷺ دەگونجێت كە پەیامبەر ﷺ دڵی بەزەینەبدا نەچووە و بە جددیی حەزی كردووە زەید دەست بە ژنەكەیەوە بگرێت بەڵكو لە ئەنجامی ئەوەدا خوا ئەو تەكلیفەی لە سەر لا بدات.

ئەمەش مانای ئەو قسەیەی عائیشەیە كە دەفەرموویت. ئەگەر پەیامبەر ﷺ شتێكی لە قورئان بشاردایەتەوە ئەم ئایەتەی دەشاردەوە كە دەفەرموویت: **(وَإِذ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً وَكَانَ أَمْرُ اللهِ مَفْعُولاً). (الأحزاب: 37 ).**

چونكە لەم ئایەتەدا بڕیاری خوا بۆ پەیامبەر ﷺ دابەزی كە دەبێ زەینەب بخوازێت و ئیتر پەیامبەر ﷺ چارەیەكی تر و رێگەیەكی تری نەما، ئەنجامدانی ئەو فەرمانە نەبێت.

ئەمە وەكو ئەوە وایە فەرمانبەرێك بە زارەكی لە لێپرسراوەكەی ببستێت كە پێی بلێت فلانە كەس بگوێزەرەوە، ئەویش حەز بەو كارە نەكات, بۆیە هەر دوای دەخات بە هیوای ئەوەی لێپرسراوەكەی ئارەزووەكەی بێنێتە جێ و لەبەر خاتری ئەو

---

[1] دوایی بە درێژ تر دێینە سەر ئەم خاڵە.

نەیگوێزێتەوە, بەڵام کە فەرمانی گواستنەوەی لە سەرەوە دەرچوو ئیتر ئەم بواری دواخستنی نامێنێت و نا چار یەکسەر فەرمانی گواستنەوەکەی لە لای خۆیەوە بۆ دەردەکات.

فەرمانی خواستنی زەینەب پێش دابەزینی ئەو ئایەتە نزیك بوو لەم نموونەیەوە، پەیامبەر ﷺ هەر بەتەمای ئەوە بوو کەخوا ئەو ئەرکەی لە سەر لاببات بۆیە بەزەیدی دەوت دەست بە ژنەکەتەوە بگرە, بەڵام کە ئایەتەکە دابەزی، ئیتر چارەیەکی نەما، جگە لە ئەنجامدانی ئەو کارە، بۆیە دەستبەجێ چووە لای زەینەب.[1]

9ـ ئەوەی شارەزای ژیانی پەیامبەر ﷺ و بۆنەکانی دابەزینی قورئان بێت دەزانێت کە زۆر شت هەبووە پەیامبەر ﷺ بە حوکمی ئەوەی مرۆڤ بووە حەزی لە هەندێك شت کردووە یان ویستوویەتی خۆی لە هەندێك شت بپارێزێت کەچی قورئان بە پێچەوانەی حەزو ویستی پەیامبەرەوە ﷺ دابەزیوە, بۆ نموونە حەزی کردووە (ئەبوتالیب)ی مامی باوەڕ بێنێت، بەڵام خوا پێی فەرمووە (**إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ**) واتە تۆ هیدایەتی کەسێك نادمیت کە خۆشت دەوێت یان حەزت لێیە هیدایەت وەربگرێت بەڵکو خوا هیدایەتی هەر کەسێك دەدات کە خۆی بیەوێت.

پەیامبەر ﷺ ڕۆژێك قسەی لەگەڵ سەرانی قورەیشدا دەکرد بە هیوای ئەوەی باوەڕی پێ بێنن، چونکە دەیزانی گەر ئەوان بڕوا بێنن هەموو خەڵکیی دوایان دەکەون, لەو کاتەدا پیاوێکی کوێر بە ناوی (ابن أم مکتوم) کە موسڵمان بوو هات بۆ لای پەیامبەر ﷺ و پێی وت ئەی پەیامبەر ﷺ فێرم بکە, پەیامبەریش ﷺ ئاوڕی لێنەدایەوە، چونکە مەبەستی بوو ئەو گەورە پیاوانە موسڵمان بن، خۆکابرای کوێرە چاویشی لێ نەبوو هەتاوەکو زویر بێت و پاشان ئەو موسڵمانە و دەتوانێ لە فرسەتێکی تردا فێری بکات، کەچی قورئان بە شێوەیەك دابەزی کە هەموو هەوڵەکان و ئاواتەکانی پەیامبەری هەڵوەشاندەوەو سوکایەتی بەو گەورە پیاوانە کردو زۆر بەبێ بایەخ باسی کردن و زۆریش لە پلەوپایەی ئەو کوێرەی بەرزکردەوە: "**عَبَسَ وَتَوَلَّى * أَن جَاءهُ الْأَعْمَى * وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى * أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ الذِّكْرَى * أَمَّا مَنِ اسْتَغْنَى * فَأَنتَ لَهُ تَصَدَّى * وَمَا عَلَيْكَ أَلاَّ يَزَّكَّى * وَأَمَّا مَن جَاءكَ يَسْعَى * وَهُوَ يَخْشَى * فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّى * كَلاَّ إِنَّهَا تَذْكِرَةٌ * فَمَن شَاء ذَكَرَهُ * فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ * مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ * بِأَيْدِي سَفَرَةٍ * كِرَامٍ بَرَرَةٍ**". (عبس: **1 ـ 16**)

لەم مەسەلەیەشدا (زەواجی زەینەب) پەیامبەر ﷺ زۆر لە قسەی خەڵکی دەترسا بەوەی کە بڵێن ژنی کوڕی خۆی خواستووە, بەڵام قورئان گوێی بەو ترسەی پەیامبەر ﷺ نەداو چۆن لەوێدا ڕوو وەرگێڕانەکەی لەو کوێرە ئاشکرا کرد, لێرەشدا ئەو ترسەی لە دڵیدا بوو بەرامبەر بە قسەی خەڵکیی خستیەدەر و گلەیی لێ کرد و پێی وت نەدەبوو لە قسەی خەڵکیی بترسایەی و دەبوایە بێ سێ و دوو فەرمانەکەی خوات جێبەجێ بکردایە.

10ـ وەکو وتمان زەینەب و کەسوکاری حەزیان بەو زەواجە نەدەکرد و زەیدیان بە هاوشانی خۆیان نەدەزانی، کاتێك پەیامبەر ﷺ چوو بۆ داخوازیی زەینەب، وایان دەزانی بۆ خۆیەتی، بۆیە زۆریان پێ خۆش بوو, جا ئەگەر پەیامبەر ﷺ بیویستایە بۆ خۆی بیخوازێ، هەر ئەو کاتە داوای دەکرد نەك دوای ئەوەی بۆ زەیدی بێنێ ئینجا دڵی بگۆڕێت.

11ـ ئەوانەی ئەو تۆمەتە دەدەنە پاڵ پەیامبەر ﷺ نایناسن و نازانن چ کەسایەتییەك بووە، نازانن چەند زاڵ بووە بەسەر نەفس و ئارەزووەکانیدا, نازانن خاوەنی چ ئیرادەیەکی پۆڵایین بووە, بۆیە داوا دەکەم لەو جۆرە کەسانە بچن ژیانی پەیامبەر بخوێننەوە بۆ ئەوەی باشتر بیناسن و بزانن چۆن کەسێك بووە, بە تایبەت ئەو کەسانەی کە گەنجن و بەرامبەر شەهوەت لاوازن و وا دەزانن هەموو کەسێك وەکو خۆیانە بۆ ئەوەی نموونەی بەرزی زاڵبوون بەسەر نەفس و نموونەی ئیرادەی بەهێز ببینن و لە ڕوانگەی خۆیانەوە بۆ دونیا نەڕوانن و وا نەزانن دونیا تەنها سێکسە، بە تایبەت بە نیسبەت ئەو گەورە پیاوانەی کە ڕووی مێژوویان گۆڕیوەو شوێن دەستیان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دیارە...

[1] دواتر بە درێژ ترباسی ئەم خاڵە دەکەین.

## حەقیقەت و حیكمەتەكانی زەواجی پەیامبەر ﷺ لە زەینەب

ئێستاش دوای ئەوەی پوچەڵی ئەو ریوایەت و راوبۆچونانەمان دەرخست كە دەڵێ پەیامبەر ﷺ حەزی لە زەینەب كردووە و لە ئەنجامی ئەوەدا زەید تەڵاقی داوە و سەلماندمان كە ئەو ریوایەتە ناكۆكە لەگەڵ قورئان و عەقڵ و لۆژیك و مێژوو و سروشت و كەسایەتی پەیامبەردا ﷺ, كاتی ئەوە هاتووە باسی حەقیقەتی ئەو زەواجەو حیكمەتەكانی بكەین, بەڵام با جارێ ریوایەتە راستەكە بێنینەوە ئینجا قسەی خۆمانی لە سەر بكەین:

سوفیانی كوڕی عویەینە دەفەرموویت: عەلی كوڕی زەیدی كوڕی جەدعان فەرمووی: ئیمام زین العابدین (عەلی كوڕی حوسەینی كوڕی عەلی كوڕی ئەبوتالب) پرسیاری لێكردم: حەسەن چی دەڵێیت دەربارەی ئەم ئایەتە **"وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ..."**؟ منیش وتم: حەسەن دەڵێت: كاتێ زەیدی كوڕی حاریسە هاتە خزمەت پەیامبەر ﷺ وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ دەمەوێت زەینەب تەڵاق بدەم، پەیامبەر ﷺ لە دڵەوە پێی خۆش بوو، بەڵام پێی فەرموو: دەست بە ژنەكەتەوە بگرەو لە خوا بترسە.

زین العابدین فەرمووی: نەخێر بەو جۆرە نییە, بەڵكو بەم جۆرە بووە: خوا پەیامبەری ئاگادار كردەوە كە زەینەب دەبێتە هاوسەرت و زەید تەڵاقی دەدات, كاتێك زەید هات بۆ لای پەیامبەر ﷺ و وتی دەمەوێ تەڵاقی بدەم، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ژنەكەت راگرە. بەهۆی ئەوەوە خوا سەرزەنشتی كردو فەرمووی بۆچی بەزەید دەڵێیت دەست بگرە بە ژنەكەتەوە لە كاتێكدا كە من ئاگادارم كردووی كە دەبێ بە هاوسەری تۆ.[1]

ئیمامی بەغەوی دەڵێت: ئەمەش شیاوترە بۆ پەیامبەران و گونجاوترە لەگەڵ مانای ئایەتەكەدا, چونكە خوا رایگەیاند كە ئەوەی پەیامبەر ﷺ شاردویەتەوە و دەری نەخستووە خۆی دەریدەخات, ئاشكراشە كە خوا جگە لە فەرمانی خواستنی زەینەب هیچی تری دەرنەخست و فەرمووی (زوجناكها) واتە دامان بە تۆ (یا مارەمان كرد لە تۆ) جا ئەگەر ئەو شتەی پەیامبەر ﷺ شاردبییەوە خۆشەویستی زەینەب بووایە یان حەزی پەیامبەر ﷺ بوایە لەوەی كە زەید زینەب تەڵاق بدات خوا ئەمەیانی دەردەخست, چونكە نابێ خوا هەواڵی دەرخستنی شتێك بداتو دوایی بیشارێتەوەو دەرینەخات, ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پەیامبەر ﷺ گلەیی لە سەر شاردنەوەی ئەوە لێكرا كە خوا پێی راگەیاندبوو كە زەینەب دەبێت بە هاوسەری ئەو، بەڵام ئەو شەرمی لە زەید كرد پێی بڵێت تەڵاقی بدە، چونكە خوا پێی راگەیاندووم كە ئەو ژنەی تۆ دەبێت بە خێزانی من. ئەم ریوایەتە لە رووی سەنەدو مەتن (ناوەڕۆك)ەوە لەوەی یەكەم راسترە: لە رووی سەنەدەوە ریوایەتی یەكەم بە چوار رێگا رەت دەكرێتەوە:

1ـ ریوایەتێكی مورسەلە, واتە صەحابی نەیگێراوەتەوە، بەڵكو تابعی (ئەوانەی پەیامبەریان نەبینیوەو دوای صەحابە هاتوون) دەیگێڕێتەوە.

2ـ عبدالله بن عامر لە سەنەدەكەدایە كە لاوازەو (**ضعيف الحديث**) و فەرمودەی لاواز دەگێڕێتەوە.

3ـ واقدی (**متروك الحديث**)ە واتە فەرمودەی لێوەر ناگیرێت.

4-ڕیوایەتی دووەم راستەوخۆ و هەر لەو سەردەمەدا هەڵەی ریوایەتی یەكەمی خستۆتەڕوو[2] و شتەكەی باسكردووە.

لە رووی ناوەڕەكیشەوە: ریوایەتی دووەم گونجاوتر و كۆكترە لەگەڵ قورئان و عەقڵ و لۆژیك و مێژوودا.

بە پێچەوانەی ریوایەتی یەكەمەوە كە وەكو لەوەبەر سەلماندمان لەگەڵ هیچ كام لەوانەی سەرەوەدا كۆك نییە. شایانی باسە ئەوەی ریوایەتی یەكەمی رەت كردۆتەوە كچەزای پەیامبەرە ﷺ, واتە كەسێكە نزیكە لە ماڵی پەیامبەرەوە ﷺ و لە نزیكەوە ئاگای لە شتەكانە.

[1] تفسیر البغوي (معالم التنويل) لە تەفسیری ئایەتەكەدا.

[2] مەبەست لە ریوایەتی یەكەم ئەوەیە كە دەڵێت پەیامبەر دڵی چوو بە زەینەبدا و حەزی لێكرد.

لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەوەیە کە ڕووداوەکە بە ڕیوایەتی یەکەم خاڵییە لە هەموو دانایی و کەڵکێك، بەڵام بەڕیوایەتی دووەم پڕە لە کەڵك و دانایی, نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لە ڕیوایەتی یەکەم جێی تانەیە لە پەیامبەر ﷺ، بەڵام بەڕیوایەتی دووەم بەڵگەی پەیامبەرێتی ئەوە، ئەوەی شارازای قورئان بێت و پەیامبەر ﷺبناسێت تەنانەت ئەگەر باوەڕی بەخواش نەبێت و خواناسیش نەبێت هەر دەزانێت کە هەموو فەرمانەکانی قورئان و هەموو ڕەفتارەکانی پەیامبەر ﷺپڕ بوون لە دانایی و نە قورئان فەرمانی بە شتی نەشیاو داوە وەنە پەیامبەر ﷺخۆی کردویەتی.

وەکو ئاشکرایە زەید کۆیلەی خەدیجە بوو, کاتێك مێردی بە (موحەممەد) کرد زەیدی پێبەخشی ئەویش ئازادی کردو کردی بە کوڕی خۆی و لە سەر دابونەریتی ئەوکاتەی عەرەب جاڕی دا کە زەید کوڕی ئەوە و ئیتر لەوەدوا هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرا, ئەوەندەش خۆشەویستیی موحەممەد (سەلامی خوای لێ بێت) چوو بوو بە دڵی زەیددا کە لای ئەوی لە هی باوك و کەسوکاری پێ خۆشتر بوو.

تەنها ئەم ڕووداوە بەسە بۆ ناسینی پەیامبەر ﷺ: کەسێك دوای چەندین ساڵ لە کۆیلایەتی و پاشان لە غەریبی و بێکەسی, باوك و مامی بێن بە دوایدا بۆ ئەوەی بیبەنەوە بۆ نیشتمان و بۆ ناو کەسوکار ئینجا ئامادە نەبێت بچێت لەگەڵیاندا و بیەوێت لای پەیامبەر ﷺبمێنێتەوە و لای ئەوی پێخۆشتر بێت لە لای کەسوکار و نیشتمان, ئایا ئەمە گەورەترین بەڵگە نییە لە سەر ڕەوشتبەرزی پەیامبەر ﷺو لە خۆشەویستی نێوان ئەو و زەید؟ بەو مەرجەی کە جیابوونەوەی زەید لە کەسوکاری لەبەر کێشە و ناکۆکی نەبووە و بە دڵئێشاوی بەجێی نەهێشتوون تاوەکو ڕازیی نەبێت ئاشتی بێتەوەو بچێتەوە بۆ ناو کەسوکار، بەڵکو لە ئەنجامی هێرشێکدا بۆ سەر تیرەکەیان بەدیل دەگیرێت و دەبرێت بۆ بازاڕی عوکاز, لەوێ (حکیم بن خزام) کە برازای خەدیجە بوو. دەیکرێت, ئەویش دەیبەخشێتە خەدیجەی پوری.

پەیامبەر ﷺدەیویست ئەو کۆیلانەی ئازاد کراون بەرز کاتەوە بۆ ئاستی ئازادەکان و پاشماوەی کۆیلایەتی لە دەرونیاندا بسڕێتەوە, بۆیە چوو بۆ داخوازیی زەینەبی پورزای کە ئافرەتێکی ئازادی خاوەن پلەوپایە بوو بۆ زەید.

پەیامبەر ﷺعادەتێکی هەبوو لەو کارانەی کە فیداکاری دەویست خزمانی خۆی پێش دەخست.

یەکەم: لەبەر ئەوەی باوەڕ و قەناعەتی تەواوی بە ڕاستی ئەو شتانە هەبوو کە بە خەڵکی ڕادەگەیاند.

دووەم: بۆ ئەوەی خەڵکی نەڵێن شتە باشەکان بۆ خزمانی خۆی دادەنێت و شتە خراپەکانیش بە سەر خەڵکیدا دەدات. بۆ نموونە: لە کاتی کۆچکردنیدا بۆ مەدینە عەلی ئامۆزای لە جێگاکەی خۆیدا بەجێهێشت بۆ گێڕانەوەی ئەمانەتەکان, هەرچەند ئەو کارە پڕ بوو لە مەترسی.

لە شەڕی بەدریشدا کاتێك (3) پاڵەوانی قوڕەیش هاتنە ناو گۆڕەپانی شەڕەوە و داوای (3) کەسیان کرد لە موسڵمانان دابەزن بۆ زۆرانبازییان, پەیامبەر ﷺحەمزەی مامی و عەلی ئامۆزای و ئەبو عوبەیدەی کوڕی حاریسی ئامۆزای بۆ ناردن، کاتێك نوێنەری گاورەکانی نەجران هاتن بۆ لای پەیامبەر ﷺو گفتوگۆیان لەگەڵدا کرد خوا پێی فەرموو موباهەلەیان لەگەڵدا بکات(**فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ**) (**آل عمران: 61**). واتە: هەرکەسێك دوای ئەو زانیارییەی بۆت هاتووە موجادەلەی کردی دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بڵێ وەرن بانگی منداڵەکانمان و ژنەکانمان و پیاوەکانمان بکەین و هەمووماں پێکەوە ڕوو بکەینە خوا و بڵێین: خوایە ئەوەمان کە درۆزنە بەر نەفرەتی خۆتی بخەیت.

لێرەشدا کاتێك پەیامبەر ﷺویستی ژن بۆ زەید بێنێت چوو داوای زەینەبی پورزای بۆ کرد, ئەویش یەکەم بۆ ئەوەی کە ڕاستیی خۆشەویستی خۆی بۆ زەید دەربخات و پاداشتی ئەو هەڵوێستەی زەیدی پێ بداتەوە کە ئەوی هەڵبژارد بە سەر کەسوکارەکەیدا, دووەمیش ئەگەر داوای کچی کەسێکی بێگانەی بۆ بکردایە لەوانەیە بیانگوتایە ئەگەر ڕاستە بە کوڕی خۆی دەزانێت و بەئازادی دەزانێت بۆچی خزمێکی خۆی بۆ ناهێنێت، ئەوە بوو دوای ئەوە خوا نەریتی بە کوڕگرتنی حەرام

کردوفەرمووی: نابێ کوڕی کەس بکەن بە کوڕی خۆتان و هەموو کەسێك بە ناوی باوکیەوە بانگ بکەن, ئەگەر باوکیشانتان نەناسی ئەوا برای دینی و دۆستتانن (**فان لم تعلموا اباءهم فاخوانكم في الدين و مواليكم**). بەوەش هەرچی ئەحکامی (تبنّي) هەیە دەبێ بسڕێتەوە, لە میراتگرتنی یەك و مەحرەمی بۆ یەکتر و حەرامی هێنانی ژنی ئەو کوڕە لە لایەن ئەو پیاوەی کردوبوی بە کوڕی خۆی ئەگەر ئەو کوڕە مرد یان ژنەکەی تەلاقدا... هتد.

سڕینەوەی ئاوها دابونەریتێکیش و نەهێشتنی شوێنەوارەکانی کە بە تەواوی رەگ و ریشەی داکوتا بوو لە ناو کۆمەلگەی عەرەبیدا پێویستی بە هەنگاوێکی کردەوەیی گەورە دەکرد لە پاڵ لایەنە تێورییەکەدا, ئەو هەنگاوەش بە پەیامبەر ﷺ خۆی نەنرایە بە هیچ کەسێکی تر نەدەنرا, لەوانەیە کەسێکی تر جورئەتی ئەوەی نەکردایە ئاوها کارێك بکات و خۆی بخاتە بەر تەوژمی تانە و قسەی خەڵکیی, هەر وەکو چۆن لە رووداوی ئیفك دا تا بوختانەکە بۆ خێزانی پەیامبەر ﷺ هەڵنەبەسترا گرنگی و دانایی لە مەرجکردنی شایەتی چوار کەس بۆ سەپاندنی ئەو تۆمەتە بە سەر کەسێکەوە نەزانرا, لێرەشدا بە هەمان شێوە ئەگەر پەیامبەر ﷺ خۆی بەو کارە هەڵنەستایە لە ریشەکێشانی ئاوها دابونەریتێك وا ئاسان نەبوو. ئەم راستییەش لە ئایەتەکەدا زۆر بە روونی بەدیدەکرێت (.. **لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً..**). واتە: بۆ ئەوەی بڕواداران هەست بە هیچ نارەحەتییەك نەکەن لە هێنانی ژنی ئەو کەسانەی کردبوونیان بە کوڕی خۆیان دوای جیابوونەوەیان لەیەك.

هەرکەسێك لە ناو خەلکی عەشایەردا ژیابێت دەزانێت گۆڕینی هەندێك دابونەریت چەند قورسەو چ ئەرکێکی گەورەی دەوێت بە تایبەت ئەگەر بێتو ئەو شتەی دەتەوێت لە جێی ئەو نەریتە دایبنێی لەبەر چاوی خەلکیدا شتێکی ناپەسەند و ناشیرین بێت، یان بەرژەوەندیی کۆمەڵێکی دەستڕۆیشتووی ناو کۆمەلگەی پێ لەق بێت، لێرەوە بوو پەیامبەر ﷺ ئاواتی دەخواست کە خوا ئەو تەکلیفەی لەسەر لاببات، پێدەچێ فەرمانی سەربڕینی ئیسماعیل لەلایەن باوکیەوە چەند قورس بوو لەسەر دڵی باوکی، فەرمانی خواستنی زەینەب ئەوەندە قورس بووبێت لەسەر پەیامبەر ﷺ، بۆ تێگەیشتنی ئەم راستییەش دەبێ یەکەم هەوڵ بدەیت بچیتە ئەو سەردەمە و سەرعەقڵیەتی خەلکی ئەو سەردەمە و خۆت بخەیتە جێگەی پەیامبەر ﷺ، ئینجا دەزانی ئەو مەسەلەیە چەند قورس بووە بە لایەوە، یەکێك لە ئێمە ئەگەر برایەکی ژنەکەی تەلاق بدات رووی نایە و دڵی نایەت بیخوازێت لە کاتێکدا کە لەڕووی شەرعەوە هیچی تێدانییە و لە رووی کۆمەلایەتیشەوە ئەو کەسە ناکەوێتە بەر لۆمە و تانەی خەلکیی تەنها ئەوە هەیە کە بۆ پەیوەندیی نێوان برایەتی و خزمایەتی کەمێك ناخۆشە، بەلام بەنسبەت زەواجی پەیامبەر ﷺ لە زەینەبەوە یەکەم تا ئەو ساتەوەختە بە حوکمی عورف حەرام بوو، لە ناو کۆمەلگەدا شتێکی زۆر ناشیرین بوو، لەو لاشەوە زەید یەکێك بوو لە خۆشەویستترین هاوەلانی پەیامبەر ﷺ، پەیامبەر ﷺ ئەوەندە خۆشی دەویست کە نەك هەر خۆی بەلکو ئوسامەی کوڕیشی زۆر خۆش دەویست و پێیان دەوت "الحب ابن الحب" واتە خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست و تا دوێنێ بە کوڕی پەیامبەر ﷺ ناسرابوو, کەواتە ئەم زەواجە ئەگەر چی لە رووی شەرعییەوە حەلال کرا، بەلام هێشتا لەرووی کۆمەلایەتییەوە کەس ئەنجامی نەدابوو, لەولاشەوە خۆشەویستی و تێکەلی نێوان پەیامبەر ﷺ و زەیدیش بوەستێت کە وەکو وتمان لە رادەبەدەر بوو.

پەیامبەر ﷺ کەسێکی ئاسایی نەبوو هەتاوەکو گوێی لە قسەی خەلکیی نەبێت, بەلای ئەوەوە کە هەلگری پەیامێك بوو بۆ خەلکی، لە لایەن خواوە تەکلیفی لێکرابوو بانگی خەلکیی بکات بۆ سەر ئەو رێبازە, زۆر مەبەستی بوو ناوو شوهرەتی خۆی بپارێزێت لە هەر شتێك لەکەداری بکات، ئەو جۆرە زەواجە نەك لە سەر پەیامبەر ﷺ، بەلکو لە سەر دڵی سادەترین کەس قورس بوو چ جای پەیامبەرێك ﷺ کە بەشێکی زۆری بانگەوازەکەی وابەستە بوو بە شوهرەت و کەسایەتی خۆیەوە.

ئەگەر خەڵكانی تر لەبەر شەهوەت و دەسكەوتی ماددیی گوێیان لە ناوزڕان نەبێت, پەیامبەر ﷺ نەك لەبەر ژنێك، بەڵكو لەبەر هەموو ئافرەتانی دونیا ئامادە نەبوو ناوی خۆی بزڕێنێت، لێرەوە دەڵێین ئەگەر خواستنی زەینەب بە دەستی خۆی بووایە هەرگیز كارێكی لەو جۆرەی نەدەكرد، بەڵام خوا فەرمانی پێدا ئیتر چارەیەكی تری نەما گوێڕایەڵیی نەبێت.

لە كۆتاییدا دەڵێین: وەكو هێنانی زەینەب بۆ زەید سڕینەوەی شوێنەواری كۆیلایەتی بوو لە دەروونی كۆیلە ئازادكراوەكاندا و بۆ دەرخستنی خۆشەویستی پەیامبەر ﷺ بوو بۆ زەید و وەكو پاداشتێك بوو بۆی لەبەرامبەر ئەو هەڵوێستەی نواندی كاتێك كەسوكاری هاتن بە دوایدا و ئەو پەیامبەری ﷺ هەڵبژارد و رازی نەبوو بگەڕێتەوە ناو كەسوكاری خۆی و نیشتمانی خۆی, هەروەها خواستنی زەینەب لەلایەن پەیامبەرەوە ﷺ دوای ئەوەی زەید تەڵاقی دا یەكەم بۆ لە ریشە دەرهێنانی سیستمی بە منداڵی خۆكردنی منداڵی خەڵكی و سڕینەوەی دەرئەنجامەكانی لە میراتگرتن و نامەحرەم بوون بە یەك و هتد، دووەمیش وەكو پاداشتێك بۆ زەینەب لەبەرامبەر ئەو فیداكارییەی كردی لەبەر خاتری پەیامبەر ﷺ بەوەی كە رازیی بوو شوو بكات بە كەسێك كە زۆر لە خوار خۆیەوە دەبینی لە رووی كۆمەڵایەتییەوە. لێرەوە دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین كە ئەم رووداوە لە یەكەم ئەڵقەیەوە كە پەیامبەر ﷺ زەید دەكات بەكوڕی خۆی و بە تێپەڕبوون بە خواستنی زەینەب لە لایەن زەیدەوە و پاشان تەڵاقدانی تا دوا ئەڵقەی كە خواستنی زەینەبە لەلایەن پەیامبەرەوە ﷺ هەموو نەخشەو تەقدیرێكی خوایی بوو بۆ بەدەستهێنانی چەندین مەبەستی تەشریعی و كۆمەڵایەتی، هەموو ئەم مەبەستانەش ئایەتەكانی قورئان لە سورەتی ئەحزابدا بە روونی باسی دەكەن.

## نەزانییەكانی نووسەر

پێش ئەوەی بچینە باسی یەكێكی تر لە ژنەكانی پەیامبەر ﷺ بە پێویستی دەزانم هەڵەو نەزانییەكانی نووسەر لەم بابەتەدا بخەمەڕوو:

1- لە باسی ئایەتی (**ما جَعَلَ الله لِرَجُلٍ من قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ**) (**الأحزاب: 4**)دا دەڵێت:

ئایەتێكی لەم چەشنە دەمانباتە نێو چیرۆكێكی پڕ لە سەرسورهێنەری سێكسییەوە, كە هەرگیز ئیسلامییەكانی ئەمڕۆ چاوەڕێی ریوایەتێكی لەم شێوەیە و رەفتارێكی ئاوهایان نەكردووە لە پەیامبەر ﷺ بوەشێتەوە.[1]

من لێرەدا راڤەی ئایەتەكەتان بۆ دەكەم بۆ ئەوەی بزانین كام چیرۆكی سێكسی لەم ئایەتەدا یا لەو ریوایەتانەی لە سەر ئەم ئایەتە هاتوون بەدی دەكرێت: خوا دەفەرموویت "خوا دوودڵی لە هەناوی كەسدا دروست نەكردووە, ئەو ژنانەشتان بەوە نابن بەدایكتان گەر ئێوە پێیان بڵێن وەكو دایكمانن، ئەو منداڵانەی منداڵی خۆتان نین و كردوتانن بەمنداڵی خۆتان ئەوانە منداڵی ئێوە نین, ئەوە قسەیەكە بە زار دەیڵێن : واتە شتێكی ناڕەوایەو و خوا قسەی رەوادەكات و رێی راست بە مرۆڤ نیشان دەدات.

كام وێنەی سێكیسی لەم ئایەتەدا بەدی دەكرێت؟

كۆمەڵێك ریوایەتیش باسكراوە لەهۆی دابەزینی ئەم ئایەتە لێرەدا بواری هێنانەوەی هەموویان نییە, خوێنەر خۆی دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ تەفسیرەكانی گبری و ابن كپیر و قرگبی وبیانخوێنێتەوە.

یەكێك لەو ریوایەتانە دەڵێت مەبەستی ئایەتەكە كە دەڵێت: "**وماجعل ادعیاءكم ابناءكم**" زەیدی كوڕی حاریپە یە كە پەیامبەر ﷺ كردبوویە كوڕی خۆی و خوا ئەو نەریتەی لە سەر موسڵمانان حەرام كرد بە پەیامبەریشەوە ﷺ. ئەم ریوایەتە چ چیرۆكێكی سێكیسی تێدایە كە ئیسلامییەكان چاوەڕێی ریوایەتێكی لەم شێوەیەیان نەكردبێ؟ پێدەچێ نووسەر وابزانێت ئەم شتانەی كە بەلای خۆیەوە تازەیە بە لای موسڵمانانیشەوە تازەیە: ئەمەش نەزانی و بێئاگایی ئەو دەردەخات. با نووسەر دڵنیابكەمەوە كە هیچ موسڵمانێك نییە لەوانەی كە باوەڕیان بە خواو پەیامبەر ﷺ هەیە سەیریان لەم ریوایەتانە بێت و بە شتێكی نائاسایی تەماشای بكەن و شەرمی لێبكەن، بەڵكو وەكو لەوەوبەر باسمان كرد ئەوە تەشریعێكە پڕ لە دانایی.

2- دەڵێت: هەموو موفەسیرەكان هاوڕان لەسەر ئەوەی ئەم ئایەتە لەسەر زەیدی مێردی زەینەب نازڵ بووە.

حوكمی ئەم ئایەتە گشتییەو هەموو حاڵەتێك دەگرێتەوە نەك تەنها زەیدی كوڕی حاریسە با لەو كاتەشدا بەبۆنەی ئەوەوە دابەزێنێت، دوو نەریتی ئەو كاتەی قەدەغە كرووە، یەكەم ژن لە خۆ حەرام كردن تەنها لەبەر ئەوەی ئەو پیاو دەڵێت تۆ وەكو دایكمی، بە منداڵی خۆ كردنی منداڵی خەڵكی.

سەرەتای ئایەتەكەش زەمینە سازییە بۆ ئەم دوو حوكمە ئەویش بەوەی كە مرۆڤ یەك دایكی هەیەو كەسی تر جێی دایكی ناگرێتەوە و منداڵی خەڵكیش جێی منداڵی خۆی ناگرێتەوە.

ئایەتەكە زۆر لەوە قوڵترە كە هەندێك لە موفسیرەكان دەڵێن بە بۆنەی فلان یان فیسارەوە دابەزیوە.

3ـ زەید لە كاروان بەجێ نەماوە، بەڵكو وەكو لەوەوبەر باسمان كرد، لە شەڕدا بە دیل گیراوەو كراوە بە كۆیلەو فرۆشراوە بە حەكیم بن حوزام و ئەویش پێشكەشی كردووەو بە خەدیجەی پوری، خەدیجەش دەیبەخشێتە پەیامبەر ﷺ كاتێك كەسوكاری هەواڵی دەبیستن دێن بیبەنەوە پەیامبەر ﷺ سەرپشكی دەكات لە نێوان خۆیو كەسوكاریدا، ئەویش كۆیلایەتی لای پێغەمبەر ﷺ هەڵدەبژێرێ بەسەر ئازادی ناو كەسوكاردا، پەیامبەریش ﷺ لە پاداشتی ئەوەدا ئازادی

---

[1] ل183

دەکاتو دەیکاتە کوڕی خۆیو جاڕی بۆ دەدات و پاشان زەینەبی پورزاشی بۆ دەخوازێتو دواتریش دەیکاتە فەرماندەی یەکێك لە لەشکرەکانی شەڕی موئتە کە لەوێ شەهید دەکرێت.

4ـ ئەو ریوایەتەی کە لە عائیشەوە دەگێڕرێتەوە لە رووی ناوەڕۆك (متن) و سەنەدەوە هەڵە و هەڵبەستراوە، لە رووی ناوەڕۆکەوە:

یەکەم: کاتێك زەید کۆچی کرد بۆ مەدینە پەیامبەر ﷺ هێشتا عائیشەی نەخواستبوو، چونکە پەیامبەر دوای ساڵ و نیوێك لە کۆچکردن بۆ مەدینە عائیشەی خواست، بەڵام زەید هەر لەو کاتەی موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە کۆچی کرد، بەمەدا دەردەکەوێت کە ئەو ریوایەتەی کە دەڵێت: عائیشە دەڵێت: کاتێك زەیدی کوڕی حاریسە لە مەککەوە هات بۆ مەدینە پەیامبەر ﷺ لە ماڵەکەی مندا بوو, لە دەرگایداو پەیامبەر ﷺ بە رووتی چوو بە دەمیەوە, سوێند بە خوا نە لەوەوبەرو نە لەوەدوا پەیامبەرم ﷺ بە رووتی نەبینی, دەستی کردە ملی و ماچی کرد.

تەنها ئەم خاڵەش بەسە بۆ رەتکردنەوەی ئاوها ریوایەتێك.

دووەم: لە سەر زمانی عائیشە دەڵێت: سوێند بە خوا نە لەوەبەر و نە لەوەدوا پەیامبەرم ﷺ بە رووتی نەبینی, ئەمیش دیارە کە درۆیە، چونکە پێچەوانەی چەند رێوایەتێکی راستی ترە کە دەفەرموویت لەگەڵ پەیامبەردا ﷺ لە یەك تەشتی ئاودا خۆمان شۆردووە, ئاشکراشە کە پیاو بە رووتی لە حەمامدا خۆی دەشوات, ئەمەش شتێکی ئاساییە کە ژن و مێرد لە حەمامدا بە یەکەوە خۆیان بشۆن.

سێهەم: هەموو یارانی پەیامبەر ﷺ و ژنانی پەیامبەر ﷺ شایەتی لە سەر ئەوە دەدەن کە پەیامبەر ﷺ کەسێکی زۆر شەرمن و بە حەیا بووە و لە کچێك کە تازە گوێزرابێتەوە بە شەرمتر بووە, (**كأن أشد حياء من العذراء في خدرها**), ئیتر چۆن بە رووتی دەچێ بەدەم میوانەوە، لە رووی رشتەشەوە (سند): ئەلبانی دەڵێت: صغیف **جداء** واتە زۆر لاوازە / **ضعيف الترمذي رقم 516 للالباني**.

5- رووداوێك باس دەکات لە ل184و ئاماژە بۆ رافەی ئایەتی (4)ی سورەی ئەحزاب دەدات لە هەموو تەفسیرەکاندا، یەکەم: ئەم گێڕانەوەیە **لة طبرى و ابن كثير و قرطبى و** بەغەوی **و شوکانی و( في ظلال )دا** کە لەبەر دەستمدان نییە. ئیتر نازانم لە کوێی هێناوەو چۆن جورئەت دەکات و دەڵێت بڕوانە هەموو راەکان

دووەم ئەریوایەتەکەی زۆر بە بزرکاوی گێڕاوەتەوە, دەڵێت: **ام كلسوم بنت عقبة بن معيط (رضي الله عنه),(كانت أول من هاجر من النساء يعني بعد صلح الحديبية, فوهبت نفسها للبنى ﷺ فقال قد قبلت فزوجها زيد بن حارثة.**

یەکەم شت سەرنج دەدرێت لێرەدا ئەوەیە کە ناوی ئەو کەسەی نەهێناوە کە روداوەکەی گێڕاوەتەوە.

دووەم شت ئەوەیە کە بە ئوم کەلسوم دەڵێت (**رضي الله عنها**) واتە نازانێت لە عەرەبیدا بە ژن دەوترێت (عنها) نەك(عنه)

سێهەم: رەخنە لەوە دەگرێت کە پەیامبەر ﷺ ئەم ژنەی مارەکردووە لە زەید, دەڵێت:

لێرەدا ئەوەمان وەبیردێتەوە کە ژن وەکو ئینسانێك بیری لە ئارەزووەکانی خۆی کردۆتەوە، بەڵام خوا و پەیامبەرەکەی ئارەزوەکەیان پێشێلکردووە و وەك کوتاڵ تەماشایان کردووە و بەبێ پرسی خۆی پێشکەشی کەسانی دیکەیان کردووە!!

ئێمەش دەپرسین:

1ـ بەچیدا دەزانیت کە بەبێ پرسی خۆی دراوەتە زەید؟ یان بە چیدا دەزانیت کە ناڕازیی بووە بە زەید؟

2ـ ئەمە ئەوە دەردەخات کە ژن قسەی هەبووە لە چارەنوسی خۆیدا بۆیە چووە بۆ لای پەیامبەر ﷺ و خۆی پێشکەش کردووە , ئافرەت بەمە بەسوك تەماشانەکراوە بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی خۆمانەوە کە ئەگەر ئافرەتێك شتێکی وابکات بەو پەڕی سووکییەوە تەماشای دەکرێت.

واتە کۆمەڵگەی ئەو کاتەی پەیامبەر ﷺ زۆر لە کۆمەڵگەی کوردەواری ئێستای خۆمان کراوەترو واقعیتر رووانیویەتە ژن و ژنخواستن.

3ـ وەکو ژن ئازاد بووە لە هەڵبژاردنی کەسێکدا کە شوی پێ دەکات ئەبێ پیاویش ئازاد بێت لە قبوڵ کردن و نەکردنی ئەو زەواجەدا.

وەکو لەمەوبەریش وتمان ئەگەر پەیامبەر ﷺ ئەو دەرگایەی بخستایەتە سەر پشت سەدان ئافرەت خۆیان پێشکەش دەکرد ,ئەویش لەبەر دانایی خۆی هیچیانی نەخواستووە..

4ـ ئەوەچی تێدایە کەپەیامبەر ﷺ مارەی بکات لە زەید, زەید کە لە بنەرەتدا ئازاد بووە دوایش کەکراوەتە کۆیلە پەیامبەر ﷺ ئازادی کردووە, ئینجا خۆشەویستترین کەس بووە بەلای پەیامبەرەوە ﷺ و پلەو پایەشی لەناو موسڵمانانا بەرز بووە بە رادەیەك کەپەیامبەر ﷺ کردویە بە سەرکردەی لەشکرێك کە جەعفەری ئامۆزای و سەدان گەورە یارانی تێدابووە.

6ـ باسی ئەوە دەکات کەباوك ومامی هاتن بۆ لای پەیامبەر ﷺ و ویستیان بیکڕنەوە لێ وئازادی بکەن و بیبەنەوە لەگەڵ خۆیاندا، بەڵام زەید لای پەیامبەری هەڵبژارد.. لە وەرگێڕانەکەدا خیانەتێك دەکات ئەویش بەوەی کە ئەو بڕگەیەی کە دەڵێت: (**فاختار الرق مع رسول الله ﷺ على حريته وقومه**).

وەکو خۆی راڤە ناکات بەڵکو دەڵێت: ئەویش مانەوەی لای پەیامبەر ﷺ هەڵدەبژێرێت!

ڕاستی راڤەکەشی بەم شێوەیەیە: ئەویش کۆیلایەتی لای پەیامبەر ﷺ هەڵدەبژێرێت بەسەر ئازادی وکەس و کاریدا.

دیارە لەبەر نووسەر ئەم خیانەتەی کردووە: چونکە ئەمە خۆشەویستی زەید بۆ پەیامبەر ﷺ و بەرزی رەوشتی پەیامبەر ﷺ دەردەخات, چونکە ئەگەر وانەبێت چۆن زەید ژیانی کۆیلایەتی و غەریبی هەڵدەبژێرێت بەسەر ئازادی و کەسوکاردا.

7ـ خۆشبەختانە نووسەر ئەو ریوایەتانە دەهێنێتەوە کەباس لە خۆشەویستی پەیامبەر ﷺ بۆ زەید و ناڕەزایی زەینەب لەشوکردن بەزەید دەکات.

هەروەها باسی هۆی ناڕەزایی زەینەب وکەسوکاری زەینەب دەکات لە شوکردن بە زەید ئەویش ئەوقسەیەی براکەی کەدەڵێت: (**وفي رواية فامتنعت وامتنع اخوها عبدالله لنسبها من قريش وان زيدكان بالامس عبدا**). واتە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە زەینەب و عەبدوڵلا برای رازی نەبوون لەبەر ئەوەی زەینەب لەقورەیش بووە و زەید تادوێنێ کۆیلەبووە.

هەروەها لەریوایەتەکەدا هاتووە کە زەینەب سەرەتا وایزانیوە پەیامبەر ﷺ بۆ خۆی داوای دەکات بۆیە رازی بووە، بەڵام دوایی کە زانیویەتی بۆ زەیدە ناڕازی بووە.

ئەمانەش خوێندنەوە هەڵەکانی نووسەر و باقی رخنەگران دەردەخات و دەیسەلمێنێت کە پەیامبەر ﷺ ئەگەر مەبەستی بوایە زەینەبی لە یەکەم رۆژەوە بۆ خۆی دەهێنا و وەکو ئەو مەلا کوردەی دەکرد کە چوو بۆ خوازبێنی کچێك بۆ کوڕێك, ماڵەکە رازی نەبوون بیدەن بە کوڕەکە، بەڵام رازی بوون بیدەن بە خۆی, ئەویش لەوێدا مارەی دەبڕێت, دوایی کە دێتەوە کوڕەکە (کە دەڵێن برازاشی بووە) لێی دەپرسێت مامۆستا چیت کرد ؟ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت:کوڕم بە خوا بە هەزار حاڵ تا بەخۆمیان دا بە تۆیان هەر نەدەدا، بەڵام پەیامبەر ﷺ ئەمەی نەکرد , خواش راستەوخۆ دەخاڵەتی کرد و فەرمووی دەبێ بە گوێی پەیامبەر ﷺ بکەن, لێرەوە دەردەکەوێت کە خوا لە بناغەوە نەخشەی بۆ ئەوە کێشا بوو کە ئەو زەواجە دەبێ سەر بگرێت بۆ ئەوەی ئەو چەند مەبەستەی پێ بپێکرێت کە لەوەبەر باسمان کرد.

8ـ لەو قسەیەی ئیبن کەسیر کە دەڵێت: **لو كان رسول الله ﷺ كاتما شيئا من الوحي لكتم هذه الآية.** بە هەڵە تێدەگات و لە ئەنجامی ئەو هەڵە تێگەیشتنە دەگاتە دەرئەنجامێکی پێچەوانە.

دەڵێت: موفەسیرێکی وەکو ئیبن کەسیر زۆری پێناخۆش دەبێت کە ئایەتێکی لەم چەشنە لە قورئاندا ببینێت بۆیە دەڵێت: ئەگەر پەیامبەر ﷺ شتێکی بە شاراوەیی لە دڵی خۆیدا بهێشتایە ئەوە ئەم ئایەتەی بەنهێنی دەهێلایەوە.

یەکەم: ئەمە قسەی ئیبن کەسیر نییە، بەڵکو قسەی عائیشەیە, کەواتە ئیبن کەسیر پێی ناخۆش نەبووە، بەڵکو قسەیەکی عائیشەی گێڕاوەتەوە کە دەلالەتە لە سەر قورسی ئەو کارە لە سەر پەیامبەر ﷺ، بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە پەیامبەر

ﷺبۆی نەبووە هیچ شتێك بشارێتەوە, واتە قورئان لە نوسینی پەیامبەر ﷺنەبووە، بەڵكو لە لایەن خواوە بووە، چونكە زۆر جار شتی وای دەرخستووە كە پەیامبەر ﷺحەزی كردووە لەسەری لابرێت وەكو زەواجی زەینەب، لێرەوە دەتوانی بڕیار بدەیت نووسەر چەند بە هەڵە و دوور لە راستیی شتەكانی خوێندۆتەوە و چەند نەزانانە لێكی داوەتەوە كە هەندێك جار سەدوهەشتا پلە پێچەوانەی ئەو مەبەستەیە كە دەقەكە یا رووداوەكە دەیدات بە دەستەوە, وەكو ئەمەی ئێستا.

9ـ لە تەفسیری ئایەتی: (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً) (الأحزاب: 37)دا چەندین هەڵە دەكات:

یەكەم: (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ..): بەم شێوەیە راڤە دەكات: ئەی پەیامبەر ﷺبۆ ئەو كەسە باس بكە (واتە زەید) كە خوا ئیمانی پێ بەخشیویت منیش ئازادییم پێ بەخشیویت.. راڤە راستەكەش بەم شێوەیەیە:

**وإذ** واتە: **واذكر إذ**. واتە: باسی ئەو كاتە بكە كە بەو كەسەت دەوت كە خوا بەهرەی خۆی بەسەردا رشتووە و تۆش چاكەت لەگەڵدا كردووە. (مەبەست زەیدە، كە خوا دروستی كردووەو ئیمانی پێبەخشیوە پەیامبەریش ئازادی كردووە و چاكەی تری لەگەڵدا كردووە).

"**.. أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ..** ". **(الأحزاب: 37)**. واتە: دەست بە ژنەكەتەوە بگرە و لە خوا بترسە، بەڵام نووسەر وای راڤە دەكات: زەینەب لە لای خۆت بهێڵەرەوە , ئەی پەیامبەر ﷺلە خوا بترسە!

ئایەتەكە باسی ئەوە دەگێڕێتەوە كە پەیامبەر ﷺبە زەیدی وتووە لە خوا بترسە، بەڵام ئەم وای لێ كردووە كە گوایە خوا بە پەیامبەری ﷺوتووە لە خوا بترسە! ئەمەش نەزانی نووسەر دەردەخات بە شێوازی ئاخاوتن لە عەرەبیدا و لە قورئاندا.

"**.. وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاه..**". **(الأحزاب: 37)**. واتە: شتێك لەدڵتدا دەشاریتەوە كە خوا دەریدەخات، بەڵام ئەو وای لێ دەكات: تۆ دەتەوێت شتێك لە دڵو دەروونتا بشاریتەوە لە كاتێكدا كە خوا دەیەوێت ئاشكرای بكات..

"**فلما قضى زيد منها وطرا**" واتە: دوای ئەوەی كە زەید ماوەیەك لەگەڵیدا بووە و سەرجێی لەگەڵدا كردووە و كاری پێ نەماوە و لێی جیابۆتەوە لە تۆمان مارە كرد.

لێرەدا زاناكان دەڵێن بۆیە باسی ئەم شتەی كردووە بۆ ئەوەی كە كەسێك وا نەزانێت مارەبڕی بە كوڕكراو رەوایە بۆ پیاو ئەگەر تەڵاقی بدات, بەڵكو تەنانەت ئەگەر گواستبێتیشیەوە و سەرجێیشی لەگەڵدا كردبێت دوای تەڵاق دانی بۆ ئەو پیاوە هەیە بیخوازێت، ئەگەر ئایەتەكە ئەم بەشەی لەگەڵدا نەبوایە لەوانەیە كەسانێك بهاتنایە و بیانگوتایە ئەوە بۆ مارەبڕی بە كوڕكراوە (هێشتا نەیگواستبێتەوە) نەك بۆ ژنی, بەڵام ئەمە ئیتر هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە و هەمووی دەڕەوێنێتەوە.

نووسەر ئەگەر لە رۆح و شێوازی قورئان شارەزا بوایە ئەم دەستەواژەیەی نەدەكردە رەخنە، بەڵكو وردەكاریی قورئانی بۆ دەردەكەوت و بە یەكێك لە خاڵە ئیجابییەكانی تەماشای دەكرد.

بەڵام چی دەڵێی بە كەسانێك كە دڵیان كوێرە لە ئاستی راستی و چاویان كوێرە لە ئاستی روناكی (.. **فَإِنَّهَالا تَعْمَى الابْصَارُ وَلَكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ) (الحج: 46)**. **(لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَـئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ)**. **(الأعراف: 179)**.

ئەوانەی كە چاویان نییە پێی ببینن و گوێیان نییە پێی ببیستن و مێشكیان نییە پێی تێبگەن, ئەوانە وەكو ئاژەڵ وان بەڵكو نەزانترن، ئەم بڕگەیەی دوایی ئایەتەكە دوو شت دەردەخات:

1- ئەو كوڕە چووبێتە لای ژنەكە و سەرجێی لەگەڵدا كردبێت.

2- دەستی لێهەڵگرتبێت و تەڵاقی دابێت، نەك هێشتا هەر لە عوهدەی ئەو پیاوە دابێت، كۆتایی ئایەتەكەش زیاتر ئەم مەبەستە دەردەخات.. (**لكي لا يكون على المؤمنين حرج في أزواج أدعيائهم اذا قضوا منهن وطرا**) واتە بۆ ئەوەی هیچ

شتێك لە سەر بڕواداران نەبێت و هیچ گوناهێكیان نەگات ئەگەر ژنی بەكوڕكرا وەكانیان بخوازن دوای ئەوەی كە تەلاقیان دەدەن.

ئەوەندە بە بەس دەزانم بۆ كەسێك خوازیاری گەیشتن بێت بە راستی، كەسێكیش مەبەستی راستی نەبێت ونییەتی دڵی پاك نەبێت بەڵگەی دونیای بۆ بێنیتەوە سوودی نابێت وەكو خوا دەفەرموویت: **وما تغني الايات والنذر عن قوم لا يؤمنون.**

## جوەیرییە کچی حاریس کچی ئەبی زیرار ( خوا لێی رازی بێت )

جوەیرییە کچی سەرگەورەی هۆزی بەنی موستەلّەق بوو کە لە شەڕێکدا بە ناوی شەڕی بەنی مستەلّەقەوە بەدیل دەگیرێت و پێغەمبەر ﷺ ئازادی دەکات و دەیخوازێت، بۆ باشتر تێگەیشتن لە چۆنیەتی هێنانی جویریە بەباشی دەزانم بە کورتی باسی هۆی ئەو شەڕە بکەم کە تێیدا بەدیل دەگیرێت.

لە سالّی پێنجەمی کۆچیدا دەنگوباس گەیشتە پەیامبەر ﷺ کە بەنی موستەلّەق هێز کۆ دەکەنەوە بۆ پەلاماردانی مەدینە بە سەرکردایەتی (**الحارث بن ضرار**) واتە باوکی جوەیرییە، پەیامبەر ﷺ کە ئەمەی بیست هێزی کۆ کردەوەو کەوتنەڕێ بەرەو بەنی موستەلّەق بۆ روبەڕووبوونەوەیان (حەزی نەدەکرد شەڕ لە مەدینەدا بکات) لە شوێنێکدا کە پێی دەوترا (المريسيع) کە ئاوی لێبوو، گەیشتە لەشکری دوژمن، شەڕێکی قورس رووی دا، لە ئەنجامدا موسلّمانان سەرکەوتن‌و ژن‌و مالّ و منداڵی بەنی موستەلّەق وەکو نەریتی ئەو کاتە لەشەڕدا کەوتنە دەستی موسلّمانان، پەیامبەر ﷺ چوار لەسەر پێنجی ئەو دەستکەوتەی دابەش کرد بەسەر شەڕکەرەکاندا و دوو بەش بۆ سوارێك‌و بەشێك بۆ پیادە.

یەکێك لە دەستکەوتەکان کچی سەرۆکی هۆزی بەنی موستەلّەق بوو، بە ناوی (**جويرية بنت الحارث**) کەوتبووە بەر سابت بن قیس بن شماس کە یەکێك بوو لە یارانی پەیامبەر ﷺ.

عائیشە دەفەرموویت: کاتێك پەیامبەر ﷺ دەسکەوتەکانی بەنی موستەلّەقی دابەش کرد، (**جويرية**) کەوتە بەر پشکی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس.

ئەو لەگەڵ سابت رێککەوتبوو کە بەرامبەر بە (9) وەرەقە (دراوێکی زیوی ئەو کاتە بوو) ئازادی بکات، جویریە ئافرەتێکی جوانی سەرنج راکێش بوو هەر کەسێك بیبینیایە دڵی لێدەچوو.

رۆژێکیان پەیامبەر ﷺ لە مالّی من بوو جوەیریە هات بۆ لای‌و داوای یارمەتی لێ کرد بۆ ئازاد کردنی، سوێند بە خوا هەر کە بینینم رقم لێی هەڵسا، چونکە زانیم جوانییەکەی سەرنجی پەیامبەریش ﷺ رادەکێشێ.

وتی: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ من کچی سەرۆکی هۆزەکەمم و لای تۆش شاراوە نییە چیم بەسەر هاتووەو کەوتمە بەر پشکی سابتی کوڕی قەیس، ئازادی، نامەی بۆ کردوم بە (9) وەرقە هاتووم یارمەتیم بدەی، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: لەوە باشترت ناوێت؟ وتی: چییە؟ پەیامبەر ﷺ فەرمووی: ئەو برە پارەیە لە جیاتی تۆ بدەم‌و بتخوازم؟ وتی: بەڵێ رازیم بەو شتە.

دەنگوباس بلاوبووەوە لەناو مەدینەدا کە پەیامبەر ﷺ جوەیرییەی کچی حارسی خواستووە، خەڵکەکە وتیان: بەنی موستەلّەق بوون بە خەزورانی پەیامبەر ﷺ چۆن دەبێ بکرێنە کۆیلە، ئەوەبوو لە ئەنجامدا هەموو دیلەکانی بەنی موستەلّەق کە ژمارەیان دەگەیشتە سەد خێزانێك هەموویان ئازاد کران.

عائیشە دەفەرموویت: هیچ ژنێکمان نەبینیوە لەو زیاتر بە فەڕو بەرەکەت بێت بۆ سەر هۆزەکەی.

پاش ئەوە هۆزی بەنی موستەلّەق موسلّمان بوون، پاش ماوەیەك پەیامبەر ﷺ وەلیدی کوڕی عوقبەی کوڕی موعیتی نارد زەکاتی سالآنەیان لێوەربگرێت، کۆمەلّێك لە پیاوانی بەنی موستەلّەق چوون بە دەمیەوە ئەویش وایزانی دەیانەوێ بیکوژن، بەهەلّەداوان گەڕایەوە و هەوالّی دایە پەیامبەر ﷺ کە بەنی موستەلّەق ویستویانە بیکوژن.

موسلّمانان ئەوەندە داکۆکییان لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبێ بچنە سەریان‌و تەمێیان بکەن، تا لە ئەنجامدا پەیامبەر ﷺ رازیی بوو بەوەی هێزێکیان بۆ بنێرێت بۆ تەمێ کردنیان.

لە کاتێکدا کە موسلّمانان لە بیری ئەوەدا بوون لەشکر پێکەوە بنێن نوێنەری بەنی موستەلّەق هاتە لای پەیامبەر ﷺ و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك بیستمان نوێنەرێکت بۆ ناردوین هاتینە پیریەوە بۆ رێزلێنانیان و ناردنی ئەو زەکاتەی لەسەرمانە، (کاتی پەیامبەر ﷺ و خەلیفەکان زەکات دەچووە بیت المال) کەچی ئەو گەڕایەوە، دوایی بیستمان کە پێی وتوون گوایە ئێمە دەرچووین بۆ کوشتنی، سوێند بە خوا بۆ کوشتنی نەهاتبووین، ئەوەبوو خوای گەورە ئەم ئایەتەی

دابەزاند: (**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ * (وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ...) (الحجرات : 7 )** واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر کەسێکی فاسق (درۆزن) هەواڵێکی بۆ هێنان یەکسەر باوەڕی پێ مەکەن بەڵکو باش لێی وورد ببنەوە نەوەکو بە نەزانی زەرەر بە خەڵکانێك بگەیەنن و دواییش پەشیمان ببنەوە لە سەر ئەو کارەی کە کردتان، ئەوەش بزانن کە پەیامبەرتان ﷺ لە ناودایە ئەگەر بێتو لە زۆر شتدا بە گوێتان بکات تیا دەچن.[1]

کەواتە لە ئەنجامی خواستنی جویریە زیاد لە سەد خێزان ئازاد کران و لە کۆیلایەتی رزگاریان بوو، پاشان هۆزەکەشی موسڵمان بوون.

ئایا ئەمە دەستکەوتێکی کەمە بۆ پەیامبەر ﷺ و ئیسلام؟

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە پەیامبەر ﷺ هیچ زۆرێکی لە ئافرەتەکە نەکرد، بەڵکو پرسی پێکرد و ئەویش رازی بوو، تەنانەت کاتێك باوکی هات بۆ ئازادکردنی، پەیامبەر ﷺ جویریەی سەرپشك کرد و باوکی جویریە لە رێگادا دوو دانە لە حوشترە باشەکانی جیا کردبوویەوە، پەیامبەر ﷺ پرسیاری ئەو دوو دانە حوشترەی لێ کرد، ئەویش لە ئەنجامدا موسڵمان بوو، چونکە ئەوکارەی بە نهێنی کردبوو، کەس ئاگای لێنەبوو بۆیە یەکسەر وتی شایەتی دەدەم کە تۆ پەیامبەری خوایت ﷺ و خوا هەواڵی ئەو حوشترەی پێداوی، لە ئەنجامدا خۆی و دوو کوڕی و هۆزەکەی موسڵمان دەبن و دەنێرێت دوو حوشترەکەش دێنن و دەیداتە پەیامبەر ﷺ و پەیامبەریش بە شێوەیەکی فەرمیی خوازبێنی جویرییەی لێدەکات، ئەویش کچەکەی سەرپشك دەکات، کچەکەشی پەیامبەر ﷺ هەڵدەبژێرێت.

ئایا زەواجێك بە ویستی ئەو کەسە خۆی بێت و ئەو هەموو دەرئەنجامە باشەی هەبێت رەخنەی لێدەگیرێت و بە کارێکی نەشیاو تەماشا دەکرێت.

بەڕواڵەت پەیامبەر ﷺ لەبەر جوانی ئەو ئافرەتەی خواستووە، بەڵام کاتێك سەیری دەرەنجامەکەی دەکەیت دەبینی کە مەبەستەکە زۆر لەوە گەورەتر بووە کە خەڵکی و تەنانەت عائیشەش لێی تێگەیشتوون.

ئەو ژنە خۆی بە شیاوی سابتی کوڕی قەیس نەزانیوە، لەبەر ئەوەی کچی سەرگەورەی هۆزی بەنی موستەلَق بووە، پەیامبەریش ﷺ ئەم راستییەی لەبەرچاو گرتوە، بۆیە پێی وتووە: ئایا لەوە باشترت ناوێت؟ئەویش کە دەپرسێت ئەو شتە چییە کە لەو یارمەتییە باشترە بۆ ئازادکردنی و پەیامبەر ﷺ پێی دەڵێت: پارەکەت بۆ دەدەم و دەتخوازم بێ سێ و دوو رازیی دەبێت، چونکە ئەوە بە گەورەترین رێزلێنان بۆ خۆی دەزانێت و موسڵمان دەبێت و دواتریش رازیی نابێت لەگەڵ باوکیدا بگەڕێتەوە.

کورد دەڵێت: "بازرگان ئەوە دەفرۆشێت کە لە بارەکەیدایە". عەرەبیش دەڵێت: "**كل إناء ينضح بما فيه**". واتە: هەر دەفرێك چی تێدابێت ئەوەی لێ دەچۆڕێ، کەسانی بچوکیش هەموو بیرکردنەوەیان لە شتی بچووکدا قەتیس دەکەن، بەڵام کەسانی گەورەو خاوەن پەیام بیرکردنەوەیان بە گوێرەی گەورەیی پەیامەکەیانە.

حەزرەتی عائیشە کە ئەم رووداوە دەگێڕێتەوە و لە دواییدا دەڵێت: هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە یان نەبیستووە ئەوەندەی جویرییە بە فەڕ بێت بۆ هۆزەکەی، داننانێکە بەو راستییەی کە لە سەرەتادا لێی وون بوو، وایدەزانی کە مەسەلەکە تەنها جوانییەکەیەو هیچی تر.

هەمووئیشێك لە دەرەنجامەکەیەوە هەڵدەسەنگێنرێت نەك لە سەرەتاکەو رواڵەتەکەیەوە، بۆ نموونە: ئاشتیبەستی حودەیبیە هەموو موسڵمانان بە زەلیلی و دابەزین لە مافەکانیان لە قەڵەمیان دا، بەڵام دوایی دەرکەوت کە گەورەترین دەسکەوت بوو، بەندەکانی ئەو ئاشتینامەیە هەمووی بە رواڵەت دۆڕانەو دابەزینە:

ئەمساڵ بگەڕێنەوە و عەمرە نەکەن، ساڵی داهاتوو بەبێ چەك بێن.

[1] تهذيب سيرة إبن هشام / ص238ـ 243.

ئەوی لەم ماوەیەدا دێتە ناو موسڵمانانەوە لە قورەیشییەکان بگەڕێنرێتەوەو ئەوەشی لەناو موسڵمانانەوە دێتەوە بۆ لای قورەیش نەگەڕێنرێتەوە.

ئەمانە بە رواڵەت دەستهەڵگرتنە لە مافەکانو بنەماکان، بەڵام دەرئەنجامەکەی بڵاوبوونەوەی ئیسلام و فەتحی مەککە بوو. ئەم زەواجەی پەیامبەریش ﷺ سەرەتا لە لای عائیشەوە لەبەر جوانی جوەیرییە بوو، بەڵام دوایی دەرکەوت بۆی کە ئەوە مایەی ئازادبوونی هۆزەکەی و موسڵمان بونیان بوو، ئەمەش بۆ کەسێکی وەکو پەیامبەری خاوەن پەیام گەورەترین دەسکەوت بوو.

## هەڵەو نەزانینو چەواشەکارییەکانی نووسەر

1ـ نووسەر "**أخذت بنفسه**"، بە (زەوقی دەچووە سەر) راڤە کردووە، لە کاتێکدا کە بە مانای: دڵی دەچوو لە جوانییەکەی یان دڵی لێیدەچوو.

ئاشکراشە کە دڵ لێچوونو زەوق چوونە سەر دوو شتی جیاوازن. یەکەمیان هەستێکی سروشتییە و دووەمیشیان زاراوەیەکی سێکسییە.

جاری وا هەیە دایکێك کچێکی جوان دەبینێو دڵی دەچێتە سەری یان دڵی لێیدەچێت و حەز دەکات بۆ کوڕەکەی بیخوازێت، بەڵام زەوق چوونە سەر ئەوەیە کە ئەو کەسە بیەوێت کاری سێکسی ئەنجام بدات لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەیبینێ.

2ـ دەستەواژەی: زەوقی دەچێتە سەر دەیبات بۆ خۆی و لە خۆشیدا کۆمەڵێکی زۆر لە سەبایاکان ئازاد دەکاتو لە بری جویرییە ژنێکی دی لە دەسکەوتەکانی دەداتە سابت.

ئەمە هەمووی خیانەتە لە وەرگێڕان و شێواندنە بۆ مانای دەقەکە. دەقەکە دەڵێت:**(قال فهل لك في خير من ذلك قالت: ماهو يا رسول الله؟ قال: اقضي عنك وأتزوجك؟ قالت نعم. قال: قد فعلت. وخرج الخبر في الناس ان رسول الله تزوج جويرية بنت الحارث فقال الناس اصهار رسول الله ﷺ فأرسلوا ما بأيديهم من سبايا بنى المصطلق)**.[1]

بڕوانە جیاوازیی نێوان دەقە عەرەبییەکەو راڤە کوردییەکەی نووسەر! ئایا ئاوەها دەیەوێت ئایینی ئیسلاممان بۆ وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی؟!

3ـ دەقە عەرەبییەکە نالێت زەوقی چووە سەر و نالێت دەیبات بۆ خۆی، بەڵکو دەڵێت سەرپشکی دەکات لەوەی کە یارمەتی بدات ئازادیی خۆی بکڕێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری یا پەیامبەر ﷺ خۆی ئەو بڕە پارەیەی بۆ بداتو بیخوازێت، ئەویش بە ویستی خۆی ئەمەی دووەم هەڵدەبژێرێت.

واتە پەیامبەر ﷺ وەکو کەنیزەکێك نایبات بۆ خۆی بەڵکو جویریە بە ئازادیی خۆی شوکردن بە پەیامبەر ﷺ هەڵدەبژێرێت.

4ـ دەقەکە دەڵێت: کاتێك موسڵمانان بیستیان پەیامبەر ﷺ جویرییەی خواستووە وتیان: بەنی موستەلەق بوون بە خەزورانی پەیامبەر ﷺ و دوای ئەوە هەرچی لەبەردەستیاندا هەبوو لە دیلەکانی ئەو هۆزە ئازادیان کردن، بەڵام نووسەر دەڵێت: لە خۆشیدا کۆمەڵێکی زۆر لە سەبایاکان ئازاد دەکات، دیارە کە جیاوازیی لە نێوان ئەم دووەدا چەندە!! دەقەکە دەڵێت موسڵمانان وەکو ڕێزلێنانێك لە پەیامبەر ﷺ ئەندامانی هۆزەکەی جومیرییەیان ئازاد کرد، بەڵام نووسەر دەڵێت پەیامبەر ﷺ لە خۆشی جویرییەدا ئەوانەی ئازاد کرد.

5ـ دەقەکە دەڵێت هیچ ژنێکم نەناسیوە لە جویرییە بەفەڕتر بێت بۆ هۆزەکەی، بەڵام نووسەر ئەم بڕگەیە وەرناگێڕێتە سەر کوردیی، چونکە چەند دەلالەتێکی تێدایەو مەبەستی سەرەکی لەو زەواجە دەردەخات کە موسڵمان بوونی هۆزی بەنی موستەلەق و رزگاربوونیان لە دیلیو کۆیلەیەتی بوو، هەروەها ئینصافو راستگۆیی عائیشە دەردەخات کە دان بە فەڕو بەرەکەتی جوەیرییەدا دەنێتو ئەم بڕگەیەش کە راڤەی ناکات ئەو قسەیەی دوایی بە درۆ دەخاتەوە کە دەڵێت عائیشە لەبەر ئەوەی کە رقی لێبووە تانەو تەشەری تێگرتووە.

[1] لەوەبەر واتاکەیمان نووسیوە دەتوانی بۆی بگەڕێیتەوە.

## ئوممو سەلەمە ( هند كچی سوهەیل ئەبی ئومەییە ئەلمەخزومی )

ئومو سەلەمە، كە ناوی هندی كچی ئەبی ئومەییەی مەخزومی بوو, ئامۆزای هەریەك لە خالیدی كوڕی وەلید و ئەبوجەهل و خێزانی ئەبوسەلەمە بوو, ئافرەتێكی جوان‌و خاوەن ژیری و دانایی بوو, لەگەڵ مێردەكەیدا زۆر باش بوو، زۆر یەكیان خۆشدەویست بە رادەیەك كە رۆژێكیان بە ئەبوسەلەمەی وت: ئەی ئەبوسەلەمە پێم گەیشتووە كە هەر ژنێك مێردەكەی بمرێت و بەهەشتیی بێت ئەگەر مێرد نەكاتەوە لە بەهەشتدا خوا بە یەكەوە كۆیان دەكاتەوە, وەرە با پەیمان بدەین بەیەك دوای یەكتر نە من شوو بكەم نە تۆ ژن بێنی, ئەبوسەلەمە پێی وت بەقسەی من دەكەیت؟ وتی بەڵێ: وتی : دوای من شووبكە, خوایە لەدوای من یەكێكی باشتری پێ ببەخشی كە رێزی لێبگرێت و سوكایەتی پێ نەكات و ئازاری نەدات. ئەوە بوو ئەبوسەلەمە لە غەزای ئوحودا بریندار دەكرێت، هەر لە دوای ئەوە لە ساڵی چوارەمی كۆچیدا دەمرێت, ئومو سەلەمە زۆر خەفەتبار دەبێت و تەنانەت چەندین جار دەبورێتەوەو دەڵێت كێ هەیە لە ئەبوسەلەمە باشتر بێت, نەیدەزانی ئەبوسەلەمە دوعاكەی لە دڵەوەو بە دڵسۆزیی كردووە و خوا قبوڵی كردووە و وەڵامی داوەتەوە.

ئەوەبوو دوای ماوەیەك ئەبوبەكر (رەزای خوای لێ بێت) چوو بۆ خوازبێنی و ئەویش دەیوت من ئافرەتێكی بە تەمەن و خاوەن هەتیوم و پێویستم بە پیاو نییە, دوای ئەوە عومەر چوو بۆ خوازبێنی، بەهەمان شێوە وەڵامی ئەویشی دایەوە، دوای ماوەیەك پەیامبەر ﷺناردی بۆ خوازبێنی، ئەویش وەڵامی دایەوە كە من ئافرەتێكی بە تەمەن و خاوەن هەتیوم و ئەیرە زۆر دەبەم و پەیامبەریش ﷺپێی وت (لەرێی نوێنەرەكەیەوە) كە منداڵەكانت لە سەر من، من بەخێویان دەكەم، ئەیرەكەشت لە خوا دەپاڕێمەوە كە نەیهێڵێت, بە نیسبەت تەمەنیشەوە من لە تۆ بەتەمەنترم.

لەدواییدا ئومو سەلەمە قایل بوو، شووی بە پەیامبەر ﷺكرد و منداڵە وردەكانیشی لەگەڵ خۆی برد.

كچە بچوكەكەی ناوی زەینەب بوو، هەموو جارێك پێغەمبەر ﷺلە ئوم سەلەمەی دەپرسی زەناب كوا یان زەناب چی دەكات[1].

ئەوەی لە ژیانی ئوم سەلەمە وردبێتەوە بە روونی بۆی دەردەكەوێت كە ئافرەتێكی زۆر ژیر و دانا بوو، نزیكەی (387) فەرمودەی لە پەیامبەرەوە ﷺگێڕاوەتەوە، زۆر جار پەیامبەر ﷺپرسی پێ دەكرد، لە ئاشتینامەی حودەیبییەدا رۆڵێكی زۆر گەورەی بینی كە بەڵگە بوو لە سەر ژیری و دانانی، كاتێك پەیامبەر ﷺئەو ئاشتینامەیەی مۆركرد یارانی ئەوەیان بە شكستی و زەلیلی لە قەڵەمدا بۆیە كاتێك پەیامبەر ﷺفەرمانی پێدان سەر بتاشن و هەدی پێشكەش بكەن خاوییان نواند لە ئەنجامدانی فەرمانەكانیدا, پەیامبەر ﷺبە دڵتەنگییەوە چووە ژوورەوە بۆ لای ئوم سەلەمە كە لەو جارەدا بردبووی لەگەڵ خۆیدا و فەرمووی خەڵكیی تیاچوون, فەرمانی پەیامبەرەكەیان جێبەجێ ناكەن, ئوم سەلەمەش پێی وت: ئەی پەیامبەری خوا ﷺتۆ قسەیان لەگەڵدا مەكە, برۆ كوشتنی خۆت سەربڕە و سەرتاشەكەت بانگ بكە سەرت بتاشێ, ئەوان كە بینییان خۆت ئەو كارە دەكەیت ناتوانن سەرپێچیت بكەن و بۆیان دەردەكەوێت كە مەسەلەكە جددییە و ماوەی سەرپێچی كردنی تێدا نییە، پەیامبەر ﷺبە گوێی ئوم سەلەمەی كرد و صەحابەكانیش هەموو هەڵسان سەری خۆیانیان تاشی و قوربانییان سەربڕی.

ئەگەر لە هۆكاری خواستنی ئوم سەلەمە ورد بینەوە چەند شتێك دەبینین:

1ـ پەیامبەر ﷺحەزی نەدەكرد هیچ ئافرەتێك بە بێ مێرد بمێنێتەوە, بە تایبەت ئەوانەی كە منداڵی وردیان هەیە و سەرپەرشتیارێكیان نییە.

وەكو ئاشكرایە زۆربەی كەسوكاری ئوم سەلەمە هێشتا لە سەر كوفر مابوونەوەو كەسێكی وای نەبوو سەرپەرشتیاری خۆی و منداڵەكانی بكات، ئامادەش نەبوو مێرد بە هیچ كەسێكی تر بكات لەبەر ئەوەی كە كەسی لە ئەبوسەلەمە بە باشتر

---

[1] نساء خلد هن التاریخ/ محمود ابراهیم الدیك.

نەدەزانی, بۆیە ئەبوبەکرو عومەری رەت کردەوە. پەیامبەریش ﷺ لەبەر ئەوەی کە ئوم سەلەمە یەکێك بوو لەوانەی کە لە سەرەتای ئیسلامەوە باوەڕیان هێنا بوو، خۆیو مێردەکەشی لە هەردوو کۆچەکەی حەبەشەدا بەشدار بوون و لە پێناوی ئیسلامدا تاڵی و سوێری زۆری چەشتبوو ویستی پاداشتی بداتەوە و شەرەفی دایکی موسڵمانانی پێ ببەخشێت لەگەڵ ئەوەی کە ئوم سەلەمە بە تەواوی شووکردنی خستبووە ئەولاوەو نیازی نەبوو دوای ئەبوسەلەمە مێردێکی تر بکاتەوە.

ئەمە واقعییەتی ئیسلام و ئاسانییەکەی دەردەخات, شووکردنەوەی دوای مردنی مێرد کە لای خۆمان بە چاوێکی سوك تەماشا دەکرێت بۆ ژن لە ئیسلامدا چارەسەرێکی کردەوەییە بۆ زۆری ڕێژەی بێوەژن، ئەگەر پەیامبەر ﷺ ئەم ڕێگا چارەسەرەی دانەنایە ڕێژەی بێوەژن لە کۆمەڵگەی موسڵمانانندا ئەوەندە زۆر دەبوو دەبووە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی, بەڵام ئیسلام زۆر بە سادەیی ئەم کێشەیەی چارەسەر دەکرد و هەر پیاوێك دەمرد یا دەکوژرا دوای ماوەیەکی کەم ژنەکەی گەر لە ڕێکی شوو کردندا بووایە یەکسەر شووی دەکرد و هیچ تانە و تەشەرەیەکیشی نەدەهاتە سەر.

## رەیحانەی کچی زەیدی کوڕی عەمر و صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەختەب

ئەم دووە پێکەوە باس دەکەین لەبەر ئەوەی کە هەردووکیان جولەکە بوون و یەکەمیان لە دەستکەوتەکانی شەڕی بەنی قورەیزە و دووەمیان لە دەستکەوتەکانی شەڕی خەیبەر بوون.

هەردووکیان پەیامبەر ﷺ سەرپشکی کردن لە نێوان ئەوەی ئازادیان بکات و بیانخوازێت و حیجابیان بە سەردا فەرز بێت یان بە کەنیزەکی بمێننەوە, رەیحانە کۆیلایەتی هەڵبژاردو صەفیە ئازادیی.

ناحەزانی ئیسلام بە تایبەت ئەوانەی کە کاریگەری جولەکەیان بەسەرەوەیە، یان سەر بە یەکێك لە دەزگاکانی جولەکەن، زۆر جەخت لە سەر ئەم مەسەلەیە دەکەنەوە لە دوو رووەوە:

یەکەمیان: ئەوەی پێی دەڵێن قەتلوعامی جولەکە بە تایبەت لە بەنی قورەیزە.

دووەمیان: خواستنی ئەم دووە لە لایەن پەیامبەرەوە ﷺ کە گوایە هۆکەی پاڵنەرێکی سێکسی بووە, بۆیە پێش ئەوەی باسی ئەم زەواجە بکەین چەند خاڵێك لە سەر شەڕی بەنی قورەیزە و شەڕی خەیبەر دەنوسین:

### شەڕی بەنی قورەیزە

ئەو نووسەرانەی ناحەزی ئیسلامن و رەخنەی لێدەگرن لە باسکردنی شەڕی بەنی قورەیزەدا باسی دیمەنی کۆتایی ئەو شەرە دەکەن کە تێیدا موسڵمانان گەمارۆی بەنی قورەیزە دەدەن و پاش (25) رۆژ لە گەمارۆدان رازیی دەبن بەوەی سەعدی کوڕی موعاز دادوەرییان بکات لەبەر ئەوەی کە لە پێش ئیسلامدا هاوپەیمانیان بوو، ئەویش بەوە حوکم دەدات کە پیاوانیان بکوژرێن و ژن و ماڵ و منداڵیشیان بە غەنیمەت ببرێت.

پەیامبەریش ﷺ پێی دەفەرموویت بەو شێوەیە حوکمت دا بە سەریاندا کە خوا لە سەرووی حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە داویێتی.

ناحەزان باسی ئەوە ناکەن بۆچی جولەکە ئەو حوکمە قورسەیان بە سەردا درا ئەویش بۆ ئەوەی خوێنەر وابزانێت ستەمێکی گەورە بوو لێیان کرا و زۆرێك لەو نووسەرانە بە قەسابخانەی ناو دەبەن.

شایانی باسە زۆربەی هەرەزۆری ئەم نووسەرە کوردانەی کە ئێستا دژی ئیسلام شت دەنوسن ئاماژە بۆ ئەم روداوانە دەدەن و ناوی قەسابخانەی لێدەنێن: ئەمە وامان لێدەکات کە گومان ببەین لەو لایەنانەی لە پشتی ئەم جۆرە کەسانەوەن و هانیان دەدەن ئەو شتانە بنوسن.

بۆ ئەوەی باشتر لە هۆی ئەو شەڕانە تێبگەین دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەرەتای کۆچ کردنی موسڵمانان بۆ مەدینە و نوسینی دەستوری مەدینە و ئەو رێککەوتننامانەی لە نێوان پەیامبەر ﷺ و جولەکەکاندا مۆر کرا و پاشان هەڵوێستی جولەکە لەو رێککەوتننامانە و لە شەڕی نێوان موسڵمانان و بێبڕواکان.

باسکردنی کوشتاری بەنی قورەیزە بێ باسکردنی پێشەکییەکانی وەکو نمایش کردنی دوا دیمەنی شانۆیەکە کەتێیدا کابرایەکی ستەمکاری پیاوکوژی دڕندە سزا دەدرێت و تۆڵەی لێدەسێنرێتەوە بێئەوەی بینەر ئاگای لە پێشەکییەکانی هەبێت و دیمەنەکانی تری بینیبێت کە تێیدا جینایەتکار جینایەتەکانی ئەنجام دەدات، ئەمە وا دەکات خوێنەر لەگەڵ ستەمکاردا هاوسۆزی بنوێنێ نەك لەگەڵ ستەملێکراودا.

ئەگەر بێتو هەڵوێستی جولەکە لە موسڵمانان باس بکەین لە سەرەتای کۆچی موسڵمانان بۆ مەدینە تا شەڕی بەنی قورەیزە و پاشان شەڕی خەیبەر دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە ئەوەی لەگەڵیاندا کرا پڕ بە پێستی تاوانەکەیانەو بەڵکو بگرە کەمتر بوو لەوەی کە شیاوی بوون, خواستنی (صفیە) و بردنیە ریزی خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ گەورەترین شەرەف بوو بە صەفییە درا، ئەوەی بەرامبەر رەیحانە کرا هەمان شت بوو، بەڵام خۆی ژیانی کەنیزەکێتی هەڵبژارد بە سەر ژیانی ئازادیدا.

هەموو دەزانین کە پەیامبەر ﷺ لەگەڵ جێگیربوونی لە مەدینەدا رێککەوتننامەیەکی لەگەڵ جولەکەدا مۆرکرد کە ئەمانە هەندێکن لە بڕگەکانی:

1ـ جولەکەش نەتەوەیەکن لەگەڵ موسڵماناندا, ئایینی خۆیان بۆ خۆیان و ئایینی موسڵمانان بۆ موسڵمانان (واتە: جولەکە لە سەر ئایینی خۆیان و موسڵمانان لە سەر ئایینی خۆیان) ئەوەیشان کە ستەم دەکات یا سەرپێچی دەکات تەنها زیان بە خۆی و کەسوکاری خۆی دەگەیەنێت.

2ـ لە سەر موسڵمانان و جولەکەکانە کە هاوکاریی یەکتر بکەن و یارمەتی یەکتر بدەن بەرامبەر هەر لایەنێك کە دەستدرێژی بکاتە سەر مەدینە یان سەر یەکێك لەو لایەنانەی بەشدارن لە مۆرکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە.

واتە بە پێی ئەم بەڵێننامەیە ڕێزگرتن لە یەکتر و پێکەوە ژیان و بەرگری هاوبەش لە نێوان موسڵمانان و جولەکەکاندا مۆر کرا، بەڵام ئایا جولەکە پابەند بوون بە بڕگەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیەوە؟

لە ڕاستیدا نەخێر بەڵکو بە درێژایی ئەو ماوەیە کە حەوت ساڵە بە بەردەوامی جولەکە ئەو بەڵێننامەیەیان پێشێل دەکرد و نەك هەر بەشدارییان نەدەکرد لەبەرگریکردن لە مەدینە، بەڵکو هەمیشە لە پشتەوە خەنجەریان دەدا لە موسڵمانان, نەك هەر ئەوەش، بەڵکو ئەندازیاری شەڕی خەندەق کەتێیدا هەموو هۆزو و تیرەکانی عەرەب هێرشێکی دە هەزار کەسییان هێنایە سەر موسڵمانان بۆ لە ریشە دەرهێنانیان هەمووی بە دەسەی حویەیی کوڕی ئەختەب و سەرانی جولەکە بوو.

بۆ ئەوەی وێنەکە ڕوونتر بێت لای خوێنەر بە باشی دەزانم کەمێك بە درێژتر لە سەر ئەم مەسەلەیە بدوێم:

کاتێك موسڵمانان هاتنە مەدینە سێ تیرەی جولەکەی تێدا بوو: بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیرو بەنی قورەیزە, ئەم سێ تیرەیە هەرسێکیان بەشدار بوون لە مۆر کردنی ئەو بەڵێننامەیە، بەڵام با بزانین هەریەك لەمانە چەند پاپەند بوون بە بڕگەکانی ئەو بەڵێننامەیەوە.

**بەنو قەینوقاع**

ئەمانە یەکەم تیرە بوون کە ئەو ڕێککەوتننامەیەیان پێشێل کرد و دەستدرێژییان کردە سەر موسڵمانان.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: دوای ئەوەی موسڵمانان لە شەڕی بەدردا سەرکەوتنیان بە دەست هێنا جولەکەکانی بەنو قەینوقاع زۆریان پێ ناخۆش بوو، بە هەوو شێوەیەك هەوڵیان دەدا لە نرخی ئەو سەرکەوتنە کەم بکەنەوەو دەیانووت ئێوە تووشی خەڵکانێکی شەڕکەر نەبوون, ئەگەر لەگەڵ کەسانێکی وەکو ئێمەدا بجەنگانایە دەتانبینی چیمان لێ دەکردن، بەوەشەوە نەوەستان، بەڵکو لە ناو بازاڕی خۆیاندا کۆمەڵێکیان دەستدرێژیان کردەسەر ئافرەتێکی موسڵمان و تەشقەڵەیان پێگێڕا, ئەویش بەوەی کە ئافرەتێکی موسڵمان هەندێك شتومەکی برد بۆ بازاڕی بەنو قەینوقاع بیفرۆشێت, لەوێ فرۆشتنی و چوو بۆ دوکانی زەڕەنگەرێك بۆ زێڕ کڕین, لەوێ چەند جولەکەیەك زۆریان لێکرد دەموچاوی خۆی دەرخات و پەچەکەی لا ببات ئەویش ڕازی نەبوو, دوایی زەڕنگەرەکە چمکێکی کراسەکەی گرێدا بە پشتیەوە, کاتێك ژنەکە هەستایە سەرپێ لەشی کەوتەدەر, پیاوەکان دەستیان کرد بە پێکەنین و ژنەکە هاواری کردو قیژاندی، پیاوێکی موسڵمان لەوێدا پەلاماری جولەکەکەیداو کوشتی, جولەکەکانیش موسڵمانەکەیان کوشت, لەوەوە شەڕەکە گەورە بوو لە نێوانیاندا, بەو شێوەیە جولەکە ئەو ڕێککەوتننامەو بەڵێننامەیەیان پێشێل کرد.

دوای ئەوە موسڵمانەکان گەمارۆی ئەو تیرەیەیان داو لە ئەنجامدا ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی کە مەدینە چۆڵ بکەن. ئەوەبوو مەدینەیان بەجێهێشت و بەرەو شام کەوتنەڕێ بێ ئەوەی کەسێکیان بکوژرێت یان شتێکیان زەوت بکرێت.

**بەنو نەزیر ( بنو النضیر )**

بە نیسبەت بەنی نەزیریشەوە بەهەمانشێوە ئەوان ڕێککەوتننامەکەیان پێشێل کردو پیلانیان گێڕا بۆ کوشتنی پەیامبەر ﷺ لە بارودۆخێکی زۆر ناسکدا کە بە کورتی بەم شێوەیە بوو:

موسڵمانان لە شەڕی ئوحوددا شکستێکی گەورەیان بە سەردا هات و هەفتا کەسیان لێ شەهید کرا، کە حەمزەی مامی پەیامبەری پاڵەوانی قورەیش یەکێك بوو لەوانە، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم پیاوێك لە هۆزی بەنی عامر بە ناوی **ابو براء عامر بن مالك بن جعفر** هات بۆ مەدینە, پەیامبەر ﷺ بانگی کرد بۆ ئیسلام ئەو ڕازیی نەبوو، بەڵام دژایەتی ئیسلامیشی نەنواند، بەڵکو پێشنیاری کرد بە سەر پەیامبەردا ﷺ کە چەند موسڵمانێکی شارەزای لەگەڵدا بنێرێت بۆ ناوچەی نەجد

که خۆی خەڵکی ئەوێ بوو بۆ ئەوەی خەڵکەکەی بانگ بکەن بۆ ئیسلام, پەیامبەر ﷺ ئەم پێشنیارەی بەدڵبوو, بەڵام دەترسا لەوەی خەڵکی نەجد بیانکوژن یان ئازاریان بدەن, بەڵام ئەبو عامر دڵنیای کردەوە کە ئەوان لە ژێر سایەی ئەودا دەبن و ئەو بەرگرییان لێدەکات، ئەوە بوو پەیامبەر ﷺ (70) حەفتا کەسی لەوانەی کە خوێندەوار و شارەزا بوون لەگەڵدا نارد بە سەرۆکایەتی (**المنذر بن عمرو الأنصاری**).

کاتێك گەیشتنە ناوچەی نەجد لە شوێنێك لایاندا پێی دەوترێت (بئر معونە), لەوێ نوێنەرێکیان نارد بە ناوی (حەرام بن ملكان) بە نامەیەکی پەیامبەر ﷺ کە بۆی نوسیبوون بۆ سەرۆکی ئەو هۆزانە کە ناوی **عامر بن الطفیل** بوو (برازای ئەو پیاوەی لەگەڵیدا هاتبوون), عامر پیاوێکی دڕندەی دڵڕەق و دژ بە ئیسلام بوو، بێ ئەوەی تەماشای نامەکە بکات نوێنەرەکەی کوشت, دوایی نزیکەی هەزار سوارێکی کۆکردەوە و چوو دای بەسەر ئەو (69) کەسەداو هەموویانی کوشت تەنها دووانیان نەبێت, یەکێکیان بە ناوی **کعب** بن زەید کە بریندار کرابوو، بەڵام نەمردبوو، دووەمیان بەناوی عەمری کوڕی ئومەییەی **ضەومەری**. عەمری کوڕی ئومەییە لە گەڕانەوەیدا دووکەسی لە هۆزەکەی **عامر بن الطفیل** بینی کە لە مەدینەوە دەهاتن, بێئەوەی بزانێت پەیامبەر ﷺ (ئەمان)ی پێ بەخشیون (واتە کەس دەستیان بۆ نەبات و نەکوژرێن) هەردووکیانی کوشت, وایدەزانی بەوە تۆڵەی لە **عامر بن الطفیل** کردۆتەوە, کاتێك گەڕایەوە مەدینە و ئەو خەبەرەی دایە پەیامبەر ﷺ، پەیامبەر ﷺ ئەو کارەی پێ ناخۆش بوو، پێی وت ئێمە ئەمانمان بەو دوو پیاوە بەخشیبوو بۆیە دەبێت دییەکەی بدەین (دییە: بڕێك پارەیە لە خوێنی ئەو کەسەدا دەدرێت کە بە هەڵە کوژرا بێت) بۆ ئەو مەبەستە چوو بۆ لای جولەکەکان بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن لە کۆکردنەوەی پارەی خوێنی ئەو دوو پیاوەدا، (دواتر دێینە سەری) ئەم کارەساتە واتە کوژرانی حەفتا صەحابەی خوێندەواری گەنج ئازارێکی زۆری گەیاندە موسڵمانان کە زیاتر بوو لەئازاری ئەو شکستەی بەسەریاندا هاتبوو لە شەڕی ئوحوددا و سەرلەنوێ ماتەمینی باڵی کێشا بەسەر مەدینەدا..

هێشتا کفنی ئەو حەفتا کەسە زەرد نەبوو بوو موسڵمانان تووشی کارەساتێکی دڵتەزێنی تر بوون ك ەتێیدا دە صەحابەی تر بەهەمان شێوەی ئەوانەی (**بئر معونة**) بەغەدر کوژران, لە کارەساتێکدا کە پێی دەوترێت (**حادثة الرجیع**) کورتەکەشی ئەوەیە کە چەند کەسێك لە هۆزی عوزەل (**عضل**)و قارە هاتن بۆ لای پەیامبەر ﷺ و موسڵمانێتی خۆیان ڕاگەیاند و داوایان کرد پەیامبەر ﷺ چەند کەسێکیان لەگەڵدا بنێرێت بۆ ئەوەی ئیسلامیان فێر بکەن, پەیامبەریش ﷺ شاندێکی (10) دە کەسی لەگەڵدا ناردن بە سەرۆکایەتی (**مرثد بن أبي مرثد الغنوي**) کاتێك شاندەکە گەیشتە شوێنێك لە نێوان مەککە و عەسفاندا پێی دەوترێت (**ذات الرجیع**) ئەندامەکانی ئەو وەفدەی هێنابوویان یەکەیەکە دزەیان کرد و چوون بۆ لای هۆزی هوزەیل و داوایان لێ کردن پێن بەدەمیانەوە بۆ کوشتنی ئەو دەکەسە.

ئەوەبوو هێرشیان کردە سەریانو هەشتیان لێ کوشتن و دووانیان خۆیان دا بەدەستەوە, بردنیان بۆ مەککەو لەوێ فرۆشتنیان بە قوڕەیش, ئەو دوو نەفەرەش زەیدی کوڕی دەثینە و خوبەیبی کوڕی عەدی بوون, قوڕەیشییەکان بە ناشیرینترین شێوە هەردووکیانیان کوشت (ئێستا شوێنی باسکردنی نییە).

هەواڵی ئەو دەکەسەش گەیشتە موسڵمانان، ئیتر ماتەمینی بە تەواوی باڵی بەسەر مەدینەدا کێشا..

لەم کاتەدا عەمری کوڕی ئومەییەی زومەری هەواڵی کوشتنی ئەو دوو نەفەرەی کەلە هۆزی عامری کوڕی توفەیلی بکوژی (70) صەحابییەکە بوو هێنا بۆ پەیامبەر ﷺ، ئەوەبوو پەیامبەر ﷺ بڕیاری دا خوێنی ئەو دووکەسە بدات, بۆ ئەو مەبەستە هەستا بەخۆیو چەند کەسێك لە یارانی چوون بۆ ناوچەی بەنی نەزیر بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن بۆ کۆکردنەوەی پارەی خوێنی ئەو دوو نەفەرە، جولەکەکان پێشوازییەکی گەرمیان لە پەیامبەر ﷺ کرد و وتیان بەسەر چاویارمەتیت دەدەین.

پەیامبەر ﷺ لە پاڵ دیواری یەکێك لە ماڵەکانیان دانیشت چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد پارەکەی بۆ بێنن, ئەوان لە ژێرەوە پیلانیان دەگێڕا چۆن ئەم هەلە بقۆزنەوەو پەیامبەر ﷺ بکوژن, ئەوە بوو رێککەوتن لە سەر ئەوەی یەکێکیان بە ناوی

عەمری کوڕی جەحاشی کوڕی کەعب بچێتە سەربانیماڵەکەو بەردێکی گەرە بهاوێتە خوارەوە بۆ سەر پەیامبەر ﷺ، یەکێك لە سەرانی بەنی نەزیر کە ناوی سەلامی کوڕی حەکیم بوو ئامۆژگاری کردن ئەوکارە نەکەن، چونکە ئەوە غەدرەو پێشێل کردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە کە لە نێوانیاندا هەیە و دووەمیش ئەگەر سەر نەگرێت دەرئەنجامی خراپ دەبێت, بەڵام بە گوێیان نەکرد و لە سەر گومڕایی خۆیان بەردەوام بوون و هەموو داب و نەریت و بەهایەکیان خستە ژێر پێ و بڕیاری ئەو خیانەتە گەورەیان دا, پەیامبەر ﷺ لە ڕێگای جبرائیلەوە هەواڵی پێدرا کە جولەکەکان خەریکی ئەنجامدانی خیانەتێکی لەو جۆرەن یەکسەر هەستاو بە بیانووی سەرئاوکردن ئەوێی بەجێ هێشت, کاتێك یارانی بینییان زۆری پێ چوو نەهاتەوە چوون بە دوایدا, لە ڕێگا نەفەرێکیان پێگەشت کە لە مەدینەوە بەرەو ئەوێ دەهات، خەبەری دانێ کە پەیامبەر ﷺ گەڕاوەتەوە بۆ مەدینە, کاتێك چوون بۆ لای و لێیان پرسی بۆچی بەو شێوەیە گەڕایەوە؟ پێیێ وتن جوولەکە نیازی کوشتنی ئەویان هەبووە بۆیە بەو نهێنییە گەڕایەوە بۆ ئەوەی پیلانەکەیان ئاشکرا نەبێت و ڕێگای تر نەگرنە بەر بۆ کوشتنی".

لێرەدا دەپرسین: ئەوە ئەگەر سەرۆکی هەر وڵاتێکی تر بوایە ئاوها بەو شێوەیە هاوپەیمانانی پیلان بگێڕن بۆ کوشتنی لەو کاتەی کە ئەو چووە بۆ لایان بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن کەچی ئەوان نەخشە بکێشن بۆ کوشتنی, چ هەڵوێستێك وەردەگرێت لێیان؟ بە تایبەت ئەگەر ئەوەش بزانین کە ئەوە لە کاتێکدا بووە کە لە شەڕێکی گەورەدا شکستیان هێناوە و دوای ئەوە لە دوو کارەساتی دڵتەزێندا دوو کۆمەڵ لە یارانی بە غەدر کوژراون, لە کاتێکی ئاوەهادا هاوپەیمانانی ئاوەها خیانەتێکی لێبکەن و پیلان بگێڕن بۆ کوشتنی لە ناو ماڵی خۆیاندا چییان لێدەکات؟

هەموو ئەوەی کە پەیامبەر ﷺ کردی بەرامبەریان ئەوە بوو پێی وتن دەبێ شاری مەدینە چۆڵکەن, چەکەکانیان نەبێت هەموو شتێکیان لەگەڵ خۆیاندا برد، تەنها (11) کەسیان لێکوژرا، یەکێکیان عەمری کوڕی جەحاش بوو، ئەوەی کە کوشتنی پەیامبەری پێڕاسپێرابوو، ئامۆزایەکی خۆی بە ناوی یامینی کوڕی عومەیر، دوای ئەوەی موسڵمان بوو کوشتی، دە کەسەکەی تریش خۆیان پەلاماری موسڵمانیانداو لە شەڕدا کوژران.

بەنی نەزیر بوون بە دوو بەشەوە، بەشە زۆرەکەیان کە سێ لە سەرگەورەکانیانی تێدابوو، حویەی کوڕی ئەختەبو سەللامی کوڕی ئەبی حوقەیق و کەنانەی کوڕی رەبیع، چوون بۆ خەیبەر و بەشەکەی تریان چوون بۆ (أذرعات الشام) هەمان ئەو شوێنەی بەنو قەینوقاع بۆی چوون، دواتر خەیبەریش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو سێ پیاوە و لەوێوە ـ وەکو لەمەودوا باسی دەکەین ـ دەستیان کردە پیلان گێڕان دژی موسڵمانان.

**بەنو قورەیزە (بنوقريظه)**

جولەکەکانی بەنی نەزیر دەرسیان وەرنەگرت لەوەی بەسەریاندا هات لە ئەنجامی ئەو غەدرو خیانەتەی لە پەیامبەر ﷺ و موسڵمانانیان کرد، بەڵکو بەردەوام بوون لە پیلان گێڕان دژی موسڵمانان، بەڵام ئەمجارە بە شێوەیەکی تر. ئەویش بە هەوڵدان بۆ دروستکردنی بەرەیەکی گەورە دژی موسڵمانان، بەرەیەك کە هەموو عەرەبو نەیارانی ئیسلام تێیدا بەشداربن بۆ ئەوەی لە ریشەیان دەربێنن، ئەوە بوو بۆ ئەو مەبەستە تیمێکیان دروست کرد کە پێکهاتبوو لە (**سلام بن أبي الحقيق النضري)و (حيى بن أخطب النضري)و (كنانة بن أبي الحقيق النضري) و (هونة بن قيس الوائلي)و (أبو عمار الوائلي)** بە سەرۆکایەتی حەیی کوڕی ئەختەب و کەوتنە گەڕان بەناو عەرەبدا بۆ هاندانیان لە موسڵمانان و پێکهێنانی بەرەیەکی گەورەو لەشکرێکی گەورە بۆ ئەوەی هێرش بەرنە سەر موسڵمانانو لە ریشەیان دەربێنن، سەرەتا چوون بۆ لای قورەیش، دوژمنی بنچینەیی موسڵمانانو بیرۆکەی پرۆژەکەیان لا باسکردن، قورەیش پەسەندیان کرد، دوای ئەوە چوون بۆ لای غەتەفانو لای ئەوانیش باسیان کرد، و بە هەردوو لایان وت کە ئێمەش لەگەڵتاندا دەبین تا لە ریشەیان دەردێنین، غەتەفانیش رازی بوون بەو مەرجەی جولەکە داهاتی یەك ساڵی خەیبەریان بدەنێ، بەو شێوەیە لەشکرێکی (10) هەزار کەسی لە قورەیش وغەتەفان پێکهێنرا، قورەیش چوار هەزارو غەتەفان شەش هەزار هەمووشیان لە ژێر سەرۆکایەتی ئەبوسوفیاندا.

کاتێك پەیامبەر ﷺ ئەم هەواڵەی بیست، موسڵمانانی کۆکردەوە بۆ راوێژو لێکۆڵینەوە، لە ئەنجامدا گەیشتنە ئەو بڕیارەی کە کەندرێکی گەورە لێبدەن لەو شوێنانەی کە جێی مەترسی هێرش هێنانە بۆ سەریان، ئەوەبوو کەندرێکی گەورەی (پێنج هەزار باڵ)یان هەڵکەند، کە ماوەیەکی زۆری خایاند، شایانی باسیشە ئەو ساڵە ساڵێکی نەهات بوو، زۆربەی موسڵمانان هەژار بوون، زۆرێکیان ژیانیان لە رووی بژێوییەوە زۆر سەخت بوو، وەرزەکەشی زستانو کەشو هەوا زۆر سارد بوو.

پەیامبەر ﷺ کارەکەی بەسەر موسڵماناندا دابەش کردبوو، هەر دە کەس دەبوایە چل باڵ بەدرێژی و نۆ باڵ بە پانیو حەوت باڵ بە قووڵی هەڵکەنن، ئەم کارە یەك مانگی رەبەقی خایاند.

دوای ئەوەی جولەکەکان لەگەڵ قورەیش و غەتەفاندا نەخشەی هێرشەکەیان کێشا، حویەی کوڕی ئەختەب کەوتەڕێ بەرەو بەنی قورەیزە بۆ ئەوەی ئەوانیش قایل بکات لە پشتەوە هێرش بێننە سەر موسڵمانان، کاتێك حویەی گەیشتە بەردەرگای قەڵای بەنی قورەیزە سەرۆکی بەنی قورەیزە کەعبی کوڕی ئەسەد زانی نیازی خراپە، فەرمانیدا دەرگای لەسەر داخەنو نەهێڵن بێتە ژوورەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێت توانی قایلیان بکات بەوەی دەرگای بۆ بکەنەوە، ئەوە بوو دوای بێنەو بردەیەکی زۆر لە نێوان حویەی و کەعبدا توانی قایلی بکاتو پاشگەزبێتەوە لەو رێککەوتنامەیەی لە نێوان جولەکەو موسڵماناندا هەیەو بەو بیانووەی کە ئەمە هەلێکەو لە دەست نادرێتو دڵنیای کرد لەوەی کە ئەمجارە موسڵمانان دەرباز بوونیان بۆ نییە.

ئیبن هیشامو ماباقی نووسەرانی ژیاننامەی پەیامبەر ﷺ باسی ئەو هەوڵە زۆرە دەکەن کە حویەی داویەتی لەگەڵ کەعبدا تا قەناعەتی پێ کرد ئەو رێککەوتننامەیە هەڵبوەشێنێتەوەو بەشداری بکات لەو هێرشە سەرتاسەرییەدا بۆ سەر موسڵمانان.

با دەقی وتووێژەکەی حویەی کوڕی ئەختەبو کەعبی کوڕی ئەسەد لە سیرەی ئیبن هیشامەوە بگوێزینەوە:

ئیبن هیشام دەڵێت: دوژمنی خوا حویەی کوڕی ئەختەبی نەزری کەوتەڕێ بەرەو لای کەعبی کوڕی ئەسەدی قورەیزی سەرگەورەی بەنی قورەیزەو مۆرکەری رێککەوتننامەی نێوان بەنی قورەیزەو موسڵمانان، کاتێك کەعب هەواڵی هاتنی حویەی بیست فەرمانی دا دەرگای قەڵاکەی بەڕوودا دابخەن، حویەی بانگی لێ کرد ئەی کەعب دەرگام لێ بکەنەوە، کەعب وتی حویەی تۆ کابرایەکی بەدیووم (شووم)ی، منیش پەیمانم لەگەڵ موحەممەدا هەیەو پێشێلی ناکەم، لە وەفاو راستگۆیی زیاتر هیچم لێ نەبینیوە، حویەی وتی بیکەرەوە قسەم هەیە لەگەڵتدا، کەعب وتی دەرگات لێ ناکەمەوە، حویەی وتی سوێند بە خوا لەبەر ئەوە دەرگام لێ ناکەیتەوە پارووە نانێکت لەگەڵدا نەخۆم، ئەمە وایکرد کەعب دەرگای لێ بکاتەوە، حویەی وتی: بەدبەخت! سەربەرزیی هەمیشەییو دەریایەکی پڕ لە شەپۆلم بۆ هێناوی، قورەیشم بۆ هێناوی بە هەموو سەرکردەو پێشەواکانییەوە و لە (مجمع الاسیال) دامناون (شوێنێکە لە باکوری مەککە)، غەتەفانم بە هەمان شێوە بۆ هێناوی لە تەنیشتی چیای ئوحوددا دامناون، پەیمانیان داومەتێ تا موحەممەدو ئەوانەی لەگەڵیدان لە ریشە دەرنەهێنن نەگەڕێنەوە.

کەعب وتی: بەدبەخت خۆت (ویحك)! سوێند بە خوا زەلیلی رۆژگارو هەورێکت بۆ هێناوم کە ئاوەکەی رژابێو تەنها بروسکەو تریشقە لێدەداتو بێ ئەوەی هیچی تێدا بێ، بڕۆ لێم گەڕێو وازم لێ بێنە، من لە موحەممەد جگە لە وەفاو راستگۆیی هیچی ترم لێ نەبینیوە، حویەی وازی نەهێناو هەر هێنای و بردی تا قەناعەتی پێ کرد دوای ئەوەی کە حویەی پەیمانی قورسی دایێ کە ئەگەر قورەیش و غەتەفان بگەڕێنەوە بێ بەدەستهێنانی مەبەستەکەیان بێت لەگەڵیاندا لە ناو قەڵاکانیاندا بمێنێتەوەو چی بەسەر ئەواندا دێت بەسەر ئەمیشدا بێت، بەو شێوەیە کەعب ئەو رێککەوتننامەیەی کە لە نێوان خۆیو پەیامبەردا ﷺ هەبوو خستە ئەو لاوەو پێشێلی کرد.

کاتێك هەواڵ گەیشتە پەیامبەر ﷺ کە بەنی قورەیزە چوونەتە ناو ئەو هاوپەیمانێتییەوە دژی موسڵمانان، چەند نەفەرێکی نارد بۆ لایان کە بریتیی بوون لە سەعدی کوڕی موعازی سەرۆکی ئەوسو سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکی

خەزرەج و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو خەواتی کوڕی جوبەیرو پێی وتن: بچن بۆ لای بەنو قورەیزە و ببینن ئەوەی پێمان گەیشتووە دەربارەیان ڕاستە یان درۆیە، ئەگەر ڕاست بوو ئەوا بەشێوەیەك پێم ڕاگەیەنن کە تەنها خۆم لێی تێبگەن و ئاشکرای مەکەن بۆ ئەوەی خەڵکیی ورەیان نەڕوخێت، ئەگەر درۆش بوو ئەوا ئاشکرای بکەن بۆ خەڵکیی.

کاتێك نوێنەرانی پەیامبەر ﷺ گەیشتنە لای بەنی قورەیزە، بینییان زۆر لەوە خراپترن کە پێیان گەیشتووە، جنێو بە پەیامبەر ﷺ دەدەن و دەڵێن: پەیامبەری خوا کێیە؟ هیچ پەیمان و بەڵێنێك لە نێوان ئێمەو موحەممەددا نییە!

قسەیەکی زۆر کەوتە نێوان نوێنەرانی پەیامبەر ﷺ و جولەکە تا گەیشتە جنێو بەیەکتر دان لە نێوان جولەکەو سەعدی کوڕی عوبادەدا کە پیاوێکی تووڕە بوو، بەڵام سەعدی کوڕی موعاز کە پێشتر هاوپەیمانی بەنی قورەیزە بوو، پیاوێکی لەسەرخۆ بوو، سەعدی کوڕی عوبادەی ئارام کردەوەو وپێی وت "دەست لە جنێوو جنێوکاری هەڵگرەو ئەوەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە لەوە زیاترە".

پاشان سەعدی کوڕی موعاز رووی کردە بەنی قورەیزەو ئامۆژگاری کردن کە ئەو کارە نەکەن، چونکە دوایی پەشیمان دەبنەوەو لە بەنی نەزیر خراپتریان بەسەردا دێت، جولەکەکان بە گاڵتەپێکردنێکەوە وەڵامیان دایەوەو قسەیەکی زۆر ناشیرینیشیان پیێ وت، وتیان: "أكلت أير أبيك". واتە: (....) باوکتت خوارد. سەعدی کوڕی موعاز وتی: قسەی تر جوانترو شیاوتر بوو بۆتان بیکەن ئەی بەنی قورەیزە.

کاتێك نوێنەرانی پەیامبەر ﷺ گەڕانەوە سلاویان لێکردو وتیان: "**عضل والقارة**". واتە: وەکو غەدری عوزەل و قاڕەیە کە بە یارانی ڕەجیع کرا (ئەو دە کەسەی کە پەیامبەر ﷺ لەگەڵ پیاوانی عوزەڵ و قارەدا ناردنی و لەوێ بە غەدر کوژران)، پەیامبەر ﷺ فەرمووی: خوا گەورەترە، موژدەتان دەدەمێ ئەی موسڵمانان کە سەر دەکەون.

لەوەدوا موسڵمانان حاڵیان زۆر شڕ بوو، دوژمن لەسەرەوەو خوارەوە هێرشیان بۆ هێناون و بەنی قورەیزەش پەیمانەکەیان شکاندووەو چونەتە پاڵ هاوپەیمانان و دووڕووەکانیش کەوتنە جموجوڵ و دەستیان کردە ترساندنی موسڵمانان و ورە روخاندنیان، بە رادەیەك کە یەکێکیان بە ناوی موعتیبی کوڕی قوشەیر دەیوت: موحەممەد بەڵێنی دەداینێ کە لە گەنجینەکانی فارس و ڕۆم بخۆین، کەچی ئێستا هیچ کام لە ئێمە لە ژیانی خۆی دڵنیا نییە تا سەرئاو بچێت.

دوای ئەوە دووڕووەکان وردە وردە دەستیان کردە کشانەوە لە لەشکرەکە بە بیانوی ئەوەی کە ماڵەکانیان لە کەناری شارەو مەترسیی هێرشی دوژمنانیان هەیە بۆ سەریان، بەو شێوەیە تا دەهات لەشکری موسڵمانان روو لە کەمی بوو، ئەوانەی باوەڕیان لاواز بوو بە دوای دووڕووەکاندا بەرەکانی شەڕیان چۆڵ کرد تا وای لێهات ژمارەی ئەوانەی پاسەوانی کەندرەکەیان دەکرد چەند سەد کەسێك تێنەدەپەڕین، لەشکری قورەیشیش بە بەردەوامی و بەنۆبەت بەدەوروبەری کەندرەکەوە دەهاتن و دەچوون و تیریان بۆ موسڵمانان دەهاویشت و بەدوای هەلێکدا دەگەڕان کە هەندێك شوێنی ئەو کەندرە پڕکەنەوەو لێوەی بپەڕنەوە ئەوبەر، موسلمانانیش دەبوایە بە بەردەوامی چاودێری ئەو کەندرەیان بکردایە کە درێژییەکەی وەکو وتمان (5) هەزار باڵ بوو، واتە: نزیکەی یان زیاتر لە (5) کیلۆمەتر , لەو لاشەوە دەبوایە ئاگایان لە بەنی قورەیزە بێت لە پشتەوە هێرشیان بۆ نەهێنن.

موسڵمانان یەك مانگی رەبەق بەو شێوەیە و لەو سەختی و دژوارییەدا ژیانیان بە سەر برد، ترس و برسێتی و سەرما و شەونخونی و ڕەشەباو باران (کە زوو زوو هەڵیدەکرد) تا وایان لێهات وەکو خوا لە باسیاندا دەفەرموویت: **(إِذْ جَاؤُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَت الْأَبْصَارُ وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَا * هُنَالِكَ ابْتُلِيَ الْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا زِلْزَالاً شَدِيداً). (الأحزاب: 10ـ 11).**

واتە: یادی ئەوە بکەن کاتێك کە دوژمنان لە سەرەوەو لە خوارەوەتانەوە هاتن بۆ تان و چاوەکانتان لار بوو و دڵە کانتان گەیشتە گەروتان و گومانی سەیر سەیرتان بۆ دروست بوو بەرامبەر بەڵێنەکانی خوا, لەوێدا بڕواداران تاقی کرانەوەو دڵەکانیان بە توندی هێنرایە لەرزە.

ئەم بارودۆخە یەك مانگی خایاند تا خوا ڕەشەبایەكی وای بۆ هەڵكردن چادرەكانیانی لە ریشە دەردەهێنا و چیتر ئاگریان پێ نە دەكرایەوە و سەرمایەكی زۆر هەڵیكرد و توانای خۆڕاگرتنیان نەما و بە ناچاری و بێ ئەوەی هیچیان دەستكەوێت و بە پەلە كەوتنە خۆیان بۆ گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان و مەدینە بەجێبێڵن، بەو شێوەیە موسڵمانان ڕزگاریان بوو.

ئێستا ئەو بارودۆخە بێنە بەرچاوت و هەوڵ بدە خۆت بخەیتە ناو ئەو واقیعەوە و هەست و خەیاڵی خۆت بخەكار بۆ ئەوەی وێنەیەكی نزیك لەو وەزعەی موسڵمانانی تێدا بوو بكێشیت, ئینجا بزانە چ بڕیارێك دەدەیت بۆ بەنی قورەیزە؟

سزای كۆمەڵێك كە لەگەڵتدا نەك هەر ڕێككەوتننامەی ئاشتی و پێكەوەژیان و ڕێزگرتن لە یەكتری هەبێت, بەڵكو ڕێككەوتننامەی یارمەتی دانی یەكتر و بەرگریی هاوبەش هەبێت, بەڵام ئەوان نەك هەر بێلایەن نەوەستن، بەڵكو لەو كاتە ناسكەدا هەڵگەڕێنەوە لە هەموو بەڵێن و پەیمانەكانیان و هەرچی ڕێككەوتن هەیە بیخەنە ژێر پێوە و بچنە پاڵ دوژمنێك كە هاتووە بۆ بنەبڕ كردنی تۆ و كوشتنی هەرچی نێرینەت هەیە و بە تاڵانبردنی ژن و منداڵ و هەرچی سامانت هەیە, تۆ چ سزایەكیان دەدەیت؟

**ئایا ئەم سزایە بۆ بەنی قورەیزە زۆرە؟**

ئەگەر بهاتبایە پەیامبەر ﷺ خەڵكی بۆ نەناردنایە و ئاگاداری نەكردنایەتەوە و هەڕەشەی لێنەكردنایە و لەو ڕۆژە نەیترساندنایە دەمانتوانی بڵێین: باشتر وابوو پەیامبەر ﷺ لێیان خۆش بێت.

یان ئەگەر لانی كەم پێش شكستی لەشكری قورەیش و غەتەفان و كشانەوەیان پەشیمانی خۆیانیان دەربڕایە دیسانەوە دەمانتوانی بڵێین: دەبوایە موسڵمانان لێیان خۆش بن، بەڵام ئەوان تا دواساتی گەمارۆی مەدینە هەر سوور بوون لە سەر هەڵوێستی خۆیان و چەقۆیان لە موسڵمانان تیژ دەكرد و دانیان لێ دەسوون, ئیتر دوای ئەوە ماوەی لێخۆشبوون هەیە؟

ڕێكخراوی ئەلقاعیدە دوو باڵەخانەی لە ئەمریكا ڕوخاند كە (3) هەزار كەسی تێدا كوژرا, بەڵام ئەمریكا وڵاتێكی گەورەی وەكو ئەفغانستانی وێران كردو بە دەیان هەزاری لێ كوشت و دەربەدەركردن و هەزارەها بینا و خانوو دامودەزگای ڕوخاند بە سەریەكدا.

جولەكە لە فەلەستین سەرباری ئەوەی كە خۆیان داگیركەرن و فەلەستینیەكانیان لە شار و دێهاتی خۆیان دەركردووە, تاكو ئێستا دەیان قەسابخانەیان بۆ ناونەتەوە كە لە هەندێكیاندا ژمارەی كوژراو خۆی لە هەزاران كەس داوە لە ژن و پیاو و پیر و منداڵ, بۆ دابین كردنی ئەمن و ئاسایشی خۆیان چەندین جار هێرشیان بردۆتە سەر فەلەستینیەكان و هەرجارە و دەیان بگرە سەدان كەسیان لێ كوشتوون.، نە بێ ئەمە پیشەی ئەمڕۆیان بێت یان كاردانەوەیەك بێت بۆ ئەوەی كە لە بەنی قورەیزە و خەیبەردا بە سەریاندا هاتووە, بەڵكو گەر بچی تەورات بخوێنیتەوە دەبینی دەیان دەقی تێدایە هانی بەنی ئیسرائیل دەدات میللەتانی تر بنەبڕ بكەن یان بە كۆیلە بكەن و باسی چەندین حاڵەت دەكات كە تێیدا قەتڵوعامی میللەتانی تریان كردووە بە تایبەت كەنعانییەكان.[1]

ئەوانەی ڕەخنە لە هێرشەكەی موسڵمانان بۆ سەر بەنی قورەیزە دەگرن كە دەچێتە خانەی سزادانەوە بەرامبەر جینایەتێكی زۆر گەورە كە لەوەبەر باسمان كرد ئەی چی دەڵێن بە زلهێزەكانی ئەمڕۆ, ئەوانەی كە لافی مافی مرۆڤ لێدەدەن و شانازی بە جاڕنامەی مافی مرۆڤەوە دەكەن, كە تەنها لە سەر گومان یان نییەتی بەرامبەر, بێئەوەی هیچ كردەوەیەكی لێ دەركەوتبێت هێرشیان دەبەنە سەرو كوشتار و وێرانكاری دەكەن و قەسابخانەی گەورە گەورە دەنێنەوە.

ئەگەر ئەو ڕووداوەی لەو كاتەدا ڕوویدا دووبارە بێتەوە بەسەر هەر وڵاتێكدا, هەڵوێستو بەرخوردی ئەو وڵاتە چی دەبێت بەرامبەر ئەو لایەنانەی بەشدارییان لەو پیلانەدا كردووە, بە تایبەت ئەگەر بێتو خەڵكی ئەو وڵاتە بێتو ڕێككەوتننامەی بەرگریی هاوبەش و هاوكاریی هەبێت لە نێوانیاندا.

**گەڕانەوە بۆ باسی ڕەیحانەو صەفییە**

[1] ئاماژە بۆ چەند دەمێكی عەهدی كۆن.

زانیمان کە رەیحانە کچی یەکێك بوو لە گەورەپیاوانی بەنی قورەیزەو صەفییەش کچی حویەی کوڕی ئەختەبی دارێژەری پیلانەکانی هێرش کردنە سەر موسڵمانان بوو لە شەڕی خەندەقدا، یەکەمیان لە شەڕی بەنی قورەیزەدا بە دیل گیرا، دووەمیشیان لە شەڕی خەیبەردا.

پەیامبەر ﷺ لەو دوو شەڕەدا دەیتوانی زیاد لەو دووە ببات بۆ خۆی، چونکە بە دەقی ئایەت پێنج یەکی دەستکەوتی شەڕ بۆ پەیامبەرەﷺو ئازادە چی لێ دەکات (**وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لله خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ...**). (**الأنفال: 41**). بەڵام لە هەر شەڕێکیاندا تەنها یەك ئافرەتی هەڵبژارد بۆ خۆی ئەویش کچی یەکێك لە سەرانی جولەکە، بە پێی ئەو بنەمایەی کە پەیامبەر ﷺ داینابوو، ئەویش ریزگرتن بە سەرۆك هێزەکان کاتێك بە دیل دەگیران، (**أكرموا عزيز قوم ذل**) واتە: رێزبگرن لەسەرکردەی گەلێك یان هۆزێك کاتێك زەلیلو بێدەسەڵات دەبێت. ئەمەش بە ئاشکرا بەدی دەکرێت لە حاڵەتی صەفییەدا کە لە شەڕی خەیبەردا بە دیل دەگیرێتو دەکەوێتە پشکی یەکێك لە صەحابەکان بە ناوی دەحیەی کەلبی، یەکێکی تر لە یارانی پەیامبەر ﷺ دێت بۆ لای پەیامبەر ﷺ و پێی دەڵێت ئەی پەیامبەری خوا ﷺ کچی حویەی بە دیل گیراوەو بەر دەحیە کەوتووە بۆ تۆ باشترو شیاوترە، پەیامبەریش ﷺ دەنێرێت بە دوایداو پێی دەڵێت صەفییە بگێڕەوە ئافرەتێکی تر ببە.

پەیامبەر ﷺ رەیحانەو صەفییەش سەرپشك دەکات لەوەی کە دەیانەوێت بە کەنیزەکی بمێننەوە یان ئازادیان بکاتو بیانخوازێت، رەیحانە یەکەمیان هەڵدەبژێرێتو صەفییەش دووەم، بۆ بەموسڵمان بوونیشیان پەیامبەر ﷺ هیچ فشارێکیان ناخاتە سەر، بەڵکو بە ویستی خۆیان موسڵمان دەبن، صەفییە یەکسەر موسڵمان دەبێت، چونکە لەوەوبەر خەونی بینیوە لە خەویدا مانگ لە چواردە شەوەییدا دەکەوێتە ناو کۆشیەوە، خۆیشی وای شیدەکاتەوە کە دەبێت بە خێزانی پەیامبەر ﷺ، رەیحانەش دوای ماوەیەك موسڵمانێتی خۆی رادەگەیەنێت لەگەڵ ئەوەی کە کەنیزەك بوو، پەیامبەر ﷺ زۆری لێنەدەکرد موسڵمان بێت، بەڵکو زۆریشی پێخۆش بوو، پاداشتی ئەو کەسەشی دایەوە کە هەواڵی موسڵمانبوونی رەیحانەی بۆ هێنا.

وا پێدەچێت رازیی نەبوونی رەیحانە بۆ ئازادکردنی لەبەر ئەوە بووبێت کە پیاوەکەی خۆی زۆر خۆش دەویست و وەکو وەفایەك بۆ ئەو نەیویست ببێت بە ژنی پیاوێکی ترو بەوەش ویژدانی خۆی ئاسودە بکات، یان لەو سەرەتایەوە دڵی گەرم بوو و ئازاری زۆری پێگەیشتبوو لەبەر کوژرانی کەسوکاری ئیتر زۆر بە تەنگ دونیاوە نەمابوو چۆن بیباتە سەرو بۆ ئەو شتێکی مایەی دڵخۆشکەر نەمابوو، یان لەبەر ئەوە بوو کە ئازادبوونو بوون بە ژنی پەیامبەر ﷺ هەندێك کۆتو رێورەسمی بەسەردا فەرز دەکرد، ئەو ئامادە نەبوو پێوەی پابەند بێت و حەزی لە ژیانی کەنیزەکێتی کردبێت کە ئازادتر بوون لە ئازادەکان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بە تایبەت لە خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ.

یەکێکی تر لە هۆیەکانی خواستنی صەفییە ئەوەبوو کە ئەو کچی حویەی دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوو، کە ئەگەری ئەوە هەبوو ئەگەر بکەوێتە لای هەرکەسێکی تر رەچاوی هەستی نەکاتو قسە بدات لە دڵیو توانجی تێ بگرێتو زوو زوو قسە بە باوکی بڵێت، بەڵام پەیامبەر ﷺ وا نەبوو، زوو زوو دڵی دەدایەوەو هەوڵی دەدا دڵی بێنێتە جێو بەنەرمیو بە رێزەوە باسی هۆی کوشتنی باوکیو کەسوکارەکەی دەکرد تا دڵی هێنایە جێ.

صەفییە خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێت: داخی کوشتنی باوكو کەسوکارەکەم زۆر لە دڵدا بوو، پەیامبەر ﷺ ئەوەندە باسی هۆی ئەو کارەساتەی بۆ دەکردمو ناچاربوونی خۆی باس دەکرد لە ئەنجامدانی ئەو سزایە تاوەکو دڵم چاك بوو و هیچی تیا نەما.

لێرەدا دوو شت دەبینین، یەکەم: رێزگرتنی پەیامبەر ﷺ لە خێزانەکانی، دووەم: بایەخدانی بەوەی کە صەفییە دڵی گەردی تێدا نەمێنێتو لە راستیی مەسەلەکان تێبگات، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر صەفییە بکەوتایەتە لای هەر کەسێکی تر لە جیاتی ئەوەی دڵی بداتەوە زیاتر ئازاری دەدا، ئەم راستییەش بە زەقی دەبینین لە مامەڵەی هەندێك لە خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ لەگەڵ صەفییەدا.

رۆژێك صەفییە دێت بۆ لای پەیامبەر ﷺ و پێی دەڵێت: ئەی پەیامبەری خوا ﷺ خێزانەکانت تانەی ئەوەم لێدەدەن کە کچی حویەی دوژمنی تۆم، پەیامبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەم جارە وایان پێ وتی بڵێ: من باوکم پەیامبەرە (مەبەستی هارون بوو، چونکە ئەو لە نەوەی هارون بوو)، مامیشم پەیامبەرە (مەبەستی موسا بوو)، مێردەکەشم پەیامبەرە.

بەم شێوەیە پەیامبەر ﷺ هەموو رێگایەکی لەوان گرت کە تانەیان لە صەفییە دەداو رۆحییەتی صەفییەی وا بەرزکردەوە کە جارێکی تر هیچ قسەیەك کاری تێنەکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە شانازیی بکات بەسەر ئەوانی تردا، هۆیەکی گرنگی تر لە هۆیەکانی خواستنی صەفییە ئەوە بوو کە صەفییە کچی سەرگەورەی جولەکەو خێزانی یەکێك لە سەرکردەکان بوو، پلەو پایەی ئەو لەناو جولەکەدا دوای نەمانی باوك و مێردی هەر دەمێنێت، بەوەی کە کەوتە لای پەیامبەر ﷺ و موسڵمان بوو و هیچی لە دڵدا نەما کاریگەریی هەبوو بۆ سەر ئەوانەی تریش، هەروەکو چۆن لەوەی جوەیرییەدا بینیمان بە خواستنی ئەو هۆزەکەی موسڵمان بوون، بەهەمان شێوە خواستنی صەفییە و راگرتنی رەیحانە لای خۆی و موسڵمان بوونیان و پاك بوونەوەی دڵەکانیان کاریگەریی زۆری دەبوو بۆ سەر ئەوانی تر، ئەگەر موسڵمانیش نەبوونایە رقەکەیان کەمتر دەبوویەوە.

لێرەدا خاڵێکی تر هەیە کە دەلالەتی گەورەی هەیە لە سەر پەیامبەرێتی موحەممەد ﷺ ئەویش ئەوەیە کە نە صەفییەو نە رەیحانە ئەو رۆڵە نابینن کە (ئەستێر) ئەیبینێت لە مەملەکەتی فارسدا کاتێك کە مێرد بە پاشای فارس دەکات و وای لێدەکات تۆڵە لە ناحەزانی جولەکە بکاتەوەو جولەکە لە خۆی نزیك بکاتەوە، بە پێچەوانەوە صەفییەو رەیحانە دەبنە دوو موسڵمانی باش و لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیان هەڵدەدەنەوەو پەیوەندیی بە ئایینی پێشووەوە بە تەواوەتی دەپچڕێ.

لە کاتی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا یەکێك لە ناحەزانی صەفییە هەواڵ دەگەیەنێت بە خەلیفە کە صەفییە هێشتا مەیلی بۆ جولەکە ماوە، ئەوەتا رۆژانی شەممە هیچ کارێك ناکات و سەردانی قەبری جولەکەکان دەکات، عومەر دەنێرێت بە دوایداو پێی دەڵێت: بیستوومە شتێکی وا دەکەیت، ئەویش دەڵێت: من چۆن ئیشی وا دەکەم، دوای ئەوەی خوا رۆژی شەممەی بۆ گۆڕیمەوە بە رۆژێکی پیرۆزتر، بە نیسبەت چوونە سەر قەبرانیش ئەوە سەر لە قەبری دایك و باوك و کەسوکارم دەدەم کە ئیسلام هانی موسڵمانانی لەسەر دەدات.

**ماریای قیبتی**

ماریا کەنیزەکێك بوو مقەوقەسی ئەسکەندەریە بە دیاریی ناردی بۆ پەیامبەر ﷺ لەگەڵ خۆشکێکی بە ناوی سیرین‌و کۆیلەیەك بە ناوی مابورو هێسترێك‌و گوێدرێژێك‌و هەزار مسقاڵ زێڕو بیست کراسی نەرمی میسری. پەیامبەر ﷺ ماریای بۆ خۆی گلدایەوەو سیرینی بەخشی بە حەسانی کوڕی سابتی شاعیر.

باسی ماریا لە ژیاننامەکاندا زۆر نەهاتووە بەڵکو زیاتر لەلایەن فەرمودەناسەکان‌و موفەسیرینی قورئانەوە هاتووە ئەویش لە دوو بۆنەدا:

یەکەم: کاتێك منداڵێکی دەبێت‌و پەیامبەر ﷺ ناوی دەنێت ئیبراهیم‌و هەندێك کەس قسەی بۆ هەڵدەبەستن، ئەم رووداوە زیاتر لەلایەن زانایانی فەرمودەوە باس کراوە.

دووەم: لە باسی هۆی دابەزینی ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی (التحريم) کە دەفەرموویت: **"(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (التحريم: 1)**. ئەم رووداوەشیان لەلایەن موفەسیرانی قورئان‌و زانایانی فەرمودەوە باس کراوە، ئێمەش لێرەدا گفتوگۆ لەسەر هەردوو رووداوەکە دەکەین.

فەرمودەناسەکان (ئەوانەی ئاماژەیان بۆ ئەم رووداوە داوە) بە شێوازی جۆراوجۆر ئەم رووداوە دەگێڕنەوە، بەڵام خاڵی هاوبەش لە قسەکانیاندا ئەوەیە کە:

1ـ کاتێك ماریا ئەو منداڵەی دەبێت هەندێك قسەی بۆ هەڵدەبەستن کە گوایە ئەوە لە پەیامبەر ﷺ نییە بەڵکو لەو کۆیلەیە کە ناوی (مابور)ەو لە میسرەوە لەگەڵیدا هاتووە.

2ـ پەیامبەر ﷺ فەرمان دەدات بە نەفەرێك بچێت مابور بکوژێت.

3ـ ئەو کەسە دەبینێت مابور ئەندامی نێرینەی بڕاوەو هیچێکی نەماوە لەوانەی بتوانێت کاری سیکسی پێ ئەنجام بدات.

خاڵەکانی جیاوازیش لە نێوانیاندا ئەمانەن:

1ـ هەندێك دەڵێن پەیامبەر ﷺ بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی وتووە بچێت بیکوژێت‌و هەندێکیش دەڵێن بە عومەری کوڕی خەتتابی وتووە.

2ـ هەندێك دەڵێن ئەو کەسەی چووە بۆ کوشتنی مابور بینی وا لای ماریاو کە چاوی کەوت بەو نەفەرە لە ترسا هەڵهات‌و چووە سەر دارخورمایەك و دوایی کەوتە خوارەوەو کەوتە سەرپشت‌و لەشی دەرکەوت‌و بینرا ئەندامی نێرینەی نەماوە، هەندێکی تر دەڵێن ئەو نەفەرەی چوو بۆ کوشتنی لەناو بیرێکدا گرتی خۆی تێدا دەشۆردو دەستی گرت‌و هێنایە دەرەوە بینی ئەندامی نێرینەی نییە.

3ـ هەندێك لە ریوایەتەکان دەڵێن: مابور ئامۆزای ماریا بوو هەندێکیشیان دەڵێن خزمی نەبوەو هەندێکی تریش دەڵێن برای بووەو پیاوێکی پیر بووە (وەکو ابن الجوزی لە کتێبی **المنتظم دا)**.

4ـ هەندێك لە ریوایەتەکان دەڵێ: مابور هەر بە خەسێنراوی لە میسرەوە هاتبوو، هەندێکی تریش دەڵێن دوای ئەوەی هاتووە بۆ مەدینە خۆی خەساندوە یان خەسێنراوە.

ئەم خاڵە جیاوازانەی نێوان گێڕاوەکان (مرويات) و هەندێك خاڵی تریش وای کردووە لە هەندێك زانا رەخنە لەم ریوایەتانە بگرن‌و بەڕاستی نەزانن‌و بە هەڵبەستراویان لەقەڵەم بدەن. ئێمە هەندێك لەو ریوایەتانە دێنینەوە و رەخنەی رەخنەگرانیش باس دەکەین‌و دواتر گفتوگۆی خۆمانی لەسەر دەکەین:

**1ـ عن أنس بن مالك أن رجلاً كان يتهم بأم ولد رسول الله ﷺ فقال رسول الله ﷺ اذهب فأضرب عنقه، فأتاه علي رضي الله عنه، فإذا هو في ركي ـ أي بئر ـ يتبرد فيها، فقال له علي: اخرج، فناوله يده فأخرجه، فإذا هو مجبوب ليس له ذكر، فكف علي عنه، ثم أتى النبي ﷺ فقال: يارسول الله انه لمجبوب ماله ذكر". (رواه مسلم وأحمد في مسنده).**

واتە: لە ئەنەسەوە دەڵێت: پیاوێك تاوانبار دەكرا بەوەی كە لەگەڵ دایكی منداڵەكەی پەیامبەر ﷺ(واتە ماریا) پەیوەندی ناشەرعی هەبێتو ئەو منداڵە لەو بێ، پەیامبەر ﷺفەرمووی برۆ بدە لە ملی، كاتێك عەلی چوو بیكوژێت بینی وا لەناو بیرێكدا خۆی فێنك دەكاتەوە، (خۆی دەشوات) پێی وت: وەرە دەرەوە، عەلی دەستی گرتو هێنایە دەرەوە بینی شەرمی (ئەندامی نێرینەی) براوەو هیچی لێ نەماوەتەوە، هات بۆ لای پەیامبەر ﷺو پێی وت: ئەی پەیامبەری خوا ﷺئەو هیچی لە ئەندامی نێرینەی نەماوە، ئەمە ریوایەتی ئیمامی موسلیمو ئیمامەی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە.

لە ریوایەتێكی تردا كە ئەلبەزاز لە كتێبەكەیدا (المسند) دەیگێڕێتەوە دەڵێت: لە عەلییەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: قسەی زۆر كرا لەسەر ماریای دایكی ئیبراهیم و قیبتییەكی ئامۆزای كە زوو زوو سەری لێدەدا (كە گوایە ئەو منداڵە لەوە نەك لە پەیامبەر ﷺ), پەیامبەر ﷺپێی وتم: ئەم شمشێرە هەڵگرە و برۆ گەر ئەو ئامۆزایەت لای ماریا بینی بیكوژە, وتم: ئەی پەیامبەری خوا ﷺلە فەرمانەكەتدا وەكو ئاسنی سوورەوەكراو بم هیچ شتێك نەمگێڕێتەوە لەوەی فەرمانت پێكردووم یان ئەوەی لەو شوێنە ئامادەیە شتانێك دەبینێت ئەو كەسانە نایبینن كە لەوێ ئامادە نین؟ فەرمووی بەڵكو ئەوەی ئامادە بوو دەیبینێ كەسێكی تر نایبینێ كە لەو شوێنە نییە، شمشێرەكەم هەڵگرت و كەوتمە رێ بۆ ماڵی ماریا, بینیم ئەو كورە وا لەوێ, شمشێرەكەم هەڵكێشا, كاتێك ئەوەی بینی ترسا و هەڵهات و چووە سەر دارخورمایەك, پاشان خۆی هەڵدایە خوارەوە و بەسەر پشتدا كەوت, كاتێك گەڵۆگونی دەركەوت دەبینم دەزگاكەی براوە و هیچێكی لێ نەماوە, نە زۆر نە كەم, شمشێرەكەم كردە ناو كیفەكەیو هاتمەوە بۆ لای پەیامبەر ﷺو ئەو هەواڵەم پێ راگەیاند, ئەویش فەرمووی: "سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە شتی خراپمان لێ دوور دەخاتەوە ئێمەی ئەهلی بەیت".[1]

حاكمیش لە (المستدرك ج 3 ص39)دا لە سەر زمانی عائیشە دەڵێت: ماریا لەگەڵ كوڕێكی ئامۆزایدا پێشكەش بە پەیامبەر ﷺكرا, دوای ئەوەی پەیامبەر ﷺسەرجێی لەگەڵدا كردو دووگیان بوو, لای كورە مامێكی داینا, عائیشە دەڵێت: خەڵكانی بوختانچی و قسەهەڵبەستوتیان: لەبەر حەز و پێویستی بە كوڕ, كوڕی خەڵكانی تری كرد بە كوڕی خۆی.

ماریای دایكی شیری كەم بوو پێغەمبەر ﷺمەڕێكی شیردەری بۆ كڕی و شیری ئەو مەڕەی پێدەدا, بەوە منداڵەكە گۆشتی گرت و قەڵەو بوو.

عائیشە دەڵێت: رۆژێكیان هێنایان بۆ لای پەیامبەر ﷺلێی پرسیم چۆنی دەبینی؟

وتم: ئەوەی بە گۆشتی مەڕ بە خێو بكرێت گۆشت بە باشی دەگرێت.

پەیامبەر ﷺوتی: لێك چوونیش نییە؟ دەڵێت (عائیشە): ئەو ئەیرەییەی تووشی ژنان دەبێت وای لێكردم بڵێم هیچ لێكچوونێك لە نێوانتاندا نابینم.

دەڵێت: بوختان و قسە هەڵبەستراوەكان گەیشتنە بەر گوێی پەیامبەر ﷺئەویش بە عەلی وت: ئەم شمشێرە هەڵگرە و برۆ لە هەر كوێیەك ئامۆزاكەی ماریات بینی بدە لە ملی.

دەڵێت: عەلی كەوتە رێ بینی وا لە ناو باخێكدایە چووەتە سەر دارخورمایەك خورما دەخوات.

[1] روى البزارنى مسند عن علي رضي الله عنه قال: كثر علي مارية أم أبراهيم في قبطي ابن عم لها, كان يزورها و يختلف اليها, فقال لي رسول اللة(ص): خذ هذا السيف فانطلق, فأنة وجدتة عندها فاقتلة, قلت يارسول اللة, أكون في أمرك اذا أرسلتنى كالسكة المحاة لايثيننى شء حتي أمضي لما امرتنى بة ام الشاهد يرى مالا يرى الغاعب؟ فقال: الشاهد يرى مالا يرى الفاعب. فأقبلت موشح السيف, فوحدثة عندها, فاخترطت السيف, فلما رأنى أقبلت نحوة تخوف اريدة, فأتى نخلة فرقى فيها. ثم رمي بنفسة علي قفاة ثم شعر برجلة, فا بة احب أمسح, مالة قليل ولا كثير فعدث السيف ثم اتيت رسول اللة فأخبرتة فقال: الحمداللة الذي يصرف عنا اهل البيت.

کاتێك چاوی بە عەلی کەوت ترس دایگرت و پەشتەماڵەکەی لێی کەوت و دامێنی دەرکەوت, بینی ئەندامی نێرینەی نییە و لە بنا بڕاوە.[1]

ئەمانەی سەرەوە ئەو ڕیوایەتانە بوون کە دەربارەی ئەم مەسەلەیە هاتووە, جگە لەو ڕەخنانەی لە پێشیانەوە باسمان کرد چەندین ڕەخنەی تر لە ناوەڕۆکی ئەو ڕیوایەتانە دەگیرێن. لەوانە:

1- ئەم ڕووداوە شتێکی گەورەیە لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ ڕوویداوە، بەڵام قورئان هیچ ئاماژەیەکی پێنەداوە لە کاتێکدا کە هەموو دەزانین قورئان لە ئاستی ئەو جۆرە ڕووداوانە بێدەنگ نەدەبوو، ئەوەتا قورئان بخوێنەرەوە دەبینی ڕووداوی زۆر لەوە سادەتر و کەم بایەختر لە ژیانی پەیامبەر ﷺ ئاماژەی پێ دراوە و باس کراوەو ئەوەندەش زۆرن ناکرێت بەم پەلەییە باس بکرێن، هەر کەسێکیش دەیەوێت زیاتر ئاشنایی پەیدا بکات با تەماشای پێڕستی **(مفردات القرآن)** بکات لە بابەتی موحەممەد لاپەرە 254.

2- هەروەها کتێبەکانی ژیاننامە هیچیان ئاماژەیان بەم ڕووداوە نەداوە سەرەڕای گرنگیەکەی و ئەو ئازارەی بە پەیامبەری ﷺ گەیاندووە.

3- لەو ڕیوایەتانەوە دەردەکەوێت کە پەیامبەر ﷺ بێ ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەك لەگەڵ مابور یان ماریادا بکات فەرمانی کوشتنی مابور دەدات, ئەمەش پێچەوانەی سروشتی پەیامبەر ﷺ و ڕێنماییەکانی قورئانە.

4- ئەگەر ڕاست بێت پەیامبەر ﷺ فەرمانی داوە مابور بکوژرێت، دەبوایە فەرمانی کوشتنی ماریاش دەربکات، چونکە ئەگەر پەیوەندییەکی نا شەرعی لە نێوانیاندا هەبوو بێت بە ڕەزامەندی هەر دوولا کراوە و هەردوو کیان وەکو یەك بەشدارن لەو تاوانەدا, بەڵام نە مێژوو، نە زانایانی فەرموودە هیچ شتێکیان لەو بارەوە نەوتووە.

5- ڕیوایەتەکان باسی ئەو کەسانە ناکەن کە بوختانەکەیان کردو ئەو تۆمەتەیان بۆ ماریا و مابور هەڵبەست کێن و پەیامبەر ﷺ چی لەگەڵدا کردن دوای ئەوەی بێتاوانی مابور دەرکەوت, ئاشکراشە کە ئەو کەسانەی بوختان بۆ موسڵمانی بێتاوان هەڵدەبەستن سزاکەیان ئەوەیە هەشتا جەڵدەیان لێبدرێت.

6- ئاشکرایە کە سزای ئەو کەسەی زینای کردبێت ئەگەر کوڕ بێت و ژنی نەهێنابێت یان کچ بێت و شووی نەکردبێت لێدانی صەد جەڵدەیە لەگەڵ یەکساڵ دوورخستنەوەی کوڕەکە, بەڵام کۆیلە و کەنیزەك نیوەی ئەو سزایە دەدرێن، ئەگەر پیاو و ژنی ئازاد زینایان کرد بەرد باران دەکرێن تا مردن، بەڵام سزای کۆیلە نیوەی ئەوەیە واتە تەنها جەڵدە لێدانە, کەواتە بە هیچ شێوەیەك ئەو سزایە لەگەڵ تاوانەکەی مابوردا هاوسەنگ نییە.

7-ڕیوایەتەکان باسی ئەوە ناکەن کە کاتێك عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەواڵی بێ ئەندامی مابوری بۆ پەیامبەر ﷺ هێنا, پەیامبەر ﷺ چی کرد جگە لەوەی کە لەبەر خۆیەوە سوپاسی خوای کرد, لە کاتێکدا کە ئاوها ڕووداوێك پێویست بەوە دەکات ئەو شتە جاڕی بۆ بدرێت یان بە لایەنی کەمەوە ئەو کەسانەی ئەو شایعەیانە بڵاو کردۆتەوە و ئەوانەی پێیان گەیشتبوو بانگ بکرێن و شتەکەیان لا باس بکرێت.

8- گونجاوتر وا بوو پەیامبەر ﷺ لە جیاتی ئەوەی بە عەلی بڵێت بڕۆ مابور بکوژە بڵێت بڕۆ بیهێنە بۆ ئێرە با لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەین, ئەو کاتە پەیامبەر ﷺ بە چاوی خۆی حاڵەتەکەی مابوری دەبینی و دەیتوانی خەڵکانێك

[1] أهديت ماية الى رسول اللة ﷺ أبن عم لها, قالت: فوقع عليها وقعه فاستحرت حاملاء. قالت: ففر لها عند ابن عمها, قالت: فقال أهل الافك و الزور: من صاحبه لي الولد أوعى ولد غيرة, وكانت أمة قليلة اللبن, فاتباعت له ضاءنه ابون, فكان يغذي بلبنها, فحسن عليه لحجه. قالت عائيشه: فدخل به على النبى ﷺ ذات روم فقال: كيف ترين؟ فقلت: من غذي بإسم الصأن عين لححة. قال: ولا الثية؟ قالت: فحلتني ما يحمل النساء من الغيرة ان قلت: ما أرى شبها. قالت: وبلغ رسول الله ﷺ ما يقول الناس فقال لعلي: خذ هذا السيف فانطلق فاضرب عنق ابن عم مارية حيث وجدته. قالت: فانطلق ماذا هو في حاءط على نخلة يخترف رطبا. قال: فلما نطر الى على وقفه السيف استقبلته رعدة. له ما للرجال شآ محوح. المستدرك ج3 ص39

بکاتە شایەت لە سەری، ئاشکراشە کە پەیامبەر ﷺ هەمیشە باشترین و گونجاوترین کاری کردووە, لەبەر ئەوە بە عەقڵی کەسەوە ناچێت کەسێکی دانای وەکو پەیامبەر ﷺ هەنگاوێکی وا دانایانە بە جێ بهێڵی و ڕێگەچارەیەك بگرێتە بەر کە جێی رەخنەیە.

9- ئەوە لە کەسایەتی و سروشتی پەیامبەر ﷺ ناوەشێتەوە کەسێك کە بە دیاریی لەلایەن کەسایەتییەکی گەورەوە پێی درابێت لە سەر بوختانێکی بێبەڵگەو بەبێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك بکوژێت.

10- ئاشکریە کە ئەم ڕووداوە دەشوبهێتە ڕووداوی ئیفك (ئەو بوختانەی بۆ عائیشەو صەفوانی کوڕی موعەتەڵ هەڵبەسترا), کەچی هەڵوێستی پەیامبەر ﷺ زۆر جیاوازە لە هەردوو حاڵەتەکەدا, لێرەدا فەرمان بە کوشتنی مابور دەدات بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەك، بەڵام بۆ صەفوان بڕیارێکی لەو جۆرە دەرناکات.

لەوێدا لەگەڵ عائیشەدا لێکۆلینەوە دەکات کەچی لێرەدا هیچ بە ماریا ناڵێت, ئەمەش جگە لە ناڕاستی ئەو ریوایەتانە هیچی تر ناگەیەنێت...

حاڵەتی دووەمیش کە باسی ماریای تێدا هاتووە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموویت: **"يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ". (التحريم: 1)**. زانایانی تەفسیر دوو هۆ بۆ دابەزینی ئەم ئایەتە باس دەکەن، یەکەمیان ئەوەیە کە پەیامبەر ﷺ لای یەکێك لە خێزانەکانی مابوویەوە هەنگوینی خواردبوو، ژنەکانی تری ئەوەیان پێ ناخۆش دەبێت کە دەبینن هەموو جارێك لای ئەو خێزانەی (بە گوێرەی ریوایەتە راستەکان زەینەب بووە) بمێنێتەوە بۆیە لە نێوان خۆیاندا ڕێکدەکەون کە پێی بڵێن بۆنی دەمت ناخۆشە، ئەویش لەبەر ئەوەی هەمیشە لەناو کۆڕو مەجلیس و لە نوێژدا بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو بۆنی دەمی بێت، بە ڕادەیەك کە بە یارانی دەفەرموو هەر کامێك لە ئێوە لەم ڕووەکانەی خوارد (مەبەستی پیازو سیرو کەوەر بوو) نەیەتە کۆڕو مەجلیسمانەوە، لەبەر ئەوە بڕیار دەدات چیتر لەو خواردنە نەخوات کە زەینەب دەیداتێ و پێشیان دەڵێ لای کەس باسی نەکەن، ئەم ڕووداوە بوخاری و موسلیم و ئەبوداود و نەسائی و ئەحمەد ریوایەتی دەکەن.[1]

ریوایەتی دووەم ئەوەیە کە ڕۆژێکیان پەیامبەر ﷺ لە ژوورەکەی حەفصە دەبێت، حەفصە ئیزنی لێدەخوازێت بچێت سەردانی باوکی بکات، ئەویش ئیزنی دەدات و پاشان دەنێرێ بە دوای ماریاداو لە ژوورەکەی حەفصەدا سەرجێی لەگەڵدا دەکات، کاتێك حەفصە دێتەوەو بەو مەسەلەیە دەزانێت تووڕە دەبێتو گلەیی لە پەیامبەر ﷺ دەکات کە چۆن ئەو کارە لە ژوورەکەی ئەودا دەکات، ئەویش دەڵێت تۆ دڵگران مەبە ئێستە بە دوای ماریا لەسەر خۆم حەرام دەکەم، ئەم ریوایەتەش تەبەری و ابن اسحاق و واحدی ریوایەتی دەکەن، بەڵام هەموویان کەسانی لاواز لە ڕستەی گێڕانەوەکەیاندا هەیەو هەموو ریوایەتەکان لاوازن وەکو لەمەودوا باسی دەکەین، جگە لەوەی کە ڕووداوی یەکەم گێڕانەوەکەی ڕاستترەو گەورە ئیمامانی فەرموودە ریوایەتی دەکەن وەکو بوخاری و موسلیم و نەسائی و ئەبوداود و ئەحمەدو زیاتر لەگەڵ دەقی ئایەتەکەو کەسایەتی پەیامبەر ﷺ و لۆژیکدا دەگونجێت، ئیمامی نەوەویش لە ڕاڤەی فەرموودەکەدا لە (شرح صحيح موسليم)دا دەفەرموویت: ریوایەتی یەکەم ڕاستەو لە بوخاری و موسلیم و کتێبە سەحیحەکانەوە هاتووە، ریوایەتی دووەمیش کە باسی ماریایە لە ڕێگای سەحیحەوە نەهاتووە.[2]

ئەمانەش دەقی هەندێ لەو فەرموودانەیە:

**1ـ وأخبرنا عبدالواحد (بن احمد) المليحي أخبرنا أحمد بن عبدالله النعيمي أنا محمد بن يوسف ثنا محمد بن اسماعيل ثنا الحسن بن محمد (بن) الصباح ثنا الحجاج عن ابي جريج قال: زعم عطاء انه سمع عبيد بن عمير يقول:**

---

[1] بخاری 6691، مسلم 1474. أبوداود 3741. نسائی 151/6،. 13/7و 71. أحمد 221/6.

[2] تەفسیری مامۆستا مەلا عوسمان لاپەڕە 396ـ 3979.

سمعت عائشة (رضي الله عنها) تقول: أن رسول الله ﷺ كان يمكث عند زينب بنت جحش فيشرب عندها عسلاً فتواصيت أنا وحفصة ان ايتنا دخل عليها النبي ﷺ فلتقل انى اجد منك ريح مغافير، أكلت مغافير، فدخل على احداهما فقالت له ذلك، فقال: "لا بأس شربت عسلاً عند زينب بنت جحش ولن أعود له". فنزلت: "يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ..... الى قوله تعالى: إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ". (التحريم : 4). لعائشة وحفصة. "وإذ أمر النبي الى بعض أزواجه حديثا لقوله بل شربت عسلاء أخرجه البخاري **6691**. مسلم **1474**، وأبوداود **3714**، النسائي **151/6**، **13/7**و أحمد **221/6** من طرق عن الحجاج.

واخرجه البخاري برقم **4912** من طرق بن يوسف عن ابن جريح، وأيضا في البخاري برقم **5267** عن الحسن بن محمد بهذا الاسناد.[1]

2ـ وبهذا الاسناد قال: حدثنا محمد بن اسماعيل انا ابراهيم بن موسى ان هشام بن يوسف عن ابن جريج عن عطاء باسناده وقال قال "لا ولكن كنت اشرب عسلا عند زينب بنت جحش فلن اعود له، ولقد حلفت فلا تخبرى بهذا احدا" يبتغى بذلك مرضات ازواجه صحيح البخارى **4912**.[2]

3ـ وقال المفسرون: وكان رسول الله ﷺ تقسم بين نسائه، فلما كان يوم حفصة استأذنت رسول الله ﷺ في زيارة ابيها فاذن لها، فلما خرجت ارسل رسول الله ﷺ الى جاريته ماريا القبطية فادخلها بيت حفصة، فوقع عليها فلما رجعت حفصة وجدت الباب مغلقا، فجلست عند الباب فخرج رسول الله ﷺ ووجهه يقطر عرقا، وحفصة تبكى فقال: ما يبكيك؟ فقالت: انما اذنت لي من أجل هذا، ادخلت امتك بيتى ثم وقعت عليها في يومى وعلى فراشي اما رأيت لي حرية وحقا، ما كنت تصنع بامرأة منهنن فقال رسول الله ﷺ "اليست هى جاريتى احلها الله لي، اسكتي فهذا حرام علي التمس بذلك رضاك، فلا تخبري بذلك امرأة منهن". فلما خرج رسول الله ﷺ قرعت حفصة الجدار الذى بينها وبين عائشة فقالت: الا أبشرك أن رسول الله قد حرم عليه أمته مارية، وقد أراحنا الله منها، واخبرت عائشة بما رأت، وكانتا متصافيتين متضاهرتين، على سائر أزواج النبي ﷺ فغضبت عائشة فلم تزل بنبي الله ﷺ حتى حلف ان لا يقربها، فنزل الله عزوجل: "يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ...". يعني العسل ومارية " تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ". وأمره ان يكفر يمينه ويراجع امته.

أخرجه الواحدى وفى اسناده عبدالله بن شبيب وهو ضعيف، واخرجه الطبري **3497**. واسناده ضعيف فيه عنعنة ابن اسحاق.[3]

بۆ ئەو کەسانەی شارەزاییان لە زانستی فەرمودەدا هەیە جیاوازیی لە نێوان ئەم فەرموودانەدا دەزانێت لە رووی راستیو هێزو متمانەپێکردنی رشتەی گێرانەوەکەی، ئەوەندە بەسە کە روداوی یەکەم لە گێڕانەوەی ئیمامی بوخاریو موسلیمو نەسائیو ئەبوداود و دووەم لە گێڕانەوەی " **طبری و واحدي** "یە.

لە رووی ناوەڕۆکی ئەو دوو ریوایەتەشەوە دەڵێین:

1ـ روداوی یەکەم واتە رێککەوتنی عائیشەو حەفصە لەسەر ئەوەی بە پەیامبەر ﷺ بڵێن بۆنی دەمی دێت زۆر زیاتر لەگەڵ رۆحی دەقەکانو کەسایەتی پەیامبەر ﷺو لۆژیکدا دەگونجێت، چونکە مەسەلەی بۆنی دەم، لە لای پەیامبەر ﷺ زۆر شتێکی گرنگ بوو، نارەحەت بوونی حەفصەو عائیشە لەوەی کە پەیامبەر ﷺ هەموو عەسرانێك لای زەینەب زیاتر دەمایەوەو هەنگوینی دەخوارد شتێکی ئاساییە لە سروشتی ژناندا و ئایەتەکانی دوای ئەوە بە راشکاوی ئاماژە بە پیلانو

---

[1] تفسير البغوي ج5 ص116. تحقيق عبدارزاق المهدي طبعة دار أحياء التراث العربي.

[2] هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو 116ـ 117.

ڕێککەوتننامەی نێوان ئەو دوو ژنەی پەیامبەر ﷺ دەدات. "إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ". بەڵام لە ڕووداوی ماریەدا هیچ ڕێککەوتنامەو پیلان گێرانێك بەدی ناکرێت، تەنها ئەوە نەبێت کە حەفصە لە پەیامبەر ﷺ دڵی دێشێ‌و گلەیی زۆری لێدەکات‌و پەیامبەریش ﷺ بەڵێنی دەداتێ چیتر نزیکی ماریا نەکەوێتەوە واتە پیلان گێڕان لە ڕووداوی هەنگوینەکە بەزەقی بەدی دەکرێت، بەڵام لە ڕووداوی ماریەدا هیچ شتێك لەو بابەتە بەدی ناکرێت. ئایەتەکەش باسی ڕێککەوتنی نێوان دوان لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکات.

2ـ بە نیسبەت ڕووداوی ماریەوە جگە لەوەی کە سەلماندمان لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا ناکۆکە، لەگەڵ لۆژیك‌و کەسایەتی پەیامبەریشدا ﷺ ناکۆکە.

ئەگەر ئەوە بزانین کە پەیامبەر ﷺ ماریەی لە شوێنێکی تایبەت بە خۆی (واتە بە ماریا) دانابوو ئەو کاتە دەزانین کە پێویستی بەوە نەبوو کە ئاوها کارێك لەگەڵ حەفصەدا بکات‌و لە ڕۆژی ئەوو لە ژووری ئەودا سەرجێی لەگەڵ ماریادا بکات، ئیزنی ئەو بدات بچێتەوە ماڵی باوکی‌و دوایی بنێرێت بە دوای ماریادا، بێ ئەوەی بزانێت حەفصە چەندی پێدەچێت لە ماڵی باوکی و کەی دەگەڕێتەوە.

ئەوەی پەیامبەر ﷺ بناسێت دەزانێت هەرگیز کارێکی وای نەکردووە بۆنی فریودانی لێ بێیت لە شەڕدا نەبێت کە نەخشەو پیلان گێڕان بەشێکی سەرەکییە تێیدا.

دەرئەنجامی باسەکە ئەوەیە کە هەردوو ئەو ڕووداوەی ماریای تێدا باس کراوە هەڵبەستراوو بێبنەمان.

## ژمارەی خێزانەکانی پەیامبەر ﷺ

ئەوەی کە مێژوونووسان‌و نووسەرانی ژیاننامەی پەیامبەر ﷺ و فەرمودەناسان لەسەری کۆکن ئەوەیە کە پەیامبەر ﷺ لە ژیانیدا یازدە ژنی هێناوە، دوویان لە ژیانی خۆیدا کۆچی دواییان کرد کە خەدیجەو زەینەبی کچی خوزەیمەی کچی حارس‌و نۆشیان دوای خۆی کۆچی دواییان کرد لەگەڵ دوو کەنیزەك: ماریای قیبتی‌و ڕەیحانەی کچی زەید.

### ئەوانەی پەیامبەری خوا ﷺ داوای کردن‌و سەری نەگرت‌و ئەوانەی خۆیان پێشکەشی پەیامبەر ﷺ کرد

وەکو وتمان مێژوونووسان کۆکن لە سەر ناوی ئەو یازدە ژنەی پەیامبەر ﷺ، بەڵام دەربارەی ئەوانەی کە خۆیان پێشکەش بە پەیامبەر ﷺ کردو ئەوانەی داوای کردن وسەری نەگرت یان پێش ئەوەی بچێتە لایان تەڵاقی دان ناکۆکن‌و پەشێوییەکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا، ئەویش لەبەر ئەوەیە کە ئەو ژنانە موشەڕەف نەبوون بەوەی ببن بە خێزانی پەیامبەر ﷺ و بە تەواوی بناسرێن، ئەمەش شتێکی ئاساییە کە ئەو جۆرە کەسانەی بە شێوەیەکی کاتی‌و سەرپێیی وابەستەبوون بە پەیامبەرەوە ﷺ نەناسرێن‌و ناویان بە تەواوی نەزانرێت‌و ئەو بایەخەیان پێنەدرێت.

ئەمە شتێکی ئاساییە، بەڵام ئەوەی کە ئاسایی نییە ئەوەیە کە ئەوانە بە خێزانی پەیامبەر ﷺ لە قەڵەم بدرێن یان هەندێك کەس بیکەنە ڕەخنە لەسەر پەیامبەری خوا ﷺ ئەمەش ڕێك وەکو ئەوە وایە کەسێك داوای دە کەسی کردبێت‌و یەکێکیان سەری گرتبێت ڕەخنەی ئەوەی لێ بگیرێت کە خوازبێنی دە کەسی کردووە و هەردەیان بە خێزانی ئەو کەسە لە قەڵەم بدرێن وەکو ئەوەی هەر دەیانی خواستبێت، لەم ڕوانگەیەوە هەندێك لە دوژمنانی ئیسلام هەوڵ دەدەن هەرچی ناوێك هاتبێت لە ژیانی پەیامبەردا ﷺ لەوانەی خۆیان پێشکەش کردووە یان داوای کردوون و سەری نەگرتووەو بیکەن بە ڕەخنە لەسەری با هەندێك جاریش یەك کەس بە چەند ناوێك ناسرابێت یان چەند ناوێك ئاماژە بێت بۆ یەك نەفەر، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی لیستەکە درێژ بکەنەوەو ناوەکان زیاتر بکەن.

## بۆچی ئیسلام ڕێگەی بە کەسی تر نەداوە وەکو پەیامبەر ﷺ زیاد لە چوار ژن بهێنێ؟

ئەم نهێنییە هەموو کەسێك پەی پێ نابات و دەرکی ناکات بە تایبەت ئەوانەی کە پەیامێکیان نییە لە ژیانداو هەموو شتەکان لە روانگەی هەستەکانیانەوە دەبینین‌و لە بایەخی لایەنە مەعنەوییەکان تێناگەن.

بەڵام ئەوانەی کە پەیامێکیان هەیە لە ژیاندا یا کەسانی سیاسیی یا کۆمەڵایەتی گەورەن گرنگی ژن هێنان یان تێکەڵی لە ڕێگەی ژنهێنانەوە دەزانن لەسەر بەرەوپێشچوونی پەیامەکانیان‌و چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان بە تایبەتی لەو سەردەمانەی پێشوودا، ئەم راستییە لە نێوان پاشاو میرو گەورەپیاوانی ئەوروپادا بە جوانی بەرجەستە کرابوو.

خوای گەورەش کە ڕێگەی بە پەیامبەردا ﷺ فەرەژنی بکات بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە بوو خزمەتی بانگەوازەکە و پەیامەکەی خۆی پێبکات‌و وەکو ڕێگەیەك بەکاری بێنێت بۆ پەرەدان بە ئایینەکەی یان لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێگەی.

ئەم راستییە لەوانەیە هەندێك لە خێزانەکانی پەیامبەریش ﷺ دەرکیان نەکردبێت بۆیە کاتێك ئافرەتێکی وەکو صەفییە یا رەیحانە دێنن بۆ لای پەیامبەر ﷺ کەسێکی وەکو عائیشە بە پێوەری خۆی شتەکان دەپێوێت، بەڵام پەیامبەری خوا بە پێوەرێکی ترو بۆ مەبەستێکی تر ئەو کارە دەکات.

بەڵی ئیشەکە یەك ئیشە بەڵام لێکدانەوەو مەبەستەکان جیاوازن.

یەکێکی وەکو عائیشە لایەنە جوانییەکەی بە هۆکاری هێنانی صەفییەو رەیحانەو هەندێکی تر لە ژنەکانی پەیامبەر ﷺزانیوە، بەڵام پەیامبەر ﷺ زۆر لەوە دوورترو گەورەتر بیری کردۆتەوە، پەیامبەر ﷺ پێش هەموو شتێك بەرژەوەندیی ئایینەکەی خوێندۆتەوە، ئەوەتا جوانترین ئافرەتی قورەیش بە دیل دەگیرێت لای موسڵمانان، پەیامبەر ﷺ لەو کەسەی وەردەگرێتەوەو دەینرێتەوە بۆ مەککە لەبەرامبەر بە ئازادکردنی چەند دیلێکی موسڵمانان.[1]

لەوانەیە کەسێکی وەکو عائیشە لەو کاتەدا لەوێ بووایەو ئەو ئافرەتەی ببینایە ترسی ئەوەی لێ بنیشتایە کە پەیامبەر ﷺ لەبەر جوانییەکەی دەیخوازێت، بەڵام، چونکە پەیامبەر ﷺ غەمی ئایینەکەی زیاتر مێشکی قاڵ کردبوو ئەو کارەی نەکرد بەڵکو یەکسەر ناردییەوە بۆ مەککە.

لەم جۆرە مانایەدا مەحوی دەڵێت:

فەلەك جاهێ سەری خەرمانی تا عەرش ئەڵبەتە نابێ

تەنەززول کا علووی هیممەتی بۆ دەنکە زیزانە

موهیممێ غەیری زاتی حەی لە هیممە تیانییە ئیللا

لەبەر ئەم ئوممەتە بێ هیممەتە دایم بە ئەحزانە.

خوای گەورە دەیزانی کە پەیامبەر ﷺ ئەو مافە بۆ بەرژەوەندیی خۆی بەکار ناهێنێت بەڵکو بۆ بەرژەوەندیی ئایینەکەی بۆیە ئەو ڕێگەیەی پێدا، بەڵام بۆ کەسێکی تر هیچ گرێنتییەك نییە کە ئەو مافە بۆ رابوردنەکانی خۆی بەکار نەهێنێت، هەر ئەمەشە وای کردووە بتوانین دانایی‌و هۆی زۆر گونجاوو مەشروع بۆ هەریەك لە ژنهێنانەکانی پەیامبەر ﷺ بدۆزینەوە هەر لە خواستنی خەدیجەوە تا خواستنی دواژنی کە (مەیمونە) بوو.

گەورەترین بەڵگە لەسەر راستیی قسەکەمان ئەوەیە کە پەیامبەر ﷺ دوای فەتحی خەیبەر ژنی تری نەهێنا سەرەڕای ئەوەی کە سەردەمی پشوودانی پەیامبەر ﷺ لەو کاتەوە دەستی پێکرد نەك لە سەرەتای سەردەمی مەدینەوە.

دوای فەتحی خەیبەر موسڵمانان بوون بە گەورەترین هێز لە ناوچەکەداو پەیامبەر ﷺ چیتر پێویستی بەوە نەبوو ژنهێنان وەکو ڕێگەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی یا چەسپاندنی دەسەڵاتەکەی یا لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێگەی بەکار بهێنێت.

---

[1] کچی ئەو ئافرەتەی ناویرا بوو بە "**شیطانة العرب**" و لەمەوبەر ئاماژەمان پێدا.

## هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ لەو ژنانەی خۆیان پێشکەشی کردووە

کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ چەند ڕووداوێمان بۆ دەگێڕنەوە کە ژنان هاتوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺو خۆیان پێشکەش کردووە کە بیانخوازێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺدەستی ناوە بە ڕووی هەندێکیانەوەو هەندێکی تریشیان سەری نەگرتووە، ئەم ڕووداوانە چەند شتێك دەگەیەنن:

یەکەم: ئەوە دەردەخات کە ئافرەت سەربەستیی هەبووە لە شووکردنداو قسەی هەبووە لەو شتانەی پەیوەست بوون بە خۆیەوەو بە لای کۆمەڵگەی موسڵمانانەوە هیچ شورەیی نەبووە گەر ژنێك یان کچێك ئاوەها کارێك بکات، بە پێچەوانەی کۆمەڵگای کوردەوارییەوە کە لە هەندێك شوێندا کچ نەك ناتوانێت بڵێت شوو بە کێ دەکەم بەڵکو تەنانەت ناوێرێت بۆ ئەو کەسەش کە هاتووە بۆ خوازبێنی گفت بدات.

دووەم: زۆربەی ئەوانەی خۆیان پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە کە بیانخوازێت پێغەمبەر ﷺ ڕەتی کردوونەتەوە، ئەویش بۆ ئەوەی کە نەبێت بە تەشریعێك‌و وای لێنەیەت پیاو قسەی نەبێت لەو مەسەلەیەداو ڕووگیر بێت‌و بۆی نەیێت ئەو جۆرە خوازبێنی کردنە ڕەت بکاتەوە، هەروەکو چۆن کچ یان ژن بۆی هەیە خوازبێنیکەری پیاو ڕەت بکاتەوە بە هەمان شێوە پیاویش ئازاد بێت‌و بۆی هەبێت خوازبێنیکەری ژن ڕەت بکاتەوە.

سێهەم: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دەرگایەی بخستایەتە سەر پشت دەیان ئەوەندەی تر لە ئافرەتان ئەو کارەیان دەکردو خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر ﷺدەکرد، بە تایبەت گەر بزانی هەموو ئافرەت‌و هەموو ماڵێك‌و هەموو عەشیرەتێك شانازییان دەکرد بەوەی کە ببن بە خزمی پێغەمبەری خوا ﷺ چ لە ڕووی پلەو پایە ئایینییەکەوە، چ لە ڕووی پلەو پایە دونیاییەکەوە، ئەمانەش هەموو پێش دابەزینی ئەو ئایەتە بووە کە خوا دەفەرموویت: **(لا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيباً) (الأحزاب: 52)**.

چوارەم: دەبێ ئەوە بزانین کە خۆ پێشکەش کردنی ژنان بەو مانایە نییە کە هەندێك لێی تێدەگەن یان لەو جۆرەی کە کچانی ئەم سەردەمە خۆیان پێشکەشی بەرپرسان دەکەن بەڵکو بە مەبەستی خواستن خۆیان پێشکەش کردووە، پێغەمبەریش ﷺ وەکو مافێکی خۆی‌بۆی ڕوانیون، دڵی نەیگرتنایە جوابی دەکردن و ئەگەر بە دڵیشی‌بوایە بە ڕێوڕەسمی عادەتی مارەی دەکردن نەك وەکو ئەوەی کە هەندێك نووسەر لە خۆیانەوەو بێبەڵگە دەیڵێن کە گوایە یەکسەر و بەبێ مارەبڕین چووبێتە لایان، ئەگەر مەبەست زەینەبی کچی جەحش بێت ئەوا یەکەم زەینەب خۆی پێشکەش نەکردو دووەمیش خوا لە لایەن خۆیەوە مارەی لێکرد، مارەبڕینیش لەوە پیرۆزتر کامەیە؟ هەر لەبەر ئەوەش بوو زەینەب شانازیی بەسەر خێزانەکانی تری پێغەمبەرەوە ﷺ دەکردو دەیوت: "ئێوە هەموو کەسوکارتان بەشوویان دان من نەیێت خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە بەشووی دام".

هەندێك لە مێژوونووسانو نووسەرانی ژیاننامەی پێغمبەر ﷺ دەڵێن ئەوەی خۆی پێشکەش بە پێغەمبەر کرد ﷺ **(ميمونة بنت الحارث بن حزن)** بوو، پێغەمبەر ﷺخواستی‌و ئەوەشی کە سەروکاری مارەبڕین‌و مەراسیمەکەی کرد عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی بوو، کە مارەییەکەی چوارسەد درهەم بوو.

یەکێکی تر لەوانەی خۆی پێشکەش بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد **(ام شريك غزية بنت جابر بن حكيم الدوسية)** پێغەمبەر ﷺ قبوڵی کرد، بەڵام دوایی زەواجەکەیان سەری نەگرت.

ئیبنو کەسیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: **(وقد قال ابن ابي حاتم: حدثنا علي بن الحسين، حدثنا يونس بن بكير، عن عنبسة بن الأزهر، عن سماك، عن عكرمة، عن ابن عباس قال: لم يكن عند رسول الله ﷺامرأة وهبت نفسها له)**. واتە ئیبن عەبباس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هیچ ژنێکی لا نەبووە لەوانەی کە خۆیان پێبەخشیبوو، واتە کەسیانی نەخواستووە.

هەر ئیبن کەسیر لە **(ابن جریر الطبري)**یەوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هیچکام لەو ژنانەی نەخواستووە کە خۆیان پێبەخشی، هەرچەند ئەوە حەڵاڵ بوو بۆی، بەڵام بەجێ هێڵرابوو بۆ ویستی خۆی، وەکو خوا دەفەرمووێت: **(إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا )** واتە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ویستی بیخوازێت.

ئیمامی بەغەویش لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: **(واختلفوا في التي وهبت نفسها لرسول الله ﷺ و هل كانت عنده امرأة منهن، فقال عبدالله بن عباس ومجاهد: لم يكن عند النبي ﷺ امرأة وهبت نفسها له، ولم يكن عنده امرأة الاّ بعقد النكاح أو ملك يمين)**. واتە زانایان جیاوازیی لە نێوانیاندا هەیە دەربارەی ئەو ئافرەتەی کە خۆی بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ، ئایا پێغەمبەر ﷺ هیچکام لەوانەی لابوو یان نا، ئیبنو عەبباسو موجاهید دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ هیچ ژنێکی لا نەبوو، جگە لەوانەی کە بە مارەیی خواستبوونیو لەگەڵ کەنیزەکەکاندا.

چی تێدایە کاتێك ژنێك خۆی پێشکەش بە پیاوێك دەکات بۆ خواستن، پیاوەکە تەماشای بکاتو چاوی پێدا بگێڕێو ئەگەر بەدڵی نەبوو رووگیر نەبێتو رەتی بکاتەوە، بۆچی کچ یا ژن بۆی هەبێت دەیان خوازبێنیکەر رەت بکاتەوە، ئەمیان لەبەر هەژاریو ئەویان لەبەر ناشیرینیو سێهەم لەبەر پلەو پایەی کۆمەڵایەتیی کەچی پیاو بۆی نەبێت گەر ژنێك خوازبێنی کرد لەبەر هەرکام لەو هۆیانەی سەرەوە رەتی بکاتەوە؟ئەگەر خۆ پێشکەشکردنی ئافرەتێك بۆ پیاوێك بۆ ئەوەی بیخوازێتو بیکاتە هاوسەریی، لەشفرۆشی بێت بە لای هەندێك نووسەرەوە، ئەی ئەوانەی تەنها بۆ بژێوی لەشی خۆیان دەخەنە بەردەستی هەموو پیاوێك بۆ رابواردن یان بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ شمەکی بازرگانی چین بە لایەوە؟!

کاتێك ئافرەت رای نەبێت لە شووکردندا بە کۆیلایەتی بزانرێ، ئەگەر ئازادییەکەی گەیشتە راددەی خوازبێنی کردنی پیاوی گونجاو بۆ ئەوەی شووی پێ بکات بە لەشفرۆشی بزانرێ ئیتر چ شێوازێك گونجاوە بە لای ئەم نووسەرانەوە؟ وابزانم ئەم کەسانە خۆشیان نازانن چ جۆرە شێوازێك پەسەند دەکەن، تەنها ئەوەندە دەزانن پێغەمبەری ئیسلام ﷺ چی کردبێت رەخنەی لێبگرن ئیتر گرنگ نییە بە لایانەوە راستە یا هەڵەیە.

چی تێدایە گەر پێغەمبەر ﷺ بەو پلەو پایە ئایینیو کۆمەڵایەتییەوە گەر ژنێك پێشنیازی کرد بیخوازێت ئەگەر بە دڵی نەبوو (لەبەر هەر هۆیەك) رەتی کاتەوە.

خوێنەری بەرێز: تۆ خۆت دادوەر بە ئەم حاڵەتەی لە خوارەوە باسی دەکەین چی پێ دەڵێیت: ژنێکی بێوەژن بەوپەڕی جورئەتەنەوە دێتە مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ و دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بمخوازە، ئەویش تەماشای دەکاتو بە دڵی نابێت، چی لێبکات، بیخوازێت یان بیگێڕێتەوە یان پێشنیار بۆ یەکێك لە یارانی بکات بیخوازێت؟

کەسێك ئەگەر کەمێك تێگەیشتنو ئینصافی هەبێت دەزانێ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیکرد ئەوپەڕی حیکمەتو دانایی بوو.

ژنێك هاتووە دەیەوێت شوو بکات، مافی خۆیەتی بە دوای باشترین پیاودا بگەڕێت، ئەگەر سەری گرت ئەوا باشتر و سەریشی نەگرت کەسێکی تر، لەسەر ئەم بنەمایە خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەڵام کە سەری نەگرت پێغەمبەر ﷺ بە دەستی بەتاڵ نایگێڕێتەوە، بەڵکو هەر یەکێکی بۆ دەدۆزێتەوە، ئەوکاتە ئەویش بە دڵی بوو شووی پێ دەکات، بە دڵیشی نەبوو رەتی دەکاتەوە، ئایا دانایی هەیە لە سەرووی ئەمەوە کە هەندێك کەس ناتوانن لێی تێبگەن؟ کەسێك گەورەییو دانایی ئەم هەڵوێستە دەرك پێ نەکات ئیتر دەرك بە چی دەکات؟ ئایا ئەمە لەشفرۆشییە یان بەرزترین پلەی تێگەیشتنو ئازادیو باوەڕ بەخۆبوونو پاکێتییە؟

ژنێك لە جیاتی ئەوەی بچێت لە ژێرەوەو بە نهێنیی هەوەسی سێکسیی خۆی لە ڕێگەی ناشەرعییەوە دامرکێنێتەوە دێت بە ئاشکرا داوای هاوسەرگیریی دەکات، ئایا ئەمە لەشفرۆشییە؟

ئەگەر کەسێك کەمێك ژیریو تێگەیشتنی هەبێت رەخنە لەو رەفتارە پڕ لە داناییو بەزەییو مرۆییەی پێغەمبەر ﷺ ناگرێت بەرامبەر ئەو ئافرەتەی خۆی پێشکەش کردو ئەویش تەماشای کردو دوایی سەری داخستو هیچی نەوت، تا

صەحابەیەك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ناتەوێت لە منی مارە بکە، صەحابییەکە دەڵێ: (**فزوجنيها**)، واتە: مارەی بکە لە من، ناڵێ (**أعطينيها**)، یان (**هبني أياها**)، بیدە بە من یا بیبەخشە بە من.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموویت ئافرەت دەبێ سەرپەرشتیاری بیدا بە شوو، ئەگەر کەس نەبوو ئەوا فەرمانڕەوا سەرپەرشتیارێتیی، کە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دەتوانێ وەکو سەرپەرشتیارێ رەفتار بکات و دوای رەزامەندی ئافرەتەکە بیدا بەو کەسەی داوای دەکات.

## ناوەرۆك

## بڵاوكراوەكانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیرە | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| 1 | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| 2 | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| 3 | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| 4 | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 5 | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| 6 | بەرەو بەختیاری ئافرەت<br>"بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 7 | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 8 | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| 9 | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 10 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت<br>"بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 11 | مێژووی دێرینی كوردستان<br>"بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| 12 | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| 13 | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| 14 | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| 15 | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان<br>رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

| | | |
|---|---|---|
| 16 | بیستو سێ ساڵ سەرووەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| 17 | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| 18 | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| 19 | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| 20 | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| 21 | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| 22 | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| 23 | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| 24 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت<br>"بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 25 | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| 26 | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| 27 | زمانی گەردەلوول، خەونی شنە با<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| 28 | هەڵەبجە 1889 ـ 1930، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |

| 29 | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
|---|---|---|
| 30 | فەرمووده هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| 31 | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، رۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| 32 | شێخ مەحمودی حەفید (1922 – 1925) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| 33 | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| 34 | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |